

پێناسی کتێب

# لە ستایشی ژیاندا

## ئەزموونی نووسەرێک

- ڕەفیق سابیر
- نیگاری بەرگ: هونەرمەند ئیبراهیم زۆراب
- چاپ: یەکەم- ٢٠٢٣
- ڕێنووس و هەڵەچنی: نووسەر
- چاپخانە: چوارچرا
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٧٧٤ )ی ساڵی ٢٠٢٣ی پێ دراوە.

لەمێژە ڕێگای گەڕانەوە بۆ ڕابردوو گیراوە
چی لەو هەموو ڕابردووە بکەم!
ئاننا ئاخماتوڤا ١٨٨٩-١٩٦٦

ئەگەر توانیت قەناعەت بە مێش بکەیت کە گوڵ لە زبڵ باشترە، ئەوکاتە دەتوانیت ناپاکان بهێنیتە سەر ئەو باوەڕەی کە وڵات لە پارە بایەخدارترە .

گیڤارا ١٩٢٨-١٩٦٧

## ناوەرۆک

## چریکەیەک لە نیوەشەودا

شەوێکی پایزی ناوەڕاستی ساڵانی شەستەکان، وەکوو شەوانی دی کارەبا بڕابوو. لەپڕ بە زیرە و هاواری ژنێک، کە ئارامیی شەوەکەی هەژاند، بێدار بووینەوە. دایکم پێش هەموومان لەناو جێگاکەی دەرپەڕی و بەرەو هەیوان چوو، منیش بەدوای ئەودا چوومە دەرێ. دەنگی گریاناویی ژنێک، هاوار و نوزانەوەی منداڵ و دەنگە دەنگ لە کۆڵان دەهات. دایکم وتی:

ئەوە لە دەنگی ئایشێ دەچێت، دەبێت ئەو بەدبەختە بەو نیوەشەوە چی بەسەر هاتبێت.!

دایکم فانۆسەکەی هەڵگرت، کە بە کزی دەسووتا. بەرەو دەرگای حەوشە ڕۆیشتین، کە دە مەترێک لە هەیوانەکە دوور بوو. لە دەرەوە دەنگەدەنگ دەهات. کاتێک چووینە دەرێ، چەند دراوسێ پێش ئێمە گەیشتبوونە کۆڵان و وردە وردە زۆرتر دەبوون، هەندێکیان فانۆسیان بەدەستەوە بوو. یا ئایشێ بە دانیشتنەوە هەردوو لاقی درێژ کردبوو، بە جۆرێک شینی دەکرد، هەناوی مرۆڤی دەهەژاند. بەدەم شین و هاوارەوە، بە دوو دەست لە خۆی دەدا و پرچ و ڕوخساری خۆی دەڕنییەوە. کاتێک لێی ورد بوومەوە، سەری پاک تاشرابوو، لەبەر خۆمەوە وتم:

ژنێکی تریش، سەری تاشرا!

لەو دەمەدا دراوسێکان لە ماڵ دەهاتنە دەرێ، کۆڵان بە شەوقی فانۆس و لایتی دەستیان، ڕووناکتر بوو. چاوم بە خەڵکەکەدا گێڕا، چەند ژن و کچی گەڕەکم بەر چاو کەوتن. بیرم بۆ ئەوە چوو کە دەبێ دوای یا ئایشێ، کە ژنێکی بێوەی و دایکی پێنج منداڵ بوو، نۆرەی کێ بێت!

ئەو بەسەرهاتە، بەشێک بوو لەو ڕووداو و دیاردە دزێو و ترسناکانەی، کە لە ناوەڕاستی شەستەکان بەدواوە، بزووتنەوەی چەکداریی کورد، کە ئەیلوولی ١٩٦١ هەڵگیرسا، لەگەڵ خۆی بۆ قەڵادزێی هێنا. لەو ساڵانەدا سەرتاشین و دواتر لوتبڕینی ژنان، پەیدا بوون. ژنکوشتن، کە لە چلەکان و پەنجاکاندا، زۆر دەگمەن بوو، زیادی کرد و ئەنجامدەرانی گۆڕدران. پێشمەرگە لەجیاتی مێرد، بە بەهانەی پووچ و بە ناوی "شۆڕش"ەوە، ژن و کچی خەڵکیان تیرۆر دەکرد. چەند کچ و ژنی بێتاوان و ئابڕومەند، کرانە قوربانی. لەوانە خێزانێک کە زۆر لەمێژ بوو لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە هاتبوون و لە قەڵادزێ جێگیر بووبوون. دوو کوڕ و کچێکیان هەبوون، هەژار و بێکەس دەژیان. پیاوەکەیان کە زۆر بەتەمەن بوو، لە گەراجی قەڵادزێ کاری دەکرد. کچەکەیان جوان بوو. شەوێک چەند چەکدارێک، "پێشمەرگەی نێوخۆ"، چوون سەری کچەیان تاشی. دواتر دەنگۆی ئەوە بڵاو بۆوە کە ویستوویانە لەگەڵی ڕابوێرن و کچەکەش ڕازی نەبووە، بۆیە سەریان تاشیوە. پاش ئەو کارەساتە دڵتەزێنە، خێزانەکە ڕوویان لە بەغدا کرد.

ژنێکی تەمەن سەرووی پەنجا ساڵان لەگەڵ مێردەکەی، مام قادر، کە کارمەندی خزمەتگوزاری بوو، دەژیان و منداڵیان نەبوو. شەوێک چەند "پێشمەرگەی نێوخۆ"، بەو تومەتەی گوایا نامە و پەیام لەنێوان کوڕ و کچان (عاشقان) دێنێ و دەبات، لووتیان بڕی.

پاش ئەو تاوانە ژنومێردەکە چوونە سلێمانی. هەندێک جار بە ڕێکەوت ئەو ژنەم لە بازاری سلێمانی دەبینی، کە بە پەڕۆیەکی ڕەش لووت و زاری خۆی دادەپۆشی، هەستم بە ئازار و شەرمەزاری دەکرد. ئەو جۆرە تاوان و کارانەی بە ناوی "شۆڕش"ەوە دەکران، هێندە زۆرن، کە لێرەدا نا نووسرێنەوە، بۆیە بە ڕووداوێک دوایی پێ دەهێنم.

خێزانێک چەند ساڵ بوو لە لادێوە هاتبوونە قەڵادزێ، لە بەری جووتکانیان دەژیان. پیاوەکە دوکاندار بوو، لەگەڵ دوو کوڕەکەی، کە زۆر بێوەی بوون، کاسبییان دەکرد. ئەو خێزانە دوو کچی گەنج، جوان و بەرچاویان هەبوو. شەوێک ئەو چەکدارانە، چوونە سەریان، بە توومەتی پووچ و بی بنەما، کچێکیان کوشت و ئەوی تریشیان بە برینداری دەرباز بوو.

ئەو دیاردانە، لە سایەی بزووتنەوەی چەکداریدا، لە قەڵادزێ سەریان هەڵدا. چەند لەو خێزانانەی ئەو جۆرە تاوانانەیان بەرامبەر کرا، بە جۆرێک تێکشکێندران، کە سەری خۆیان هەڵگرت، بەدەم نەفرەتکردن لە وڵات و گوایا شۆڕش، بۆ شاری تر چوون.

قەڵادزێ شارێکی بچووک بوو، نزیکەی هەموو خەڵکەکەی یەکتریان دەناسی. کەسێکی غەریب ڕێی بکەوتایەتە ئەوێ، بە ئاسانی دەناسرایەوە. بۆیە چەند ڕۆژ دوای هەر ڕووداوێکی لەو جۆرە، دەزاندرا کام "قارەمانی نەتەوە"! تاوانەکەی ئەنجام داوە.

ئەوانەی دەستیان دەچووە ئەو جۆرە بەدکارییە، خۆیان کەسانی ڕێزدار نەبوون، هەندێکیان داوێنپیس و بەدناو بوون. لەناو ئەو ئاژاوە و بێقانوونییەدا، دەرفەت بۆ ئەو جۆرە کەسانە ڕەخسابوو توانای شەڕخوازانە و وێرانکارانەی خۆیان پیشان بدەن، تۆڵە لە نەیاری خۆیان بکەنەوە، یاخود سزای کچ و ژنی بێ پشتوپەنا

بدەن، کە ئامادە نەبوو خۆی بخاتە بەردەستیان. بە کورتی لەو ڕۆژەوە شەڕ لە کوردستان هەڵگیرسا، جارێکی تر سەری سندووقەکەی (پاندۆرا)، بەڵام لە کوردستان، هەڵدرایەوە.

بەپێی ئەفسانەیەکی گریکی کۆن گەورەخوداوەند زییۆس، فرمانی بە هیفایستۆس کرد کە یەکەمین ژن، پاندۆرا، لە گڵ دروست بکات، تا لە ڕێگای ئەوەوە شەڕ، دەرد و تاوان لە سەرزەمین بڵاو بکرێتەوە، چونکە زییۆس دەیەویست، لە بەرانبەر ئەوەی پرۆمێسیۆس ئاگری لە خوداوەندان دزیبوو، تۆڵە لە مرۆڤ بکاتەوە.

خوداوەندان دیاریی جۆراوجۆریان بە پاندۆرا بەخشی، هەروا سندوقێکیان پێ دا بۆ مێردەکەی بەرێت. بەڵام پێیان وت نابێت بە هیچ جۆرێک سەری سندوقەکە هەڵداتەوە. دواتر پاندۆرا خۆی پێ نەگیرا و سەری سندوقەکەی هەڵدایەوە. لەناکاو هەرچی ئازار، بەڵا، نەخۆشی، خراپەکاری و تاوان هەن، لە سندوقەکەوە هاتنە دەرێ و بە هەرلادا بڵاو بوونەوە. پاندۆرا ترسا و خێرا سەری سندوقەکەی نایەوە. لەو دەمەدا هاوارێک لەناو سندوقەکەوە هات:

-پاندۆرا من هیوام، سەری سندوقەکە هەڵدەوە با منیش بێمە دەرێ!

بەڵام ئیتر درەنگ بوو!

***

لە ئەیلولی ١٩٦١ شەڕ لە کوردستان هەڵگیرسا. سەرەتا کۆمەڵێک ئاغای پشدەر و بیتوێن لە حکومەت یاخی بوون و پەنایان بۆ چەک برد. ڕێگای نێوان ڕانیە- سلێمانی و کۆیەیان گرت. سەرکردایەتیی پارتی ئەو دەرفەتەی قۆستەوە، بە بێ خۆئامادەکردن و بەرنامە، چووە پاڵ یاخیبوونە چەکدارییەکە.

دواتر له شوێنی خۆیدا باسی دەکەم.

ئەو شەرە ئاشتی، ئارامی و تەبایی نەهێشت. دیاردەی کوشتن، تیرۆر، دووبەرەکی و پەلامـاری سـەربازیی هێنا و چەنـدان جـار نـاوچەی پشدەر بۆردمـان کـرا. بەشـێکی خەڵکی قەڵادزێ لەترسـی بۆردومـان، یـان هـاتنی سـوپای عێـراق، ڕوویـان له گونـد و نـاوچە شاخاوییەکانی پشدەر کرد. له هەمان کاتدا شـەڕ تەمەنـی منداڵی و لاوێتیی نەوەی ئێمه و چەندان نەوەی دواتری زەوت کرد. ناچاری کردین زوو گەورەبین و بەرگەی شەڕ و کارەساتەکانی بگرین.

له گەرمەی شەڕی نێوان عێراق و بزووتنەوەی چەکداریی کورد، شـەڕی نێوخـۆ لەسـەر دەسـەڵات، لەنێـوان سـەرۆکی پـارتی و مەکتەبی سیاسیی پارتی، دەستی پێ کرد، که به شـەڕی مەلایـی و جەلالـی ناسـرا. ئەو شـەڕە کۆمەڵی کوردسـتانی کـردە دوو بەرەی پێـک نـاکۆک. هەروا دەری خسـت که گەلـی کـورد، هێشـتا وەکـوو نەتەوە، پـێ نەگەیشـتووە، هەمـاهەنگیی نەتەوەیـی و ئامـانجی هاوبەشی نەتەوەیی نییه. بۆیه بزاڤی چەکداری، لەپێناوی دەسەڵاتە، نەک بۆ ئازادیی کوردستان.

به هـۆی هەڵگیرسـاندنی شـەڕ هەزاران گەنجـی کـورد، به نـاوی گوایا شۆڕشەوە کرانه قوربانی. زیاتر له نیوەی ئەو قوربانییانه له شەڕی نێوخۆدا، بەکوشت دران، یـان فەلەج و پەککەوتە کران. دوا شتێک، که لەناو کۆڵەپشتە شڕەکەی بزووتنەوەی چەکداریدا مـابوو (هیوا) بوو، شەڕی نێوخۆ ئەویشی کوشت.

له سـایەی ئەو دوو شـەڕەدا چاکه له بەرانبەر خـراپە و تاوانـدا، خۆشەویسـتی و لێبـوردەیی له بەرانبەر تـۆڵەدا، ژیـان له بەرانـبەر مردنـدا، پاشەکشـەیان کـرد. ژیـانی مـرۆڤ، که بـۆ هەر کەسـێک بەنرخترین شتی دنیایە، وەکوو ژیانی فڕوجێک بێ بایەخ کرا. به

لای منەوە سەرەتای شکست و ئاشبەتاڵی بزووتنەوەی چەکداریی ئەیلول، لەگەڵ هەڵگیرسانی شەڕی نێوخۆ، دەستی پێ کرد.

هەر شتێکی زیندوو، لە سروشت و کۆمەڵدا، ئامانجی ئەوەیە ڕۆحی خۆی- ژیانی خۆی، لە ڕێگەی چالاکیی جۆراوجۆر، گەشە پێ بدات و بیپارێزێت. بۆ مانەوەی خۆی، پێویستە توخمی چاکەی لەگەڵ خۆی هەڵگرتبێت. گوڵێک یان دارێک بۆ ئەوەی بە زیندوویی بمێنێت، خۆی جوان دەردەخات، بۆ ئەو شتانە دەگەڕێت کە بۆ مانەوە و باشتربوونی ژیانی بەسوودن. دارگوڵ گوڵ دەگرێت، بۆنی خۆش بڵاو دەکاتەوە، بە دیمەنی جوانی، چاو و دەروونمان ڕوون و دڵمان خۆش دەکات. دارمیوە گوڵووکی ڕەنگاوڕەنگ دەگرێت، کە دەبن بە میوەی بەتام و بەسوود. مرۆڤ، باڵندە، ئاژەڵ، زیندەوەر و سروشت سوودی لێ دەبینن. تەنانەت ئەو زیندەوەر و ئاژەڵانەی زیان بە مرۆڤ دەگەیەنن، لە توخمی چاکە بێبەش نین، دەشێت لە بواری تردا، سوودیان هەبێت، سیستمی ئێکۆلۆگی بپارێزن. ئەرستۆ تالیس (٣٨٤-٣٢٢ پێش زاین) دەڵێت:

جوانی هەمیشە چاکە.

مرۆڤیش وەکوو گیانداری تر، بەڵام بە پشتبەستن بە عەقڵ و ئەزموونی خۆی و کەسانی تر، ئامانجی ئەوەیە چۆن بژی و بە کام شێواز ژیانی خۆی جوانتر و باشتر بکات، بەختەوەر بێت و بمێنێت. ژیان بۆ هەر گیاندارێک، لە پێش هەموووانەوە بۆ مرۆڤ، گرینگترین شتە. ژیان چاکە بۆیە جوانە، جوانە چونکە چاکە. ژیان تاکە دەستکەوتێکی مرۆڤە کە بە هیچ شتێکی دنیا قەرەبوو ناکرێتەوە.

بزووتنەوەی چەکداریی کورد، بەپێی لۆجیک هەر دەبوو شکست بێنێت و ئاشبەتاڵ بکات، چونکە هیچ توخمێکی چاکی لەگەڵ خۆی

هەڵنەگرتبوو، کە سوودی بۆ ژیان، سروشت و ئینسان هەبێت.

هیچ دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی، بەم حوکمڕانییەی ئێستای هەرێمی کوردستانیشەوە، ئەگەر پڕی تۆخمی چاکە و ئامانجی چاکەخوازی و چاکەویستی نەبێت، ناتوانێت تا سەر بەردەوام بێت.

کۆمەڵی کوردستان، بە هۆی هەڵگیرساندنی شەڕ و بزووتنەوەی چەکداری و شەڕی نێوخۆ، هەڵتەکێندرا، دەیان هەزار کەس لەناو چوون، وڵات وێران کرا، خەڵک لە گوند و سەرزەویی خۆی دەرپەڕێندران، جوانی، ئاشتی و تەبایی وەکوو هیوا کوژران... کوژران.!

## ١
# هەڵاتن بەرەو ژیان

سەرەتای هاوین بوو، هێشتا نەچووبوومە قوتابخانە. ڕۆژێک لە گەڵ هاوڕێیەکم، مەحموودی حاجی مەحموودی خەیات، چووینە سەربانی مزگەوتی گەورە، کە نزیکی ماڵمان بوو، بۆ ئەوەی بەچکە چۆلەکە بگرین. سەربانەکە زۆر گەورە بوو، لە حەوشەی مزگەوتەوە دارتووی بڵیند هەڵکشابوون، لقەکانیان بۆ لای سەربانەکە شۆڕ بووبوونەوە. لەوێ بە دوای بەچکە چۆلەکەیەک کەوتم، کە بە ئاستەم هەڵدەفڕی و دەنیشتەوە. لە ترسی من و بۆ پاراستنی ژیان و ئازادیی خۆی، بە باڵەفڕە خۆی هەڵدایە سەربانێکی نزمتر، کە دەبوو بە پەیژە بۆی بچمە خوارێ. بە پەلە ویستم بە پەیژەکەدا بچمە خوارێ. لە هەنگاوی دووەم یان سێیەمدا، پێم هەڵخلیسکا و بەربوومەوە، لەتاو ئازاری باسکم زیرەم لێ هەستا. ویستم هەستمەوە، بەڵام نەمتوانی دەستی چەپم بجوڵێنم، باسکم شکابوو. مەحموود بە پەلە بە هانامەوە هات، پێکەوە چووینەوە ماڵێ. دایکم کە بەو شێوەیە منی بینی شڵەژا، بە مەحموودی وت بەڕاکردن بچێت بۆ بازار، بە باوکم بڵێت خێرا بێتەوە ماڵ.

زۆری پێ نەچوو باوکم هاتەوە، بە باوەش هەڵی گرتم، لە

سەرەتای شەقامی خانەقا لە بەردەم ماڵێک، کە نزیکی ماڵی خۆمان بوو ڕاوەستا. منی دانا و لە دەرگای ماڵەکەی دا.

زۆر ڕۆژ لەگەڵ هاوڕێکانم لە نزیکی ئەو ماڵە یاریمان دەکرد. بەڵام ئەو دەرگایە هەمیشە داخرابوو، لەوە نەدەچوو کەسێک لەوێ بژی. دەرگاکە زۆر سەرنجڕاکێش و سەیر بوو، پان، دوو لا، قەبە و قایم مێخڕێژ کرابوو. لە شەقامی خانەقا، وەکوو لە بیرم بێت، تەنیا یەک دەرگای تری لەو جۆرە هەبوو، کە لە تەنیشت ئەو بوو.

دەرگاکە کرایەوە پیاوێکی ڕەشتاڵەی مۆن، کە پێشتر لەو کۆڵانە نەمدیتبوو، دەرکەوت. بە سەرسوڕمانەوە تەماشای باوکمی کرد، لێی پرسی: چیت دەوێ؟

باوکم دەستی بۆ لای من ڕاکێشا، وتی:

لەبەر ئەو کوڕەم، کە دەستی شکاوە، هانام بۆ جەنابت هێناوە.

من لەتاو ئازار، چاوبەگریان شانم بەلای چەپدا خوار کردبۆوە، قۆڵم وەکوو باڵی شکاوی کۆترێک شۆڕ بووبۆوە. پیاوەکە تەماشای کردم و فەرمووی لێ کردین. چووینە ژوورێ و بردینیە هۆڵێکی گەورە، کە لای دەرگاکە بوو، لەوێ دانیشتین. دوای تاوێک کابرا هاتەوە، کراسی لەبەر داکەندم، بەدەم پرسیارکردنەوە، دەستە شکاوەکەمی بەرز کردەوە، هەندێک جوڵەی پێ کرد، لەناکاو ئازارێکی زۆر وەکوو بروسکە بەناو لەشمدا گەڕا و هاوارم کرد. کاتێک بە ئاگا هاتمەوە لە ماڵی خۆمان لەناو جێگا پاڵ کەوتبووم، دەستی چەپم هەڵبەسترابوو، دایکم بە باوەشێنێکەوە لە تەنیشتم دانیشتبوو.

ئەو کەسەی زۆر بە باشی دەستی شکاوی منی هەڵبەستەوە، فەرمانبەرێکی بەڕێوەبەرایەتیی تووتن (ئینحیسار) بوو، کە ساڵانە لە سەرەتای بەهاردا، حکوومەت دەینارد بۆ قەڵادزێ. ئەو

سەردەمە تووتنی زۆر و باش، لە گوندەکانی پشدەر دەچێندرا و حکومەت تووتنەکەی دەکڕییەوە. ئەو فەرمانبەرانە، کە تووتنناس بوون، پێشوەخت بەوردی تووتنەکانیان دەپشکنین، بەگوێرەی کوالیتییان، نمرەیان بۆ دادەنان و نرخەکانیان دیاری دەکردن. دواتر تووتنەکە بۆ کارگەکانی جگەرە لە بەغدا، سلێمانی، هەولێر و چەندان شاری تری عێراق دەنێردران، کە هەزاران کرێکار لەو کارگانەدا کاریان دەکرد.

من، وەکوو دایکم دەیوت، دە ڕۆژ پێش جەژنی ڕەمەزانی ١٣٦٩ی کۆچی، کە بەو حیسابە دەکاتە پێنجی تەممووزی ١٩٥٠ لە قەڵادزێ هاتوومە دنیا. بەڵام لە تۆماری ڕەسمیدا نووسراوە کە ١-٧-١٩٥٠ لەدایک بووم. لەبەر ئەوەی لە مانگی ڕەمەزاندا هاتبوومە دنیا، ویستبوویان ناوم بنێن (ڕەمەزان). تا ماوم لەم بارەیەشەوە سوپاسگوزاری دایکمم، کە نەیهێشتبوو ئەو ناوەم لێ بنێن. بە منداڵی توشی سوریژە بووبووم، کە چەند خوشک و برام بەو نەخۆشییە جوانەمەرگ بووبوون، بەڵام من ئەو شانسەم هەبوو، کە بۆ ژین لەدایک بووم، نەک بۆ جوانەمەرگبوون.

باوکم سابیر قادر تەها خەلیل، لە کۆیە لەدایک بووبوو. لە تۆماری ڕەسمیدا ساڵی ١٩٠٠ بە ساڵی لەدایکبوونی داندرابوو. هێشتا منداڵ بووە، باوکی کۆچی دوایی کردووە. نەنکم، لە باوکمەوە، ناوی حەبیبە بوو. من نەمدیتبوو، بەڵام باوکم زۆر جار وەکوو ژنێکی جوان، گورجوگۆڵ و ورەبەرز، باسی دەکرد. دوای مردنی باپیرم بەدیار چوار منداڵەکەیەوە، محەمەد، عەبدوڵڵا، زبێدە و سابیر، دانیشتبوو.

مامی گەورەم، کە لە دوای شەڕی دووەمی جیهانی مردبوو، دوو کوڕی لەپاش بە جێ مابوو، ئەحمەد و مەحموود. دوای

مردنــی مــامم، هاوســەرەکەی مێــردی کردبــۆوە. بــاوکم هەردوو بــرازاکەی، کە منــداڵ بــوون، بەخــۆ گرتبــوو، وەکــوو منداڵی خــۆی پەروەردەی کردبــوون. مــامەکەی تــرم نــاوی عەبــدوڵلا بــوو، بە گەنجی مردبوو. پووره زبێدەشم نەدیتبوو، بەڵام کچ و کوڕێکی هەبوو، کچەکەی، ئایشەگوڵ، کە میهرەبانی و مەحەبەتی پوورانەی بەرانــبەری مــن زۆر بــوو. کوڕەکەشــی نــاوی ڕەشــید بــوو، کە هاتوچۆی ئێمە و خزمانی نەدەکرد.

لەســەردەمی شــەڕی یەکەمــی جیهانــدا ١٩١٤-١٩١٧ ڕۆژێــک لەشکری تورک لە کۆیە دەستی بە ڕەشبگیریی لاوان و مێرمنداڵان کردبوو، تا بۆ سـەربازییان بەرێت. لەو ڕەشبگیرییەدا باوکم، کە تەمەنی نەگەیشتبووە شازدە ساڵ، لەگەڵ سـەدان لاو و مێرمنداڵی تر، بەتەڵەوە بووبوون. یەکسەر ڕەوانەی ئۆردوگایەکی سـەربازیی دەرەوەی کۆیە کرابوون. لەوێ ڕاهێنانیان پێ کردبوون، تا دواتر بۆ بەرەی شەڕ بەڕێیان بکەن. بەشێک لەو گەنجانە، وەکوو باوکم گیرایەوە، جیا کرابـوونەوە، لە کـاتی پەڕینەوە لە زێ و ڕوبـاری بەخوڕ و ترسناک، پێش لەشکر دەخران، زۆریان ئاو دەیبردن و دەخنکان. باوکم وتی:

(هەفتــانە چەنــدان کەس لە ئۆردوگــا هەڵــدەهاتن. ئەوانەی دەگیرانەوە، بەپێی فرمانی سوپا، دەبوو گوللەباران بکرێن. بەڵام کوڕی دەوڵەمەندەکان جیا دەکرانەوە، کەسوکاریان دەردەکەوتن و بە پارە ژیانی ئەوانیان دەکڕییەوە. ئەگەر ئەو سەربازە هەڵاتووانە، بۆ نموونە پێنج کەس بوونـایە، ڕادەسـتی کەسـوکاریان دەکـران، لەجیـاتی ئەوان پێنج سـەربازی تـری بـێ گوناهیـان گوللەبـاران دەکردن. من دەترسام شەوێک بێن لەجیاتی کەسێکی دی بمبەن و بمکوژن. بۆیە لەگەڵ دوو برادەرم هەڵاتین و چووینەوە کۆیە).

بەلام بـاوكم، كە هەردوو بـرايەكەی بە زۆرەملـێ كرابـوون بە سەرباز، لە كۆيە نەمابۆوە. لەگەڵ دايكی، خوشكی و چەند خزمێك، يەكسـەر بەرەو قەلادزێ چووبـوون، كە ئەو كـاتە لەشـكرێ تـورك لەوێ كشـابۆوە. ئەو سـەردەمە زۆر بنەمـاڵەی كـۆيی، لە ترسـی لەشكری عوسمانی، يـان بۆ كـاری بازرگانی، لەنێوان كوردسـتانی بندەسـتی عوسـمانی و كوردسـتانی بندەسـتی ئێرانـدا، چووبـوونە قەلادزێ، كە لە سنووری ئێران نزيكە، لەوێ نيشـتەجێ بووبـوون، بەشێكيان خزم و ناسياوی ماڵی باوكم بوون.

لەشـكری تـورك، كە سـالانی ١٨٩٢-١٨٩٣ نـاوچەی پشـدەری داگير كردبوو، ناوی ناوچەكەی گۆڕيبوو بە (قەزای حەميديە). لەو سـالانەدا سـەركردەی لەشـكرەكەيان، حوسـنی بەگ، لە قەلادزێ كـوژرا بـوو. توركەكـان لەوێ، لە گردێكـی بەرزی دەروازەی قەلادزێ ناشتبوويان، دواتر ئەو شوێنە بە (گردی حوسنی) ناسـرا. دوای ئەو ڕووداوە و پـێش كۆتـايی سـەدەی نـۆزدەيەم، لەشـكری تورك لە ناوچەی پشدەر كشابۆوە.[1]

ئەو سەردەمە كاروانچييان، بە كالا و كەلوپەلی جۆراوجۆرەوە، لە موكريـانەوە بە ڕێگـای بێـوران و كێلێـدا چـوونەتە قەلادزێ، كە كاروانسەرای لێ بووە. لەوێوە بەرەو ڕانيە، كۆيە، هەولێر، مووسڵ و حەڵەبـيش چـوون، كـالا و شـمەكەكانيان سـاخ كـردوونەوە. لە گەڕانەوەشـدا لەو شـارانەوە، بەتـايبەت لە حەڵەب و مووسـڵ، كە ناوەنـدی گەورەی بازرگـانی بـوون، كـالا و شـمەكی زۆريـان لەگەڵ خۆيان هێناوە و بۆ ئێرانيان بردوون.

---

1- ڕەفيق سابير، پەيڤ و پەيام، هەڵبژاردەی نووسينەكانی ١٩٧٠-١٩٨١ كۆكردنەوە و ئامادەكردن بوار نوورەدين، غەزەلنووس ٢٠٢٢ ل ٣٧٨

هاتوچۆی بازرگانی هەم ژیانی ئابووریی خەڵکی ئەو ناوچانەی باشتر کردبوو، هەم پێوەندیی کۆمەڵایەتی و کولتووری، لەنێوان خەڵکی هەردوو بەشی کوردستاندا، پێک هێنابوو. لە ئەنجامدا شێوەزاری خەڵکی ئەو ناوچانە لە یەکتر نزیک بوونەوە. بۆ نموونە شێوەزاری موکریان، پشدەر، بیتوێن، کۆیە ، سۆران و هەولێر تا سنووری بادینان، کە ڕێگایەکی هاتوچۆی بازرگانی بووە، لەیەکتر دەچن. کەچی شێوەزاری سنە، مەریوان، بانە، سلێمانی و گەرمیان لە یەکترەوە نزیکن، چونکە ئەو ناوچانە ڕێگایەکی تری بازرگانیی بوون. کاروانەکان لە سنەوە بەرەو مەریوان، سلێمانی و کەرکووک تا موسڵ و بەغدا چوون. بەردەوام بازرگانان و کاروانچییانی هەردوو دیوی کوردستان، بەو دوو ڕێگایەدا لە هاتوچۆدا بوون. دوای دەیان ساڵ تێکەڵاوی، ژنخوازی، یان گەڕان بە دوای کار و ژیانێکی باشتردا، سەدان خێزان و هەزاران کەس، لەودیوی کوردستانەوە هاتوونەتە ئەمدیوی کوردستان، لەوێ نیشتەجێ بوون، یان بە پێچەوانەوە. ئەو پێوەندی و هاتوچۆیە، لە ژیانی کۆمەڵایەتی، کولتووری و شێوەزاری خەڵکی ئەو ناوچانەدا ڕەنگیان داوەتەوە.

باوکم، کە بە سابیری چایچی ناسرابوو، لەگەڵ دایک و خۆشک و دوو براکەی لە قەڵادزێ جێگیر بووبوون. لەوێ کاری جۆراوجۆری کردبوو، کاروانچێتی، کەوشدرویی، دوکانداری و چایچێتی. باوکم دوو جار ژنی هێنابوو، ژنی یەکەمی ناوی فاتم بوو، خوشکی حاجی ئەحمەد حەمەدەمین کۆیی بوو، کە کەسایەتییەکی بەڕێز و ناسراوی قەڵادزی بوو. لەو ژنەی پێنج منداڵیان بووبوو، کچێک و چوار کوڕ. دوای شەڕی یەکەمی جیهانی، پەتا و نەخۆشیی جۆراوجۆری وەکوو سورێژە، خروێلکە،

تاعون و نەخۆشیی تر، لە کوردستان بڵاو بووبوونەوە. تا ساڵی ١٩٣٩ نەخۆشخانە لە قەڵادزێ نەبوو، بۆیە خەڵکێکی زۆر، لەوانە چوار منداڵی باوکم، بەو جۆرە نەخۆشیانە جوانەمەرگ بووبوون. لەگەڵ لەدایکبوونی منداڵی پێنجەمیان، دایە فاتم و منداڵەکەیان پێکەوە گیانیان سپاردبوو. باوکم لەناو ئەو منداڵانەیدا، زۆر جار خەمبارانە باسی کچەکەی دەکرد، کە نۆبەرەیان بوو، ناوی عیسمەت بوو. خزمان دەیانوت باوکم لە سەرقەبران، لە کاتی ناشتنی هاوژینیدا، گریابوو. ئەو ڕۆژانە ئەو کارە ئاسایی نەبوو. حاجی تاهیر عەبدوڵڵا کۆیی، کە مامی فاتمە خان و گەورەی بنەماڵەکەیان بوو، پێی وتبوو:

سابیر مەگری، ئەوە ئامینی خوشکەزام دا بە تۆ!.

بەو جۆرە دایکم، بە بێ ئەوەی پرسی پێ بکەن، درا بە پیاوێک کە چواردە ساڵ لە خۆی گەورەتر بوو!

دایکم کچی بازرگانێکی دەوڵەمەندی قەڵادزێ، حاجی مەحموود عوسمان، بوو، کە لە حوزەیرانی ١٩٦٦ کۆچی دوایی کرد. نەنکم، لە دایکمەوە، ناوی هەمین عەبدوڵڵا بوو، خۆشکی حاجی تاهیر عەبدوڵڵای کۆیی بوو، دوای لەدایکبوونی دایکم، جوانەمەرگ بووبوو. پاش کۆچی دوایی نەنکە هەمین، باپیرم کە بە بابەگەورە ناومان دەبرد، کچێکی کۆیی بە ناوی ڕابیعە هێنابوو، کە بە ڕابی بانگی دەکرد. هەموو نەوەکانی حاجی مەحموود پێمان دەوت دایەگەورە. بابەگەورەم لەو ژنە چوار کوڕی هەبوو، حوسێن، حەسەن، حەمید و مەجید. سێ لەو خاڵانەم بە ڕێگای حاجی مەحمووددا ڕۆیشتن و بوونە بازرگانی سەرکەوتوو.

دایەگەورەم کەسێکی ڕووخۆش نەبوو، تەنانەت کەمێک تووڕە دیار بوو. وێنەی ژنێکی بەهێز و دەسەڵاتدار، کە ژنی پیاوێکی

دەوڵەمەندە و دایکی چوار کوڕە، خۆی پیشان دەدا.

دایکم بە ساوایی کەوتبووە لای باوەژنی. زڕدایک لە کوردەواریدا، بە گشتی چارەی منداڵی مێردەکەیان ناوێت، کە لە ژنی پێشوویە. تەنانەت هەندێکیان هەوڵ دەدەن منداڵەکە لە بەرچاوی باوکی بخەن. دایکم بە چەند مانگی کەوتبووە لای دایەگەورەم، دەکرا وەکوو منداڵی خۆی قبووڵی بکردایە، چونکە بەڕاستی بووبوو بە کچی ئەو، لەو بەولاوە ژنێکی تری وەکوو دایک نەناسیوە.

ڕاستییەکەی منداڵ، وەچەی هەر ژن و پیاوێک بێت، ئەو دوو کەسە بە دایک و باوک دەناسێت کە لە ئامێزیاندا گەورە بووە، بە ناز و خۆشەویستیی ئەوان پەروەردە کراوە. ئەو خۆشەویستی و نازە و هەستی دایکایەتی و باوکایەتی، پێکەوە لەگەڵ منداڵەکەدا گەورە دەبن. دایکوباوکەکەی تر، کە منداڵەکە نەیدیتوون، هەر لە لایەنی بایۆلۆجی (خوێن)ەوە پێوەندییان بە منداڵەکەوە هەیە. ساڵانە دەیان هەزار منداڵ لەبەر هەژاری، یان بە هۆی شەڕ و کارەساتی تر، یاخود لەبەر هۆکاری کۆمەڵایەتی، ڕادەستی خانەی منداڵانی بێسەرپەرشتیار دەکرێن. دایکوباوکی نوێ بەخۆیان دەگرن، بەخێو و پەروەردەیان دەکەن. منداڵەکانیش هەر ئەوان بە دایکوباوکی خۆیان دادەنێن. قانوون و عورف و کۆمەڵیش، لە هەموو دنیا، جگە لە هەندێک وڵاتی دواکەوتووی ئیسلامی، ئەوان بە دایکوباوکی ئەو منداڵانە دەزانن، لەگەڵ منداڵەکانی تریاندا، لە ئەرک و ماف و میراتدا، هاوبەش و یەکسان دەبن.

لە کوردەواری و چەند وڵاتی ئیسلامیدا زۆر خێزان، کاتێک ئەو منداڵە بێکەسانە بە خۆیان دەگرن و گەورەیان دەکەن، بە منداڵی ڕاستەقینەی خۆیانیان دانانێن، بە شێوەی منداڵەکانی تریان ناز و

خۆشەویستییان پێ نادەن، لەناو خێزاندا بە نامۆ دەبیندرێن. لە چەند وڵاتی ئیسلامی، لەوانە لە عێراق، بە قانوون وەکوو منداڵەکانی تری خێزان ناناسرێن و مافی میراتبەرییان پێ نادرێت. تەنانەت ئەگەر دایکوباوکەکە بە وەسیەتنامەی تایبەت مافی میراتگری بەو منداڵە بدەن، هێشتا لە میراتدا لەگەڵ منداڵەکانی تری خێزان، هاوماف ناکرێن. لە بڕگەی دووەمی (یاسای چاودێریی نەوجەوانان)ی عێراقی، مادەی ٤٣ دا، کە لە هەرێمی کوردستانیش پەیڕەو دەکرێت، هاتووە:

(وەسیەتکردن بۆ بچووک -منداڵەکە- یەکسان بێت بە کەمترین بەشی میراتگر، بەڵام نابێت یەک لەسەر سێی جێماوەکە (مەبەست میراتەکەیە، نووسەر) تێپەر بکات.)[1]. بەپێی ئەو قانوونە ئەگەر دایکوباوکەکە منداڵی تریان نەبێت، دەوڵەت دەست بە سەر دوو بەشەکەی تری میراتەکەدا دەگرێت. ئەمە ئەوپەڕی ناعەدالەتییە.

ئەم دیاردەیە پاشخانی ئاینی و کولتووریی هەیە. مێژوونووسانی ئیسلام دەڵێن بەپێی نەریت و ڕێسای کۆمەڵی عەرەبیی سەردەمی پێش ئیسلام و چەندان ساڵ دوای دەرکەوتنی ئیسلامیش، منداڵی بەخۆگیراو (تەبەنیکراو) بە منداڵی ئەسڵیی خێزان دادەندران، لە هەموو ماف و ئەرکێکدا، بە مافی میراتیشەوە، لەگەڵ منداڵانی تری خێزان، یەکسان و هاوبەش بوون.

پێغەمبەر کوڕی نەبوو، منداڵێکی بە ناوی زەید بەخۆ گرت و کردی بە کوڕی خۆی (تەبەنی کرد)، خەڵکیش وەکوو کوڕی ئەو ناسیان. زەید کچێکی هێنا ناوی زەینەب بن جەحش بوو. دواتر، بە داوای پێغەمبەر، زەید ژنەکەی خۆی تەڵاق دا و پێغەمبەر لە خۆی

1-یاسای چاودێری نەوجەوانان، ژمارە ٧٦ی ساڵی١٩٨٣ هەموارکراو، بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی، چاپی یەکەم ٢٠١٢، ل٣٠

ماره کرد. ئەو کارە تا ئەو کاتە، لە دورگەی عەرەب و کولتووری عەرەبدا، وێنە و پێشینەی نەبوو، بۆیە بە کاری نەشیاو داندرا، قسەی توند و باسی ڕەخنەگرانەی زۆری بەدوادا هات، کە چەند مێژوونووسی ئیسلام بە فراوانی باسیان کردووە.[1]

بەشێک لەو مێژوونووسانە بەوە پاکانە بۆ ئەو کارە دەکەن، کە گوایا پێغەمبەر لە بەر ئەوە زەینەبی نەهێناوە چونکە حەزی لێی بووە، بەڵکو ویستوویەتی بەو کارەی ئەو نەریت و عورفە کۆنە بگۆڕێت، کە منداڵی تەبەنیکراو، بە منداڵی ڕاستەقینەی خێزان دادەنێت.[2]

بەڵام بۆچی ئەو نەریت و عورفە بگۆڕدرێت؟ مەگەر ئیسلام بۆ خێر، داد و چاکە نەهاتووە؟ ئایا لەو دوو عورف و نەریتە، کامیان چاکتر، دادوەرانەتر و مرۆڤدۆستانەترە؟.

بەهاری ١٩٨٨ لە کارەساتی کیمیابارانکردنی هەڵەبجەدا ٢٠٩ منداڵ ون بوون. زۆربەیان خێزانی تر بەخۆیان گرتن و بوونە منداڵی ئەوان. تا ئێستا تەنیا ١٦ منداڵیان دەرکەوتوونەتەوە. لە ئاداری ٢٠٢٢ منداڵێکی تری هەڵەبجە، بە ناوی هاوڕێ دەرکەوت. لە چاوپێکەوتنێکدا، لە کەناڵی تەلەڤزیۆنی گەلی کوردستان و کوردسات، ڕایگەیاند کە ئەو منداڵێکی ونبووی هەڵەبجەیە، سەربازێکی عێراقی هەڵی گرتۆتەوە، لە بەغدا لە گەڕەکی کەڕادەی شەرقی، ڕادەستی خانەی منداڵانی بێسەرپەرشتیاری کردووە. لەوێ ناوی لێ نراوە وەلید. دوای شەش مانگ ڕۆژی ٣٠ ئابی ١٩٨٨ خێزانێکی کەرکووکی بەخۆیان گرتووە و بە بڕیاری دادوەر، منداڵەکە ڕادەستی ئەوان کراوە. ئەو خێزانە وەکوو کوڕی خۆیان

1- د. محمد هيكل، حياه محمد، و د. محمود حمدى زقزوق تعدد زوجات النبي محمد صلى الله عليه وسلمsaaid.net .

2- د.محمود حمدى، نفس المصدر.

بەخێویـان کـردووە، بـێ ئەوەی پێـی بڵـێن ئەو منـداڵێکی ونبـووی هەڵەبـــجەیە. دوای مردنـــی بـــاوکی، لە ٩ی حـــوزەیرانی ٢٠٢١ دایکەکەی لەبەر مەسەلەی میرات، دوای ٣٤ ساڵ کوڕ و دایکایەتی، پێی وتووە:

(تۆ بێ بەشی لەم وەرەسەیە، لە بەر ئەوەی تۆ منداڵی من نیت و موتەبەنیت، بڕۆ بە دوای کەسوکارەکەت بگەڕێ لە هەڵەبجە!).[1]

زۆربەی ژن و پیـاوی کـوردەواری و وڵاتـانی نـاوچەکە، لەبەر مەســەلەی میـرات، یـان هۆکـاری دواکەوتـووانەی کولتـووری و کـــومەڵایەتی و هۆکـــاری تـــر، نـــاتوانن ئەو جـــۆرە منـــداڵانە و "زڕمنـداڵەکانیان" وەکـوو منـداڵی خۆیـان تەماشـا بـکەن و نـاز و خۆشەویسـتییان پـێ بـدەن. ئەمە تەنیـا نیشـانەی عەقڵتەسـکی و دواکەوتوویی نییە، بەڵکو لاوازیی بەرپرسیاریی دایکوباوکایەتی و کەمیی هەستی مرۆڤدۆستیی ئەو جۆرە کەسانەش دەردەخات.

دایکـم زۆر ڕێـزی دایەگەورەمـی دەگـرت، تـا هـاوینی ١٩٦٦ کە بـاپیرم کـۆچی دوایـی نەکـرد، نەمزانیبـوو دایەگەورەم وەکـوو لە کـوردەواری دەڵـێن (زڕنەنکمە). بەڵام هەسـتم دەکـرد دایەگەورەم، وەکوو کچـی خـۆی لەگەڵ دایکم ڕەفتـار ناکـات. بیـرم نـایەت یەک جـــاریش بـــابەگەورەم و دایەگەورەم، ســـەردانی مـــاڵی ئێمەیـــان کردبێت. زۆر جـار لە خـۆم پرسـیوە: ئایـا ئەگەر نەنکـم نەمردبـایە، دەیهێشـت ئـامینەی کچـی، بە بێ پـرس و ویسـتی خـۆی، بـدرێت بە پیاوێک کە چواردە ساڵ لە خۆی گەورەتر بێت؟

دایکـم حەوت منداڵی بووبوو، سـێ منـداڵیان شـەفیق، نەسـرین و نەسـرینی دووەم، کە پاشـەبەرە بـوو، زوو جـوانەمەرگ بووبـوون. چوار منداڵیان، ڕەئووف، مـحەمەد، سـەبریە و ڕەفیـق، مـابووینەوە.

---

1- کەناڵی تەلەڤزیۆنی کوردسات و گەلی کوردستان، نیسانی ٢٠٢٢

ئێمە مایەی خۆشی و بەختەوەریی دایکم بووین، ئەو بۆ ئێمە دەژیا، خۆی خانمی ماڵ و ئاگاداری ڕەفتار و هەڵسوکەوت و هاتوچۆی سەبریە و من بوو. لە هیچ ڕوویەکەوە جیاوازیی لە نێوانماندا نەدەکرد. جارێک بە چاولێکەری لە برادەرێکم، کە لە خوشکی دەدا، بە توندی پرچی سەبریەی خوشکم ڕاکێشا و هاواری لێ هەستا. دایکم زۆر تووڕەبوو، هەردوو شانی گرتم و ڕایتەکاندم، وتی: ئەوە لەکوێ فێربووی؟ دیوتە کەسمان لە سەبری و لە تۆ بدەین؟ بانگی خوشکمی کرد و پێی وت چی لێ کردی وای لێ بکەوە. خوشکم دوودڵ بوو، بەڵام دایکم لێی دووبارە کردەوە، سەبریە بەحاڵ پرچی ڕاکێشام، ئازارم پێ نەگەیشت، بەڵام بەخۆمدا شکامەوە، چونکە پێشتر دایکم ئەوەندە لێم تووڕە نەبووبوو. دوای ئەوە قەت جارێکی تر لە خوشکم نەدا.

بە باوەڕی تەواوەوە وتوومە و دەیڵێم ئەو دەستەی بتوانێت لە ژن، کچ و منداڵ بدات، بۆ شکاندن باشە.

٢

## وەچەی ئامینە و سابیر

کاکە ڕەئووفم براگەورەمان بوو، ساڵی ١٩٣٦ لەدایک بووبوو. لە سەرەتای ساڵانی پەنجاکان خوێندنی سەرەتایی لە قەڵادزێ، تەواو کردبوو. بەڵام ئەو ڕۆژگارە تەنیا قوتابخانەی سەرەتایی لە قەڵادزێ هەبوو، کە ساڵی ١٩٣٨ کرابۆوە. کاکە ڕەئووفم دوو ساڵ چاوەڕێی کردبوو قوتابخانەی ناوەندی لە قەڵادزێ بکرێتەوە. ڕۆژێک خاڵە حاجی تاهیر کۆیی، لە سلێمانییەوە چوو بوو بۆ قەڵادزێ، سەردانی دایکمی کردبوو. پێی وتبوو:

حەیفە ڕەئووف ئاوا دابنیشێت، من لەگەڵ خۆم دەیبەم بۆ سلێمانی، با لەوێ لەگەڵ کوڕەکانم بخوێنێت.

خاڵە حاجی تاهیر دوای شەڕی دووەمی جیهانی، لەگەڵ شاعیر خادیم (حاجی میرزا عەبدوڵڵا)، ماڵیان لە قەڵادزێوە گواستبۆوە بۆ سلێمانی. لە شەقامی مەولەوی دوکانیان لە تەنیشت یەکتر بوو، پێکەوە خەریکی بازرگانی بوون. خاڵە حاجی تاهیر زۆر بەتەنگ دایکمەوە بوو، خۆی بەمێردی دابوو، وەکوو کچی خۆی ڕەفتاری لەگەڵ دەکرد. کوڕ و کچەکانیشی، محەمەد، قادر، عەبدوڵڵا، مستەفا، حەنیفە و سەبیحە، دایکمیان بە پووری خۆیان دەزانی.

ماڵی خاڵە حاجی تاهیر سەد مەترێک لە سەرووی مزگەوتی

کاک ئەحمەدی شێخ بوو، کە ڕاستییەکەی سێ خانوو بوون لێک دراببوون. ساڵانە جارێک یان دوو جار بۆ سەردانیان دەچووین بۆ سلێمانی، بە پاسێکی گەورە، کە بۆدییەکەی تەختە بوو، سەفەرمان دەکرد. ئەو کاتە ڕێگای نێوان قەڵادزێ و سلێمانی قیرتاو نەکرابوو. هێشتا بەنداوی دوکان دروست نەکرابوو، لەنێوان خەلەکان و دوکان هەورازی زۆر قووچ، ترسناک و پڕپێچ هەبوون. ساڵی ١٩٥٦ خاڵە حاجی تاهیر کۆچی دوایی کرد. دایکم زۆر پەرۆشی بوو، کە باسی دەکرد چاوی پڕ دەبوو لە فرمێسک، زۆر جار دەیوت، خاڵم لە من ڕۆیی.

کاکم ماوەیەک لە ماڵی خاڵە حاجی تاهیر ژیابوو، دواتر چووبوو بۆ بەشی ناوخۆیی، کە ئەو کاتە لە سلێمانی بۆ قوتابیانی دەرەوەی شار کرابۆوە. دوای قۆناخی ناوەندی، لە پەیمانگەی تەندروستی لە بەغدا، خوێندنی تەواو کردبوو، ساڵی ١٩٥٩ بوو بە (موەزەف سیحی- یاریدەدەری پزیشکی) و لە قەڵادزێ دامەزرا. لە ئابی ٢٠٠٠ لە سلێمانی بە جەڵتەی دڵ کۆچی دوایی کرد.

من دوای دایکم، کاکە ڕەئووفم لە هەموو کەس خۆشتر دەویست، ئەویش منی زۆر خۆشدەویست، بەتەنگمەوە بوو، مەبەستی بوو سەرکەوتووانە خوێندن تەواو بکەم. هەر خۆی لە ناوەڕاستی ئەیلولی ١٩٥٦ دەستی گرتم و بەرەو دنیای خوێندن و ڕووناکیی بردم، بۆ یەکەم جار لەسەر کورسیی قوتابخانە دانیشتم. تا ساڵی ١٩٥٥ تەنیا یەک قوتابخانەی کوڕان، قوتابخانەی ئاسۆس، لە قەڵادزێ هەبوو. کوڕان و کچان پێکەوە لەوێ دەیانخوێند. وا بزانم لە پایزی ئەو ساڵەدا، یەکەم قوتابخانەی کچان و لە پایزی ١٩٥٦ دووەم قوتابخانەی کوڕان، زانستی، کە یەکپۆلی بوو، لە قەڵادزێ کرانەوە. من نێردرام بۆ قوتابخانەی زانستی، کە لە ماڵی

ئێمە نزیکتر بوو. قوتابخانەکەمان سەرەتا لە خانووی کاک کەریمی ئەسعەد کۆیی بوو. دوای دوو ساڵ، کە پۆلەکان زیاتر بوون، قوتابخانەکەمان گواسترایەوە بۆ خانووی حاجی فەقێی کۆیی، کە باڵەخانەیەکی گەورەی شەش حەوت ژووری بوو. لە پۆلی یەکەم مامۆستا سمایل ئەفەندی، کە لە سلێمانییەوە نێردرابوو بۆ قەڵادزێ، مامۆستامان بوو. سمایلە فەندی پیاوێکی قۆز، سوور و سپی، چاوشین و کەڵەگەت بوو، مامۆستایەکی نموونەیی، بەڕێز، هێمن، میهرەبان و بەتەحەمول بوو. بەڕێزی یەکەم مامۆستای من بوو، بە ئەلفوبێی کوردیی ناساندم، فێری خوێندنەوە و نووسینی کردم.

کاکە محەمەد ساڵی ١٩٤٢ لەدایک بووبوو، زۆر قسەخۆش، خزمدۆست و دڵپاک بوو. کەمێک سەرەڕۆ بوو، زوو هەڵدەچوو، بەڵام دوای تاوێک هیچی لە دڵدا نەدەما. ئەگەر لەگەڵ کەسێک بەشەڕ بهاتایە، زیاد لە پێویست دەستی دەوەشاند.

شەوێکی هاوین دوای نانخواردن، لە حەوشە دانیشتبووین میوەمان دەخوارد. خاڵە حەمیدم، بێ ئەوەی لە دەرگا بدات، بە پرتاو بەژوور کەوت، پرسی: خوشکێ کوا حەمەڕەش؟

کاکە محەمەد، لە سەرەتای تەمەنی لاوییدا بوو. وازی لە خوێندن هێنابوو، کەبابچی بوو. هێشتا نەکرابوو بە سەرباز. بە پێچەوانەی شەوانی دی، زوو هاتبۆوە ماڵێ، لە حەوشە لەسەر قەرەوێلەکەی نووستبوو. دایکم وتی:

چی بووە حەمید؟ ئەوەتا لێرە نووستووە و ژانەسەریەتی.

خاڵە حەمیدم پەلاماری قەرەوێلەی کاکە محەمەدی دا و هەڵی گێڕایەوە. کاکە محەمەد کەوتە سەر زەویەکە، وێنەی ئاسکی تەقەلێکراو دەرپەڕی و بەرەو کۆڵان هەڵات، خاڵم هاواری لێ کرد:

ناپیاو، ئەوە فێری عارەقخواردنەوە بوویت! وەڵڵا جارێکی دی عارەق بخۆیەوە دەتکوژم.

دوای ئەوە کاکە محەمەد، مەگەر جار جار لە هەندێک بۆنە و سەیرانی بەهاراندا، دەنا قەت ئارەقی نەخواردەوە.

کاکە محەمەدم، لە کاتی کودێتای خوێناوی شوباتی ١٩٦٣ لە بەغدا، سەرباز بوو، وازی لە سەربازی هێنا و هاتەوە قەڵادزێ. لە ساڵی ١٩٦٥ تا ئاداری ١٩٧٠ لە چەند ناوچە، لەوانە لە گەڵاڵە و ناوپردان پێشمەرگە بوو. دوای ١١ی ئاداری ١٩٧٠ چەکەکەیان لێ ستاندەوە و ناردیانەوە ماڵ. ئەو ساڵە بە هەزاران پێشمەرگە بێرێزانە، وەکوو ئەوەی خزمەتکاری دیوەخان بووبن، ئیزن دران. سەرانی بزاڤی چەکداری، کە بوونە حوکمڕانی کاتیی کوردستان، ئەو پێشمەرگانەیان لەبیر کرد و کارێکیان بۆ نەدۆزییەوە. پێشمەرگە هەبوو لە داخان خۆی کوشت. یەکێک لەوانە گەنجێکی بیست ساڵان بوو، عەبدوڵڵای ئاغای غەفوور، کە خوشکەزای نووسەر سوارە قەڵادزەیی (جەمال محەمەد) بوو.

کاکە محەمەدم چەند مانگێک بێکار لە قەڵادزێ بوو، دوای ئەوە چوو بۆ بەغدا و ساڵانێکی زۆر لەوێ، لە کەبابخانەی ئەربیل، کەبابچی بوو. لە ناوەڕاستی هەشتاکان لە بەغدا ماوەیەک گیرا، کە ئازاد کرا، بە یەکجاری بە ماڵەوە چوونەوە قەڵادزێ. دوای وێرانکردنی قەڵادزێ، لە حوزەیران (جوونی)ی ١٩٨٩ کەوتە ئۆردوگای دارەتوو و بوو بە کارمەندی ئاگرکوژاندنەوە. لە ٤ی ئابی ٢٠٠٦ ئەویش، لە هەمان تەمەنی کاکە ڕەئووفم، بە جەڵتەی دڵ کۆچی دوایی کرد.

سەبریەی خۆشکم ساڵێک پێش من لەدایک بووە. پێکەوە قۆناخی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیمان تەواو کرد. ئێمە هاورێ بووین و

پێکەوە گەورە بووین. ئەو وەکوو هەموو کچانی ئەو سەردەمەی قەڵادزێ، زۆربەی کات لە ماڵ بوو، زۆر خۆی بە وانەکانییەوە ماندوو دەکرد و یارمەتی دایکمی دەدا. منیش لە خوێندن تەمبەڵیم دەکرد، لەگەڵ ڕەفیقەکانم خەریکی یاریکردن، تۆپتۆپێن، کەللاێن (هەڵماتێن)، جگێن و یاری تر بووین. هاوینانیش بەدزی لە چۆمی قەڵادزێ، یان لە زێی سندۆڵان، کە ئاوەکەی کەم دەبۆوە، مەلەمان دەکرد. لە کۆتایی ساڵدا سەبریە و من هەردووکمان دەردەچووین.

لە ڕۆژانی تاقیکردنەوەی بەکالۆریای پۆلی شەشەمی سەرەتایی، لە حوزەیرانی ١٩٦٢، سەبریە شەوانە جەرەسی سەعاتەکەی بەجۆرێک دادەنا کە دەمی پێنجی بەیانی بەخەبەر بێین. من حەزم لە خەوی بەیانیان بوو، کاتێک ئەو دەنووست، دەستکاریی زەنگی سەعاتەکەم دەکرد، بۆ ئەوەی درەنگتر لێ بدات. سەرەتا سەبریە وایزانی سەعاتەکە خراپ بووە و دەبێت چاک بکرێتەوە. سێ ڕۆژ ئەو کارەم بۆ چووە سەر، بەیانییەک پێی زانی و هاواری کرد:

دایە بە شایەت بە، ئەگەر لە تاقیکردنەوە دەرنەچووم خەتای ڕەفیقە!

ئەو ساڵە سەبریە لە خولی یەکەمی تاقیکردنەوەکە دەرچوو، من لە وانەی علوم کەوتم. ئەمەش بۆ من زۆر گران تەواو بوو. هاوینەکەی لەبەر شەڕ، دۆخی قەڵادزێ شڵەژا، ئیدارەی حکومەت بۆ ماوەیەک لە قەڵادزێ کشایەوە. من بۆ تاقیکردنەوەی خولی دووەم، لەگەڵ چەند هاوپۆلی خۆم، بە ئۆتۆمبێل چووین بۆ سلێمانی. لە کاتی تاقیکردنەوەدا، شەڕ لە ناوچەی خەلەکان دەستی پێ کرد، ڕێگای نێوان دوکان و قەڵادزێ گیرا. ئێمە شەش حەوت قوتابی بووین، لەوانەی لە بیرم ماون ئیبراهیم مەحموود جەلال، ڕەفیق ڕەئووف، عەبدوڵڵا مەلا ئەمین. چەند ڕۆژ لە سلێمانی

چاوەڕێمان کرد ڕێگاکە بکرێتەوە، بەڵام بێ ئەنجام بوو. بۆیە بە ئۆتۆمبێل چووین بۆ شارۆچکەی دوکان، لەوێوە بە پێیان و بە سۆراخکردن بەرەو بنگرد بەڕێ کەوتین. لای ئێواری گەیشتینە بنگرد و چووینە مزگەوت. خەڵکی بنگرد زۆر میهرەبانانە میوانداریيان کردین. شەوەکەی لەوێ، لە سەربانی مزگەوت، جێیان بۆ ڕاخستین و نووستین. لەگەڵ بانگی بەیانی بەخەبەر هاتین. لەوێ قاوەڵتیمان کرد. خەڵک ڕێگایان پێشان داین، بە چیای ئاسۆسدا سەرکەوتین. لەوێوە قەڵادزێ دەرکەوت، هەموومان شاد و دڵخۆش بووین، هەستمان کرد گەیشووینەوە ماڵ. لە زێی سندۆڵان پەڕینەوە و لای نیوەڕۆ، شەکەت و برسی گەیشتینەوە قەڵادزێ. لەو سەفەرەدا پێیەکانم بلۆقیان کردبوو، هەتاو بردبوومی، ڕۆژی دواتر لەرزوتا دایگرتم. دایکم جلەکانمی داکەند، عەزیزییەکی سەبریەی خوشکمی لە دۆیشەوی هەڵکێشا و لەبەری کردم. لە ژووری لەسەر زەوییەکە جێی بۆ ڕاخستم و خەوم لێ کەوت. کاتێک بەخەبەر هاتم لەرزوتا بەری دابووم.

هاوینی ١٩٦٦ سەبریە و من خوێندنی ناوەندیمان تەواو کرد. ئەو بۆ خوێندن چوو بۆ پەیمانگەی (فنونی بەیتی) لە سلێمانی و بوو بە مامۆستا، ئێستا خانەنشینە و لەگەڵ هاوژینەکەی، قادر مەولوود، لە قەڵادزێ دەژی. منیش لە قەڵادزێ درێژەم بە خوێندنی ئامادەیی دا، کە ئەو کاتە هەر بەشی ئەدەبی لە قەڵادزێ هەبوو، دواتر بۆ خوێندن لە زانکۆ ڕووم لە بەغدا کرد.

هەردوو نەنکم، باپیرم (لە باوکمەوە)، مام و پوورم نەدیون، هەموویان پێش لەدایکبوونم مردبوون. بە مێرمنداڵی هەندێک جار بیرم لەوە دەکردەوە بۆچی منیش، وەکوو زۆربەی خزم و برادەرانم، ئەو جۆرە کەس و خزمانەم نەبوون. ئەوان لەگەڵ

پوورزا و ئامۆزاکانیان یارییان دەکرد، بەکۆمەڵ دەچوونە ماڵی یەکتری. ئەگەر یەکێکیان لەگەڵ کەسێک گرفتێکی هەبووایە، یان بەشەر بهاتایە هەموویان، بە هەق یان ناهەق، پشتیان دەگرت و لەسەریان دەکردەوە.

له کۆمەڵی کوردەواری و ئەو وڵاتانەی دەسەڵات و دادگا ناتوانن، یان مەبەستیان نییە ماف و کەرامەتی مرۆڤ بپارێزن، خەڵک بۆ خۆپاراستن، پەنا بۆ بنەماڵە، یان خێڵ و هۆز دەبەن، بۆ ئەوەی لە سایەی ئەواندا لە دەستدرێژی و ستەم پارێزراو بن. چونکە قانوون و دادگا بایەخیان نامێنێت، لەجیاتیی دادگا و پۆلیس، خەڵک خۆیان بڕیار دەدەن، بە دەستی خۆیان و بەو جۆرەی دەیانەوێت و دەتوانن، تۆڵە دەکەنەوە و قانوونی تایبەتی خۆیان دەسەپێنن. لەو جۆرە کۆمەڵانە بەگشتی نەریتی خێڵایەتی، بنەماڵەپەرستی و خزمپەروەری بەهێز دەبن، سیستمی داد لاواز دەبێت، تاوان و کوشتن و فەسادی زیاد دەکەن. ئەم دیاردەیە پێش بە هەماهەنگیی نەتەوەیی و بەهێزبوونی ئینتیمای نەتەوەیی و نیشتمانی دەگرێت.

ماڵمان لەپەنای قەڵات، لە سەرەتای شەقامی خانەقا بوو. خانووەکەمان، بە حەوشەکەیەوە، نزیکەی سێ سەد مەتری دووجا بوو. لەسێ ژوور و هەیوانێکی گەورە، کە مەترێک لە حەوشەکە بڵیندتر بوون، پێک هاتبوو. لە هەیوانەکەوە چیای سەرکەشی ئاسۆس و گردی ئەوبەری چۆمی قەڵادزێ دیار بوون. حەوشەی ماڵەکەمان تا ڕادەیەک گەورە بوو، باخچەیەکی چکۆلە، دارمێوێک و دارتوویەکی بڵیند و سێبەرداری لێ ڕوابوو. دارتووەکە هاوینان تووی زۆری دەگرت.

خانووەکە بە خشتی گڵ دروست کرابوو، دیوارەکانی نیو مەتر

پان بوون. ژوورەکان هاوینان فێنک بوون، زستانان بە ئاسانی گەرم دەکران. هەیوانی لای ڕاست و لای چەپ، پێشەکەیان بە پانایی دوو مەتر بە دیوار گیرابوون، هەیوانی لای ڕاست تەندوربان بوو، کە ئاگردان و تەباخێکی یەکچاوی بۆ چێشتلێنان لێ بوو. هەیوانی لای چەپیش کەلوپەلی زیادی لێ دادەندرا.

ژوورەکەمان بە سۆپایەکی دار، کە ئاگردانێکی لە بەردەم بوو، گەرم دەکرا. زستانان باوکم، دایکم، سەبریە و من، لە ژووری ناوەڕاست، دەنووستین. کارەبامان نەبوو. لەبەر ڕووناکی چرا و دواتر لۆکس، سەعیمان دەکرد. ساڵانە، وەکوو هەموو خەڵکی قەڵادزێ، پێش زستان بارەداری زۆرمان دەکڕی، کە لە لادێکانەوە بە وڵاخ دەهێندرانە قەڵادزێ و لە مەیدان دەفرۆشران. هەمیشە لەسەر سۆپاکە کتری، یان تەنەکەیەکی بچووکی پڕ ئاو دادەندرا. ئاوە گەرمەکە بۆ چالێنان و قاپشووشتن بەکار دەهێندرا. دواتر سۆپای عەلادین داهات، کە ئەویش ئاوی لەسەر گەرم دەکرا و تەنانەت بۆ چێشتلێنان سوودی لێ دەبیندرا.

هاوینان لە حەوشە لەسەر قەرەوێلە و تەختەخەو دەنووستین، کاتێک دنیا گەرمتر دەبوو، تەختەخەو و قەرەوێلە دەبرانە سەربان. لەوێ بە چیغی قامیش دەورە دەدران. تا پۆلی شەشەمی سەرەتایی دایکم، من و سەبریەی خوشکم، لەسەر دوو تەختەخەوی لێکدراو، دەنووستین. بەڵام باوکم لە حەوشە دەنووست.

ئاودەستی ماڵان لە حەوشە، لە بییر دروست کرابوون، چونکە نۆین (زێراب) لە قەڵادزێ نەبوو. چەند کەس لە قەڵادزێ کەوتنە ناو ئاودەستخانەی ماڵان و لەوێدا مردن. یەکێک لەوانە کوڕی پیرەژنێکی ئازەری بوو، کە بە ئاغا نەنە ناسرابوو، لەمێژ بوو

کەوتبوونە قەڵادزێ و مێردەکەی نەمابوو. ئاغا نەنە تاقە کوڕێکی هەبوو، لە کۆڵانی پشت ماڵی ئێمە کرێچی ماڵی حاجی مامە سادق بوون. تازە کوڕەکەی سەربازیی تەواو کردبوو، گەڕابۆوە بۆ قەڵادزێ. ڕۆژێک کەوتە ناو ئاودەستخانەی ماڵەکەیان و خنکا. ئاغا نەنە لای ماڵەکەیان بە کوڵ دەگریا، لە خۆی دەدا و پرچی خۆی دەڕنییەوە، بە شێوەزارێکی تایبەت هاواری دەکرد:

لە کەربەلا نەمردی

لە جەلەولا نەمردی

لە ئەدەبخانەی ماڵ هاج مامە مردی!

ئەو کاتە هێشتا ئاوی خواردنەوە نەگەیشتبووە ماڵان، ئاوبەر، کە بە سەقاو ناو دەبران، بە تەنەکە ئاویان بۆ ماڵان دەهێنا. ماڵەکەمان، لە چۆمی قەڵادزێ و کانیی ژنان و کانیی پیاوان نزیک بوو. هاوینان زۆرینەی ژنانی گەڕەک لەوێ ئاویان گەرم دەکرد، جل و بەرگیان دەشوشت. هەندێک ڕۆژ لای عەسر، دایکم بۆ نوێژکردن و بینینی دەستەخوشکەکانی، دەچوو بۆ کانیی ژنان، کە هەواڵی گەڕەک و شارۆچکەکە، لەوێ باس دەکران. لە گەڕانەوەیدا تەنەکەیەک ئاوی خواردنەوە و چەند هەواڵی نوێی قەڵادزێی لەگەڵ خۆی دەهێنایەوە.

ساڵی ١٩٥٤-١٩٥٥ نووسەر و شاعیر مامۆستا محەمەد ڕەسووڵ هاوار، لە قەڵازێ کارمەندی فەرمانگەی تووتن بووە. لە بیرەوەرییەکانیدا، بە چەند دێرێک لەبارەی قەڵادزێ، کە ئەوکاتە من ٤-٥ ساڵان بووم، نووسیویەتی:

"قەڵادزێی ئەو سەردەمە ژیانی زۆر ناخۆش و گران بوو. کارەبا نەبوو، لۆکسمان دادەگیرساند. بۆ ڕادیۆ دەبوایە پاتریی زلی ئاسن هەبوو، کە نزیکەی پەنجا کیلۆ دەبوو، هەر بە دوو سێ ڕۆژ

دەماننارد بۆیان چارچ دەکردینەوە. پرۆژەی ئاو نەبوو، بە تەنەکە ئاویان بۆ دەهێنایین، تەنەکەی بە (٥) فلس بوو (سەیر ئەوە بوو لە قەڵادزە عانەیەک بە پێنج فلس دەچوو، پێیان دەوت عانەی بابەکر ئاغا، لە شوێنی تر عانە بە چوار فلس بوو). ئاوکێشەکە کە کەرەکەی خێرا نەڕۆیشتایە، نەقیزەیەکی لێ ئەدا و ئەیوت حەچە سەگباوک هەموو بارەکەت بای چوار عانەیە.[1]

ساڵی ١٩٦٠ یان ١٩٦١ ئاوی داودێ، کە مەزارگەی شێخ فەرخ و خاتو ئەستی لێیە، بە بۆری گەیەندرایە قەڵادزێ. پرۆژەی دروستکردنی نۆین (زێراب) دەستی پێ کرد. هاوینەکەی نۆرەی کۆڵانی ئێمە هات، کابرایەک بە ماڵاندا گەڕا و ئاگاداری هەمووانی کرد، کە هەر منداڵێک بیەوێت کاریان لەگەڵ بکات، سبەینێ سەعات هەشتی بەیانی لە کۆڵانەکە چاوەڕێ بێت. من و چەند منداڵی تر دەستمان بە کار کرد. ئێمە بە ساج، کە لەسەر سەرمان دادەنا، چیمەنتۆی گیراوەمان دەبرد بۆ ئەو وەستا و کرێکارانەی زێرابەکەیان دروست دەکرد. سێ ڕۆژ ئەو کارەم کرد، بەڵام زۆر ماندوو بووم، نێوشان و پشتی ملم، ئەوەندە لیتەی چیمەنتۆیان پێدا ڕژابوو، برینداربووبوون. دوای ئەوە باوکم نەیهێشت بەردەوام بم. لەبری کارەکە لاموایە نیو دینار کەمترم وەرگرت.

ماڵەکەمان حەمامی تێدا نەبوو. تا پۆلی دووەمی سەرەتایی، دایکم هەفتەی جارێک لەگەڵ خۆی دەیبردم بۆ حەمامی ژنان، کە نزیکی قوتابخانەکەمان بوو، یەک دوو جاریش، بە تایبەت زستانان، لەماڵێ ئاوی گەرم دەکرد، لە ژووری لەناو تەشتێکدا دەیشووشتم. ئەو کاتە لە قەڵادزێ تەنیا یەک حەمام هەبوو، بەیانیان بۆ ژنان و

---

1- محەمەد ڕەسوول هاوار، بیرەوەری، بنکەی ژین، سلێمانی ٢٠٠٧، ل٩٠

ئێوارانیش بۆ پیاوان بوو.

لەو ماڵەدا، کە باوەشی پڕ ئارامی و میهرەبانانەی خۆی بۆ گرتبووینەوە و لە سایەی بەخشندەیی ئەودا دەژیان، من هاتمە دنیاوە. هەر لەوی خوشکم و هەردوو براکانم، لەگەڵ منداڵە جوانەمەرگەکانی ئامینە و سابیر (شەفیق، نەسرین و نەسرینە چکۆلە، کە دوو ساڵ لە من بچووکتر بوو) لەدایک بووین، چوارمان شانسی ئەوەمان هەبوو بژین، ئەوانی تریش بە منداڵی جوانەمەرگ بوون. بەساڵداچوون و پیربوون شانسێکە هەموو کەس نییەتی.

من لە دایکمەوە فێری دادخوازیی بووم، لە ئەزموونی ژیانی و شێوازی دابەشکردنی میراتی حاجی مەحموودی باوکییەوە، واتای ناعەدالەتیم زانی. بەڵام چۆن، لە کوێ و بە کام شێواز دەتوانین بە عەدالەت بگەین؟

لەو ڕۆژەوە مرۆڤ دێتە دنیاوە، بەرەوڕووی ناعەدالەتی دەبێتەوە، هەندێک کەس وێنەی شازادە لەدایک دەبن و گەورە دەکرێن، هەندێکی تر وەکوو گەدا. زۆرینە لەشساغ و پتەون، بەشێکیش دەردەدار و کەمئەندامن. دەوترێت مردن عادیلانەیە، کەچی ساڵانە ملیۆنان کەس زۆر بە گەنجی، یان وەکوو هەشت خوشک و براکانم، بە ساوایی جوانەمەرگ دەبن.!

شاعیر نازم حیکمەت، لە هۆنراوەیەکیدا دەڵێت:

بۆ ئەوەی مردن دادپەروەرانە بێت

پێویستە ژیان دادپەروەرانە بێت.

## ٣
## لەبەر کلووە بەفرەکاندا

ڕۆژێکی ساردی زستان، بیستی جەنیوەری ١٩٦٨ بەفر و بەستەڵەک هەموو شوێنێکیان تەنیبوو. هەر باوکم، دایکم و من لە ماڵ مابووینەوە. کاکە ڕەئوفم ماڵی خۆی کردبوو، لەگەڵ براژنە گورجیی خاڵۆزام و منداڵەکانی دەژیا. خوشکم لە سلێمانی دەیخوێند و کاکە محەمەدیش پێشمەرگە بوو. ئێمە هەرسێکمان گرانەتامان گرتبوو، لە ژوورێک کەوتبووین. باوکم ماوەیەک بوو ناساخ بوو، زۆربەی کات لە ماڵ بوو. ئەو ڕۆژە سەعات نۆی بەیانی، دایکم بە دەنگێکی گریاناوی، بەڵام هێمنانە، بەخەبەری هێنام و وتی:

هەستە کوڕم، بابت تەواو بووە، بڕۆ خاڵەکانت ئاگادار بکە!

ئەو بەیانییە بەفر بە پرتاو دەباری، خێرا لەناو جێگا هاتمەدەرێ، لە هەیوانەکە تەزوویەکی سارد، بە لەشمدا هات، کەمێک هەڵلەرزیم. چاوبەگریان بەرەو ناو بازار چووم و خاڵە حەمیدم لە دوکانەکەی بینی و ئاگادارم کرد. لە ڕێگا چەند برادەرم تووش هاتن، هەواڵەکەم پی وتن. زۆری پێ نەچوو دراوسێ و ناسیاو هاتن بۆ ماڵمان. دواتر خاڵە حەمیدم، کە لە هەموو خاڵەکانم چاپووکتر و هەڵسووڕاوتر بوو، لەگەڵ دوو کەس، بە تاتەشۆرێکەوە پەیدا

بوون. لە لای دارتووی حەوشەکەمان تاتەشۆرەکەیان دانا، لە سێ لاوە بە چیغێک دەوریان گرت و تەرمی باوکمیان بە ڕووتی لەسەری پاڵ خست.

من لەگەڵ چەند برادەر و ناسیاو، لەژێر گوێسەبانەی لای دەرگای حەوشە، ڕاوەستابووم. بە ڕێکەوت لەوێوە چاوم لە تەرمی باوکم بوو، کە وەکوو مەلۆتکەیەک لەسەر پشت پاڵخرابوو، تا لای ملی دیار بوو. مردووشۆرەکە سەرقاڵی شوشتنی بوو. لەو ساتەدا بەردەوام بەفر دەباری، تەرمی باوکم لەناو کەف و بەفردا بە ئاستەم دیار بوو، کاتێک ئاو بە لایەکی جەستەیدا دەکرا، هەڵم لە جەستەی هەڵدەستا، شوێنی ئاوەکە لە شێوەی پەڵەیەکی گەورەی خواروخێچ دەردەکەوت، بەڵام خێرا بە کلوەبەفر و کەفی سابوون، دادەپۆشرایەوە. ئەو دیمەنە چەندان جار دووبارە بۆوە، دەمەویست تەماشای نەکەم، کەچی خۆم بۆ نەدەگیرا و بێئاگایانە چاوم تێ دەبڕییەوە.

سالآنێکی زۆر، بە تایبەت لە کاتی بەفربارینددا، ئەو دیمەنە خەمناکە دەهاتەوە بەرچاوم، دەمەویست لە شیعرێکدا نیگاری بکێشم، بێ سوود بوو. سەرەنجام ساڵی ١٩٩٥ ئەو دیمەنە تێکەڵاوی هەست و خەیاڵ، دۆخی شەڕ و هەندێک لایەنی ژیانی باوکم و خۆم بوون، پێکەوە بە شەپۆل ڕژانە ناو هۆنراوەیەکی درێژ (پرسیارە بێ وەڵامەکان)، کە لە ساڵی ١٩٩٦ لە کۆمەڵەهۆنراوەی (ئاوێنە و سێبەر)دا بڵاو کراوەتەوە.

مەرگی باوکم خەمبار و بێتاقەتی کردم. بۆ یەکەم جار بیرم لە مانای ژیان، مردن و زیندووبوونەوە و هەندێک مەسەلەی تر کردەوە، بیرۆکە و پرسیاری سەیر بە خەیاڵمدا هاتن و چوون. کۆمەڵێک برادەری زۆر باشم هەبوون، کە دڵسۆز بوون و متمانەم

پێ دەکردن، کەچی هەندێک جار هەستم دەکرد تەنیاترین کەسی دنیام. هەوڵم دەدا شیعر بخوێنمەوە و بنووسم. ئایا ئەو هەست و بۆچوونـــانە پێوەنـــدییان بەو قۆنـــاخەی تەمەنەوە هەبـــوو، کە سەردەمی مێرمنداڵیم بە جێ دەهێشت و بەرەو گەنجێتیی دەچووم، یان ئەنجامی مردنی باوکم بوون؟ یاخود بەرهەمی هەردووکیان بوون؟

باوکم کەسێکی هێمن و بێدەنگ بوو، قەت پەنای بۆ توندوتیژی نەدەبرد. مردنی ژنی یەکەم و هەشت منداڵی هەردوو ژنی، کاری خۆیان تێ کردبوو، ئەویان گۆڕی بوو بە کەسێکی بە تەحەمول و کەمدوو، کە وابەستەی خێزانەکەی بوو.

دایک و باوکم خوێندەوار نەبوون، لە ناوچەیەکی لاچەپی دوور لە ئاوەدانی و خوێندەواری، ژیانیـان بەسـەر بـرد. ئەوان وەچەی شەر بوون، ئەنجامە سەختەکانی شەڕی یەکەم و دووەمی جیهانی، شـەڕی لەشکری عێراق و شـەڕی نێوخۆشیان بینی. هەر کام لەو شەڕانە، بەڕادەی جیاواز، وڵاتیان وێران کرد، برسێتی، بێکاری و مەرگیـان هێنـا، سـەدان هەزار قوربانییـان لـێ کەوتەوە. ئەوان بە ڕێکەوت لە مردن دەرباز بووبوون. بەڵام بەهۆی ئەو شـەڕانە هەژاری، دەربەدەرییان بینیبوو، ژیان و گوزەرانیان تێک چووبوو. لەبەر نەبوونی نەخۆشخانە، دوکتۆر، دەرمان، بڵاوبوونەوەی پەتا و نەخۆشیی جۆراوجۆر، چەندان جار جەرگیان سووتابوو.

ئەو ســـەردەمە دایـــک و بـــاوکم، وەکـــوو ملیۆنـــان خەڵکـــی کوردستان، لە شارستانەتی دوور و لە دنیا دابڕابوون. لەم دنیا بەرینەدا، هەمـوو تەمەنیـان لە سـنووری دوو سـێ کیلـۆمەتری چوارگۆشـەییدا بەسـەر بـرد. لە سـایەی سـتەم و بێدادی، لەنـاو تاریکستانی نەخوێندەواری و خورافەدا ژیان. تا مردن نە بەرهەمی

ئەدەبی و هزری هیچ شاعیر، نووسەر، بیرمەندیان خوێندەوە، نە دەریا، شاری گەورەی دنیا، مۆزەخانەی وڵاتان، شانۆ، تەلاری بەرزی پڕهونەری شارانیان بینی. ئەوان تەنانەت جگە لە قەڵادزێ، ڕانیە، کۆیە، سلێمانی و بەغدا، کە بۆ لای دوکتۆر چوون، شار و جێگەی تریان نەدیت.

دایک و باوکم و خەڵکی وڵاتەکەم، لە کۆمەڵێکدا گەورەبوون، کە لە شێوەی جەنگەڵستان بوو. بەهێزەکان ئەوانی تریان تێک دەشکاند. لەناو تاریکستان و دۆخی فرەسەختی ژیاندا، کە شەڕ، پەتا، نەخوێندەواری، ستەم و هەژاری، هێز لە مرۆڤ دەبڕن، کوا خەڵک دەتوانن بەدوای داهێنانی ئەدەبی و هونەریدا بگەڕێن! چۆن بیریان دەکەوێتەوە، یان دەرفەتیان دەبێت، چێژ و خۆشی لە جوانییە بێسنوورەکانی ژیان ببینن!

بە بۆچوونی من تا ئێستا، لە هیچ شوێنێکی دنیادا، مرۆڤ بەگشتی بەوجۆرە ناژی کە شایەنییەتی. بەڵام کارەساتەکە ئەوەیە هێشتا لە زۆر وڵاتی دنیا، لەوانە لە کوردستان، سەدان ملیۆن کەس هەن، بە هۆی شەڕ، بێدادی، فەسادی و ستەمی دەسەڵاتی سیاسی، نەدار و زەلیل دەژین. ئەوان، وەکوو هەر گیانلەبەرێکی تری ناو سروشت، بێ مافن. وەکوو ئەوان، بە درێژایی ڕۆژ و ساڵ، هۆش و توانا و ڕەنجیان بۆ پەیداکردنی نان، دۆزینەوەی پەناگەیەک و درێژەدان بە ژیانی خۆیان و منداڵەکانیان تەرخان کردووە. ئەوان لە چێژ و خۆشی و بەخشندەیی ژیان، بێ بەش کراون.

لە ئینجیلدا هاتووە: مرۆڤ هەر بە نان ناژی.

ئەمە دروستە، بەڵام ئایا مرۆڤ بە بێ نان دەتوانێت بژی؟

## سێ کۆپلەی هۆنراوەی پرسیارە بێ وەڵامەکان:

کلوەبەفرەکان بە پرتاو دەبارێن: بەسەر تەنیاییتدا
بەسەر فرمێسکەکانی دایکمدا
بەسەر منداڵیمدا
بەسەر ئەو خەڵکە تۆقیوەی لە حەوشەکەمان ئاپۆرەیان داوە
بەسەر خەمناکترین ئێوارەدا دەبارێن و دەبارێن.
نە ئێوارە لە پەیڤینم دەگات
نە ئەو درەختە تەنیایەی ژوور سەرت
کە بەفرەگەڵای گرتووە.
من لە کۆڵانی بەیاندا ڕامدەکرد
لە ناکاو بەسەر تەرمەکەتدا کەوتم
بەسەر چارەنووسدا کەوتم.
ئێستا لەژێر ئەم فەزا لێڵەدا من ڕەنگی تەرمم لێ نیشتووە
گومڕایەکم داهاتووی خۆم ون کردووە.
لەژێر ئەم فەزا لێڵەدا
دەڵێی دوو دیلین، دوو کۆیلەین ڕێکەوت پێکمان نامۆ دەکات
چارەنووسیش لە دووڕیانێکی ئەبەدییدا
بەرەو دوو ونبوونمان دەبات.

کلوەبەفرەکان بە پرتاو دەبارێن
تۆیش لەبەر سەرمای ئێوارەدا
وەک خاچێکی کەوتوو، یان وەک ساوایەکی ڕووت
بێباکانە ڕاکشاویت
بێ باک لە چارەنووس، بێ باک لە زەمان

بێ باک لە داهاتووی من
بێ باک لە دزەنیگای دۆست و دوژمن.
ئێستا ڕووتیت و
کلوەبەفرەکان جەستەت وەک کێلگەی پەمۆ سپی دەکەن
وەک کفنێکی دڕاو داتدەپۆشن.

تۆ زوو هاتیت
بەسەر جیهانێکدا کەوتیت لەنێوان ڕاستی و ئەفسانەدا بوو.
ڕێگایەکان بە شەوێکیان دەسپاردیت
کە مانگ و ئەستێرەکانی خۆی دەڕەتاند.
منداڵێک بوویت لە منداڵیت بێزار،
لە کۆڕەو و شەوەقەترانییەکاندا
منداڵییت دەگۆڕییەوە بە جامێک شیر و لەتێک نان.
لاوییەتیشت لە بازاڕی بێکاریدا، لە مەیدانی شەڕ و
سەنگەری هەرەسدا بە جێ دەهێشت.
گەشتێکی چەند بێ مانا بوو
بەنێو تاریکی و تەپوتۆزی ڕۆژگاردا ڕاتدەکرد و
ڕێیەکان هەڵیان دەگرتیت،
مێژوویەک بەرۆکی دەگرتیت لە خۆڵەمێش تەڵختر بوو.
زوو هاتیت و تەمەنت دیرۆکێک بوو:
خەون و حەسرەت و ئەڤین دەیاننووسییەوە
تابلۆیەک بوو: جەنگ و ستەم دەیانسڕییەوە.
کاتێک هاتیت بەسەر ولاتێکدا کەوتیت
کە بە زەبری نزا و ستەم و دەروێشی ڕاگیرابوو
وڵاتێک لە سێبەری منارەدا سەر بڕابوو.

٤

## مەرگباران

### ئا- جوانترین کوژراوی دنیا

-ئاگادارتـان دەکەیـن شـەوی پێشـوو پـۆلیس تاوانبـارێکی لەنـاو بردووە، کە ماوەیەک بوو خەڵک و کاروانچییانی ڕووت دەکردەوە. پاش نیوەڕۆ تەرمەکەی لە لای سـەرا دادەنـدرێت. کێ دەیەوێت بـا بێت بە چاوی خۆی ئەو تاوانبارە ببینێت.

ڕۆژێک جارچی بە بازاڕی قەڵادزێدا هـاتە خوار، لە چەند جێگا ڕاوەستا و بە دەنگی بەرز ئاگادارییەکی لەو جۆرەی خوێندەوە، کە پۆلیس پێی دابوو. هەواڵەکە بە خێرایی بە شاردا بڵاو بۆوە.

ئەو سـەردەمە جـارچی هەبـوو، هەر هەواڵ و پەیـامێکی گرینـگ و خێرای پۆلیس و دایرەی تری حکومەت، کە پێوەندیی بە شـارەکەوە هەبووایە، بە هۆی جارچییەوە بە خەڵک دەگەیەندرا.

ئەوکـــاتە، ئەگەر بە هەڵە نەچـــووبم، قوتـــابیی پـــۆلی یەکەمـــی سەرەتایی بووم، یەکەم جار بوو هەواڵی لەو جۆرە ببیسـتم. بۆیە لەگەڵ چەند هاوڕێیەکم، چووینە لای سـەرا، کە لە کۆتـایی شـەقامی سـەرەکیی قەڵادزێ، بەرامـبەری قوتابخـانەی سـەرەتایی ئاسـۆس بـوو. لەوێ خەڵکێکـی زۆر، پیـاو و ژن و منـداڵ، کـۆ بووبـوونەوە، وەکوو ئەوەی بۆ تەماشـاکردنی فیلمێک هـاتبن. تەرمـی کـوژراوەکە لەپـاڵ دیـواری سـەرا، کە لە بەردی نەقـاڕی دروسـت کرابـوو، بە

دانیشتنەوە لەسەر کورسییەک داندرابوو، دوو پۆلیس لە نزیکییەوە ڕاوەستابوون. کوژراوەکە گەنج، قەبە و بەقەڵافەت بوو، کورتەک و شەرواڵی نوێی لەبەر بوو، وەکوو ئەوەی خۆی بۆ زەماوەند، یان ئاهەنگێک ئامادە کردبێت و بیەوێت قسە بۆ خەڵک بکات. بەڵام دەلینگی لاقی ڕاستی شەرواڵەکەی، تا سەرئەژنۆی هەڵکرابوو. کوژراوەکە خەڵکی قەڵادزێ نەبوو، کەس نەیدەزانی کێیە و ناوی چییە. پۆلیسێکیان، کە سێ خەتی بە قۆڵەوە بوو، هەندێک قسەی لەبارەی کوژراوەکە کرد، بە ڕێگر و جەردە ناوی هێنا، کە چەند کەس و کاروانچی لە دەرەوەی قەڵادزێ ڕووت کردۆتەوە. گۆپاڵە ڕەشە بریقەدارەکەی دەستی، بەرەو لای ئەژنۆی کوژراوەکە برد، کە برینێکی بچووکی هێندەی دەنکە خورمایەکی پێوەبوو، وتی:

گوللە بەر ئەژنۆی کەوتووە، خوێنی زۆری لەبەر ڕۆیشتووە و مردووە.

ئەمە یەکەمین جار بوو تەرمی کوژراوێک، یان مردوویەک ببینم. تا ئێستا دیمەنی ئەو پیاوە غەریبە، ڕووخساری جوانی، پرچ و سمێڵە ڕەشە قەترانییەکەی، هەر لە بەر چاوم ماون. ڕوخساری ئەسمەری پیاوەکە، مەیلەوزەرد هەڵگەڕابوو، بەڵام لە مردوو نەدەچوو. برین بە ڕوخساری و خوێن بە جلەکانییەوە نەبوون. خەڵک بە سەرسوڕمانەوە تەماشایان دەکرد، ژنان فسکە فسکیان بوو. لەوە دەچوو هەیبەت و قەڵافەت و پۆشتەیی و جوانییەکەی سەرنجی هەمووانی ڕاکێشابێت.

نازانم پێشتر پۆلیسی قەڵادزێ کاری لەو جۆرەی کردبوو، یان نا، بەڵام وا دیار بوو حکومەت دەیەویست لە ڕێگای ئەو تەرمەوە، دەسەڵات و توانای خۆی پیشان بدات، ئەو کەسانەش چاوترسێن بکات کە بەنیازی کاری لەو جۆرەن.

لەناو ئەو دیمەنە نائاساییەدا، کە ترس و سەرسوڕمان ئاوێتەی یەکتر بووبوون، کوڕێکی زۆر گەنج، ساڵح برایم، بە خۆبادانەوە بەرەو لای کوژراوەکە چوو، لە تەنیشتی ڕاوەستا. ئاوڕێکی لە خەڵکەکە دایەوە و بە پێکەنینەوە وتی:

لەوە دەچێت ئێستا تامەزرۆی جگەرە بێت.

جگەرەیەکی خستە نێوان لێوی کوژراوەکە، کەمێک چەمایەوە چەرخەکەی هەڵکرد، ویستی جگەرەکە دابگیرسێنێت، لەپڕ جگەرەکە لە لێوی مردووەکە بەربۆوە، ساڵح هەڵبەزییەوە، وەکوو ئەوەی مردووەکە لێی ڕاسابێت، خێرا کشایەوە، منیش لە ترسان ڕاچڵەکیم. نازانم لەو چرکەساتەدا چەند کەسی تر، وێنەی من و ساڵح ترسان، بەڵام خەڵکەکە دەستیان کرد بە پێکەنین و قسەی تەنزئامێزیان بە ساڵح وت.

ساڵانێک دواتر، کاتێک کورتە چیرۆکی گارسیا مارکێز (جوانترین خنکاوی دنیا)م خوێندەوە، پیاوە قۆزە کوژراوەکەی قەڵادزێم بە بیر هاتەوە. چیرۆکەکەی مارکێز باسی کەسێکی خنکاو، نەناس و بێناو دەکات، کە ڕۆژێک شەپۆلی دەریا هەڵی دەداتە کەناری نزیک گوندێک. خەڵکی گوندەکە لە دەوری کۆ دەبنەوە و بە سەرسامییەوە تەماشای دەکەن. خنکاوەکە کەسێکی زۆر زل، جوان و قەبەیە. پێدەچێت ئاوی زۆر چووبێتە لەشییەوە و هەڵامسابێت. خەڵکەکە پێشتر کەسی زەبەلاحی لەو جۆرەیان نەدیوە. زۆر پێی سەرسام دەبن، لەخۆڕا ناوی (ئێستیبان)ی بەسەردا دەبڕن. هەرچەندە ئەو مردووە، بەڵام خەڵکەکە لەو باوەڕەدان، کە هێشتا تواناداره و شتی لەدەست دێت.

دوای خوێندنەوەی چیرۆکەکە، بە زمانی فارسی، ئەو ڕووداوەم بە بیر هاتەوە و لەخۆم پرسی:

تۆ بڵێی پیاوە قۆزە کوژراوەکەی قەڵادزێ، جوانترین کوژراوی ئەو کاتەی دنیا نەبووبێت؟

ژیـان پـڕە لە ڕووداو و ڕێکەوتـی سـەیر و چـاوەڕواننەکراو! دووەم کـوژراو، کە دوو سێ سـاڵ دواتر تەرمەکەیم بینی، سـاڵح بـرایم بـوو، ئەو گەنـجەی ویسـتی بە کـارێکی کۆمێـدی، بەڵام بێزەوقـانە، بێدەنگیی شـوێنەکە بشـڵەقێنێت و تاوێک سەرسـامی و ترسی ئەو خەڵکەی بۆ بینینی کوژراوەکە چووبوون، بڕەوێنێتەوە.

سـاڵح گەنجێکی بزۆز و پڕ جوڵە بوو، هـیچ کـارێکی نەدەکرد. ڕاسـت یـان ناڕاسـت دەوتـرا گوایـا بـۆتە پۆلیسـی نهێنـی (ئەمـن). هەمیشـە لە بـازار و چایخـانە دەبینـدرا. دوای کـوژرانی، دەوتـرا کە حەزی لە گـاڵتە و سـوعبەت بـووە، بەڵام هەنـدێک جـار سـنووری بەزاندووە، سەری کردۆتە سـەر کەسـێک و پێی ڕابواردووە، تـوڕە و بێزاری کردووە.

یەکێک لەو کەسانەی ساڵح تووڕە و هەراسانی کردبوو، وەسـتا بەکـری دوکانـدار بـوو، کە لە ناوەڕاسـتی بـازار، لە گۆشـەیەکی تەنیشت چایخانەی سمایلی مام ئەحمەد، دوکانێکی چکۆلەی هەبوو. نوقـڵ، شـیرینی، بنێشـت، پسـکویت، جـگەرە و شـتی لەو جـۆرەی دەفرۆشـت. وەسـتا بەکـر کەسـێکی کـورتیلەی تێکسـمراو بـوو، هەمیشە کڵاوی گوڵداری لەسەر بوو. کەس و خزمی نەبوو، دەوترا کوردی ئێرانە.

پێشـنیوەڕۆیەکی هـاوین، لەگەڵ مەحمـوودی وەسـتا حـاجیی بەرگدروو، لە دوکـانی بـاوکی مەحمـوود بووین، کە دە مەترێک لە خوار چایخانەکە بوو. کەسێک لە بەردەمی چایخانەکە هاواری کرد:

دە بەسە سەگباب! سەد جارم پێم وتی لە کۆڵم بەوە! خەڵکینە بە شایەت بن، خەتای من نییە و شەرم پێ دەفرۆشێت.

لەناکاو هاوار لە کەسێک هەستا و بوو بە دەنگە دەنگ، خەڵک بەرەو لای چایخانەکە ڕایان کرد، ئێمەش بە پەلە چووین بزانین چی بووە. لەوێ سالح لەسەر جادەکە، لە بەردەم دوکانی بەکر کەوتبوو، لینگەفرتەی دەکرد و خوێنی زۆری لەبەر دەڕۆیی. بەکری دوکاندار چەند هەنگاوێک لەو دوور کەوتبۆوە و خەنجەرێکی خوێناویی هەڵبڕیبوو، بە دوو چاوی حەپەساو و ترسناک بە خەڵکەکەیدا ڕوانی، وەکوو ئەوەی چاو بۆ کەسێک بگێڕێت، یان بە خەڵکەکە بڵێت کێ دەیەوێت لەسەر سالح بکاتەوە. لە ناکاو وەستا بەکر، هەستی کرد چی کارێکی ترسناکی کردووە، بەرەو ناو چایخانەکە هەڵات. چایخانەکە لە پشتەوە دەرگایەکی بچووکی هەبوو، کە بۆ جادەی ئەودیوی بازار دەچوو. بە پەلە سالح بەرەو خەستەخانە برا، بەڵام جوانەمەرگ بوو. بەکری دوکانداریش بۆی دەرچوو. زۆری نەبرد ژن و منداڵەکانیشی دیار نەمان.

### بێ- هەمزە حەسەن: بەدبەختترین تیرۆرکراو

دوای شۆڕشی تەمووزی ١٩٥٨ سەرەتا کێشەی سیاسی لەنێوان حزبی شیوعی عێراق و پارتی دەرکەوت. ناکۆکیی نێوان جووتیار و ئاغاکانی پشدەر، کە لەمێژ بوو هەبوو، توندتر بوو. ئەو کێشە و ناکۆکییانە چەند ڕووداوی توندوتیژانەیان بەدوادا هات، کە ئارامیی شارەکەیان کەمێک تێک دا. ئاغاکانی پشدەر، وەکوو جاران دەسەڵاتیان نەما بوو. دەترسان زەوییەکانیان، کە سەرچاوەی سامان و ژیان و دەسەڵاتیان بوون، زەوت بکرێن. بۆیە چەند کەسیان بە شێوازی جیاواز بێزاری و کاردانەوەی توندوتیژانەیان پیشان دا.

ساڵی ١٩٥٩ شانۆگەرییەک لەبارەی کێشەی نێوان جووتیار و دەرەبەگ لە قەڵادزێ، لە قوتابخانەی ئاسۆس نمایش کرا. لە شانۆگەرییەکەدا هەمزە حەسەن، کە قوتابییەکی ئاغازادە و خەڵکی گوندی بنەوشان بوو، ڕۆڵی جووتیارێکی بوێر و یاخیی بینی. لە دیمەنێکدا بەرانبەر بە ئاغاکە ڕاوەستا هاواری کرد:

جووتیارم جووتیارم
خەریکی زەویوزارم
چەماوەی قامچی و دارم
لەدەست ئاغا بێزارم.

ئامادەبووان کەوتنە چەپڵە لێدان. دواتر هەمزە ڕووی لەو کەسە

کرد کە ڕۆڵی ئاغای دەبینی، پەنجەی بۆ ڕاوەشاند و وتی:

دەستم بۆ بێنی دەستت دەشکێنم

بۆ دەنکە جۆیەک چاوت دەردێنم.

دوای چەند ڕۆژ هەمزە لە گوندی بنەوشان، لە لایەن شێخ مەحموودی بنەوشان، بە ناڕەوا شەهید کرا. بکوژەکەی گیرا، لە دادگا حوکمی یازەدە ساڵ زیندانی بەسەردا سەپێندرا. خەڵکی قەڵادزێ بەو تاوانە توڕە و خەمبار بوون، بۆیە هەمزەیان لە گۆڕستانی شار نەناشت، بەڵکو بە شکۆوە لە گردی حوسنی ناشتیان، ناوی گردەکەشیان گۆڕی بە گردی هەمزە.

هەر لەو کاتانەدا بوو چەند چەکداری ئاغاکان، بەشەو لە گوندی کێلەسپی، هێرشیان کردە سەر ماڵی کەسایەتییەکی دیار و بەرپرسێکی چالاکی حزبی شیوعی لە پشدەر، مەحموودی حاجی حەمەڕەش، کە جووتیار بوو، بۆ ئەوەی بیکوژن. کاک مەحموود تەقەی لێ کردنەوە و خۆی دەرباز کرد. بەڵام کەسێک لە هێرشبەران کوژرا، کە دەوترا بە گوللەی خۆیان کوژراوە.[1]

پاش نزیکەی ٣٥ ساڵ، مامۆستا ئەمینی کوڕی کاک مەحموود، کە بەرپرسی بزووتنەوەی جووتیاران بوو لە پشدەر، تیرۆر کرا. مامۆستا ئەمین هاوتەمەنی من بوو، لە قۆناخی خوێندنی ناوەندی هاوپۆل و ئەندامی یەکێتیی گشتیی قوتابیانی عێراق بووین.

---

1-کەسایەتیی ناسراوی قەڵادزێ وەستا جەلالی ناڵبەند، ئەو کاتە چالاکوانی حزبی شیوعی بوو، وتی: ئەو شەوە تفەنگەکەی من لە لای مەحموودی حاجی حەمەڕەش بووە، بەڵام تفەنگەکە کۆن بوو، ئەو شەوە هەر یەک گوللەی پێ هاوێژرابوو.

### پ- تیرۆرکردنی بەفرینی لاسلکی

بـزووتنەوەی چەکـداریی ئەیلـول، شـێوازی تـری تونـدوتیژی و مۆدێلی تیرۆری سیاسیی داهێنـا. دەوتـرا شـۆڕش بە بێ کوشـتن و چاوترسـاندن ناکرێت!. لیژنەی نـاوچەی پـارتی لەقەڵادزێ بریـاری دەدا کێ بکوژرێت. لام وایە یەکەم کەس، کە سەرەتای ساڵی ١٩٦٢ کوژرا، ئەفسەرێکی پۆلیسی ئەمن بوو، کە ناوی ئیسماعیل بـوو، بە ئەبو حەقی ناو دەبرا. ئەبو حەقی کەسێکی باش نەبوو، گێچەڵی بە چالاکوانانی شیوعی و پارتی دەکرد. ڕۆژێک لە سـەیرانگەی شـێخ فەرخ، لە لایەن کـوڕە ئاغـایەکەوە کـوژرا. دواتـر جاسووسـێک، لە سـلێمانییەوە نێردرابـوو بـۆ قەڵادزێ، نـاوی جەلال بـوو، زۆربەی کات لە چایخانەی سـەید وەسیم یاریی کۆنکەنی دەکرد. شـەوێک لە چایخانەکە کوژرا.

لە سـەرەتای بزاڤی چەکداری کەسـێکی زۆر بەرێز و بێوەی بە نـاوی بەفـرین (یـان بەفـری) کە مـفەوەزی لاسـلکی بـوو، لە سلێمانییەوە نێردرا بوو بۆ قەڵادزێ، بە ناڕەوا تیرۆر کرا. لیژنەی ناوچەی پارتی داوایان لێ کردبوو کە ئەو بروسکانەی حکومەت بۆ قەڵادزێ دەیانێنێرێت، بیدات بە پارتی. بەفرین خۆی لە بنەماڵەیەکی نیشتمانپەروەر بوو، پێی وتبوون من سوێندم خواردووە کە هـیچ نهێنیـیەک نەدرکێـنم، بـۆیە نـاتوانم ئەو کـارە بـکەم، بەڵام ئەو فەرمانبەرەی تر، کە لەگەڵ من کار دەکات، سوێندی نەخواردووە،

بەو بڵێن هەر زانیارییەکتان بوێت ئەو دەتانداتێ. لەسەر ئەو قسەیە بەفرینیان کوشت.

بەفرین گەنجێکی بەڕێز، سوروسپی، مووزەرد، قۆز و باڵابەرز بوو، خەڵکی سلێمانی بوو، بە ژن و منداڵەوە لە قەڵادزێ بوون. خەڵک کوشتنی ئەویان بە تاوان دانا و بۆی خەفەتبار بوون. دواتر لە ناوەڕاستی سالانی شەستەکان، برایەکی بەفرین و خزمەکانی، کە پێشمەرگە بوون، هاتن بۆ قەڵادزێ بۆ ئەوەی تۆڵەی بەفرین بکەنەوە. بەرپرسانی پارتی لە قەڵادزێ تاوانەکەیان خستبووە ئەستۆی وەستا حاجیی کۆیی خەیات، کە لە کاتی کوژرانی بەفرین بەرپرسی لیژنەی ناوچەی پارتی بوو لە قەڵادزێ. دوای لەتبوونی پارتی ساڵی ١٩٦٤ وەستا حاجی، کە بە لایەنگری باڵی مەکتەبی سیاسیی دادەندرا، لە لیژنەی ناوچەی قەڵادزێ نەما بوو.

ڕۆژێک لاموایە لە هاوینی ١٩٦٥ برایەکی بەفرین، لە پشت قوتابخانەی سەرەتایی ئاسۆس، بە دەمانچە تەقەی لە وەستا حاجی کرد چەند گوللەی پێوەنا. وەستا حاجی بەرنەکەوت و دەرباز بوو، بەڵام گوللەیەک بە ڕانی کاکە ڕەئووفم کەوت، کەماڵی لەو ناوە بوو. بە پەلە کاکم ڕەوانەی نەخۆشخانەی ڕانیە کرا. باش بوو گوللەکە ئێسقانی ڕانی نەگرتبوو. کاکم چەند شەوێک لە نەخۆشخانە مایەوە و بە سەلامەتی گەڕایەوە قەڵادزێ.

## ت‌- تیرۆرکردنی دڵشادی ڕەسووڵی

دەوروبەری پێنج ساڵان بووم، یەکەجار دڵشادی ڕەسووڵیم بینی. ڕۆژێک خاڵە حوسێنم، کە کوڕەگەورەی حاجی مەحموود و کەسایەتییەکی دیاری قەڵادزێ بوو، لەگەڵ پیاوێکی گەنج، باڵابەرز و ڕووخۆش، هاتنە ماڵی ئێمە. باوکم لەماڵ نەبوو، خاڵم بە دایکمی وت:

خوشکێ ئەوە میرزا دڵشادی ڕەفیقمە، بە ماڵەوە دێنە قەڵادزێ، تا جێیەکی لەبار پەیدا دەکەن، با لە ماڵی ئێوە بن.

محەمەد دڵشاد کوڕی میرزا غەفووری سابلاخی بوو. لەسەردەمی کۆماری مهابادا، وەکوو کەسایەتییەکی سیاسی و ڕووناکبیر و دەرکەوتبوو. لەو ساڵانەدا کۆمەڵێک پەخشانی ئەدەبی، لە گۆڤاری گەلاوێژدا بڵاو کردبۆوە. ساڵی ١٩٦٩ لە کتێبخانەی گشتیی سلێمانی، ئەو نووسینانەم خوێندنەوە.

دوای ڕوخاندنی کۆمار، خۆی و بنەماڵەکەیان لە کۆیە گیرسابوونەوە. مەسعوود محەمەد، بەڕێزەوە باسی محەمەد دڵشاد و بنەماڵەکەیان دەکات، کە لە گەڕەکی ئەوان نیشتەجێ بووبوون.[1]

دوای چەند ڕۆژ دڵشادی ڕەسووڵی، کە بە میرزا محەمەد دڵشاد ناسرابوو، لەگەڵ بەسێ خانی هاوسەری و مام ڕەسووڵی کوڕیان، کە تەمەنی دوو سێ ساڵ بوو، هاتنە ماڵی ئێمە و ژوورێکیان بۆ چۆڵ کرا. من و خوشکم زۆرمان پێ خۆش بوو. ماوەیەک بوو

1- مەسعوود محەمەد، گەشتی ژیانم، چاپی یەکەم ستۆکهۆلم ١٩٩٢ ل١٢١

نەسرینی خوشکم جوانەمەرگ بووبوو، مام ڕەسووڵ جێگای ئەوی بۆ گرتینەوە. ڕۆژانە یاریمان لەگەڵ دەکرد، خوشکم لە کۆڵی دەکرد، لە حەوشە و کۆڵان دەیگێڕا. ڕۆژێک مام ڕەسوول وتی بمبەنە بەغدایە. لەوە دەچوو لە ڕادیۆ، یان لە باوکی، ناوی بەغدای زۆر بەرگوێ کەوتبێت. خوشکم پێی وت بەغدا زۆر دوورە نایگەینێ. ڕۆژی دواتر دیسان هەڵی پێچاین بیبەینە بەغدا، وتمان باشە. چووینە بازار، کە سەد مەترێک لە ماڵمانەوە دووربوو. لەوێ مام ڕەسووڵ قەرەباڵغی و هاتوچۆی زۆری خەڵک و منداڵ و ئۆتۆمبێلی بینی دڵخۆش بوو، پێمان وت ئەوە گەیشتینە بەغدا. دەستی بە ڕاکردن کرد ، بەرەو ئەم دوکان و ئەو دوکان چوو، ئێمەش شاد و دڵخۆش دوای کەوتین. تاوێک لەوێ ماینەوە و چووینەوە ماڵ. مام ڕەسووڵ لە دەرگاوە بە هاواری کرد:

دایە لە بەغدایە بووم.

دوای ئەوە چەند جاری دی مام ڕەسووڵمان بردەوە "بەغدا".

پاش دوو سێ مانگ، ماڵی محەمەد دڵشاد خانوویەکی گەورەی سەربەخۆیان بەکرێ گرت، یان کڕییان و چوونە ئەوێ.

دڵشادی ڕەسووڵی ماوەیەک لە ناوچەی مەرگە و پشدەر میرزای ئاغاکان بوو، پێوەندیی باشی لەگەڵیان هەبوو. پاش شۆڕشی تەمووزی ١٩٥٨، وەکوو کەسایەتییەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی دەرکەوت. لە ناوەڕاستی شەستەکانی سەدەی پێشوو، بە هاندانی شێخ حوسێنی بۆسکێن و چەند ئاغای پشدەر، لە حکومەتی عێراق نزیک بۆوە. دەترسا ساواکی ئێران بیکوژن. چەند چەکداری لە دەوری خۆی کۆ کردەوە، کە زۆربەیان خەڵکی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوون. شەوێک ئاغایەکی پشدەر (ع ع) کە دۆستی بوو، بە ناوی کارێک بردییە دەرەوەی قەڵادزێ، لە گوندی

هەڵشۆ ڕادەستی پێشمەرگەی پارتیی کرد و جوانەمەرگیان کرد.

بەڵام مام ڕەسووڵی کوری ساڵی ۱۹۷۸ لەگەڵ چەند کەسی تر کە لە ڕێکخستنی نهێنی، لاموایە یەکێتیی نیشتمانی، کاریان کردبوو، گیـــران. ئەحـــمەدی تەنەکەچـــی، کە بەرپرســـیان بـــوو، لەگەڵ مەحمـــوودی مـــامەلاوە، نکوڵییـــان لە تـــومەتەکە کـــرد، بە دە ســـاڵ زیندانی حوکم دران، دواتر بە لێبوردنی گشتی ئازاد کران. ئەوانی تر، مـام ڕەسـووڵ، ئەحـمەدی کـاکەمین، عوسـمان شـەفیق، حەمەی ئەحمەدی عەولا، لەتیفی بانک و چەند کەسی تر، لەسێدارە دران.

میرزا دڵشاد و بەسێ خان چەند منداڵی تریان هەبوون، من تەنیا ناوی حوسێنم لە بیرە، کە لە مام ڕەسووڵ بچووکتربوو. بنەماڵەی بەڕێـزی دڵشـادی ڕەسـوولی لە قەڵادزێ مـانەوە، بـاوکی میـرزا دڵشاد، سەرپەرشتیی خێزانەکەی دەکرد.

دڵشـادی ڕەسـوولی کەسـایەتییەکی دیـاری نـاوچەی پشـدەر و کوردستان بوو. ڕووناکبیر، بەڕێز و بێوەی بوو، تیرۆرکردنەکەی غەدرێکی گەورە بوو. ئەو جۆرە تیرۆرە، دیاردەیەکی نوێ بوو، سـەرەتا سـام و ترسـیان لە کۆمەڵدا بـڵاو کـردەوە، بەڵام ئەوەنـدە دووبارە کرانەوە، بوونە بەشێک لە ژیانی خەڵک. ئەمەش سـەرەتای دارمـانی ئەخلاقـی، ویژدانـی، کـۆمەڵایەتی و ئینسـانیی بـوو، لە باشووری کوردستان، کە بزاڤی چەکداری دایهێنا و تا ئەمرۆش، بە گوڕ و تینی زۆرترەوە، بەردەوامە.

تیـرۆر و کوشـتن، بە هەر بەهـانە و نـاوێکەوە بێـت، تـاوانێکی ترسنۆکانە و وەحشییانەیە، ناتواندرێت پاکانەی بۆ بکرێت.

## ١
## کودێتای ١٤ی تەمووز و ژیاندنەوەی توندوتیژی

بەیانییەکی هاوین دوای نانخواردن، بۆ فولکەی سەرەتای شەقامی سەرەکیی قەڵادزێ چووم، کە لە پشت ماڵی ئێمە و لەبەردەم دایرەی پۆست و ماڵی باپیرم بوو. زۆر ڕۆژ لەوێ لەگەڵ جەلالی خاڵە حەسەنم و هاوڕێکانم یاریمان دەکرد. لە دوورەوە هاوار و دەنگە دەنگ هات. لە سیلەی کۆڵانەکەمان دەرچووم و فولکەکە دەرکەوت، خەڵکێکی زۆرم بینی لەوێ کۆ بووبوونەوە. بەشێکیان بەدەم چەپڵەڕێزانەوە گۆرانییان دەوت، چەندان کەسی تر هاواریان دەکرد. ئەوە یەکەم جار بوو ڕووداوی لەو جۆرە ببینم. لە تەواوی ئەو بەزم و هاتووهاوارەی ئەو ناوەی پڕ کردبوو، ئەوەندە تێگەیشتم کە مەلیک کوژراوە و شۆرش کراوە. بە ڕاکردن گەڕامەوە ماڵ، بۆ ئەوەی ئەو هەواڵە بە دایکم بگەیەنم. چونکە دایکم هەندێک جار، کە ناوی مەلیک دەهات، بە هەیبەتەوە باسی دەکرد و دەیوت نەوەی پێغەمبەرە. لە دەرگاوە هاوارم کرد:

دایە مەلیک کوژراوە!

دایکم کە لەو باوەڕەدا بوو، کەس ناتوانێت ئازار بە نەوەی پێغەمبەر بگەیەنێت، وتی:

کوڕم وا مەڵێ گوناهت دەگاتێ!

وتم: دایە گوناهی چی؟ خەڵک لای ماڵی باپیرم کۆ بوونەتەوە

دەڵێن مەلیک کوژراوە، لە خۆشییان گۆرانی دەڵێن و شایی دەکەن.

دوای ئەوە بە ڕاکردن گەڕامەوە بۆ لای فولکەکە.

ئەو ڕۆژە ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ بوو، مانگێک بوو پشووی هاوینەی قوتابخانە دەستی پێ کردبوو، من بۆ پۆلی سێیەمی سەرەتایی دەرچووبووم.

شۆڕش، یان کودێتای سەربازیی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ بە سەرۆکایەتیی عەبدولکەریم قاسم، ڕووی دا. لە ئەنجامدا مەلیک و چەند کەسی بنەماڵەکەی، لەوانە عەبدولئیلا، کە خاڵی مەلیک بوو، بە ناڕەوا کوژران. سەرۆکوەزیر نووری سەعید، کە لە دیارترین سیاسەتمەداری ناوچەکە بوو، لە لایەن ئاپۆڕەی بەلەسەبووی خەڵک، بە جۆرێکی دڕندانە لەناو برا. تەرمەکەی بە ئۆتۆمبێل، لە شەقامەکانی بەغدا ڕاکێشرا و پارچە پارچە کرا.

ئەو توندوتیژی و کوشتارەی کودێتاکە لەگەڵ خۆی هێنای، سەرەتای نەخشەی سیاسیی نوێی عێراقی بە خوێن کێشا. لە هەمان کاتدا، کولتووری کوشتن و توندوتیژی، کە لە کۆنەوە بە قووڵی ڕیشەی بە کۆمەڵی عێراقدا ڕۆچووە، ژیاندەوە.

هیچ شتێک لە نەبوونەوە نایەت. کوشتنی مەلیک و کەسانی بنەماڵەکەی و نووری سەعید و تێکرای ئەو تاوانە مەزن و کوشتارە کەموێنانەی دواتریش بە ناوی شۆڕشەوە، لە عێراقدا کران، بەرهەمی مێژووی خوێناویی سەدان ساڵەی کۆمەڵی عێراقن، کە هەمیشە مەیدانی کوشتار، تیرۆر و لەناوبردن بووە.

ناوچەکانی عێراقی عەرەبی کەوتونەتە نێوانی دورگەی عەرەب و ئێران. ئەو ناوچانە لە کۆنەوە ئامانجی خێڵە بە دووەکانی دوورگەی عەرەب بوون، کە بۆ تالانی، غەنیمەت و پەیداکردنی لەوەڕگا بۆ ماڵاتەکانیان، ڕوویان تێدەکرد. لە سەردەمی پەلامار و

غەزوی عەرەبیی ئیسلامیدا، ئەو ناوچانە کرانە بنکەی سەرەکیی لەشکری بەدووەکانی عەرەب، تا بەرەو ئێران و دوورتر بڕۆن. دواتریش ناوەندی دەسەڵاتی ئیسلامی گوێزرایەوە عێراق. شاری کوفە کرایە جێگای (بیت المال)ی مسوڵمانان. خێڵە بەدووەکانی عەرەب، کە بە توندوتیژی و تاڵانچێتی ناسراون، تا سەرەتای سەدەی بیستەم، بە پۆل ڕوویان لە ناوچەکە کرد، کولتووری بەخوێنئاودراوی خۆیان تێدا چەسپاند. زۆرترین کوشتار، کێشە و شەڕە خوێناوییەکانی نێوان گرووپە جیاوازەکانی مسوڵمانان، لە سەردەمی جیاوازدا، لەو ناوچانە ڕوویان دا، بۆ نموونە:

لە سەردمی خەلافەتی ئومەویدا (٦٦١-٧٥٠) خەڵکی مسوڵمانی هەردوو ویلایەتی کوفە و بەسرە، لایەنگری عەلی کوڕی ئەبو تالیب بوون، حوکمڕانیی ئومەوییەکانیان بە ناشەرعی دەزانی. ئومەوییەکان پەلاماریان دان و زیاتر لە هەشت هەزار کەسیان لێ کوشتن. حەجاج، کە والیی ئومەوییەکان بوو لە عێراق، لە ماوەی ٢٠ساڵی حوکمڕانیدا ١٠٠ تا ١٢٠ هەزار مسوڵمانی عێراقی کوشت. دوای مردنی کە دەرگای زیندانەکان کرانەوە ٨٠ هەزار مسوڵمانی زیندانیکراویان لەناودا بوون، کە ٣٠ هەزاریان ژن بوون. کاتێک عەباسییەکان (٧٥٠-١٢٥٨) دەسەڵاتی ئومەوییەکانیان لەناو برد، نزیکەی ٦٠٠ هەزار کەسیان لە ئومەوییەکان و لایەنگرانیان کوشت. حوسێن و بەشێک لە ڕابەرانی ڕۆحیی شیعەکان لە عێراق شەهید کران. هزر و مەزهەبی شیعە، ئەلخەواریج، ئەلموعتەزیلە، هەروا بزاڤی ڕەشەکان، قەرامیتە، ئەلغولات، زەندیقەکان، لەو ناوچانە دەرکەوتن. دەوڵەتی خەلافەتی ئیسلامی بە توندی پەلاماری ئەو بزاڤانەی دا و کوشتاری زۆری لێ کەوتەوە. بۆیە یاخیبوون لە دەسەڵات و پەنابردن بۆ توندوتیژی و لەناوبردن،

بـوونە دیـاردەیەکی ئاسـایی و بەشـێک لـە کولتـووری سیاسـیی دەسـەڵات و خـەڵکی ئـەو ناوچانـە پێـی ڕاهـاتن. کـەچی بـۆ نموونـە خەڵکی سووریا لەو جۆرە کێشە و ناکۆکییانە بەدوور بوون، ئەوان گوێڕایەڵ و ملکەچی حوکمڕانانی ئیسلام بوون.[1]

ئەو کوشـتارانە دەتـوانن بۆمـان ڕوون بـکەنەوە بـۆچی گـۆڕینی سیسـتمی مەلەکیـی عێـراق بـۆ سیسـتمی کۆمـاری، لافـاوی خـوێنی لەگەڵ خـۆی هێنـا. کەچـی ئەم جـۆرە گۆڕانکـارییە لە وڵاتـانی تـری ناسراو بە عەرەبی، بێ کوشتن و خوێنڕێژی ڕوویان دا. بۆ نموونە سـاڵی ١٩٢٠ لە سـووریا مەلیـک فەیسـەل لابـرا و نێـردرایەوە بـۆ ئـوردون. سـاڵی ١٩٥٦ چەنـد ئەفسـەر لە میسـر، بە ڕابەری جەمـال عەبدولناسـر، بە شـۆڕش، یـان کودێتـا، مەلیـک فارووقیـان لابـرد. مەلیـک و خێـزانەکەی بـۆ ئیتالیـا نێـردران. سـاڵی ١٩٦٢ مەلیکـی باکووری یەمەن و ساڵی ١٩٦٩ مەلیک محەمەد ئیدریس سنوسی لە لیبیـا، بە کودێتـای سـەربازی لابـران، خۆیـان و بنەماڵەکانیـان بە هێمنـی دوور خـرانەوە و دەوڵەتـی مەلەکـی گـۆڕدرا بە کۆمـاری. لە تێکـڕای ئەو وڵاتـانە، مەلیـک و بنەمـاڵەکەی، بە بـێ خوێنڕشـتن، بە کەلوپەلی پێویستەوە، ڕەوانەی دەرەوەی وڵات کران.

شـۆڕشـی تەمـووز سـەرەتا ئـازادیی سیاسـی، هـزری، مـافی ڕادەربـڕین و خۆپێشـاندانی لەگەڵ خـۆی هێنـا. بـۆ یەکەمـین جـار حزبی شیوعیی عێراق، پارتی دیموکراتی کوردستان، حزبی بەعس و حزبی تری عێراقی، ئازادانە و بە جۆرێکی قانوونی، دەستیان بە کار و چالاکیی سیاسی و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامە و گۆڤار و کتێب کـرد. ڕێکخـراوی پیشـەیی لاوان، قوتابیـان، ژنـان، سـەندیکای

1- بۆ زیاتر بڕوانە: هادی العلوی، فصول من تاریخ الاسلام السیاسی، نیقوسیا، قبرص، ١٩٩٥ ص ٣٩ هەروا ڕەفیق سابیر، ئیمپراتۆریای لم، سوید ١٩٩٨ ل٣٢

مامۆستایان، پارێزەران، کرێکاران و جووتیاران...تاد، پێکهێندران.

گرینگترین دەستکەوتی شۆڕشی ١٤ی تەمووز بۆ کورد ئەوەبوو، لە دەستووری کاتیی عێراقدا، کە لە ٢٧-٧-١٩٥٨ دەرچوو، دان بە ماڤی نەتەوەیی کورد لە عێراقدا نرابوو. لە مادەی سێیدا هاتبوو: (قەوارەی عێراق لەسەر بنچینەی هاوکاریی نێوان تەواوی هاوولاتیان و ڕێزگرتنی مافەکانیان و پاراستنی ئازادییان دامەزرێندراوە، عەرەب و کورد لەم وڵاتەدا هاوبەشن و ئەم دەستوورە دان بە مافە نەتەوەییەکانیاندا دەنێت، لە چوارچێوەی عێراقدا).[1]

ئەمە یەکەمجار بوو لە مێژووی عێراق و ناوچەکەدا، ئەم مافە دەستوورییە بە کورد بدرێت. چونکە لە دەستووری ساڵی ١٩٢٥ی عێراقدا، کە بریتانییەکان بۆ عێراقیان دانابوو، تەنانەت ناوی کورد نەهاتبوو. کەچی تەنیا سێ ساڵ پێش ئەو دەستوورە، لەشکری بریتانی بەزەبری تیرۆر و بۆردمان و هێزی سەربازی و مورتەزەقەی بیانی، مەملەکەتی کوردستانی ڕوخاند، ئاڵای مەملەکەتی کوردستانی داگرت و شاری سلێمانی وێران کرد. مەلیک مەحموودی زیندانی کرد و باشووری کوردستانی بەعێراقەوە لکاند. کەچی پاش ئەو کارەساتانەی بریتانیا بەسەر گەلی کوردستانی هێنا، پێی زۆر بوو ناو و مافی گەلی کورد لە دەستووری عێراقدا بنووسرێت. ئەمەش هەڵوێستی نامرۆڤانەی ئینگلیز بەرانبەر بە کورد و ڕۆحی شەڕانگێزیی ئەوان دەردەخات، کە غەدر و ڕەزالەت و تاوان، بەشێکە لە بوون و کولتووریان.

ئەو مافە نەتەوەییەی لە دەستووری نوێی عێراق بە کورد درابوو، تورکیا، ئێران و سووریای هەراسان کردبوو. ئەوان

1-الدستور المؤقت لعام 1958(almadasupplements.com)

دەترسان گەلی کورد لە وڵاتەکانیاندا، داوای مافی دەستووریی لەو جۆرە بکەن. لەبەر ئەو هۆکارە و بە هۆی کۆتاییهێنانی دەسەڵاتی بریتانییەکـان لە عێـراق، ئەو وڵاتـانە و بریتانیـا، لە سـەرەتاوە دژایەتیـی دەوڵەتـی کۆمـاریی عێراقیـان کـرد و ویسـتیان بە هەر شـێوەیەک بێـت، تێکـی بشـکێنن. شـایەنی وتـنە تـا ئەمـڕۆ لە دەستووری تورکیا، ئێران و سووریادا، تەنانەت دان بە هەبوونی گەلی کورد لەو وڵاتانەدا نەندراوە.

شـۆڕش یـان کودیتـای تەمـووز و عاقیبەتەکـانی، ژیـان و چارەنووسی گەلانی عێراقیان گۆڕی. ئازادیی سیاسی، هزری و ڕادەربڕین، لە سایەی نەبوونی کولتووری دیموکراتی، کێشە و ناکۆکیی لێ کەوتەوە. پێش ١٤ی تەمووز، خەڵکی قەڵادزێ تەبا دەژیان. کەچی دوای ئەوە، خەڵکەکە بوونە دوو بەرەی جیاواز و دواتر پێک ناکۆک، بەرەی حزبی شیوعی و بەرەی پارتی. زۆرینەی خەڵکی شارەکە بەسەر ئەو دوو بەرەیەدا دابەش بوون. قسە و لێدوانی سیاسی لە ماڵان، قوتابخانە، چایخانە، کۆڵان و شەقام بەرگوێ دەکەوتن. پارتییەکـان یەکتریـان بە هەڤـاڵ نـاو دەبـرد، شـیوعییەکان بە هـاوڕێ بـانگی یەکتریـان دەکـرد. شـیوعییەکان وشـەی (گەنج)یـان بەکـار دەهێنـا و پارتییەکـان وشـەی (لاو). هەر لایەنەیان دروشم و هوتاف و سروودی خۆی هەبوو. ڕەنگی زەرد و سوور بوونە سیمبولی دوو گروپ و دوو بەرەی جیاواز. هەر حزبە لە بۆنەی گشتی، یان بۆنەی تایبەتی خۆیدا، ئاهەنگی ساز دەکرد، لایەنگران و خەڵکی تری بانگ دەکرد. تەنانەت ئاهەنگی نەورۆز، هەمان ڕۆژ لە دوو جێگای جیاواز دەگیرا، هەر حزبەی بە جیا ئاهەنگەکەی ڕێک دەخست و لایەنگرانی خۆی کۆ دەکردەوە. نەورۆزی ١٩٦٣ کە پۆلی یەکەمی ناوەندی بووم، شیوعییەکان لە

گردی حوسنی ئاهەنگیان گێرا. نەجات مەلاخدر، سنەوبەر زاهیر ڕەشید، نەزیرە شەفیق مامە و من، لەگەل چەند قوتابیی تر، شایی شێخانیمان کرد و گۆرانیمان وت. جەمال محەمەد (سوارە قەلادزەیی) پێشتر، چەند ڕۆژ پراوەی پێ کردین.

لەهەندێک بۆنە و ئاهەنگدا دەمبەدمە لەنێوان لایەنگرانی هەردوو حزبدا دروست دەبوو، یان ڕەفتاری سەیر و گاڵتەجاڕانە دەبیندران. بۆ نموونە کۆمەڵێک گەنجی سەر بە حزبی شیوعی، پێکەوە بە شەقامی سەرەکی قەلادزێدا دەهاتنە خوارێ، بەیەکدەنگ هاواریان دەکرد:

هەر دەڕۆین دەڕۆین دەڕۆین بەرەو ئیشتیراکییەت
بە پشتیوانی گەل و ئیتیحادی سۆڤییەت.

دواتر چەند پارتییەک، بۆ گاڵتە و جەفەنگ، بە هەمان شوێندا دەڕۆیشتن و هاواریان دەکرد:

هەر دەڕۆین دەڕۆین دەڕۆین بەرەو مزگەوتی گەورە
بە پشتیوانی فەقێ و مەلایەکی دەنگ گەورە.

پارتییەکان هاواریان دەکرد:
پارتەکەمان پارتی گەلە
پارتی کرێکار و ڕەنجبەرە.

بەڵام شیوعییەکان دەیانوت:
پارتەکەمان پارتی گەلە
سەرۆکمان (مینە قەلە).[1]

---

1- مینە قەل خزمەتکاری شێخ محێدینی بنەوشان بوو، وا بزانم دواتر کوژرا.

ڕۆژێکـی هـاوینی ١٩٥٩ یـان ١٩٦٠ پارتییەکـان لە فـولکەی لای نەخۆشخانەی قەڵادزێ، خەڵکی زۆریان کۆ کردبۆوە. چەند کەسێک لە سـەربانی یـانەی فەرمـانبەران، کە بەرانـبەر فـولکەکە بـوو، ڕاوەسـتابوون بـۆ ئەوەی قسـە بـۆ خەڵـک بـکەن. یەکەم جـار حیسـامەدین تەیـب کـۆیی، کە بە (شـەعب) نـاو دەبـرا، لای مایکرۆفۆنەکە ڕاوەستا وتار بدات. هاواری کرد:

ئەی دانیشتوانی شاری قەڵادزێی بێ شەرەف!

ئامـادەبووان تاوێک حەپەسـان و بـوو بە دەنگە دەنگ، وەکوو ئەوەی بـاوەڕ بە گـوێی خۆیـان نەکەن. ئەوانەی لە تەنیشـت حیسـامەدین ڕاوەسـتابوون، ئاگاداریـان کـردەوە، بەڵام ئەو خـۆی تێک نەدا و هاواری کرد:

عەفوەن عەفوەن بەشەرەف!

خەڵکەکە دەستیان کرد بە هاتوهاوار و فیکەکێشان.

بە کورتی جاران لە نـاوچەی پشـدەر کێشـە و نـاکۆکی لەنێـوان دوو عەشـیرەت، میراودەلییەکـان و مەنگوڕەکـان، هەبـوو. دوای شۆرشـی تەمـووز کێشـەی نێوان دوو عەشـیرەتی نـوێی سیاسـی، پارتی و شیوعی، دەرکەوت.

ئەو کاتە نزیکەی دوو ساڵ نووسەر و ڕۆژنـامەنووس، مامۆستا مسـتەفا سـاڵح کەریـم، لە قەڵادزێ بەرپرسـی ڕێکخسـتنی حزبـی شیوعی و بەڕێوەبەری قوتابخانەی ئاسۆس بوو.

قەڵادزێ ناوەندی قەزای پشدەرە، نزیکی ئێرانە. جاران قەزاکە لە دوو ناحیە، سەنگەسەر و هێرۆ، پێک هاتبوو، لە چوار لاوە بە ٢٧٦ گونـد دەورە درابـوو، کە هەموویـان، جگە لە شـێنێ، وێـران کـران. ١٩٧ گونـدیان دوای ڕاپەڕینـی ١٩٩١ ئـاوەدان کـراونەتەوە، سـێ

گوندی جاران، ژاراوە، هەڵشۆ و ئیسێوە، کراون بە ناحیە.[1]

زۆریـــــنەی خەڵکـــــی نـــــاوچەکە بە کشـــــتوکاڵ، مەڕداری و بازرگـانییەوە خەریـک بـوون. خـۆراک و پێداویسـتیی تـری خەڵکـی قەڵادزێ، لە گۆشـتەوە بـۆ گەنـم، بـرنج، نیسـک، مـاش و میـوە و تووتن، لەو گونـدانە دەهـاتنە بەرهەم. بەیانیـان زوو جووتیـاران لەو گونـدانەوە، بە بـاری کەر و ئێسـتر، سـەوزە، میـوە، ماسـت، پەنیـر، ڕۆنەکەرە، شیر و هێلکە و پەلەوەریان بۆ قەڵادزێ دەهێنا و تـا لای نیـوەڕۆ، لە مەیـدانی شـارەکە، هەموویـان دەفرۆشـتن. هەنـدێک لەو جووتیـــارانە، بە بـــێ کەبـــابخواردن نەدەگەڕانەوە گونـــدەکانیان. هەنـدێکی تریـان سـەردانی خـزم و ناسـیاوی خۆیـان دەکـرد. لەو ماوەیەدا وڵاخەکانیان لە مەیدانەکە، یان لە لای ماڵی ناسیاوەکانیان، دەبەستنەوە. یەکێک لە خۆشییەکانی سەردەمی منداڵیم سواربوونی ئەو کەرانە بـوو. هاوینـان لەگەڵ بـرادەرانم، دەچـووین هەوسـاری یەک دوو کەرمان دەکردەوە و بە نۆرە غارغارێنمـان پـێ دەکـردن، وەکـوو قارەمـانی بەیـت و حیکـایەتە فۆلکلۆرییەکـان، بە خۆمـان دەنـازی و دارێکمـان وەکوو شمشـێر هەڵدەبڕی. لە ناکـاو هـاوار و هەڕەشـــەی خـــاوەنەکەی، لە دوورەوە دەهـــات، خێـــرا هەڵـــدەهاتین. هەندێک جاریش، پێش ئەوەی خاوەنەکەی بێت، لە سـواریی وەڕس دەبووین و لە دەوروبەری مەیدان کەرەکەمان بەجێ دەهێشت.

زۆربەی گونـد و زەویـی کشـتوکاڵیی نـاوچەی پشـدەر مـوڵکی میراودەلییەکـان و چەنـد بازرگـانی قەڵادزێ بـوون. بەڵام چەنـد گونـدێکی بـاکووری ڕۆژهەڵاتـی قەڵادزێ، لەوانە دەلـۆ، مێرتکـان، شەروێت، ئاڵییە ڕەشان، سونێ، شێنێ و چەند گوندی تر، نـاوچەی

---

1-ئەو زانیارییە لە کتێبێکی بڵاونەکراوەی مامۆستا مۆفەق میراودەلی، لەبارەی ناوچەی پشدەر، وەرگیراوە.

خێڵـی مەنگـوڕ و مـامەش بـوون، کە ئاغـای خۆیـان هەبـوون. مەنگوڕەکـان خێڵێکـی گەورەی قسەخۆشـی کوردسـتانن، زۆربەیـان لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان و ناوچەی موکریان دەژین، لای ئەوان و لە گوندەکانی تری پشدەر، ژن ئازادیی تەواوی هەبوو، کچ بە دڵی خـۆی مێـردی هەڵـدەبژارد. ئەگەر کەسـوکاری ڕازی نەبوونـایە، کچەکە هەڵدەگیرا و دواتر بنەماڵەی بوک و زاوا مەسڵەتیان دەکرد. بۆیە ژنکوژی لە نـاوچەکە زۆر زۆر دەگمەن بـوو، یـان دروسـتتر بڵێم نەبوو. ڕەدووکەوتن، کە بە بێ گرفت چارەسـەر دەکرا، بـاو بـوو. مـن خـۆم لە چەنـدان کەسـی ئەو نـاوچەیەم بیسـتووە، کە وتوویانە ئێمە لەسەر کونە میزێک ئینسان ناکوژین.

جووتیـارانی نـاوچەی پشـدەر لەو گونـدانە دەژیـان و سـەرقاڵی کشـتوکاڵ و مەڕداری بـوون. ئەوان زۆربەی خـۆراکی سـەرەکیی خۆیان و خەڵکی قەڵادزێیان دابین دەکرد. لەبری کارەکانیـان نیوە، یـان بەشـێکی بەرهەم و داهـاتی زەوییەکانیـان بـۆ خۆیـان دەبـوو، ئەویتری بۆ خـاوەن زەوییەکـان دەچوو. هاوینـان کـاتی دروێنە و کـۆکردنەوەی بەرهەمـی کشـتوکاڵی، کەسـانی ڕەنجـبەر، کرێکـاری کشـتوکاڵ، دەچوونە ئەو گوندانە و کاریـان دەکرد، بەشـێک لەوانە کوردی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوون، کە زۆر کاردۆست بوون.

کێشـەی نێوان ئاغـا و جووتیـار، لە پشـدەر و ناوچەکـانی تـری کوردستان و عێراق، بەرچاو بوو، چونکە جووتیاران لە لایەن ئاغـا و زەویدارانی ترەوە، زوڵمیـان لـێ دەکرا و دەچەوسـێندرانەوە. ئەو کێشـەیە بە فراوانـی لە کـورتەچیرۆکی کوردیـدا، ڕەنگـی داوەتەوە، چەنـدان چیرۆکنووسـی ئەو سـەردەمە، لەوانە عەلادیـن سـەجادی، ئیبراهیم ئەحمەد، شەهید حەسەن قزلجی، شەهید مـارف بەرزنجی، مسـتەفا سـاڵح کەریـم، کـاوس قەفتـان و چیرۆکنووسـی تـر، باسـی

ستەمی ئاغا و ناکۆکیی نێوان ئاغا و جووتیاریان کردووە. ئەو سەردەمە، کە زۆرینەی خەڵک گوندنشین بوون، ئەو کێشە چینایەتییە گرفتێکی سەرەکیی کۆمەڵی کوردستان بوو.

ساڵی ١٩٣٨ ئیدارەی حکومەتی عێراق لە قەڵادزێ دامەزرێندرا. دوای ئەوەش میراودەلییەکان دەسەڵاتیان، بە جۆرێکی تر، هەر بەردەوام بوو، بابەکر سەلیم ئاغا، کە سەرۆکی عەشیرەتی میراودەلییەکان بوو، کرا بە قایمقامی قەڵادزێ. بریتانییەکان لە عێراق هەوڵیان دەدا لە ڕێگەی سەرۆکخێڵەکانەوە، کە دەسەڵاتداری ناوچەکانیان بوون، کۆنترۆڵی ناوچە جیاوازەکانی عێراق بکەن. بۆیە پشتگیریی سیستمی فیۆدالی و ئەو سەرۆکخێڵانەیان دەکرد، کە دۆستیان بوون، یان دژایەتیی دەسەڵاتی ئەوانیان نەدەکرد. لە زۆر ناوچە، سەرەتا ئەوانیان بە قایمقام و سەرۆکی شارەوانی دانا. لە پەرلەمانی عێراقیشدا، کۆمەڵێک سەرۆکخێڵی کوردستان و عێراق، بە نوێنەری ناوچەکانیان دیاری کرابوون.

شۆڕشی تەمووز سروشتی کێشەی سیاسی و ژیانی خەڵکی کوردستان و تەواوی عێراقی گۆڕی. تا ئەو کاتە هەموو لایەنە سیاسییەکانی عێراق، پێکەوە لە دژی حکومەتی عێراق و کۆلۆنیالیزمی بریتانی وەستا بوون. دوای ڕزگاربوون لەوان، ناکۆکی و دووبەرەکێ کەوتە نێوان ئەو هێز و لایەنە نێوخۆییانە. ناسیۆنالیستانی عەرەب و حزبی شیوعی، دوژمنانیەتیی یەکتریان دەکرد. هەر لایەنەیان دەیەویست، عەبدولکەریم قاسم و حکومەتی کۆماری، بەرنامە و داخوازییەکانی ئەوان جێبەجێ بکات. هەروا ناسیۆنالیستانی عەرەب لە دژی داخوازییە نەتەوەییەکانی گەلی کوردستان وەستان. لە کوردستانیش گرژی کەوتە نێوان حزبی شیوعی و پارتی. بریتانیا و ئەمریکا و دەوڵەتانی ناوچەکە، بە تایبەت ئێران، تورکیا و ئەردەن، ئاگری ناکۆکییە نێوخۆییەکانی عێراقیان خۆشتر کرد. دەیانویست

حکومەتی کۆماریی عێراق لاواز بکەن و بیڕوخێنن، چونکە عێراق لە کۆلۆنیالیزمی بریتانی ئازاد کرا، پێگەی سیاسی و ئابووریی بریتانیا و ئەمریکا لە عێراق زۆر لاوازبوو. حکومەتی عێراق لەجیاتیان پێوەندیی لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەت و وڵاتانی سۆشیالیستی، بەتین کرد. سەرەنجام لە شوباتی ۱۹٦۳ کودێتایەکی خوێناوی لە عێراق ڕووی دا و عەبدول کەریم قاسم کوژرا. حزبی بەعس دەسەڵاتی گرتە دەست، هەزاران ئەندام و لایەنگری حزبی شیوعی و ئازادیخواز کوژران و گیران. کودێتاچییەکان درندانە پەلاماری گەلی کوردیان دا. چەند ساڵ دواتر سکرتیری ئەو کاتەی حزبی بەعس، عەلی ساڵح ئەلسەعدی، وتی:

ئێمە بە شەمەندەفەر (قیتار)ی ئەمریکا گەیشتینە دەسەڵات.

لە دوای شۆڕشی ١٤ی تەمووزەوە، دەوڵەتی عێراق و چارەنووسی گەلەکەی کەوتنە ناودەستی ئەفسەرانی کودێتاچی و حزبی بەعس. چارەنووسی گەلی کوردستانی عێراقیش، کەوتە نێو بەرداشی دەسەڵاتی عیراق و سەرانی هێزی چەکداری کورد، کە هەردوو لایان، بە ڕادەی جیاواز، پەنایان بۆ گرتن، ئەشکەنجەدان، کوشتن و تیرۆر دەبرد. سەرەنجام کولتووری شەڕانگێزی و توندوتیژی بەهێزتر بوو، تا ئەمڕۆش عێراق، بە کوردستانیشەوە، سەقامگیری، تەبایی و دیموکراتیی بەخۆیەوە نەدیوە.

٢

## هەڵگیرساندنی شەڕ لە کوردستان

دوای شۆڕشی تەمووزی ١٩٥٨ کێشەی نێوان ئاغا و جووتیار توندتر بوو. زۆرینەی جووتیارانی عێراق و کوردستان ڕوویان لە حزبی شیوعی کرد، کە دەیەویست زەویی سەرۆکهۆز و موڵکدارە گەورەکانی عێراق، بەسەر جووتیاراندا دابەش بکرێن و بەشێکی کەمی بۆ خاوەن زەوییەکان بمێنێتەوە.

لە کۆتایی ئەیلولی ١٩٥٨ قانوونی چارەسەری کشتوکاڵ لە عێراق (قانوونی ژمارە ٣٠) دەرچوو. دروشمی زەوی موڵکی ئەو کەسەیە کە دەیچێنێت، کرا بە باسێکی سیاسیی گرینگ، لە هەموو شوێنێک دەبیسترا. ئەو قانوونە بەو ئامانجە دەرکرا کە کێشەی لەمێژینەی نێوان ئاغا و جووتیار چارەسەر بکات، ئاستێکی ماقوولی دادپەروەری، لە بواری کۆمەڵایەتی، ئابووری و موڵکایەتیی زەوی، بچەسپێنێت. بەڵام قانوونەکە، لەگەڵ گرینگییەکەیدا، زۆر بە پەلە و بە فشاری حزبی شیوعی دەرچوو. چارەسەرکردنی کێشەی زەوی لە عێراقدا، لەوە ئاڵۆزتر بوو کە هێندە بە پەلە، بێ لێکۆڵینەوەی ورد و هەبوونی دەسەڵاتێکی بەهێز، چارەسەر بکرێت. بۆیە قانوونەکە کێشەی نوێی بۆ عێراق هێنا، ناکۆکیی نێوان هێزە سیاسییەکانی زیاتر کرد و تەنانەت ئاگری

شەڕی لە کوردستان هەڵگیرساند.

قانوونەکە جیاوازیی شێوەی موڵکایەتیی زەوی لە کوردستان و ناوچە عەرەبییەکانی عێراقدا، لە بەرچاو نەگرتبوو. لە کوردستان تا ساڵی ١٩٥٨ قانوونی عوسمانی، لەبارەی وەرەسەی موڵکایەتی پێڕەو دەکرا. دوای مردنی سەرۆکخێڵ، یان ئاغاکە، زەوییەکانی لەنێوان کوڕەکانیدا دابەش دەکران.

بەڵام لە ناوەڕاست و باشووری عێراق، بەپێی نەریتی عەشایەریی ناوچەیی، کوڕی گەورە دەستی بەسەر زەوییەکاندا دەگرت، واتا دابەش نەدەکرا.[1]

سەرۆکخێڵەکانی کوردستانی عێراق دژی ئەو قانوونە نوێیە وەستان. کۆمەڵێک ئاغای ناوچەی پشدەر (میراودەلییەکان) پەنایان بۆ ئێران برد و ماوەیەک لەوێ مانەوە. دوای ئەوە بە چەکەوە گەڕانەوە ناوچەی پشدەر. ئەوان، کە بە ئێران پشتئەستوور بوون، پەلاماری دوو گوندی عەشیرەتی مەنگوڕەکانیان دا، گوندی دێلۆ و مێرتکە، کە نزیکی قەڵادزێن، بۆ ئەوەی داگیری بکەن. مەنگووڕەکان کە دوژمنایەتیی کۆنیان لەگەڵ میراودەلییەکان هەبوو، بە توندی داکۆکییان لە گوندەکانیان کرد، دەنگی تەقە لەناو قەڵادزێ دەبیسترا. زۆر کەس لە هەردوو لا کوژران. لەشکری میراودەلییەکان، ئاگریان لەو دوو گوندە بەردا، بەڵام بە تێکشاوی

---

1- ڤالدیمار غالمار، عراق نوری السعید. دراسه وتقدیم وتحقیق سیار الجمیل، دار میزوپوتامیا ص٢٢٢٠١٥٦ ط١، بغداد

د.سیار جەمیل دەڵێت: "کورەگەورە نیوەی زەوییە کشتوکاڵییەکانی پێ دەدریت، نەک هەمووی، بۆ ئەوەی قەوارەی بنەماڵەکە و دیوەخانی خێڵەکە پارێزراو بێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێک جار مافی میراتگریی زەویوزار، لەناو خێڵە عەرەب، کورد و تورکمانەکاندا، لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر جیاوازیی هەبوو. بۆ نموونە دەکرا کەسی بەهێز و دەسەڵاتداری بنەماڵەکە، موڵکەکان زەوت بکات، یان سەرۆکخێڵ وەسیەت بکات موڵکەکان بدرێنە یەکێک لە کوڕەکانی.

گەڕانەوە. زۆرینەی خەڵکی قەڵادزێ لەو دەستدرێژییە ناڕەوایە بێزار بوون، پێیان خۆش بوو میراودەلییەکان لەو شەڕەدا شکان.

دەوڵەتی ئێران، کە زۆر بە توندی دژی حکومەتی کۆماریی عێراق وەستابوو، لە بەرامبەر چەکدارکردنی ئەو میراودەلییانەی پشدەر، مەرجی بۆ دانابوون. عەبدوڵڵا ئەحمەد ئاغای پشدەری، کە خۆی لە عەشیرەتی میراودەلییە، ئەندامی پارتی و لەناو ڕووداوەکاندا بووە، دەڵێت ئەو شەڕە بە داوای ئێران کرا، بۆ ئەوەی ئاژاوە بنێتەوە و دوژمنایەتی لەنێوانی دوو عەشیرەتی پشدەر و مەنگوڕایەتی تازە بکاتەوە و ببێتە شەڕی نێوخۆ. ئەو دەنووسێت:

(ئاغایەکانی پشدەری ویستیان بە بەردێک دوو ئامانج بشکێنن یەکەمیان، ڕازیکردن و فەرمان بەجێ هێنانی کاربەدەستانی ئێرانی و دووەمیان وەرگرتنەوەی ئەو دوو گوندانە کە بە هی خۆیانیان دەزانین.)[1]

سەرەتای یاخیبوونی چەکداری لە دژی حکومەتی عێراق لە ناوچەی پشدەر و بیتوێن، بە ڕابەریی ئاغاکان دەستی پێ کرد. (لە مانگی ٧ی ١٩٦١ کۆبوونەوەیەکی فراوانی عەشایری ساز کرا لە ناوچەی بیتوێن، ماڵی شێخ حوسێن بۆسکێن، لەو کۆبوونەوەیەدا هەموو خاوەن زەوییە زۆرەکانی ناوچەی ڕانیە و پشدەر ئامادەی بوون و بڕیاریان دا خۆپێشاندانێکی چەکداری بکەن دژی ڕژێمی عەبدولکەریم و هەرچی زووتریش ڕێگای مابەینی ڕانیە، سلێمانی و کۆیە ببەستن و ماوە نەدەن هێزەکانی چەکداری میری بەم ڕێگەیەدا هاتوچۆ بکات.)[2]

دوای ئەو یاخیبوونە چەکدارییە (عەشایەرەکانی دەوروبەری

---

1- عەبدوڵڵا ئەحمەد ڕەسووڵ پشدەری، شۆڕشی ئەیلولی١٩٦١ دژی ڕژێمی قاسم، بەشی دووەم، هەولێر ١٩٩٧، ل١٨

2- عەبدوڵڵا ئەحمەد ڕەسووڵ پشدەری، هەمان سەرچاوە، ل١٤

سلێمانی وەکو هەمەوەند و شوان و شێخ بزێنی و سمایل عوزێری و دۆڵـــی جافـــاتی، هەســـتان و ئەوانـــیش ڕێگاکـــانی بازیـــان و دەربەندیخانیان گرت و چەکداریان دامەزراند. ئیتر دەنگی شۆڕشـی عەشایەر لە هەموو عاستێک بەرز بۆوە. وایان ئەزانی کە تەنیا هەر خۆیـان دەسـەڵاتداری کوردسـتانن و کەسـی تـر هـیچ نییە و تـا گەیشـــتبوونە ئەو ڕادەی لەخۆبـــاییبوون کە دەیـــانوت پـــارتی دیمـوکراتی کوردسـتان ئەگەر بە بۆچـوونی ئـێمە کـار نەکـات و ئەنـدامانی مەکتەبـی سیاسـی، ئەوانەی کەوا ڕایـان کـردووە و هاتوونەتە ناوچەکانی کوردستان، بەپێی فەرمانی ئێمە نەجوڵێنەوە، لەمەو دووا ئیمە دژی ئەوانیش ئەوەستین).[1]

بەم جۆرە شۆڕشی عەشایەر هەڵگیرسا!.

پـارتی بە فشـاری لەشـکری ئاغاکـان و لە ترسـی لەدەسـتدانی پێگەی خۆی، بە بێ پلانی سیاسی، سەربازی و خۆئامادەکردن بۆ خەبـاتی چەکداری، چووە پاڵ "شۆڕش"ی عەشـایەر، کە ئەو کـاتە تاکە هێزی چەکداریی کوردستان بوون. ئەو یاخیبوونە چەکدارییە، کە بە هانداندان و کۆمەکی ئێران کرا، دەرگای دۆزەخی بە ڕووی گەلی کورد لە عێراق کردەوە، کە تا ئەمڕۆ تیایدا دەسووتێت.

نووسەر مەسعوود محەمەد دەنووسێت:

(ئەو هەمـوو نـاودارانەی حـزب و ئەنـدامە چالاکەکـانی فەرمـانی گرتنیـان دەرچـوو، هەبـوو تییانـدا گیراشـن، هـیچ کەس گـوێی نەبـزووت و دنیـای بـۆ نەوروژا. کەچـی چـوار پێـنج (اقطـاعی-دەرەبەگ) کە سـاڵەهای سـاڵ بـوو مێشـکی خەڵـک لە دژیـان دەئاخنـدرا و یاسـای تەسـوییە و ئیسـلاح زیراعـی و ئامانجەکـانی شۆڕشـی چواردەی تەمـووزیش خەریکی بە هیچ دانانیـان بـوون،

---

1- عەبدوڵلا ئەحمەد ڕەسوول پشدەری، سەرچاوەی پێشوو، ل١٥-١٦

بەرانبەر بە فەرمانی حکومەت ڕاست بوونەوە دنیایان بەدوادا هات. حزب کەوا جگە لە هەندی لیژنەی محەلی بەولاوە لە بەرنامەیدا نەبوو هەستێتە سەرپێچی و یاخیگەری، ناچار ما لە ترسی ڕووتانەوە باوەش بەو هەلکەوتەدا بکرێت.)[1]

سەرخێلەکانی کوردستان خەلکیان لەگەل نەبوو، بە بێ پارتی نەیاندەتوانی درێژە بە یاخیبوونی چەکداریی بدەن. سەرانی پارتی لەبری ئەوەی بە شێوازی سیاسی و ئاشتییانە، کار بۆ مافی دەستووریی گەلی کوردستان بکەن، بە بێ پلان و خۆئامادەکردن چوونە پال شۆڕشی عەشایەر، کە هیچ پێوەندییەکی بە مافی نەتەوەیی گەلی کوردەوە نەبوو. سەرکردایەتیی پارتی، بەو کارە نامەسئولەیان، هەستی نەتەوەیی خەلکیان وروژاند و بۆ بەرژەوەندیی خۆیان بەکاریان هێنا. لە هەمان کاتدا بەهانەیان بە دەولەتی نوێی عێراق دا، هێزی سەربازی بۆ کوردستان ڕەوانە بکات. ناسیۆنالیست و شۆڤێنیستانی عەرەبیش، دەرفەتیان بۆ ڕەخسا بە ئاشکرا دوژمنایەتیی گەلی کورد بکەن.

لە دیموکراتترین ولاتی دنیا، ئەگەر هێزێک، بە چەک بەرەنگاری دەولەت ببێتەوە، هێز و توانای سەربازی و ئەمنیی دەولەتەکە، بۆ تێکشاندنی ئەو هێزە چەکدارە بەکار دەهێندرێن.

شەڕی چەکداری، لە باشووری کوردستان هەلگیرسا. هێزی چەکداریی ئاغاکان و پارتی دەستیان بەسەر چەند گوند و شارۆچکەی ناوچەی پشدەر و بیتوێندا گرت. چەند بنکەی پۆلیس گیران، یان پۆلیسەکان بە چەکەوە چوونە پال هێزی چەکداران.

لە ١١ی ئەیلولی ١٩٦١ حکومەتی عێراق، هێزی سەربازیی بۆ کۆیە، بیتوێن و قەلادزێ بەڕێ کرد، بۆ ئەوەی ئەو ناوچانە

---

1- مەسعود محمەد، گەشتی ژیانم، چاپ ١، ستۆکهۆلم ١٩٩٢ ل٤٠٣

بگرێتەوە. ئەو ڕۆژە، کرا بە ڕۆژی هەڵگیرسانی بزاڤی چەکداری. شۆڕشی عەشایەر، ناوەکەی کرا بە (شۆڕشی ئەیلوول). بەڵام لە ناوەرۆکدا بە (شورشی عەشایەر) مایەوە، چونکە بە عەقڵێکی خێڵەکییانە بەڕێوە چوو، زەوتکردنی دەسەڵات و بەرژەوەندیی سەرانی بزاڤەکە، نەک ماف و ئازادیی گەلی کوردستان، کرابوون بە ئامانج.

حکومەتی عێراق لە بەرانبەر پێشمەرگە، هێزێکی چەکداری، بە ناوی سوارەی سەلاحەدین (فرسان صلاح الدین)، لە کوردستان پێک هێنا و بۆ شەڕی پێشمەرگە پرچەکی کردن. ئەو هێزە چەکدارە جلی کوردییان لە بەر بوو. سەرەتا خەڵک بە (جاش پۆلیس) ناوی بردن. چونکە ئەو کاتە لە کوردستان هەر پۆلیس، بە چەکەوە دەبیندران. حکومەت هێندەی پۆلیس بایەخی بەو چەکدارە نوێیانە نەدەدا، چونکە هیزێکی بەکرێگیراوی کاتی بوون، نەک بەشێکی چەسپاوی هێزی چەکداریی دەوڵەتی عێراق. دواتر بۆ ئاسانیی وتنی ناوی ئەو چەکدارە تازانە و ڕیسواکردنیان، وشەی پۆلیس لە (جاش پۆلیس) کرایەوە، وشەی جاش، کە گوێی خەڵک پێی ڕاهاتبوو، مایەوە. ناوەکە لای خەڵک چەسپا.

پێش شۆڕشی تەمووز و دواتریش، خەڵکی کوردستان خۆی شار و شارۆچکە و دەزگاکانی حکومەتی لە کوردستان بەڕێوە دەبرد. لە دەستووری کاتیی عێراقدا بڕیار درا کە عێراق وڵاتی هاوبەشی عەرەب و کوردە. بۆچی سەرکردایەتیی پارتی، کە خۆی بە نوێنەری کورد دەزانی، هەوڵی نەدا سوود لەو مافە دەستوورییەی بە کورد درابوو، وەربگرێت، بە قانوونی تایبەت و لە ڕێگەی دەزگای دەوڵەتی، یەکسانبوونی نەتەوەیی لە عێراقدا، بچەسپێنێت.؟ بۆچی هیچ دەرفەتێکیان بە حکومەتی نوێی عێراق

نەدا، تا ناوەرۆکی ئەو مادە دەستوورییە جێ بە جێ بکات؟ لەجیاتییان پەنایان بۆ چەک برد و بوون بە بەشێک لە دوژمنانی عێراقی نوێ. ئایا سەرکردایەتیی پارتی بە ویست و ئیرادەی خۆیان و، بۆ بەرژەوەندیی کورد پەنایان بۆ چەک برد، یان وەکوو ئاغاکان، بە هاندانی دەوڵەتی ئێران، ئەو ئاگرەیان لە کوردستان کردەوە؟!

عیسا پەژمان، دوای شۆڕشی تەمووز لە سەفارەتخانەی ئێران لە بەغدا بەرپرسی دەزگای جاسووسیی ساواک بوو. دەگێڕێتەوە کە لە ساڵی ١٩٦١ عەبدولرەحمان زەبیحی، بە مام جەلالی ناساندووە. مەسەلەی کۆمەکی ئێران بە گەلی کوردی عێراق، لەنێوان هەردووکیاندا باس کراوە. لێرەوە سەرەتای پێوەندیی نێوان سەرکردایەتیی پارتی و دەزگای ساواک دروست بووە.

عیسا پەژمان پێشنیاری بە بەرپرسی گشتیی ساواک، سەرلەشکر پاکرەوان، کردووە سوود لە ناڕەزایی گەلی کورد لە عێراق وەربگرن و لە دژی حکومەتی عێراق و بۆ بەرژەوەندیی ئێران بەکاری بهێنن. سەرلەشکر پێشنیارەکەی بە شای ئێران گەیاندووە و عیسا پەژمانی ناردۆتە لای شا، تا خۆی ئەو مەسەلەیەی بۆ ڕوون بکاتەوە. پەژمان بە شا دەڵێت:

"ئەگەر مەلا مستەفا و سەرانی پارتی بە بۆچوون و پێشنیازی ئێمە ڕازی بن، سەد لە سەد بە قازانجی ئێمەیە و دەتوانین سوود لەوان ببینین. ئێمە هاوکارییان ناکەین، بەڵکو یەک مامەڵەی ڕووت لەگەڵ ئەوان دەکەین. سەرەتا ئیمکانیاتێکی بچووکیان دەخەینە بەردەست، کارێکیشیان پێ دەسپێرین بۆمان بکەن. تەنیا موافەقەت بفەرموو هەزار تفەنگی برنەو و یەک میلیۆن فیشەک- کە هەڵبەت هەموویان کۆنن بۆ ئێمە کەڵکی بەکارهێنانیان پێوە نەماوە- لەگەڵ

دوو سـەد هەزار تـا سـێ سـەد هەزار تـمەن (دەروبەری سـێزدە هەزار تا بیست هەزار دیناری ئەو کاتە) بدەین بە ئەوان. ئەگەر لە مـاوەی دیـاریکراودا کارەکەیـان بـۆ بە ئەنجـام گەیانـدین، لە هاوکاریکردنیان بەردەوام دەبین، ئەگەر نا کارەکە ڕادەگرین).[1]

شای ئێران پێشنیارەکەی پەسەند کردووە، پێی وتووە نامەیەک لەو بارەیەوە بنووسێت تا ڕەزامەندی بدات. پەژمان دەڵێت:

(دوای ئەوەی شا لەسەر نامەکە نووسی ڕازیم، هەستم کرد من فەرماندەی بزوتنەوەی کوردستانم.)[2]

لێرەوە پێوەندیی نێوان ئێران –ساواک و سەرانی پارتی دەستی پێ کرد و تا ئاشبەتاڵی ١٩٧٥ بەردەوام بوو.

مرۆڤ قەت لە سەرەتایەکی هەڵەوە، بە ئەنجامی دروست ناگات.

ساڵی ١٩٦٤ کێشە لەسەر دەسەڵات، لەنێوان سەرۆکی پارتی و مەکتەبی سیاسی دروست بوو. (لە نیسانی ١٩٦٤ مەکتەبی سیاسی کۆنفرانسـێکی لە مـاوەت بەسـت. بە زۆریـنەی دەنـگ بڕیـار درا هەمـوو دەسـەڵاتێک لە مەلا مسـتەفا بسـەندرێتەوە. مەلا مسـتەفا بڕیـارەکەی ڕەت کـردەوە و وتـی مـن خـۆم حـزبم، هەموویـان دەرکراون.)[3]

تەمـووزی ئەو سـاڵە مەلا مسـتەفای بـارزانی، بە لەشـکرێکەوە پەلاماری بارەگای مەکتەبی سیاسیی پارتی دا، ئەوانیش پەنایان بۆ

---

1- عرفان قانعی فرد، تندباد حوادث، گفت و گو با عیسی پژمان، مامور ویژەی شاه و نمایندەی ساواک در کردستان عراق، چاپ رامین، ئیران ١٣٩٠ل ١١٧

مایەی سەرنجە عەبدولڕەحمان زەبیحی، کە نەیاری ڕێژیمی شای ئێران بوو، بۆتە ئەندازیارێکی دامەزراندنی پێوەندیی نێوان ساواکی ئێران و سەرانی پارتی!

2- عرفان قانع فرد، سەرچاوەی پێشوو، ل١١٨.

3- مام جەلال، دیداری تەمەن، ئامادەکردنی سەلاح ڕەشید، ل٢٩٦ چاپخانەی کارۆ، سلێمانی ٢٠١٧

ئێـران بـرد. ئەمە یەکەم جـار بـوو لە مێـژووی بزاڤـی نەتەوەیـی کورددا، کێشەی سیاسی بە زەبری چەک چارەسەر بکرێت.

دوای لەتبوونی پارتی، عیسا پەژمـان بە مـام جەلال دەڵێت: (شـا بڕیــاری داوە لەگەڵ مەلا مســتەفا پێــک بێــت، مــن خــۆم لە کۆبوونەوەکەدا بەشدار بووم، شا وا بیر ئەکاتەوە کە مەلا مستەفا نەفەرە و ســەرۆکی عەشــیرەتە، ڕێککەوتــن لەگەڵیــدا ئاســانترە لە ڕێککەوتـن لەگەڵ ئەوانەی تـر، ئەمــانە حـزبین، تـۆ ئەمـڕۆ لەگەڵ ئیبرایم ئەحمەد ڕێک ئەکەویت، سبەینێ حزب ئەیەوێ سیاسـەت بگـۆڕێ بڕیارێـک دەرئەکـات و ئەڵـێ ئیبـراهیم ئەحـمەدم لابـرد لە سکرتێر و نووری ئەحمەدی تەهام لە جێگەی دانا.) [1]

لە بەرانبەر ئەوەدا، حکومەتی عێراق بە چەک و پارە، هاوکاریی مەکتەبی سیاسیی پارتی کرد و شـەڕی نێوخۆ هەڵگیرسـا. بزاڤی چەکداری، لەبری ئەوەی بۆ بەدەستهێنانی مـافی نەتەوەیـی کـورد کار بکات، گۆڕدرا بە شەڕی نێوخۆ. یان وەکوو ئامرازێکی دەستی ئێران و عێراق، لە دژی گەلی کورد و بۆ وێرانکردنـی کوردسـتان بەکار هێندرا، بەم کارەش زەمینەی ئاشبەتاڵ ئامادە کرا.

دەوڵەتی ئێران، کە پێشتر شەڕی نێوان عەشیرەتی میراودەلی و مەنگوڕەکـانی هەڵگیرسـاند، ئایـا لە شـەڕی نێـوان سـەرانی پارتیـدا، ڕۆڵێکی هەبووە؟!

بە ڕای مـن دەوڵەتە سەردەسـتەکانی کوردسـتان، زەحـمەتە دوو تفەنگ بدەن بە بزاڤێکی چەکداری، ئەگەر تفەنگێکیـان لە دژی کـورد بەکار نەهێنێت.

---

1- مام جەلال، دیداری تەمەن، ل٣٠١

## ٣
## دنیابینین لە لوولەی تفەنگەوە

لەگەڵ هەڵگیرساندنی شەڕ لە کوردستان، سەرەتای قۆناخێکی خوێناوی دەستی پێ کرد. دۆخی سیاسی، کۆمەڵایەتی، ڕۆشنبیری و ژیان و گوزەرانی خەڵک، گۆڕانیان بەسەردا هات. کوشتن، هێرشی سەربازی، بۆردومان و توندوتیژی پەرەیان گرت و بوون بە بەشێک لە ژیانی ڕۆژانەی خەڵک. لە دوای کودێتای خوێناویی بەعس لە ٨ی شوباتی ساڵی ١٩٦٣ کوشتار و پەلاماری سەربازی بۆ سەر کوردستان زیاتر بوون.

هاوینی ساڵی ١٩٦٣ لە ترسی بۆردومان، چەند مانگ بەشێکی خەڵکی قەڵادزێ ڕوویان لە لادێکانی ناوچەی پشدەر کرد. ئێمە لەگەڵ ماڵی چەند خزم و ناسیاودا، چووینە گوندی سونێ، کە نزیکی شێنێیە. لەوێ لە قەدپاڵێک بە ناوی مەڕانێ کەپرمان دروست کرد، چەند ماڵێکیش تاوڵیان هەڵدا. زۆر ڕۆژ بۆ میوەکڕین، یان بۆ کاتبەسەربردن و ڕاوەتەیر و هەنجیرخواردن، لەگەڵ منداڵانی تر، دەچووینە سونێ و شێنێ و گوندی دی. هاوینەکەمان لەوێ بەسەر برد.

من لە پۆلی یەکەمی ناوەندیی بووم، لە وانەی ماتماتیک (بیرکاری) کەوتبووم. لە بەر ئەوەی ئیدارەی حکومەتی عێراق لە

قەڵادزێ کشابۆوە، نەمتوانی لە خولی دووەمدا ئیمتیحان بدەمەوە، بۆیە ئەو ساڵە لە پۆلی یەکەمی ناوەندیی مامەوە. کاتێک وەرزی خوێندن دەستی پێ کردەوە، قوتابخانە لە قەڵادزێ نەکرایەوە. باوکم بڕیاری دا بۆ خوێند من، لەگەڵ چەند خزمێکدا، بنێرێت بۆ سلێمانی، کە ماڵی کاکە ڕەئووفم لەوێ بوو. بەڵام سەبریەی خوشکم لە قەڵادزێ مایەوە.

لە ترسی فڕۆکەی جەنگی، ئێوارەیەکی درەنگ بە سواری ئێستر بەرەو سلێمانی بەڕێ کەوتین. کاروانچییەکە منی لەسەر پشتی ئێسترێک، کە مافوور و نوێنی هەڵگرتبوو، بەستەوە، بۆ ئەوەی ئەگەر خەوم لێکەوت بەرنەبمەوە. بە درێژایی شەو بەڕێوە بووین. دنیا تاریک بوو، من لە سەرەتای ڕێگادا خەو بردمییەوە، بەڵام هەموو جارێک، کە ئێسترەکە لای جۆگەلەئاوێک بازی دەدا، یان لە شتێک دەپرینگایەوە و دەردەپەڕی، بەخەبەر دەهاتم، وامدەزانی لە هەمان جێگا دێین و دەچین. چونکە بە تاریکی و لەناو ئەو دۆڵ و شاخانەدا، دیمەنەکان لە پێشچاوی خەواڵووم، وەکو یەک دەردەکەوتن.

دەمی بەیانی، تازە هەتاو هەڵاتبوو گەیشتینە بازگەی قەیوان. سەربازەکان ڕایان گرتین، تاوێک بارەکانیان پشکنی، تەماشای شوناسنامەی هەمووانیان کرد و ئیزنیان داین.

لە سلێمانی لە ماڵی کاکە ڕەئووفم بووم، کە لە نەخۆشخانەی سلێمانی کاری دەکرد. لە قوتابخانەی ئامادەیی سلێمانی، لە پۆلی یەکەمی ناوەندی، دەستم بە خوێندن کرد. مامۆستا سامی ئەفەندی بەڕێوەبەری قوتابخانەکە بوو.

لەناو قوتابییەکاندا خۆم بە نامۆ دەبینی، ڕۆژ و هەفتەم دەژماردن، بەو هیوایەی قوتابخانە لە قەڵادزێ بکرێتەوە و

بگەڕێمەوە ماڵ. ئەو ساڵە بۆ من سەخت و ناخۆش بوو، یەکەمجار بوو لە کەسوکار و برادەرانم دوور کەوتبوومەوە. تەنیا و بێتاقەت بووم، برادەرم نەبوو. دواتر برادەرێکی ئازیز و میهرەبانم پەیدا کرد، ئەویش ئەنوەر قادر ڕەشیدی هونەرمەندە، کە تا ئەمڕۆ پێوەندیمان هەر بەردەوامە. تۆ بڵێی لەو کاتەوە، بێ ئەوەی بە خۆمان زانیبێت، شیعر و هونەر پێکەوە کۆی نەکردبینەوە؟

سەرەتای ساڵی (١٩٦٤) ئیدارەی حکومەتی عێراق گەڕایەوە بۆ قەڵادزێ و قوتابخانە کرایەوە، بەڵام چوار مانگی یەکەمی وەرزی خوێندن تێ پەڕی بوو. ماڵی کاکە ڕەئووفم چوونەوە قەڵادزێ، بەڵام منیان نەبردەوە. پورزا و خاڵۆزایەکی دایکم، حاکم بەکر ئیسماعیل و هاوسەرەکەی، خاتوو حەنیفەی حاجی تاهیری کۆیی (دایکی هەڤاڵ)، بە کاکمیان وت با ڕەفیق سەری لێ نەشێوێت، لە قەڵادزێ، بەو نیوساڵەی خوێندن کە ماوە، هیچی تازە فێر نابێت، باشترە لێرە خوێندنی ئەمساڵی تەواو بکات و لە ماڵی ئێمە بێت.

من دەمەویست ڕۆژێک زووتر بچمەوە بۆ قەڵادزێ، بەڵام کاکم ڕازی کردم بمێنمەوە. دەوروبەری شەش مانگ لە ماڵی کاکە بەکر، لە کۆڵانی دووەمی خانووەکانی گەڕەکی عەقاری، ژیام. لەوێ هەستم دەکرد لە ماڵی خۆمانم. پورم، ژنێکی دڵپاک، پڕهەست، خزمدۆست و چاکەخواز بوو، هێندەی دایکم لەگەڵم میهرەبان بوو.

من لە قۆناخی خوێندنی ناوەندی بە کتێب ئاشنا بووم، کە ئەو کاتە بە دەگمەن چاپ دەکران. هەروا بوومە ئەندامی یەکێتیی گشتیی قوتابیانی عێراق، کە سەر بە حزبی شیوعی بوو. لە کۆبوونەوەکاندا، جار جار بەرپرسەکەمان نامیلکەی مارکسییانەی دەهێنا، ناوەرۆکەکەی بۆ باس دەکردین. چەندان لاپەڕەی بۆ دەخوێندینەوە، کە بە زمانێکی سادە نووسرابوون، ڕوون و ڕەوان

کرابــوون بە کــوردی. ئـێمە لەنــاو خۆمانــدا لێـدوانمان لەبــارەی ناوەرۆکی کتێبەکـان دەکرد. هەر پرسـیارێکمان هەبووایە، وەڵامـی ڕاسـت، یـان ناڕاسـتمان لە بەرپرسـەکەمان وەردەگـرت. یەکێک لەو نامیلکانەی لە بیرم مـاوە سـەرکردەیەکی حزبی کۆمۆنیسـتی چین، لیــو شــاو شــی، بە نــاوی (چــۆن دەبــی بە تێکۆشــەرێکی تەواو) نووسـیبووی. کتێبەکە باسـی ڕەفتـار، دیسـپلین و ڕەوشـتبەرزیی مرۆڤی کۆمۆنیست و شۆڕشگێڕی دەکرد. نامیلکەکەی تر لەبارەی ماتریالیزمی مێژوویی بوو، کەبیرمەندێکی ڕووس نووسیبووی. بە زمانێکی سادە قۆناخەکانی گەشەکردنی کۆمەڵی مرۆڤایەتیی دیاری کردبوو، کە لە کۆمۆنی سـەرەتاییەوە دەسـتی پێ کردووە، بەرەو قۆنــاخی کــۆیلایەتی، دەرەبەگــایەتی، دواتــر ســەرمایەداری و سۆشیالیسـتی چـووە. بەرای ئەو نووسـەرە، کە نـاوەکەیم لەبیـر نەمـاوە، ئێسـتا نـۆرەی قۆنـاخی کۆمـۆنیزم هـاتووە، کە دواقۆنـاخی گەشـەکردنی مرۆڤـایەتییە و حزبی کۆمۆنیسـتی سۆڤیەت خەریکە دایــدەمەزرێنێت. لەو قۆنــاخە نــوێیەدا جیــاوازیی چینــایەتی، چەوســاندنەوەی مــرۆڤ لە لایەن مــرۆڤەوە، شــەڕ و ســتەمکاری نامێنن، خەڵک ئارام، ئازاد، خۆشگوزەران و یەکسـان، بە ئاشـتی و برایانە، دەژین.

ئەو جـۆرە نـامیلکە و باسـانە، بـۆ ئەو سـەردەمەی ئـێمە، کە لە قۆناخی خوێندنی ناوەندیی بووین، بە زانیـاریی گرینـگ دادەندران، چـونکە بەرەو ڕامــان و بیرکردنەوەیــان دەبــردین، ورەیــان بەرز دەکردینەوە، هەسـتی هاوسـۆزی، مرۆڤدۆسـتی، بـاوەڕ و پرینسـیپی ئەخلاقییان، پەرە پێ دەدایـن. هەنـدێک جـاریش وێنەی حیکـایەتێکی خۆش و دڵگیر، هزر و خەیاڵیان دەبزوانـدین. من بە خەیـاڵ وێنەی قەڵادزێم دەهێنایە پێش چاو، کە وەکوو بەهەشتی لێ هاتووە. شەڕ،

تـاوان و کوشـتن نەمـاون، هەمـوو کەس ئـارام و خۆشـگوزەران دەژین. نە سەرباز و پۆلیس، نە ئەوانەی بە زەبری چەک کرابوونە ئاغـای نـاوچەکە، دەسـەڵاتیان دەمێنێت. ئەو جـۆرە کتێبـانە هانیـان دەدایـن بەدوای کتێبـی تـردا بگەڕێـین، بـۆ ئەوەی زانیـاریی زیـاتر بەدەست بخەین و درێژە بەو جۆرە خەون و خەیاڵانە بدەین.

مـن و مەحمـوود حـاجی مەحمـوود، کە هـاوڕێی منـداڵیم بـوو، پـێکەوە لە لیژنەیەکـی قوتابیـان بـووین. هەردووکمـان حەزمـان لە شیعر بوو، هەوڵمان دا ئێمەش، بە چاولێکەریی لە شاعیران "شیعر" بنووسین. ئەو سەردەمە دەوترا پێویستە شاعیر نازنـاوی تـایبەتی خۆی هەبێت. ئێمەش کە بریارمان دابوو ببینە شـاعیر، پێش ئەوەی دەسـت بە نووسـینی "شـیعر" بکەیـن، نازناومـان بـۆ خۆمـان دانـا. مەحمـوود نازنـاوی (بێهاوتـا)ی هەڵبـژارد، منـیش نازنـاوی (هیـوا). مەحموود زوو پشتی لە شیعرنووسین کرد، بەڵام لە بواری تـردا، بە ڕاستی بێ هاوتـا بـوو. کەسێکی بە دیسپلین، ڕاستگۆ، بە وەفـا، دڵسـۆز و بە ئاگـا بـوو، بەڵام کەمێـک دڵناسـک بـوو. لەگەڵ خوێندنەکەیدا، بەرگدروویەکی باش بوو، سـەعات و ڕادیۆی چـاک دەکردەوە، دەستی لە کارەبا وەردەدا..

من و مەحمـوود هاوپۆل بووین، لە قۆناخی خوێندنی سـەرەتایی، دوو سـاڵ لە کـاتی پشـووی هاویندا، بـاوکم بردمـی بـۆ لای بـاوکی مەحموود، وەستا حاجی خەیات، بۆ ئەوەی لەوێ وەکـوو شـاگردی خۆبەش، لەگەڵ مەحموود کار بکەم، یـان وەکـوو دایکـم دەیـوت بـۆ ئەوەی ببەسـترێمەوە و لە کـۆڵان نەسـووڕێمەوە. مەحمـوود و مـن پـێکەوە چـووینە بەشـی کـوردی، لە کـۆلێجی ئەدەبیـات لە بەغـدا، ژووریکمـان بەکـرێ گـرت. مەحمـوود، بە پـێچەوانەی مـن، دەیزانـی چێشـت لـێ بنێت. ئەو چێشـتی خۆشـی لـێ دەنـا و منـیش قاپەکـانم

دەشوشتن. زۆر جار تەمبەڵیم دەکرد و قاپەکان تا ڕۆژی دواتر بە پیسی دەمانەوە. مەحموود ئەوەی بەدڵ نەبوو. بۆیە بڕیارمان دا لە ماڵێ چێشت لێ نەنێین. مەحموود لە دوا ساڵی خوێندندا، لەگەڵ ڕۆژنامەی هاوکاری ڕێک کەوت، هەفتانە وتاری لەبارەی دۆخی سیاسیی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بۆ دەنووسین. لەو وتارانەیدا پشتی بە ڕۆشنبیریی سیاسیی خۆی بەست و سوودی لە گۆڤار و ڕۆژنامەی فەلەستینی و عەرەبی وەرگرت. دواتر مەحموود لە قوتابخانەی ئامادەیی قەڵادزێ، بوو بە مامۆستای زمانی کوردی. مەحموود، لە ناوەڕاستی هەشتاکانی سەدەی پێشوو، بە ڕووداوی ئۆتۆمبێل جوانەمەرگ بوو. ئێستا من بوومەتە ٧١ ساڵ، کەچی مەحموودی هاوڕێم هەر ٣٥ ساڵە.

ئەو ڕۆژەی لەگەڵ مەحموود بڕیارمان دا ببینە "شاعیر" شتێکم لەبارەی هونەری شیعر نەدەزانی. بەڵام گوێم بە وەزن و ڕیتمی شیعری کوردی و بەیت و گۆرانیی فۆلکلۆری ڕاهاتبوو، کە ڕۆژانە لە چایخانەکانی قەڵادزێ دەبیستران. هەندێک جار هەوڵم دەدا هەستێک، خەمێک، یان شادییەکی خۆم بە "شیعر" بنووسم، یاخود لاسایی شاعیری تر بکەمەوە. بەو جۆرە کارە دڵخۆش بووم، وامدەزانی شیعرم نووسیوە!

پێش قۆناخی خوێندنی ئامادەیی، بە "شیعر" نامەیەکی دڵداریی دوو لاپەڕەییم نووسی، کە بە وەزنی دە برگەیی ڕێک خرابوو، بەو هیوایەی بیدەم بە کچێک، کە دڵم پێوەی بوو. نامەکە ماوەیەکی زۆر لە گیرفانمدا مایەوە، دەژاکا و پاکنووسم دەکردەوە، چونکە شایەنی ئەوە نەبوو بەو جۆرە بدرێت بە ئازیزا!. قەت نەموێرا ئەو نامەیە بدەم بەو کچەی بۆیم نووسیبوو. چەند جار لە کۆڵان تووشی دەهاتم، دەلەرزیم، قسەم بۆ نەدەهات. دواتر دەستکاریی

نامەکەم کرد و دام بە برادەرێک، کە دڵی بە کچێکەوە بوو، ئەو لە من ئازاتر بوو. نامەکە، وەکوو لە دیدارێکدا وتوومە، بە وێنەی نوشتە و دوعای پیاوچاکان، کاری خۆی کرد.! کاتێک چوومە قۆناخی خوێندنی ئامادەیی، وازم لەو کارە، "سکاڵانووسی عاشقان" هێنا چوونکە پێم وا بوو کارێکی منداڵانەیە.

ساڵانی شەستەکان، پەیداکردنی کتێب ئاسان نەبوو. بە هۆی شەڕەوە، کتێب و گۆڤار زۆر بە دەگمەن و بە کوالێتیی خراپ، بڵاو دەکرانەوە. کتێبی عەرەبی بە ڕێکەوت لە قەڵادزێ دەست دەکەوتن، چونکە ئەو کاتە کتێبخانە و کتێبفرۆشی لە قەڵادزێ نەبوون. دەزگای حکومەتی، یان ئەهلی کتێبیان بڵاو نەدەکردەوە. کەچی سانسۆری چاپەمەنی هەبوو. ئێمە لە دنیای ڕووناکبیری، زانستی و زانیاری دابڕابووین. بزووتنەوەی چەکداری، لەناو قوڕاوی شەڕی نێوخۆدا چەقیبوو. بایەخی بە مەسەلەی ئەدەبی و ڕووناکبیری و بڵاوکردنەوەی کتێب و گۆڤار نەدەدا. هەموو شتێک لە لوولەی تفەنگەوە دەبیندرا. تفەنگیش، کە لە ئێران و عێراقەوە دەنێردران، بەکرێ درابوون و لە شەڕی نێوخۆدا ڕوویان پێ لە یەکتر کرابوو.

شەڕی نێوخۆ توندتر و فراوانتر بوو. لەگەڵ خۆیدا توندوتیژی، کینە و دوژمنایەتیی وەکوو پەتا، بە کۆمەڵی کوردەواریدا، بڵاو کردەوە و تێکەڵاوی ژیانی خەڵکی کرد. لە ڕەوشی بەردەوامبوونیدا کۆمەڵی کوردستان، وەکوو دوو بەرەی پێکناکۆک، لە بەرانبەر یەکتردا سەنگەریان گرت. ئەو شەڕە کولتووری دێرینی شەڕی نێوان خێڵ، بنەماڵە و میرنشینەکانی کوردستانی ژیاندەوە، کە مێژوویەکی ڕەش و دێرینی هەیە. یان دروستتر، ئەو شەڕە نێوخۆییە بەرهەمێکی ڕەسەنی ئەو مێژووە ڕەشەیە.

مێژووی کورد، پێش هەر شتێک، مێژووی شەڕی نێوخۆی نێوان خێڵ، بنەماڵە و میرنشینەکانە، کە بە کۆمەک و هاندانی دەوڵەتی

عوسمانی، یان ئێرانی، وێنەی مورتەزەقە، لەنێو خۆیاندا و لەگەڵ یەکتر شەڕیان کردووە. بەشێک لەو میرە ڕەفتارچەتانە، بە فرمانی سوڵتانی عوسمانی و بۆ چەتەیی و تاڵانی، پەلاماری ئێزیدییەکانیان داوە و هەزارانیان لێ کوشتوون، کچ و ژنیان زەوت کردوون.

مێژوونووسی کورد عەبدولقادری ڕۆستەمی بابان، کە لە سەردەمی میرنشینی ئەردەڵان و باباندا ژیاوە، باسی شەڕی نێوخۆی بنەماڵەی بابان دەکات، کە بەشێکیان لە بەغداوە لەشکری عوسمانییان دوای خۆیان خستووە، تا دەست بەسەر سلێمانیدا بگرن. بەشێکی تریان، بۆ هەمان مەبەست، لەشکری ئێرانییان بۆ سلێمانی هێناوە. ئەم کارە لە سەردەمی برایان سلێمان پاشا و مەحموود پاشادا، گەیشتۆتە لوتکە. مێژوونووس دەنووسێت:

(ئەو جووتە برایە لە ماوەی چوار ساڵدا، یەکیان بە یارمەتیی لەشکری عوسمانی و ئەویتریان بە یارمەتیی لەشکری ئێران، شەش جار بەنۆرە بەسەر وڵاتی باباندا زاڵ بوون و وڵات لە دەستدرێژیی ئەوان تووشی وێرانی و چارە ڕەشی بوو).[1]

سەرانی بزووتنەوەی چەکداری و ڕابەرانی شەڕی نێوخۆ، کە بۆ دەسەڵات چەکیان هەڵگرتبوو، نەک بۆ ئازادکردنی وڵات، ئەو کولتوورەیان زیندوو کردەوە و تەنانەت داهێنانیان تێدا کرد، تەکنیکی شەڕەکەیان پێش خست! تیرۆری سیاسی، ئەشکەنجە، ئەتکردن و دیلکوژییان داهێنا. ساڵی ١٩٦٤ چەتەکانی کانی ماسی، کە کۆمەڵێک چەقۆکێش و چەتەی کاژیک و ئامرازی دەستی پارتی بوون لە سلێمانی، چەندان ئەندام و کادری دیلکراوی حزبی شیوعییان تیرۆر کرد، هەیانبوو، بە زیندوویی نەوتی پێدا کرا و سوتێندرا.

---

1- عبدالقادر ابن ڕستم بابانی، ڕەوشی کوردان، تاریخ وجغرافیای کردستان موسوم به سیر الاکراد، بکوش محمد توکلی، چاپخانە ارژنگ ١٣٦٦. ئەم کتێبە لە لایەن مامۆستا کەریم حیسامی بە ناوی ڕەوشی کوردان کراوە بە کوردی.

بە هـۆی شـەڕی نێوخـۆ، تەواوی وزەی گەلـی کـورد لە عێراق، بەفیـــڕۆ درا. هەزاران پێشـــمەرگە و ئـــازادیخواز، کە بە ئـــاواتی کوردستانێکی ئازاد چەکیان هەڵگرت، لە شـەڕی نێوخۆدا بەکوشت دران. بزاڤـی چەکـداری شـێوێندرا و بـۆ وێرانکردنـی کـۆمەڵی کوردستان، بەکار هێندرایەوە. بەو کارەش گەلی کورد زەبوون و بێ هیوا کرا و سەرەتای کوشتنی هیوا و وڵات دەستی پێ کرد.

تۆماس هۆبێس ١٥٨٨-١٦٧٩پێیوایە شەڕی نێوخۆ لەچاو شـەڕی دەرەکـی، کـاریگەریی قـووڵتر بە جـێ دەهێڵێـت، درەنگتـریش شـوێنەوارەکانی دەسـڕدرێنەوە. خەڵـکە بەشـەڕهاتووەکە بەردەوام ئاگاداری کار و ژیـانی یەکترن. بەڵام ئەگەر دوژمنـایەتییەکە لەگەڵ کەسانێک بێت، کە لە شوێنی تر دەژین، ئەوا کەمتر یەکتریـان بیر دەکەوێتەوە، ئاسانتریش شەڕەکەیان لەبیر دەچێتەوە.

ئەمریکـا لە شـەڕی دووەمـی جیهـانی، لەگەڵ ژاپـۆن و ئەڵمانیـا بەشەڕ هات، بەڵام زۆر زوو لەگەڵیان ئاشت بۆوە، کەچی شـەڕی نێوخـۆی ئەمریکـا ١٨٦١-١٨٦٥ هێشـتا شـوێنەواری مـاوە. خەڵکی ویلایەتەکانی باشووری ئەمریکا، کە شـەڕی نێوخـۆی تێدا بـوو، تـا ئێستا حەساسییەتیان بەرانبەر بە ویلایەتەکانی باکوور هەیە.

ئەوا شەسـت سـاڵە شـەڕی نێوخـۆ کـۆمەڵی کوردسـتانی لەت، پەرپـووت و بێهیـوا کـردووە. لە سـایەی سـەرانی شـەڕی نێوخـۆ و "قارەمانـــان"ی دیلکوژیـــدا، هێشـــتا ئەو شـــەڕە، زەمیـــنەی سـەرهەڵدانەوەی ئامـادەیە و دەڵێـی دوێنـێ دەسـتی پـێ کـردووە. ئەمەش دەیسـەلمێنێت کە تـا ئێسـتا کـۆمەڵی شکسـتخواردووی کوردسـتان و کولتـوورەکەی، نەگەیشـتوونەتە ئەو ئاسـتەی بتـوانن خۆیـان لە پیسـایی کولتـووری شـەڕی نێوخـۆ و بەرپرسـانی ئەو شەڕە، پاک بکەنەوە.

## ٤

## ئەشکەنجەدان لە ڕۆژی تاقیکردنەوەی بەکەلۆریادا

پـایزی ١٩٦٦ لە بەشـی ئەدەبـی دەسـتم بە خوێنـدنی قۆنـاخی ئامـادەیی کـرد، کە ئەو کـاتە دوو سـاڵ بـوو. دەرسـەکانمان گـران بـوون، چـونکە مامۆسـتای پێویسـت، پسـپۆڕ و بەئەزموونمـان کەم بـوون. تـا ئەو کـاتە هـیچ کەسـێکی خەڵکـی قەڵادزێ نەبووبـوو بە مامۆسـتای ئامـادەیی. بەشـێکی مامۆسـتاکان تـازە دامەزرابـوون و ئەزموونی مامۆستاییان نەبوو، یەکەم جـار لە قەڵادزێ دەسـتیان بە وانەوتنەوە کردبوو. یان هەندێک جار مامۆسـتای سـەرەتایی، کە بە باشی شارەزای بابەتەکە نەبوو، دەرسـی پـێ دەوتـین، بۆیە دەبـوو زۆر خۆمـان مانـدوو بکەیـن. لە دوای پۆلی شەشـەمی سـەرەتایی، خوێنـدن بە زمـانی عەرەبـی بـوو. لە تـاقیکردنەوەی بەکەلۆریـای ئامادەییـدا، دەبـوو لەگەڵ قوتابیـانی ئامـادەیی بەغـدا، موسـڵ و ناوچەکـانی تـر، کە بە زمـانی خۆیـان دەیانخوێنـد و باشـترین مامۆسـتایان هەبـوو، کێبڕکـێ بکەیـن. وەڵامـی ئەو پرسـیارانە بـدەینەوە، کە بـۆ هەمـوو قوتابیـانی دواسـاڵی خوێنـدنی ئامـادەیی، بەشی ئەدەبی، لە عێراق، دادەندران.

سـەرەتای حـوزەیران (جـونی)ی ١٩٦٨ چـاوەڕێی تـاقیکردنەوەی بەکەلۆریـا بـووین. دەسـەڵاتی حکـومەت لە قەڵادزێ لاواز بـوو.

بەڕێوەبەرایەتیی پەروەردە دەترسا پرسیارەکان، کە سەرانسەری بوون، ئاشکرا بکرێن و بفرۆشرێن، بۆیە بڕیار درا هەموومان، کە وەکوو لەبیرم بێت دوازدە قوتابیی کوڕ و دوو قوتابیی کچ بووین، بۆ تاقیکردنەوە بچینە سلێمانی. لەوێ باڵی مەکتەبی سیاسیی پارتی (جەلالییەکان) دەسەڵاتدار بوون.

شوێنی تاقیکردنەوە لە قوتابخانەی ئامادەیی کچان، لە خوار فولکەی خانەقای مەولانا خالید بوو. ڕۆژی یەکەمی تاقیکردنەوە، جەلالییەکان لە ئازاد حەمەسوور بابانیان دا، کە چالاکوانی یەکێتیی قوتابیانی پارتی بوو. ئەو ڕۆژە زانیم نۆرەی منیش دێت. ڕۆژی دووەم، لە کاتی وەڵامدانەوەی پرسیارەکاندا، شڵەژاو و بیرپەرتێن بووم. لە هۆڵی تاقیکردنەوە چوومە دەرێ، هاوپۆلانم پێش من ڕۆیشتبوون. بە تەنیا بەرەو ناوشار چووم، کە ئەو کاتە تا لای فولکەکە چۆڵایی بوو. بیست مەترێک لە قوتابخانەکە دوور کەوتمەوە، چوار کەس، کە سەر بە باڵی مەکتەبی سیاسی بوون، دەوریان گرتم. لەناو هەموویاندا تەنیا شێرکۆی شێخ عەلیم ناسی. دوای چەند قسە و پرسیار، دەستیان بە جنێودان و هەڕەشەی کوشتن کرد و ڕایانکێشامە ناو کەندڕێک، کە لە قەراخی جادەکە بوو. تا شەکەت بوون ئەشکەنجەیان دام. لە چەند لاوە بە بۆکس و دەسکەدەمانچە، سەر و ڕوخساریان خوێناوی کردم. دوای ئەوە، وڕ و نیوەبێهۆش، بەجێیان هێشتم. لە کاتی ڕۆیشتنیاندا بانگی شادمان ناوێکیان کرد، تا وازم لێ بهێنێت و بڕۆن. دواتر زانیم ئەو کوڕە خزمی شێرکۆ و برای عارف تەیفور بوو.

هەڵبژاردنی ئەو کات و شوێنە بەو مەبەستە بوو، کە وێرای ئەشکەنجەدانم، نەهێڵن سەرکەوتووانە تاقیکردنەوەکە تەواو بکەم. ئەگەر ئەو ساڵە دەرنەچووبام، دەبوو دوو ساڵی تر درێژە بە

خوێندنی ئامادەیی بدەم، چونکە دوای ئەوە خوێندنی ناوەندی و ئامادەیی لە پێنج ساڵەوە کرا بە شەش ساڵ.

کاتێک هێز و توانام هاتەوە بەر، بە کەندرەکەدا هەڵگەڕام و چوومە سەرجادەکە. دوای تاوێک عارەبانەیەکی دوو ئەسپی، کە ئەو کاتە لە سلێمانی زۆر بوون، بەوێدا هات. سواری عارەبانەکە بووم و بردمییەوە بۆ ماڵی حاکم بەکر ئیسماعیل و خاتوو حەنیفەی حاجی تاهیر (دایکی هەڤاڵ)، کە لە تەنیشت یانەی فەرمانبەران بوو. ئێستا خانووەکە کراوەتە یانەی ڕۆشنبیریی زانکۆی سلێمانی. کاتێک دایکی هەڤاڵ، کە بە پووریێ ناوم دەبرد و بەڕاستیش پوور و شاژن بوو، بەو حاڵەوە بینیمی، حەپەساو و پەشۆکا لێی پرسیم:

ئەوە بۆ ئاوات لێ هاتووە؟

وتم: لە لای هۆڵی تاقیکردنەوە، جەلالییەکان لێیان دام.

دوای تاوێک برینپێچێکی ناسیاویان هات، برینەکانی بۆ دەرمان کردم، پلاستەری لێ دان و لەفافی لە چەند برینێک پێچا. دواتر کاکە بەکر، کە حاکمی تەحقیقاتی سلێمانی بوو، هاتەوە و بەو جۆرە منی بینی زۆر تێک چوو، بەڵام هیچی نەوت. ئەوە بێڕێزییەک بوو بە ئەویش کرابوو. چونکە من لە ماڵی ئەوان میوان بووم، کەچی بەرپرسی باڵی مەکتەبی سیاسی لە سلێمانی، کاک محەمەدی حاجی تاهیر، برای دایکی هەڤاڵ و خاڵۆزای دایکم و حاکم بەکرە، هاوسەرەکەی (براژنە نەسرین) کە کچی نووسەر زەکی هەناربیە، خوشکەزای حاکم بەکر و پوورزای دایکمە، کەچی کاک محەمەد ڕێگای داوە بە جۆرە، لە دەمی تاقیکردنەوەی بەکەلۆریادا، ئەشکەنجەم بدەن. دوای ئەو ڕووداوە پێوەندیی نێوان حاکم بەکر و کاک محەمەد درزی گەورەی تێکەوت.

حــاکم بەکــر کەســایەتییەکی بەڕێــز، بە شەخســییەت و لە دامەزرێنەرانی پارتی بوو. برای مامۆستا سابیر ئیسماعیل بوو، کە کەسایەتییەکی دیاری کۆیە بوو. کاکە بەکر لەمێژ بوو دەستی لە کاری حزبـایەتیی بەردابـوو، بەڵام لە کـۆنەوە بـرادەری مامۆسـتا برایم ئەحـمەد و مـام جەلال بـوو. بـۆیە پارتییەکـان وایـان دەزانـی لەگەڵ جەلالییەکــانە، کە وا نەبــوو. دوای ١١ی ئــازار، بە داوای پـارتی، گـوێزرایەوە بـۆ شـاری حلـله (بابـل). ئەو کـاتەی لە بەغـدا بـووم، بەردەوام سـەردانم دەکـردن. دواتـر سـاڵی ١٩٧٧ لەوێـوە گوێزرایەوە بۆ هەولێر.

دوای ئەو لێدانە، ڕۆژانە شـۆفێرەکەی کـاکە بەکـر، کە کـوڕێکی قەڵادزەیی بوو ناوی حوسێن باوزێ بوو، لەگەڵ پۆلیسێک (کاک تالیب)، کە لە ماڵەکەیان هاوکاریی دەکردن، بە ئۆتۆمبێل دەیانبردم بـۆ هـۆڵی تـاقیکردنەوە و دەیانهێنـامەوە مـاڵ. کـاک تالیـب خەڵکـی گوندی زێوەی نزیک سلێمانی بوو، دوای هەڵگیرسانەوەی شـەڕ لە بەهاری ١٩٧٤ ڕووی لە شاخ کرد و لە پیرەمەگروون شەهید کرا.

بە هـۆی ئەو دەسـتدرێژییەی کـرایە سـەرم، لە وانەیەک کەوتـم، هەروا ئەو نمرانەم نەهێنان، کە شایستەیان بووم.

شـێرکۆی شـێخ عەلـی، سـاڵێک یـان زیـاتر لە قەڵادزێ ژیـا، لە قوتابخـانە پـێکەوە دەمانخوێنـد. مـن لە ڕیـزی یەکێتیـی گشـتیی قوتابیـانی عێـراق، چـالاک بـووم. ئەو لایەنگـری بـاڵی مەکتەبـی سیاسـیی بـوو، کە ئەو کـاتە بارەگایـان لە قەڵادزێ هەبـوو. زۆر توندوتیژانە لەگەڵ خەڵک دەجوولانەوە، لەخۆڕا خەڵکیان دەگرت و ئەشکەنجەیان دەدان. خەڵک لێیان بیزار بوون، بۆیە زۆر نەمانەوە چوونە سلێمانی. شێرکۆ پێش ڕێککەوتنی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ لای جەلالییەکان هەڵات و چوو بۆ لای مەلاییەکان.

سـاڵێک دواتـر، لە نـۆڤەمبەری ١٩٦٩ لە سـلیمانی میـوانی مـاڵی حاکم بەکر بووم. بێ ئەوەی هیچ توومەت و تاوانێکم بدرێتە پاڵ، لە لایەن بـاڵی مەکتەبـی سیاسـییەوە گیـرام. دوو مانـگ زیـاتر لە بارەگاکەیان لە گەڕەکی کانێسکان، لە سلێمانی، لە زینداندا مامەوە. سـەرەتا چەنـد ڕۆژێـک بە تەنیـا لە ژوورێکـی بچووکدا بەنـد کـرام، کەس بەلامـدا نەهـات. ئەو کـاتە گەرمەی خۆئامـادەکردن بـوو بـۆ هەڵبژاردنـی ڕێکخراوەکـانی قوتابیـان لە سـلێمانی. جەلالییەکـان دەیانزانی هەڵبژاردنەکە نابەنەوە، بۆیە فشاری زۆریان بۆ قوتابیـان هێنـابوو. ڕۆژێـک کـوڕێکی گەنجـی بـاڵابەرز، کە لە مـن بەتەمەنتـر بـوو، هێنـدرایە ژوورەکە. وتـی نـاوی عـارف تەیفـورە، لە زانکـۆی بەغدا، دەخوێنێ و بەسەردان هاتۆتەوە بۆ سلێمانی. منیش خۆم پێ ناساند. عارف تەیفور، کە ئێستا ئەندامی مەکتەبی سیاسیی پارتییە، چەنـــد ڕۆژێـــک لە زینـــدان مـــایەوە، نە ئەشـــکەنجەیان دا و نە سـووکایەتییان پـێ کـرد، زوو ئـازاد کـرا. منـیش گـوێزرامەوە بـۆ ژوورێکـی گەورە. بەردەوام دانیشـتوانی ئەو ژووره دەگـۆڕدران، چەند کەس ئازاد دەکران، یان دەنێردران بۆ بەکرەجۆ، کە زیندانی سەرەکی لەوێ بوو، لە جێی ئەوان کەسانی تر دەهێندران.

هەندێک جار لە پەنجەرەوە دەمانبینی، لە حەوشـە ئەشکەنجەی کەسـێکیان دەدا. شـەوێکی مـانگی دێسـەمبەر (کـانوونی یەکەم) گەنجێکـی کـورتیلەی ڕەشـتاڵەیان ڕووت کردبـۆوە، بەو سـەرما و بەسـتەڵەکە بە سـەتڵ ئـاوی سـاردیان پێدا دەکـرد و دارکارییـان دەکـرد، کـوڕەکە سـوێندی دەخـوارد کە ئەو نەیکوشـتووە، کەچـی ئەوان زیـاتر ئەشـکەنجەیان دەدا، ئەویـش هەمـان قسـەی دووبـارە دەکـردەوە و دەپـاڕایەوە کە لێـی نەدەن. زینـدانییەک وتـی: ئەمە یوسـفە لـچەیە گرتوویـانە، دەبـێ کێـی کوشـتبێت! دواتـر بیسـتم کە

یوسـفه لـچه به تـومەتی تیرۆرکردنـی سـەرکردەیەکی حزبـی دیموکراتی کوردستانی ئێران، قادر شەریف، گیرابوو.

مانگێـک زیـاتر بـوو لە زینـدانـدا بـووم. ڕۆژێـک گـوێم لە دەنگـی ژنێک بوو که به تووڕەییەوە وتی: نا، دەمەوێ محەمەد ببینم، بزانم بۆ کوڕی منی گرتووە؟ یەکسەر دەنگەکەم ناسییەوە، دەنگی دایکم بوو، کە داوای دەکرد خـاڵۆزاکەی، مـحەمەدی حـاجی تـاهیر، ببینێت. دوای تاوێک بەدوامدا هاتن، دایکم لەگەڵ خوشکم لە هۆڵەکە لەسەر کورسـی دانیشـتبوون، دایـکـم لاقێکی لە گەچ گیرابـوو، بە دارشـەقە ڕێی دەکرد. من نەمزانیبوو لاقی شکاوە، وتی:

لە ڕێگـای سـەرقەبران تراکتـۆر لێـی دام، ڕەسـووڵی حـاجی عەبدوڵلای نوورەدینی، لە هەورازەکەی قەڵادزێ تراکتۆرەکەی پێ سەرنەخرا، پاشەوپاش گەڕایەوە و لەدواوە لە منی دا. خوا ڕوحمـی کرد پانی نەکردمەوە.

زۆرم پێ سەیر بوو حاجی عەبدوڵلای بـاوکی ڕەسـووڵ، ڕێگەی دابوو کوڕەکەی، کە سێ ساڵێک لە مـن گەنجتر بـوو، تراکتۆر لـێ بخوڕێ. پێشتر کوڕەگەورەکەی، محەمەد، کە هـاوپۆلی مـن بـوو، لە تەمەنـی ١٤ یـان پـازدە سـاڵی، بە تراکتـۆر زەوی کێڵابـوو، تراکتۆرەکە وەرگەڕابوو، محەمەد جوانەمەرگ بووبوو. ئەو کـوڕەی تـری، ڕەسـووڵ، خۆشـبەختانە لە مـردن گەڕابـۆوە، بەڵام دایکـم باجەکەی دابوو.

ئەرستۆ تـالیس دەڵێت، مرۆڤ کاتێک کـارێکی خراپ دەکـات، لە بەر ئەوە نییە کە نازانێت کـارەکە خـراپە، بەڵکـو دەزانێت، کەچـی دەیکات.

بە جوانەمەرگبـوونی مـحەمەد، مـن و هـاوپۆلانم خەمبـار بـووین، چـونکە کـورێکی زۆر بە ئەدەب، هـێمن و بێـوەی بـوو. دوای

قوتابخانە، هەمیشە گوێڕایەڵ، لە دوکانی باوکی دادەنیشت. هەندێک ڕۆژ بەلای دوکانەکەیانــدا دەڕۆیشــتین، ئەگەر بە تەنیــا بــووایە، فەرمووی خورماخواردنی لێ دەکردین. ئەگەر باوکیشی لە دوکان بــووایە، چــاوی لــێ دادەگــرتین، دەچــووین لە کــۆڵانی تەنیشــت دوکانەکەیــان، چاوەڕێمــان دەکــرد. دوای تاوێــک مــحەمەد دەهــات، هەندێک خۆرمای بۆ دەهێناین و ماوەیەک پێکەوە قسەمان دەکرد.

نیــو ســەعاتێک لەگەڵ دایکــم و ســەبریەی خوشــکم دانیشــتم، لە هەواڵی خزمــان و برادەران ئاگاداریــان کــردم. دایکم باوەشی پێدا کــردم، مــاچی کــردم و لەگەڵ خوشــکم ڕۆیشــتن. پــاش ڕۆیشــتنیان بێتــاقەت و خەمبــار بــووم، پــێم خــۆش نەبــوو دایکــم بەو لاقە شــکاوەوە، بــۆ ســەردانم هــاتبوو بــۆ ســلێمانی. چاوەڕێم نەدەکــرد، دوای چەند مانگ دووریی، دایکم لە زینداندا بمبینێتەوە. قەت دایکم هێندە بێهێز و خەمبــار نەدیبوو، بۆ یەکەمجار هەستم کرد ڕەنگی پیریی لێ نیشتووە.

مانگێــک دوای ســـەردانی دایکــم، لە کۆتــایی کــانوونی دووەم (جەنیوەری)ی ١٩٧٠ خاڵە حەمیدم و حاجی حەمە سەعید سەوز، کە پــێکەوە بازرگانییــان دەکــرد، هــاتنە بارەگــاکە، بــۆ ئەوەی بە کەفالەت ئازادم بکەن. بە خاڵە حەمیدم وت:

خاڵە کەفالەتی چیم دەکەن! خۆ پێیان نەوتووم بۆچی گیراوم و چ تاوانێکم کردووە، نامەوێت کەس کەفالەتم بکات.

خاڵە حەمیدم وتی:

وەختی ئەو قسانە نییە، بڕۆ کەلوپەلەکەت بێنە با بڕۆین.

کاکە مــحەمەدی حاجی تــاهیر کەسێکی دەستپاک، دڵسۆز و بە پرینسیپ بوو. بەشی زۆری سامانی حاجی تــایەری بۆ کوردایەتی و حــزبەکەی خەرج کــرد. بەڵام کەمێــک تونــدڕەوانە و دەروێشــانە

حزبایەتیی دەکرد، خزمایەتی و دۆستایەتیی لە بەرچاو نەدەگرت. دوای ڕێککەوتنی ١١ی ئادار، وازی لە کاری سیاسی هێنا و لە بەغدا نیشتەجێ بوو. منیش لەگەڵی ئاشت بوومەوە.

هاوینی ١٩٧٩ لە پێشمەرگایەتیدا، لەگەڵ سێ هاوڕێی پێشمەرگە لە مهاباد دەگەڕاینەوە بۆ خەڕی ناوزەنگ. لە شارۆچکەی سەردەشت دەرچووین و بەرەو بێوران بەڕێ کەوتین. لە دووری پازدە بیست مەتر، چوار پێنج پێشمەرگەم بینی، کە بەرەو لای ئێمە دەهاتن، یەکێکیان شێرکۆی شێخ عەلی بوو، کە پێشمەرگەی حزبی سۆسیالیست بوو، ئەویش منی بینی. بە بیرمدا هات سڵاوی لێ بکەم، ئەوەی چوو تازە ناگەڕێتەوە. ئەوەتا هەردووکمان، بە هۆی ستەمی دەسەڵاتی بەعس، بەرەوڕووی یەک چارەنووس بووینەتەوە. بەڵام خێرا پەشیمان بوومەوە. بە خۆمم وت ئەو کەسێکی ڕۆحزلە، لەگەڵ چەند کەسی تر منی ئەشکەنجە داوە. ئەگەر سڵاوی لێ بکەم ڕەنگە وا بزانێت لە ترسان، یان لە لاوازییەوە، ئەو کارە دەکەم. بڕیارم دا ئەگەر ئەو سڵاوی کرد، بە گەرمی وەڵامی بدەمەوە، ڕاوەستم و دۆستانە تاوێک قسەی لەگەڵ بکەم. کاتێک لێک نزیک بووینەوە، بۆ یەکترمان ڕوانی، بێدەنگانە بەلای یەکدا ڕەتبووین. دوو ساڵێک دواتر هەواڵی شەهیدکردنی شێرکۆم بیست، کە جەمالی عەلی باپیر بە غەدر و شێوازێکی ناجوامێرانە کوشتی و خۆیشی تێدا چوو. لە دڵەوە پێم ناخۆش بوو ئەو تاوانە گەورەیە بەرانبەر بە شێرکۆ شێخ عەلی کرا. کاتێک سەرکردایەتیی حزبی شیوعی بڕیاری دا بۆ پرسە سەردانی حزبی سۆشیالیست بکەن، من بە مەبەست ویستم بەشدار بم. لەگەڵ فاتیح ڕەسووڵ، بە نوێنەرایەتیی حزب، چووینە لای حزبی سۆشیالیست، لەوێ چاومان بە تاهیری عەلی والی و عەبدولخالق

زەنگەنە کەوت، پرسە و هاوخەمی خۆمان و حزبی شیوعیمان، بە ئەوان و لە ڕێی ئەوانیشەوە، بە بنەماڵەی بەڕێزی شەهید شێرکۆ شێخ عەلی گەیاند.

ئەو ڕۆژانەی ئەشکەنجە درام، چەند هەفتەم مابوو ببم بە هەژدە ساڵ. چالاکوانی یەکێتیی گشتیی قوتابیانی عێراق بووم لە قەڵادزێ، هیچ بەرپرسیارییەکی سیاسیم نەبوو. تاوانێکم نەکردبوو، تا هێندە زاڵمانە و لە ڕۆژی دووەمی گرنگترین تاقیکردنەوەدا، کە تەواوی چارەنووسی قوتابیی پێوە بەندە، پەلامار بدرێم، ساڵی دواتریش بەند بکرێم. ئەو ئەشکەنجەدان و بەندکردنە، پلانی خوێندن و داهاتووی منیان شێواند. بە داخەوە ئەو ڕۆژانە، شەڕ، تیرۆر، کینەی سیاسی، قبووڵنەکردنی یەکتر و خولیای تۆڵەستاندنەوە، بەرچاوی زۆرینەی خەڵکیان لێڵ کردبوو. تیرۆر، چەتەیی و هەموو جۆرە تاوانێک، بە ناوی "شۆڕش" و کوردایەتییەوە، حەڵاڵ کرابوون.

ژیان لەسایەی شەڕدا، ئەشکەنجەدان و زیندانیکردن، سەخت و بە ئازار بوون، بەڵام توانیم بەرگە بگرم، درێژە بە خوێندن بدەم، بە ورەی بەرز و بە هیوای نوێوە چاو ببڕمە داهاتوو.

نووسەری فرەنسی ئالفۆنس دێ شاتۆبریا (١٨٧٧-١٩٥١) دەڵێ:

لە ناخۆشی و سەختی هێزم وەرگرت، ئەگەر بەختەوەری لە ئامێزی بگرتمایە خنکابووم.

## ١
## گەڕان بەدوای ڕێگایەکدا

لە ساڵانی شەستەکانی سەدەی پێشوو تا ئاداری ١٩٧٠ کوردستانی عێراق گیرۆدەی شەڕ بوو. تیرۆر و بێهیوایی وێنەی تارماییەکی ڕەش و ترسناک، دەسووڕانەوە، چارەنووسی هەر کەس و هەمووان نادیار بوو.

ئەو دەمەی ژیان دەکەوێتە بەر هەڕەشە و خەریکە مانا و بایەخی خۆی لە دەست بدات، مرۆڤ بیر لە خۆپاراستن و دەربازبوون دەکاتەوە. هەڵاتنی فیزیکی یان ڕۆحی، دەتوانێت ڕێگاچارەیەک بێت. هەندێک جار بیرکردنەوە و ئەزموون، یان خێزان، هاوڕێ و کەسانی دەوروبەر، یارمەتیی مرۆڤ دەدەن دەرباز ببێت. یاخود غەریزەی مانەوە و درێژەدان بە ژیان، لەتەنگانەدا مرۆڤ بەرەو ڕێگایەک دەبات. بەڵام کام ڕێگا؟ ڕێگا هەیە هەڵدێرە، یان تەماوییە ونت دەکات، ڕێگاش هەیە بە ئازادی و ئامانجی خۆت دەگەیەنێت.

کاتێک وڵات دەکرێتە زیندانێکی گەورە و وڵاتکوژان دەبنە پاسەوانی، ژیان و مردن جیاوازیی ئەوتۆیان لەنێواندا نامێنێت. زۆر کەس بەو ئەنجامە دەگەن، کە پشتکردنە وڵات و سەرهەڵگرتن بەرەو هەر شوێنێک بێت، هەنگاوێکە بەرەو ژیان و ئازادی. مرۆڤ

بە هیوای دۆزینەوەی پەناگەیەکی ئارام، ئامادەیە هەر ڕێگایەک، چەند ناڕوون و تەماوی، یان ترسناک و مەرگهێنەر بێت، تاقی بکاتەوە. ساڵانە سەدان هەزار کەس، لەبەر ستەم، فەسادی و تیرۆری دەسەڵات، یان لەبەر بێکاری، بێهیوایی و نەداری، بەدەم نەفرەتەوە وڵاتەکانیان جێ دەهێڵن. دەیانیان لە دەریادا دەخنکێن، یان لەسەر سنووری وڵاتان، مینیان پێدا دەتەقێتەوە، یاخود لەسەرمان ڕەق دەبنەوە. کەچی هەزارانی تر، هەمان ڕێگا تاقی دەکەنەوە. دیارە هەر کەس دڵی بە ژیان خۆشە و دەخوازێت بژی. دەوترێت هەموو کەس بەهەشتی دەوێت، بەڵام کەس نایەوێت بمرێت. کەسێک کە لە ناچاریدا ڕێگای مردن دەگرێت، دەزانێت زۆری تر لەو ڕێگایەدا مردوون، کەچی باکی نییە و تاقیی دەکاتەوە. ڕەنگە لە بەر ئەوە بێت کە ئەو کەسە پێی وایە ژیانی جۆرە مردنێکە، یان بەلای زۆرەوە لەو باوەڕەدایە کە ئەو، بە بێ گرفت دەرباز دەبێت.

مرۆڤ توانایەکی سەیری خۆهەڵخەڵەتاندنی هەیە. بە غەریزە ژیانپەروەرە، هەمیشە چاوی لە چاکەیە، چاوەڕێی شتی باش بۆ خۆی و خێزانی دەکات. لە کاتی ترسناکی لەو جۆرەدا، ئەگەر لای ڕوون بێت کە هەندێک لە هاوسەفەرانی لە دەریادا دەخنکێن، ئەو خۆی نابینێت، پێی وایە ئەو دەرباز دەبێت و بە ئامانجی خۆی دەگات. کەچی هەر ئەو کەسە دەشێت لەگەڵ سەدان هەزار کەسی تر بیتاقەیەکی یانسیب (لۆتۆ) بکڕێت، بەو هیوایەی بیتاقەکە بۆ ئەو دەربچێت!.

لە کاتی گەڕان بەدوای ڕێگایەکدا، ئەوەی گرینگە یەکەم هەنگاوە، کە دەشێت چارەنووسی کەسەکە دیاری بکات.

لەو دۆخە سەختەی ئەو کاتەی قەڵادزێ و کوردستاندا، یەکەم

هەنگاوی من بەرەو کتێب بوو. لەبەر بێزاربوون لە شەڕ، کوشتن و تاوان، نامۆبوون بە دەوروبەر و کۆمەڵ، بەدوای دنیایەکی جیاوازدا دەگەڕام، کە ئارامی و ئاسوودەییم پێ بدات. نەمدەتوانی خۆم لەگەڵ دەوروبەر و کۆمەڵ بگونجێنم، لەوەش لاوازتر بووم کە بەرەنگاریان ببمەوە. نامۆیانە هەوڵم دەدا بە خەیاڵ لێیان ڕابکەم و پەناگەیەک بدۆزمەوە. بۆیە هانام بۆ دنیای کتێب و ئەدەبیات و دواتریش بۆ خەیاڵ و نووسین برد.

خوێندنەوەی کتێب، بە تایبەت شیعر و ئەدەبیات، دنیایەکی نوێی پڕ لە فانتازیا، خەون، چاوەڕوانی و هیوایان پێشان دەدام. ئارامی و سێبوورییان بۆ دەهێنام. تاوێک لە ترس، دڵەڕاوکێ و کەشوهەوای شەڕ، ترسی فڕۆکەی جەنگی، دووریان دەخستمەوە. شیعر و ئەدەبیات، ئەو شتە بایەخدارانە بوون کە بیر و خەیاڵیان دەجولاندم، جوانیی ژیان، ئاسوودەیی و هیوام تێدا دەبینین.

لە قۆناخی خوێندنی ناوەندی و سەرەتای ئامادەیی، چەند کتێبی ئەدەبیم خوێندەوە، لەوانە دیوانی وەفایی، کە زۆرم بەدڵ بوو، چەند شیعری دیوانەکەم لەبەر کردبوون. سودی زۆرم لە کتێبی مێژووی ئەدەبی کوردی، مامۆستا عەلادین سەجادی وەرگرت. کتێبەکە زانیاریی لەبارەی مێژووی ئەدەبی کوردی، ژیان و شیعری چەند شاعیری کلاسیکی کورد، بە خۆ گرتووە. هەروا چەند نامیلکەی شیعریی سالح دیلان، کامەران و ئەحمەد دڵزارم خوێندنەوە، کە بەشێکیان شیعری سیاسی بوون.

ئەو سەردەمە لە قەلادزێ کتێبخانەی گشتی و کتێبفرۆشی نەبوون، بەڵام کتێب بۆ خوێندنەوە دەست دەکەوت. ئەو کتێب و نامیلکانەی لێرە و لەوێ دەستم دەکەوتن، سەرنجیان ڕادەکێشام، زانیاری نوێ و بەسوودیان پێ دەدام. بەڵام کتێبەکان کەمبوون. لە

ناکاو بەسەر گەنجینەیەکی کتێبدا کەوتم. لە دیمانەیەکدا باسی خاڵۆزایەکم، جەمال حسێن حاجی مەحموود، کردووە، کە کتێبی زۆری هەبوو. لە ترسی پشکنینی سەبازی، هەموویانی لە ماڵی ناسیاوێکی خۆیان، لە گوندی هورێوەی ناوچەی پشدەر، شاردبۆوە، چونکە خاڵە حوسێنم شیوعی بوو. پاش کودێتای حزبی بەعس، لە ساڵی ١٩٦٣ کۆمەڵێک سەرکردەی سیاسی و ئەفسەری ناسراوی عێراقی، ڕوویان لە قەڵادزێ کرد، لەوانە عەزیز محەمەد، عومەر عەلی شێخ، کەریم ئەحمەد، سەلیم فەخری، سەعید مەتەر، عەقید غەزبان سەعد، هونەرمەندی ناسراوی عێراقی زەینەب (نێرگز) و چەندانی تر. بەشێکیان ماوەی چەند هەفتە و مانگ لەماڵی خاڵە حوسێنم مانەوە.

کاکە جەمال، کە پێنج ساڵ لە من گەورەتر بوو، کاتێک زانی هۆگری خوێندنەوە و عەوداڵی کتێبم، هەموو کتێب و گۆڤارەکانی، بە من بەخشی. بەڵام دەبوو خۆم بچم لە گوندی هورێوە، کە نزیکەی سێ سەعات لە قەڵادزێ دوورە، بیان هێنمەوە. بەو جۆرە من لە شازدە ساڵیدا بوومە خاوەنی "کتێبخانۆکە"ی خۆم.[1]

خوێندنەوەی زۆر و بەردەوام، بەلای زۆرەوە، مرۆڤ بەرەو نووسین دەبات. نووسین بە بێ خوێندنەوە، کورتخایەن و ساکار دەبێت. دابڕان لە خوێندنەوە، زوو یان درەنگ، دابڕانە لە نووسین. ئەو نووسەرانەی بابەتی کاڵوکرچ دەنووسن، یان توانای نووسینیان نامێنێت، پێشتر وازیان لە خوێندنەوە هێناوە، یان زۆر کەم دەخوێننەوە. خۆسێ ساراماگۆ ١٩٢٢-٢٠١٠ دەڵێت:

یەکەم توانایەک، کە مرۆڤ پێش مردن لەدەستی دەدات، توانای

---

1- خەڵەف غەفوور، عەشق و ئازادی، چاوپێکەوتن لەگەڵ ڕەفیق سابیر، لە بڵاوکراوەکانی ئینستیتوتی نارین، سلێمانی ٢٠٢١

خوێندنەوەیە.

ئەو قسەیەی ساراماگۆ بۆ نووسەر دوو جار دروستە.

خوێندنەوەی زۆر و ژیان لەگەڵ کتێبدا، هەست و خەیاڵیان جوڵاندم، هزر و بۆچوونی نوێیان لا دروست کردم. دواتر خوێندنەوە بەرەو بیرکردنەوە، ڕامان و گومانی بردم. ئەو توانایەی پێ دام هەست، بیر و بۆچوونی خۆم، بە جۆرێکی گونجاو دەرببڕم، بوێرم بەرەو بیرکردنەوە، پرسین و نووسینی "شیعر" و بابەتی جۆراوجۆر هەنگاو بنێم. خوێندنەوە و نووسین سەرەتای ڕێگایەکی نوێیان پێشان دام، کە دواتر بوو بە شاڕێگای ژیانم.

لە دەمی نووسینی ئەدێڕانە، ڕووداوێکی خۆشم بە بیر هاتەوە.

لە ناوەڕاستی هەشتاکاندا، کە لە بولگارستان دەمخوێند، پێش ئێکای هاوسەرم، کچێکم ناسی ناوی نینا بوو، مێژووی ئەدەبیاتی خوێندبوو. زۆر جار پرسیاری لەبارەی ژیانم، سەردەمی منداڵی، هەرزەکاریی لێ دەکردم، دەیەویست بزانێت چۆن لە دۆخی شەڕدا ژیاوم و خوێندوومە، چیم خوێندۆتەوە و چۆن بوومەتە شاعیر.

شەوێک باسی ڕۆژانی مێرمنداڵی و قاتوقڕیی کتێب و سەرەتای ئاشنابوون بە کتێبم بۆ کرد. کاتێک باسی خەونە شیرینەکانی سۆشیالیزم و کۆمۆنیزمم بۆ کرد، کە نووسەرە سۆڤیەتییەکە، خستبوویە مێشکمانەوە، نینا لە قاقای پێکەنینی دا و ئەم ڕووداوەی بۆ گێڕامەوە:

ئەو دەمەی من لە پۆلی پێنجەم و شەشەمی سەرەتایی بووم، لە قوتابخانە و ڕادیۆ و تەلەڤزیۆنەوە، باس دەکرا کە بولگارستان، پێش کۆتایی ساڵی حەفتاکان، لێهاتووانە قۆناخی سۆشیالیستی تێ دەپەڕێنێت و دەچێتە قۆناخی کۆمۆنیستی. ستەم و بێدادی نامێنن و تەواوی خەڵک یەکسان و خۆشگوزەران دەژین. ئەو قسانە زۆر

دڵگیر و هیوابەخش بوون، کەچی هەندێک جار خەمباریان دەکردم. خەفەتم بۆ ئەوە دەخوارد کە ئەو دەمەی کۆمۆنیزم لە بولگارستان دادەمەزرێندرێت، من گەورە بووم و سەردەمی منداڵی، مێرمنداڵی و چەند ساڵێکی تەمەنی لاویم، بە بێ کۆمۆنیزم، بەفیڕۆ چوون. دایکم بۆ دڵدانەوەم پێی دەوتم:

کچم خەفەت مەخۆ، تۆ زۆر لە من و باوکت بەختەوەرتری، ئەو کاتە تۆ لە سەرەتای لاویدا دەبیت، کەچی من و باوکت بەرەو پیربوون دەچین.

## ٢
## پەناگەیەکی ئارام

پاش تەواوکردنی خوێندنی قۆناخی ئامادەیی دوو ساڵ (هاوینی ١٩٦٨ تا پایزی١٩٧٠) نەمتوانی لە زانکۆ بخوێنم. زۆربەی کات خەریکی خوێندنەوە بووم. لە کار و چالاکیی سیاسی و قوتابیان سارد بووبوومەوە. چونکە حزبی شیوعی ناکۆکیی توندی تێ کەوتبوو. نیوەی حزبەکە، بە ڕابەریی عەزیز ئەلحاج، جیا بووبۆوە، بە ناوی سەرکردایەتیی ناوەندیی حزبی شیوعی (القیادە المرکزیە) خۆی ناساندبوو. ئەو باڵەی حزبی شیوعی، پێی وابوو کۆمیتەی ناوەندیی حزبی شیوعی، ڕێبازێکی ڕاستڕەوانە و سازشکارانەی گرتووە.

من بە گەنجی کەمێک سەرەڕۆ بووم، بۆیە لە چەند لایەنەوە بۆچوون و هێزی سیاسیی (قیادەی مەرکەزی)م بە دروستتر دەزانی، بەڵام بە دوایان نەکەوتم. پێم وابوو ئەو دوو باڵەی حزبی شیوعی، کە هێزی چەکداریی خۆیان هەبوو، وەکوو دوو باڵەکەی پارتی، لە دژی یەک پەنا بۆ چەک دەبەن. من نەمویست ببم بە بەشێک لەو کێشەیە و شەڕی هاوڕێکانی دوێنێم بکەم، بۆیە لە کاری سیاسی- حزبایەتی سارد بوومەوە.

لە قەڵادزێ هیچ کارێک نەبوو بیکەم. چاوەڕێ بووم دەرفەتێکم

بۆ بڕەخسێت درێژە بە خوێندن بدەم. زۆربەی کاتی خۆم بۆ خوێندنەوە تەرخان کردبوو. هەر گۆڤار، کتێب و نامیلکەیەکی ئەدەبی، مێژوویی، فۆلکلۆری، دیوان و کۆمەڵەشیعر و چیرۆکم دەست بکەوتایە، بە بایەخەوە دەمخوێندەوە.

سەرەتای ساڵی ١٩٦٨ یەکەم دوکانی کتێبفرۆشیی لە قەڵادزێ، لە لایەن گەنجێکی ڕووناکبیر، قادری حاجی عەبدوڵڵا مەلا فەرخ، کرایەوە. کاک قادر برادەرم بوو، لاوێکی ڕووخۆش، نەترس و سەرەڕۆ بوو. چەند ساڵێک ئەندامێکی چالاکی یەکێتیی گشتیی قوتابیانی عێراق بوو. لە قۆناخی خوێندنی ناوەندیدا، ئەو پێشنیاری پێ کردم بچمە ڕیزی ئەو ڕێکخراوە.

کتێبفرۆشییەکەی بوو بە ژوانگەی خوێندەواران و شەیدایانی کتێب و خوێندنەوە. زۆر ڕۆژ چەندان سەعات لەوێ دەمامەوە، یارمەتیم دەدا، یان بڵاوکراوە و کتێبی نوێم دەخوێندەوە و باسی بابەتی جۆراوجۆرمان دەکرد. قادر لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٠ ماوەیەک گیرا، لە بەغدا لە بەندیخانەی (قەسر ئەلنیهایە) مایەوە. دوای ئازادبوونی، لە قەڵادزێ بە هۆی کێشەیەکی کۆمەڵایەتییەوە، بەرەوڕووی هەڕەشەی کوشتن بۆوە. بە ناچاریی، وەکوو عاشقێکی بێمراد و ڕەنجاو کوردستانی جێ هێشت. ساڵانێک لە میرنشینی یەکگرتووی عەرەبی ژیا و خەریکی بازرگانی بوو. لەوێ کچێکی لوبنانی هێنا. دواتر بەماڵەوە چوونە لوبنان، لە سەرەتای نەوەتەکاندا لەوێ جوانەمەرگ بوو.

لەو کتێبانەی ئەو کاتە زۆر بەدڵم بوون دوو کۆمەڵەهۆنراوەی عەبدوڵڵا گۆران بوو، بەهەشت و یادگار، فرمێسک و هونەر. چونکە تایبەت و نوێ بوون. زمان، ڕوونیی مانا، وێنەی شیعری، سادەیی و قووڵیی واتا، تایبەت و ناوازە بوون. بەشێکی هۆنراوەکان، لە

ڕووی زمان، ڕوونی دەربڕین، کێش و قافیە، لە فۆلکلۆرەوە نزیک بوون، بەڵام کاریگەر، پڕ هەست و پڕ وێنەی شیعری بوون. چەند شیعرێکیشیان، وەکوو زۆرینەی شیعری کلاسیکیی کوردی، بە وەزنی عەروزی عەرەبی نووسرابوون.

ساڵانی زۆر شیعری کلاسیکیم بە دەنگی بەرز، بەڵام "بەگوێ" دەخوێندەوە! مەبەستم ئەوەیە، لە کاتی خوێندنەوەی شیعرەکەدا، تەواوی هۆش و خەیاڵم لای کێش و مۆسیقای شیعرەکە بوو، نەک واتا و ناوەرۆکەکەی. هەستم دەکرد ئەو جۆرە شیعرە وشە دەگۆڕێت بۆ دەنگ و ڕیتم. بۆیە وەزن، ڕیتم و مۆسیقای شیعرەکە بە جۆرێک سەرنجیان ڕادەکێشام، بە ئەندازەیەک هەست و خەیاڵیان داگیر دەکردم، سەرەتا بیرم بە لای مانا و ناوەرۆکی شیعرەکە و وێنە شیعرییەکانیدا نەدەچوو. دوای یەک دوو جار خوێندنەوە و گوێگرتن لە ڕیتم و ئاوازی شیعرەکە، هۆشم دەدایە مانا و ناوەرۆک و وێنە شیعرییەکان و جۆری وەزنی شیعرەکە. تا ئێستاش کە شیعری کلاسیک دەخوێنمەوە، یان گوێ لە گۆرانییەک دەگرم، سەرەتا هۆشم لای ڕیتم، مۆسیقا و ئاوازەکەیەتی، چونکە هەستم دەبزوێنن و چێژم پێ دەدەن، دواتر هۆشم بۆ لای دەنگی هونەرمەندەکە و تێکستی گۆرانییەکە دەچێت.

لەو ئەزموونەی خۆمەوە، ساڵی ١٩٧٦ لە باسێکدا (کێش لە شیعری نوێی کوردیدا) لەو بارەیەوە نووسیومە:

(زۆربەی شیعری کلاسیکی لە سەرووی تێگەیشتنی خەڵکەوە بووە، ڕاستەوخۆ خواست و ئاواتی ئەوانی دەرنەبڕیوە، بۆیە کێش و قافیە، بە حوکمی ئەو مۆسیقایەی بە شیعرەکەی دەبەخشی، باشترین پردێک بووە لەنێوان شاعیر و خوێنەر- گوێگردا. هەروەها ئەو مۆسیقا پتەوەی کێش و قافیە (بەتایبەتی کێشی

عەرووز و یەکێتیی قافیە)، لە دیوی دەرەوەی شیعرەکەدا دروستی دەکات، وا لە گوێگر- خوێنەر دەکات، ئەگەر لە شیعرەکە بگات، یان تێی نەگات، جۆرە چێژێکی لێ وەربگرێت، بەو شێوەیەی چێژ لە بیستنی پارچە مۆسیقایەک وەردەگرێت. لێرەدا شیعرەکە تا رادەیەکی زۆر لە ماناکەی خۆی ڕووت دەبێتەوە و وەکوو مۆسیقای لێ دێت. ئەو مۆسیقایە خوێنەر- گوێگر خامۆش دەکات و سەرەتا دەرفەتی ئەوەی ناداتێ، بیر لە ماناکەی بکاتەوە. بۆیە دەبینین ئەو شیعرانەی، کە وردەکاریی زۆریان تێدایە و ماناکەیان قووڵە و خۆیان بە دەست خوێنەر- گوێگرەوە نادەن، ئەوا کێش و قافیەکەیشیان زۆر سوار و پتەون، شیعرەکەیش لەناو شەپۆلی مۆسیقادا نقووم بووە، وەکوو گەلێ لە شیعرەکانی نالی و مەحوی. لە کاتێکدا شیعرەکانی حاجی قادری کۆیی، کە ماناکانیان ئاسان و ڕەوانن، کێشەکانیشیان ئەو مۆسیقا قووڵەیان تێدا نییە، کە خوێنەر- گوێگر خامۆش بکەن، سەرەڕای ئەوەی زۆر جار حاجی قادر بایەخی بە یەکێتیی قافیە و قافیەی پتەو نەداوە.)[1]

لە نووسینی کوردیدا ڕیتمی شیعر لەگەڵ وەزنی شیعر تێکەڵ و هاوواتا دەکرێن، کەچی جیاوازییان هەیە. ڕیتم پێوەندیی هاوسەنگانەی نێوان جوڵە و وەستانە، کە لە ڕەوشی جوڵانی بەردەوام و ڕێکخراو و هاوسەنگدا، دروست دەبێت، ئاڵوگۆڕی بەسەردا دێت، کە دەشێت خاو، یان خێرا بێت، بەڵام هاوسەنگ و گونجاوە و لە ڕەوتی خۆی دەرناچێت. هەروا ڕیتم زەمانی خۆی

1- ڕەفیق سابیر، کێش لە شیعری نوێ کوردیدا، سێ بەش، بیری نوێ ژ.١٩٩، ٢٠٠، ٢٠١ لە ١٠-٧-١٩٧٦ تا ٢٤-٧-١٩٧٦

ئەم باسە لە کتێبی پەیڤ و پەیام (هەڵبژاردەی نووسینەکانی سالانی ١٩٧٠-١٩٨١) وەک خۆی بڵاو کراوەتەوە، کۆکردنەوە و هەڵبژاردن بوار نوورەدین، پەخشخانەی غەزەلنووس، ٢٠٢٢ ل ٥٠

هەیە. دەکرێت هاوسەنگی، گونجان و زەمان، بە سێکوچکەی ڕیتم دابندرێن. ئەدەب و هونەر و سروشت بە هەموو پێکهاتەکانییەوە، ڕیتمی تایبەت بە خۆیان هەیە. جوڵە و بزاوتی ئێمە و کارکردنی ئۆرگانەکانی لەشی مرۆڤ، بەگوێرەی ڕیتمێکی هاوسەنگ و لە زەمانی تایبەتی خۆیاندا، بەڕێوە دەچن. ئاژەڵ و گەزندە و پەلەوەریش، بەپێی ڕیتمی خۆیان دەڕۆن، یان دەفڕن، یاخود لەسەر سک دەخشێن. هەڵهاتن و ئاوابوونی خۆر و مانگ، لە کاتی خۆیاندا، ئاڵوگۆڕی وەرزەکانی ساڵ و جیاوازیی ئاووهەوا و کورتی و درێژیی ڕۆژ و شەو لە وەرزەکاندا، ئەنجامی سووڕانەوەی ڕیتمداری زەویین بە دەوری خۆردا.

لە هەموو هونەرێکدا ڕیتم هەیە، واتا هاوسەنگی، گونجان و زەمان هەیە. بۆ نموونە ڕیتم لە هونەری نیگارکێشاندا گونجان و گرژیی نێوان بەشەکانی تابلۆ، یان پەیکەرەکە پێشان دەدات، کەچی لە شیعردا توخمێکی سەرەکییە. ئەفلاتوون لای وایە شیعر لە وشە، مۆسیقا و ڕیتم پێک دێت.

مۆسیقا ڕەگەزێکی گرینگی شیعرە، یان ئەو ڕەگەزەیە کە زمان و ڕیتمی شیعر، لە زمان و ڕیتمی پەخشان و قسەی ئاسایی جیا دەکاتەوە. لە شیعردا دوو جۆرە ڕیتم هەیە، یەکێکیان بە هۆی وەزنی شیعرەوە ڕێک دەخرێت. شیعری کلاسیکیی کوردی، بەپێی وەزنی تەفعیلەی عەرەبی ڕێک خراوە، کەچی لە شیعری نوێی کوردیدا، وەزنی بڕگە بەکار دەهێندرێت. جۆر و ژمارەی تەفعیلەکان، یان هاوسەنگی و ژمارەی بڕگەکان، لە هەر دێڕێکدا، وەزنی شیعرەکە دیاری دەکەن. ئەم وەزنە شیعرییانە، بەپێی جۆر و تایبەتمەندیی خۆیان، ڕیتمێکی تایبەت لە شیعرەکەدا ڕێک دەخەن، کە دەکرێت بە ڕیتمی دەرەکی ناو ببردرێت. جۆرێکی تری

ڕیتمی شیعری لە زمان و هزرەوە سەرچاوە دەگرێت، بە هۆی شێوازی پێوەندیی نێوان دەنگ، وشە، وێنەی شیعری و هاوسەنگیی جوڵە و وەستان لە ڕستەکاندا، ڕێک دەخرێت، لە ڕەوشی هۆنراوەکەدا، زەمانی خۆی دیاری دەکات. ڕیتمەکە ئەگەر وەزنیشی نەبێت، بەردەوام دەبێت، چونکە پێوەندیی ڕاستەوخۆی بە وەزنی شیعرەوە نییە، دەکرێ ئەمەیان بە ڕیتمی ناوەکی ناو ببردرێت. هەموو وەزنێکی ڕێکخراوی شیعری ڕیتمی خۆی هەیە، بەڵام هەموو ڕیتمێکی شیعری، مەرج نییە وەزنی ڕێکخراوی خۆی هەبێت.

ڕیتم لە شیعر و هونەردا هاندەرێکی گرینگی جوڵاندنی هەستی مرۆڤە، لە ڕەوشی بەردەوامبوونیدا، خەیاڵ دەبزوێنێت و ئەو هەستە بەرەوپێش دەبات.

سەرچاوەیەکی گرینگی تری ڕۆشنبیریی ئەو ساڵانەم شیعر و بەیت و حیکایەتی فۆلکلۆریی کوردی بوون، کە بە زمانێکی ڕەسەن و پاراو وتراون. ئەو سامانە ئەدەبییە فۆلکلۆرییانە، کە بەشێکی گرینگ و بایەخداری ئەدەبی کوردین، لە ناوچەی پشدەر زۆر بڵاو بوون. لە چەندان چایخانەی قەڵادزێ بەردەوام، بە درێژایی ڕۆژ، دەبیستران، ئێمە لە منداڵییەوە پێیان ڕاهاتین. زۆربەی دایکانی ئەو سەردەمەی قەڵادزێ و پشدەر، لەوانە دایکم، چەند بەیت، حیکایەت و شیعر و گۆرانیی فۆلکلۆرییانەیان دەزانی. دایکم شەوانی پایزان و زستانان، هەندێک جار، حیکایەتی بۆ دەکردین. هەندێک شەوی زستان، کە هەر شوێن دەبوو بە سەهۆڵبەندان، لەدەمی حیکایەتکردندا، لە گردە چۆڵ و ڕووتەنەکەی ئەوبەری ماڵمانەوە، کە چۆمێک لە قەڵادزێی جیا دەکردەوە، لورەی گەلەگورگ دەبیسترا، من لە ترسان توند باوەشم لە دایکم دەدا. دایکم دەیوت:

کورم مەترسە، گورگ ناتوانێت بێتە ماڵمان.
منیش دەموت:
دایە من لە گورگ ناترسم، بەڵام بێزم لێی دەبێتەوە!.
دایکم چەند جار لەناو خزمان، بە پێکەنینەوە دەیوت:
ڕەفیق لە گورگ ناترسێت، بەڵام بێزی لێیان دەبێتەوە.
من وامدەزانی دایکم باسی ئازایەتیی من دەکات، دڵم بە قسەکانی خۆش دەبوو.

قەزای پشدەر، کە قەڵادزێ ناوەندەکەیەتی، لە ڕۆژهەڵاتەوە بە سەردەشت- موکریانەوە بەستراوە. ئەو ناوچانە لە کۆنەوە مەڵبەندی بەیت، حیکایەت، شیعر و گۆرانیی فۆلکلۆری بوون. بەشێکی گرینگی ئەو بەیت و حیکایەتانە، ساڵانی ۱۹۰۱-۱۹۰۳ لە موکریان، لە لایەن ڕۆژهەڵاتناسی ئەڵمان، ئۆسکارمان، کۆ کراونەتەوە. بەیتەکان لە زاری هونەرمەندی بەیتبێژ ڕەحمان بەکری بیستراون و تۆمار کراون. ساڵی ۱۹۰۵ لە کتێبێکدا (توحفەی موزەفەرییە) لە بەرلین چاپ کراوە. هێمنی شاعیر، بە پێشەکییەکی ناوازەوە، هێناویەتە سەر ڕێنووسی کوردی.[1]

یەکێک لەو تێکستانەی ئۆسکارمان کۆی کردوونەوە حیکایەتی شێخ فەرخ و خاتوون ئەستێیە. مەزاری ئەو دوو عاشقە لە گوندی داودێیە، کە جاران دە کیلۆمەتر لە قەڵادزێ دوور بوو، ئێستا لە پەنای قەڵادزێیە. کانیی خاتوون ئەستێ، کە ناودارترین کانیی ناوچەکە بوو، لە هەمان گوندە. بەشێکی ئاوی خواردنەوەی جارانی قەڵادزێ، تا حوزەیرانی ۱۹۸۹ کە قەڵادزێ وێران کرا، لەو گوندە و

---

1- ئۆسکارمان، توحفەی موزەفەرییە، پێشەکی و ساخکردنەوە و هێنانەسەر ڕێنووسی کوردی هێمن موکریانی، چاپی سێیەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ۲۰۲۱

لە پەنا مەزاری پیرۆزی ئەو دوو عاشقەوە، بە بۆڕی ڕادەکێشرا و بە سەر ماڵاندا دابەش دەکرا. هەروا گوندی داودێ کرابوو بە سەیرانگە، بەهاران زۆرینەی خەڵکی قەڵادزێ ڕوویان تێ دەکرد، لەوێ شایی و ڕەشبەڵەک دەگیرا. کوڕان و کچانی عاشق و ژنانی مورادخواز، زیارەتی مەزاری شێخ فەرخ و خاتوون ئەستییان دەکرد، بە چرپە ڕاز و نیازی دڵیان، بۆ شێخی عاشقان دەردەبڕی و بەردیان بە کێلەگۆڕەکەیەوە دەنووساند.

تا سەرەتای حەفتاکان، بەیتبێژی لێهاتوو لە پشدەر هەبوون، کە بە زمانێکی پاراو و ڕەسەن، بە دەنگێکی بەسۆز بەیت و گۆرانیی فۆلکلۆرییان دەچڕی. لە کاتی گێڕانەوە یان چڕینی بەیتەکان، تۆن و شێوازی دەنگی بەیتبێژان، بەپێی بەرەوپێشچوونی ڕووداوەکان و ئاستی دراماتیکییان، گۆڕانیان بەسەردا دەهاتن، بەرز و نزم دەکران، هەندێک کۆپلە و بەش بە دەنگی کز و خەمبارانە دەوتران. لەناکاو بەیتبێژ تێی هەڵدەکرد، بە چڕینی حەماسییانە سەرنجی بیسەرانی ڕادەکێشا. بەو شێوازە بەیتبێژ هونەرمەندانە، لە ڕووی ڕەوانییەوە بیسەرانی بۆ ڕوودانی پێشهاتێک دەخستە دڵەڕاوکێ و چاوەڕوانی. یان لە ناکاو شێوازی وتنی بەیتەکە، لە گێڕانەوەی پەخشانئامێزی ئاساییەوە، دەگۆڕدرا بە شیعر. بەیتبێژ بە دەنگێکی خۆش، دراماتیکییانە و پڕجۆش، درێژەی بە چڕینی بەیتەکە دەدا. لەگەڵ ئەو چڕینەدا ڕووداوەکان دەچوونە پێش، ئەوانیش لەگەڵ خۆیاندا بیر و خەیاڵی بیسەرانیان دەوروژاند و پێشبینی و چاوەڕوانیی جۆراوجۆر و جیاوازیان، لە لا دروست دەکردن.

زۆر جار لەگەڵ برادەرانم، چوومەتە ئەو چایخانانەی بەردەوام ئەو بەیت و گۆرانییە فۆلکلۆریانەیان لێ دەدان، کە بە دەنگی بەیتبێژان لەسەر شریت تۆمار کرابوون. ئەوەندە ئەو بەیتانەم

بیستبوون کە پێشوەخت دەمزانی چۆن ئەم یان ئەو بەیت تەواو دەبێت، کەچی گوێم لی دەگرتنەوە. چونکە بەیتی فۆلکلۆری تەنیا حیکایەت و گێڕانەوەی بەسەرهات نییە، تا بە بیستنی و زانینی ئەنجامەکەی کۆن ببێت. بەڵکو هونەری بەکارهێنانی زمان، دەنگ، ڕیتم، وەزن و ئاوازە. هونەری گێڕانەوە و چڕینە، هونەری جڵەوشلکردنی خەیاڵ و هۆنینەوەی ڕووداو و پێشهاتی چاوەڕواننەکراوە. دەنگی تایبەتی بەیتبێژ، شێوازی وتنی بەیتەکە و گۆڕینی تۆنی دەنگ، لە ڕەوشی ڕووداوەکاندا، هونەرێکە تەنیا بەیتبێژ و هونەرمەندی شارەزای لاوک و حەیران دەیزانن.

ساڵانی دواتر، کە سەرقاڵی خوێندنەوەی ئەدەبیات بووم، بە هەمان پەرۆشییەوە، چەند ساڵ جارێک هەندێک بەرهەمی نووسەرانی وەکوو (دەستەیڤسکی، شەیکسپیر، مارکیز، ئێلیۆت، نالی) و چەندان نووسەری ترم دووبارە و چەندبارە دەخوێندنەوە، لێیان تێر نەدەبووم، هەر جارەی شتێکی نوێم تێدا دەبینینەوە. دوای ساڵانێکی زۆر، ئەو دەمانەی شەوانە حیکایەتم بۆ ماریای کچم دەکرد، یان چیرۆکم بۆ دەخوێندەوە، لە نهێنی ئەو ڕازە گەیشتم. هەندێک چیرۆک و حیکایەت هەبوون چەندان جار بیستبوونی، کەچی بەردەوام پێی دووبارە و چەندبارە دەکردمەوە. ئەوە ڕازێکی گرینگ و سیحراویی هونەر و ئەدەبیاتە. لە هەر تەمەنێکدا بین، چەند بە هەورازی قووچی ژیاندا هەڵکشێین، هێشتا لە بەردەم ئێستێتیکا، داهێنانی هونەری و ئەدەبیدا، وەکوو منداڵ شاگەشکە و سەرسام دەبین. لێیان تێر نابین، یان ڕەنگە لەو ساتانەدا، تەنانەت تاوێک ببینەوە بە منداڵ.

کۆتایی ساڵی ١٩٦٨ و سەرەتای ساڵی ١٩٦٩ لەگەڵ هاوشاریم، حەمید عەزیز، کە تازە بەشی فەلسەفەی لە زانکۆی بەغدا تەواو

کردبـوو، بـووینه هـاوڕێ. بڕیارمـان دا پـێکەوە بەیـت و شـیعری فۆلکلـۆری، لەوانه شـیعری شـاعیری میللـی عـەلی بەردەشـانی، کۆ بکەینـــەوە. تێکســـتەکان، کە دەفتەرێکـــی دوو ســـەد لاپەڕەییـــدا نووسـرانەوە، بـەو هیوایـەی لە کتێبێکدا بڵاویـان بکەینـەوە. دواتـر بڕیارمـان دا دەستنووســەکە بـدەین بـە مامۆسـتا مـحەمەد تۆفیـق وردی، کە زۆر بایەخی بە فۆلکلۆری کوردی دەدا، چەندان کتێب و نامیلکەی فۆلکلۆری و ئەدەبیی بڵاو کردبوونەوە.

مامۆستا وردی کەسێکی دڵپاک، دڵسۆز و وڵاتپەروەر بوو. لـە سـەردەمی دامەزرانـدنی کۆمـاری مهابـاددا، چووبـوو بـۆ مهابـاد و لـەوێ مامۆسـتا بـوو. دوای ڕوخانـدنی کۆمـار گـەڕابۆوە کۆیـە و دواتـر لـە بەغـدا وەک مامۆسـتا جێگیـر بووبـوو، لـە گـەڕەکی حەیدەرخانـە دەژیـا. ڕۆژانـە دوای تـەواوکردنی کارەکـەی، دەهاتـە چاپخانەی پەرلـەمان و لـەوێ دەمـانبینی. کاتێک دەستنووسـەکەمان پـێ دا، زۆر دڵـی خـۆش بـوو. دوای ماوەیـەکی کـورت بەشـێکی دەستنووسـەکەی، لەگـەڵ چەنـد تێکسـتی فۆلکلـۆری، وەک کتێبێک بڵاو کردەوە. لە پەراوێزی پێشـەکییەکەیدا سوپاسـی کـاک حەمید و منی کردبوو، کە چەند تێکستی کتێبەکەمان پێ داوە.

لە هاوینی ١٩٦٩ تا بەهـاری١٩٧٠ چەنـد مانگ لە سلێمانی ژیـام، لەوێ دەرفەتـی باشـم بـۆ خوێنـدنەوە هەبـوو. کتێبخـانەی گشـتیی سـلێمانی شـوێنی بەردڵانـی مـن بـوو. هەسـتم دەکـرد بەسـەر گەنجینەیەکی گەورەی ئەدەبی و ڕووناکبیریدا کەوتـووم، دەبـێ لە کەمترین کاتدا، زۆرتـرین سـوود لەو گەنجینـەیە ببیـنم. تـا زینـدانی کرام، هەفتانە چەند ڕۆژ دەچوومە کتێبخانەی گشتی. لەوێ چەندان ژمارەی گۆڤاری گەلاوێژ، شـەفەق، هیـوا، کۆمەڵەچیرۆکی عەلادین سـەجادی، بـرایم ئەحـمەد، شـاکر فەتـاح، مسـتەفا سـاڵح کەریـم،

حوسێن عارف و ...تاد خوێندنەوە. هەر لەو سەردەمەدا لە ماڵی حاکم بەکر ئیسماعیل، کتێبێکی زۆر سەرنجڕاکێشم بە عەرەبی خوێندەوە، کە کۆمەڵناسی ناسراوی عێراقی، عەلی ئەلوردی، نووسیبووی. کتێبەکە ناوی (الاحلام بین الحقیقه والخیال)، خەون لەنێوان ڕاستی و خەیاڵدا، بوو، کە زۆر پێی سەرسام بووم. نووسەر هەندێک ڕووداوی سەیری گێڕابۆوە، بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت مێشکی مرۆڤ شەپۆلی کاهرۆ موگناتیسی بەڕێ دەکات، کە بە هۆیەوە مرۆڤ دەتوانێت، لە هەندێک حاڵەتی زۆر تایبەتدا، هەست بە هەواڵی ناخۆشی منداڵەکەی بکات، لە هەر جێیەک بێت. چونکە منداڵەکە بەشێکە لە جەستەی دایکی، بۆیە لە ساتی ترسناک و تەنگانەدا، شەپۆلی کاهرۆ موگناتیسی هەردووکیان، دەتوانن پێک بگەن. بۆ سەلماندنی ئەو تێزە، نووسەر چەندان ڕووداوی جۆراوجۆری باس کردووە. بۆ نموونە، دایکێک، کە ناو و شوێنەکەی نووسراوە، نیوەشەو خەبەری بۆتەوە، هاواری کردووە کوڕەکەم لە دەریادا نقووم بوو، بێ ئەوەی ژنە بزانێت کوڕەکەی بە کەشتی سەفەری کردووە. دواتر دەرکەوتووە، کە لەو ساتەدا، کوڕەکەی لە شوێنێکی دوور لە دەریادا خنکاوە.

خوێندنەوە و ڕووکردنە شیعر و ئەدەبیات سەرچاوەی ڕووناکبیری و پەناگەیەکی ڕۆحی و دەروونیی من بوون. سێبووری، ئارامی و هێزیان پێ دام. هەست، خەیاڵ و بیرکردنەوەیان جوڵاندم، ڕوانین و بۆچوونی منیان لەبارەی ژیان و ڕووداوەکان گەشە پێ دا و بەرەو نووسینیان بردم. نووسینیش بایەخی وشە و دەسەڵاتی وشەی پێشان دام، گیانی مرۆڤدۆستی، پرینسیپی ئەخلاقی و هەستی بەرپرسیاریی بەتین کردم. لە نوێ هیوای پێ بەخشیمەوە. بەو ئەنجامەی گەیاندم کە ژیان بێ هیوا،

مردنێکی پڕئـازار و لەسـەرخۆیە. سـەرەتای مـردن، یـان کوشـتنی مــرۆڤ، بەلای زۆرەوە کوشــتنی نەتەوەیەکــیش، بە کوشــتنی هیواکانی دەست پێ دەکات.

## ٣
## نووسین و خۆناسین

له ١١ی ئاداری ١٩٧٠ ڕێککەوتنی ئاشتی، لەنێوان حکومەتی عێراق و پارتی دیموکراتی کوردستان، ڕاگەیەندرا. بەپێی ڕێککەوتنەکە، بۆ یەکەم جار مافی ئۆتۆنۆمی بۆ گەلی کورد له عێراق سەلمێندرا. دەبوو له ماوەی چوار ساڵدا، قانوونی ئۆتۆنۆمی بڕیار بدرێت و دەزگاکانی ئۆتۆنۆمی دابمەزرێندرێن. دوای نۆ ساڵ شەڕ و خوێنڕژان، ئاشتی و ئارامی بۆ کوردستان گەڕانەوە. لەگەڵ خۆیاندا هیوای ژیانی نوێ، یەکڕیزی، ئاوەدانی و پێشکەوتنی ئابووری، کۆمەڵایەتی و کولتوورییان هێنا.

ساڵێک پێش ئەو ڕێککەوتنە، سەرەتای بزووتنەوەی ڕووناکبیری سەری هەڵدابۆوە. یەکەم زانکۆ له کوردستان، زانکۆی سلێمانی، دامەزرێندرا، که ڕووداوێکی گرینگی ڕووناکبیری و ئەکادیمی بوو. یەکێتیی نووسەرانی کورد پێکهات، گۆڤاری ڕزگاری، بەیان و هەفتەنامەی هاوکاری بڵاو کرانەوە. دواتر کۆڕی زانیاریی کورد له بەغدا دامەزرێندرا. هەفتەنامەی برایی، بیری نوێ، ژین، گۆڤاری دەفتەری کوردەواری، ڕوانگە، بڵاوکراوەی تر و کتێبی جۆراوجۆر، پەخش کران، چالاکیی ئەدەبی، هونەری دەستیان پێ کردەوە.

ئەو کاته حزبی بەعس تازه، به کودێتایەکی سەربازی،

دەسەڵاتی زەوت کردبوو. هێشتا لاواز بوو، نەیتوانیبوو سیستمی خوێندن و ژیانی ئەدەبی و هونەری، کۆنترۆڵ بکات، ئایدیۆلۆجیا و دەسەڵاتی سیاسی و ڕۆشنبیریی خۆی بسەپێنێت. تا ڕادەیەکی باش ئازادیی نووسین و ڕادەربڕین لە عێراق هەبوو. لەناو وڵاتانی عەرەبیدا، عێراق بە پرخوێنەرترین وڵات دادەندرا.

شاری بەغدا ناوەندی ئەدەبی و کولتووریی عێراق بوو. تەنانەت ناوەندی ئەدەبی و ڕووناکبیریی کوردییش بوو. گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکان، لە بەغدا دەردەچوون. کۆڕی زانیاریی کوردی و بەڕێوەبەرایەتیی ڕۆشنبیریی کوردی، بەشی زمان و ئەدەبی کوردی، لە بەغدا بوون. سەرەتای پایزی ۱۹۷۰ لە قەڵادزێی کەنارخراو و لە دنیا دابڕاوەوە، کە تەنانەت خوداش لە بیری کردبوو، چوومە بەغدا و لە زانکۆ دەستم بە خوێندن کرد. دوو ساڵ دواتر، ئێواران لە بیری نوێ (الفكر الجديد) دەستم بە کاری ڕۆژنامەنووسی کرد.

پێش ئەوەی لە زانکۆ بخوێنم، وێرای شیعر، هەوڵی نووسینی کورتەچیرۆک و وتاری ئەدەبیم دەدا، بەڵام نەمدەویست پێشانی کەسی بدەم. بڕیارم دا کورتە وتارێک، کە لەبارەی مێژوونووس مامۆستا محەمەد ئەمین زەکی و بەرهەمەکانی نووسیبووم، بۆ ڕۆژنامەی هاوکاری بنێرم. دوای چەندان ڕۆژ چاوەڕوانی، لە ۱۱ی تەمووزی ۱۹۷۰ نووسینەکە، لە ژمارە ۲۷ی ڕۆژنامەی هاوکاری، بڵاو کرایەوە. کاتێک ناو و نووسینی خۆم لە ڕۆژنامەدا بینی، زۆر دڵخۆش بووم. هەفتانە تەنیا حەوت هەشت دانە ڕۆژنامەی هاوکاری بۆ قەڵادزێ دەهات، کەچی کاتێک تەماشای خەڵکم دەکرد، لاموابوو زۆربەیان وتارەکەی منیان بینیوە، یان هەواڵی بڵاوبوونەوەی نووسینەکەیان بیستووە! لەو ژمارەیەی هاوکاری،

هەر وتارەکەی خۆم چەندان جار خوێندەوە و نووسینەکانی ترم فەرامۆش کردن. دوو ساڵ دواتر، ڕۆژێک لە نووسینگەی یەکێتیی نووسەرانی کورد لە بەغدا، مامۆستا شوکور مستەفا قسەیەکی خۆشی کرد، ئەو ڕۆژەی هێنایەوە یادم، کە یەکەم وتارم بڵاو کرایەوە.

ژمارەیەکی نوێی گۆڤاری یەکێتیی نووسەران ، نووسەری کورد، دەرچووبوو. نووسەرێک لە مامۆستا شوکوری پرسی ئایا ژمارەی نوێی گۆڤارەکەی پێ چۆنە؟ مامۆستا شوکور، کە نووسینێکی خۆی لە گۆڤارەکەدا بڵاو کرابۆوە، وتی:

کوڕینە لە هەر جێیەک نووسینی من بڵاو بکرێتەوە، هەر نووسینەکەی خۆم، چەندان جار، دەخوێنمەوە و بەلای نووسینی کەسی دیکەدا ناچم.

ساڵی ١٩٦٩-١٩٧٠ سۆراخی ژیان و بەرهەمی چەند شاعیری نەناسراوی ناوچەی پشدەرم کرد، کە کۆچیان کردبوو. هەندێک زانیاریم لەبارەی ژیانی سێ شاعیر دەست کەوت، مەلا ئەحمەدی ئەشکەنەیی (فەنایی ١٣١٥– ١٣٧٩ ک.) میرزا حەسەنی جوانەمەرگ ١٩٢٥-١٩٥٦، شاعیر میرزا ئەحمەد لافاو. دواتر سێ وتارم لەبارەی ژیان و هەندێک لایەن و بەرهەمی ئەو شاعیرانە و چەند نموونەی هۆنراوەکانیان، بڵاو کردنەوە.

لەناو دەستنووسەکەی فەنایی چەند شیعرێکی بڵاونەکراوەی وەفایی و کاکە حەمەی ناری، هەبوون، کە بە خەتی فارسی و ڕێنووسی کۆن، نووسرابوونەوە. لە کاتی خۆیدا هۆنراوەکانی وەفایی، لە ژ ٣٨ ی ٢٦-٩-١٩٧٠ لە هاوکاری، بڵاو کرانەوە. بەڵام هۆنراوەکانی ناری دران بە د.مارف خەزنەدار، کە لە کتێبێکدا بڵاوی کردنەوە. نووسیبووی کە من ئەو هۆنراوانەم پێ داون.

ئەو ڕۆژانە شـیعر و وتـاری ئەدەبـی و مێـژوویيم دەنووسـی، بابەتی فۆلکلۆریم کۆ دەکردەوە. بەڵام خوێندنەوەم بێ پلان و بێ مەنهەج بوو، کتێبەکان جۆراوجۆر بوون، نووسینە سەرەتاییەکانی منیش لەبارەی بابەتی لێک جیاواز بوون. نەمدەزانی چیم دەوێت، یان زیاتر خۆم بۆ کام ژانری ئەدەبی تەرخان بکەم.

لە تەمـووزی ١٩٧٠ تـا کۆتـایی ئایـاری ١٩٧١ چەنـدان نووسـینی ترم بڵاو کرانەوە. لەوانە کورتەباسێک لەبارەی مێژووی نـاوچەی پشـدەر، دۆسـتایەتیی نێـوان شـاعیران خـادیم و بێخـود، وتارێـک لەبـارەی پۆشــکین. هەروا لە کۆتــایی ســاڵی ١٩٧٠ چیرۆکێکــی کورتیلەم، لە بڵاوکراوەیەکی دیوار لە کۆلێجی ئەدەبیات، کە هاوڕێم کەمـال میراودەلـی دەری دەکـرد، بـڵاو کـردەوە. کەمـال سێ سـاڵ پـێش مـن لە زانکـۆ دەسـتی بە خوێنـدن کردبـوو، زۆر چـالاک و هەڵسوڕاو بوو. کۆرسێکی زمانی کوردی بۆ هەندێک لەو قوتـابییە کـوردانەی زانکـۆی بەغـدا ڕێـک خسـت، کە لە بادینـان، خـانەقین و بەغـداوە هـاتبوون، بەڵام بە کـوردی نەیـان خوێنـدبوو، بـۆیە بە نووســین و خوێنــدنەوەی کــوردی ئاشــنا نەبــوون. منــیش لە وانەوتنەوەدا بەشداریم کرد.

تــا ئەو کــاتە ســێ کــورتەچیرۆکم نووســیبوون، بەڵام بەدڵــم نەبوون، بۆیە بیرم لە بڵاوکردنەوەیـان نەکردەوە. مـن لە نووسـیندا حەزم لە وەســفکردنی ورد و فراونــی شــوێن و ســیما و شــێوەی کەسەکان نییە، کە زۆر جار لە چیرۆک و ڕۆماندا پێویسـتن، بەڵکو زیاتر مەیلم بەلای تێکستی ئەدەبیی چڕ و پوختدا دەچێت.

لە هــاوینی ١٩٧٠ بـۆ یەکەم جـار هـۆنراوەیەکم بـۆ ڕۆژنـامەی هاوکاری نارد، کاتێک بڵاویـان کـردەوە، چەنـد دێرێکیـان لابردبوو. دوای ئەوە لە بڵاوکردنەوەی شیعر سڵەمیمەوە. لەجیاتییـان زۆرتـر

رووم لە خوێندنەوەی شیعری نوێی عەرەبی و بیانی و بابەتی ڕەخنەی ئەدەبی کرد. زانیاریم لەبارەی هونەری شیعر زیاتر بوو. تێڕوانین و بۆچوونم سەبارەت بە شیعر و ئەدەبیات، بە تایبەت شیعری نوێ، گۆڕدران و بەرچاوم ڕوونتر بوو. گەیشتمە ئەو باوەڕەی کە من مەیلم بەلای شیعردایە، لە شیعرنووسیندا زیاتر هەست بە خۆشی و ئاسوودەیی دەکەم، هزر و خەیاڵم ئازادترن. لە کاتی نووسیندا میتافۆر و وێنەی تری شیعریم بەکار دەهێنان، کە بۆ چیرۆک، وەکوو هونەری گێڕانەوە، پێویست و گونجاو نین، کەچی لە شیعردا زمان دەڕازێننەوە و مانای نوێ دادەهێنن. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو کاتە، کە تازە لە زانکۆ دەستم بە خوێندن کردبوو، هێشتا بە تەواوی دڵنیا نەبووم شیعر بکەمە شارێگای ئەدەبیم.

چەند مانگ دواتر، بە هۆی کۆڕێکی شیعرییەوە، کە ئێوارەی ڕۆژی شەممە ١٧-٤-١٩٧١ لە بارەگای یەکێتیی نووسەرانی کورد، بەڕێوە چوو، متمانەم بە خۆم و توانای شیعرنووسینم زیاتر بوو. کۆڕەکە بۆ قوتابیانی بەشی کوردیی کۆلێجی ئەدەبیات، ڕێک خرابوو، دوکتۆر مارف خەزنەدار سەرپەرشتیی دەکرد. لەو کۆڕەدا کۆمەڵێک قوتابی و چەند مامۆستا، ڕۆژنامەنووس و نووسەر ئامادە بوون. چەند قوتابییەک، لەوانە ئەنوەر قادر محەمەد، من و چەند قوتابیی تر، شیعرمان خوێندەوە، دواتر قسە لەبارەی شیعرەکان کرا. ئەوە یەکەم جار بوو، لە کۆڕێکی ئەدەبی و لە بەردەم خەڵک و مامۆستاکانم، شیعری خۆم بخوێنمەوە. هۆنراوەکەی من (تابلۆیەکی شارەکەم) بە باشی سەرنجی ئامادەبووانی ڕاکێشا و قسەی زۆر باشی لەبارەوە کرا. تەنیا دوکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، کە مامۆستامان بوو، ڕەخنەی لە ناوەڕۆکی هۆنراوەکە گرت، لە ڕوانگەی ڕێبازی ڕیالیزمی

سۆشیالیستییەوە، بەندەی بە ڕەشبین و عەبەسی ناو برد، بێ ئەوەی بە لای شێوە و لایەنی هونەریی هۆنراوەکەدا بچێت. لە بەرانبەر ئەو قسەیەی مامۆستاکەم کەوتمە داکۆکیکردن لەخۆم، بە سادەیی وتم من کەسێکی مارکسیم و عەبەسی نیم!

ڕۆژنامەی هاوکاری لە ٢٤ی نیسان هەواڵی کۆڕەکەی بڵاو کردەوە و تەنیا ئاماژەی بە ناو و هۆنراوەکەی بەندە دابوو، دەقی هۆنراوەکەشی بڵاو کردبۆوە و نووسیبووی:

(لەو کۆڕەدا چەند بەرهەمێکی قوتابیان پێشکەش کرا. لە ئەنجامدا هەڵبەستەکەی قوتابی ڕەفیق سابیر، پۆلی یەکەم، لە لایەن بەشداربووانەوە پەسەند کرا. ئەمەش تەواوی هەڵبەستەکەیە....)

دوای ئەوە چەندان هۆنراوەی ترم لە ڕۆژنامەی هاوکاری، گۆڤاری ڕوانگە، بەیان، نووسەری کورد، گۆڤاری هەولێر و شوێنی تر، بڵاو کرانەوە. بڕیارم دا زیاتر کات و توانای خۆم بۆ شیعر تەرخان بکەم.

هەندێک لەو هۆنراوانەی ئەو سەردەمە، بە نموونەی باشی شیعری نوێی ئەو دەمە داندران، لەوانە هۆنراوەی شەوێک لەسەر گۆڕی وەلی دیوانە. ساڵی ١٩٧١ هۆنراوەکەم بۆ لیژنەی فێستیڤاڵی یەکەمی شیعری کوردی نارد، کە لە کەرکووک ڕێک خرا، بەڵام ڕێگەی من و زۆربەی شاعیرە لاوەکانیان نەدا بەشداربن.[1]

هەروا هۆنراوەی چەند بیرەوەرییەک لە ژوورێکی بێ دیواردا، نموونەی دیاری شیعری نوێی نیوەی یەکەمی حەفتاکانە. لەو هۆنراوەیەدا شیعر و گێڕانەوەی پەخشانئامێز تێکەڵ کراون. تێکستەکە بە تەکنیکی شیعری نوێ دەست پێ دەکات، دواتر گێڕانەوەی پەخشانئامێز دێت. ئەو حاڵەتە دوو جار لە هۆنراوەکەدا

1- هۆنراوەکە لە گۆڤاری بەیان ژمارە ٧ی ١٩٧٢ بڵاو کرایەوە.

دووبارە بۆتەوە. نووسەر و ڕەخنەگری ئەدەبی، عەبدوڵلا تاهیر بەرزنجی و شاعیر سەباح ڕەنجدەر، ئەو هۆنراوەیە بە دەقی کراوە ناو دەبەن. لایان وایە، هۆنراوەکە یەکەم دەقی کراوەیە، لە شیعری نوێی کوردیدا.

هۆنراوەکەم، بۆ گۆڤاری یەکێتیی نووسەران (نووسەری کورد) نارد، بە مەبەست نووسیبووم: هۆنراوەی ڕەفیق سابیر. چونکە دڵنیا نەبووم ئەوان بە شیعری دادەنین. دوای ماوەیەک مامۆستا عەبدولڕەزاق بیمار، کە ئەو کاتە لە گۆڤارەکە کاری دەکرد، وتی:

دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکە نووسینەکەیان پێ باشە، بەلام بە شیعری نازانن. بۆیە بەو مەرجە بڵاوی دەکەنەوە کە لەجیاتی (هۆنراوەی ڕەفیق سابیر) تەنیا ناوەکەت، بە بێ وشەی (هۆنراوە) بنووسرێت. هۆنراوەکە، بەو جۆرەی ئەوان ویستیان، لە ژمارە ٨ی ١٩٧٣ی گۆڤارەکەدا، بڵاو کرایەوە.

سۆکرات (٣٦٩-٤٧٠ پێش زاین) ڕووی لە مرۆڤ کرد و وتی:

خۆت بناسە!

خۆناسین لە هەموو بوارەکانی ژیاندا بەکەڵکمان دێت. بە هۆیەوە دەتوانین ڕێگای ژیان و داهاتووی خۆمان دیاری بکەین، متمانەمان بەخۆمان ببێت، بێ ئەوەی خۆمان بە زل بزانین. ژیان پڕە لە هەل و دەرفەتی جۆراوجۆر، پڕە لە جوانی، لە هیوا و بەخشندەیی.

هەر کەس پێویستی بەوەیە بزانێت چی لە ژیان دەوێت، لە چ بوارێکدا بەهرە و توانای زۆرترە، بە کام جۆرە کار دڵخۆشە. گرینگە کارێک بکات، کە لەگەڵ بەهرە، حەز و تواناییدا دەگونجێت.

شیعر و شیعرنووسین یارمەتییان دام بە جۆرێکی تر بۆ زمان، کۆمەڵ و ژیان بڕوانم. زمان لای من گۆڕدرا بە ئامرازی داهێنان و بیرکردنەوە. بوو بە هونەری بەکارهێنانی وشە و دۆزینەوەی

پێوەندیی شاردراوەی نێوان وشەکان. لە ڕەوشی شیعرنووسیندا بایەخی فانتازیام زانی، کە هزر والآ و زمان ئازاد، ڕوون و ڕووت خۆی وێنا دەکات. ئازادیی زمان هزرمان ئازاد و عەودالّی ئازادیمان دەکات، بۆی دەگەڕێین و دەمانەوێت بەدەستی بخەین.

شیعر و ئەدەبیات ژیانیان لە لا جوانتر و دڵگیرتر کردم، توانای جوانناسی، هاوسۆزی و مرۆڤدۆستییان پەرەپێدام و هۆگری خۆشەویستییان کردم، خوشەویستیی ئینسان، کە لە سایەی شەڕدا، نرخی فروجێکی نەمابوو. خۆشەویستیی وڵات، کە وێنەی نێچیرێکی زامدار، ڕۆژانە خوێنی لەبەر دەڕۆیی و تا ئێستاش ئەو نەزیفی خوێنە بەردەوامە. خۆشەویستیی شەهیدان، کە بە مەرگی خۆیان کۆڕی بەرگرییان گەرمتر دەکرد و ئەو کاتە بە قارەمان و پیرۆز دادەندران. خۆشەویستیی ژیان و سروشت. خۆشەویستیی سەگی بێلانە، کە لە کاتی دەستڕێژ و تۆپباران و هاتنی فرۆکەی جەنگیدا، ترس و هەلاتن و کونەتەیارە و تەنانەت مردنیان لەگەڵ بەش دەکردین. خۆشەویستیی ئەو شێتانەی کە شارەکەمان بەوانەوە جوانتر بوو، ئەو شێتانەی شەوانی قەدەغەکردنی هاتوچۆ (منع التجول) بە دەستڕێژی سەربازی عێراقی، یان بەتۆپبارانی لەشکری ئێران، شەهید کران، بە خوێنی ئەوان لاپەرەی تری مێژووی شار و نەتەوەکەیان، لە شەقام و کۆلانەکانی قەلادزێ، نووسرانەوە. یەکێک لەو شەهیدانە، یای ئامان بوو، کە دایکی چەند منداڵ بوو، زۆر بە درەنگی و پاش لەدایکبوونی دوامنداڵی، باری دەروونیی دارمابوو. یەکێکی تریان سەعیدی دێوانە بوو، کە بە سەعیدە شێت ناسرابوو، دەوترا عیشق شێتی کردووە. ئەو جۆرە ڕووداوانە کاریان تێ کردووم، کەم تا زۆر لە هۆنراوەکانمدا ڕەنگیان داوەتەوە و تایبەتمەندیی تریان پێ بەخشیون. ئەو

شێتانەی لە قەڵادزێ و ناوچەکانی تری کوردستان، شەهید کران، نەیاندەزانی شەڕ چییە، بۆ چییە و بۆ دەبێت ئەوان ببنە سووتەمەنی شەڕ!.

سەعید ئارامترین و جوانترین شێتی قەڵادزێ بوو، ڕەنگە بێدەنگترین پیاوی دنیاش بووبێت، چونکە قەت نەمدی قسەیەک بکات، یان بەلەسە ببێت. نازانم سەعید کەی هاتبوو بۆ قەڵادزێ، بەڵام وەکوو سیمبوڵیکی جوان و پاکی شارەکە بوو. لای من سەعید میری شێتانی قەڵادزێ و ڕەنگە کوردستانیش بووبێت. لە منداڵییەوە بیستبووم کە سەعید عاشقی کچێک بووە و پێی نەگەیشتووە، لە بەر ئەوە شێت بووە. نازانم ئەو قسەیە ڕاست بوو، یان بێدەنگی و هێمنی و ڕیشە سپی و ڕوخسارە نوورانی و خەمبارەکەی، خەڵکیان هێنابووە سەر ئەو باوەڕەی کە سەعید، دەبێت دیوانەی ئەوین بێت. چونکە تەنیا دێوانەیەکی ئەوین دەتوانێت، ئەوەندە جوان، ئارام، بێدەنگ و بێگرفت بێت.

سەعید لە ناوەڕاستی حەفتاکانی سەدەی پێشوو، کە شەڕ لە کوردستان هەڵگیرسایەوە، گیانی سپارد. هەندێک دەڵێن سەعید بە جۆرێکی ئاسایی مرد، هەندێکی تر دەڵێن قوربانییەکی تری تۆپبارانی ئێرانە (کە بە تۆپەکانی شۆڕش ناو دەبران!) ساڵی ١٩٧٤-١٩٧٥ ئەفسەرانی ئێران، ئەو تۆپانەیان، بە ناوی تۆپبارانی سەربازگەی لەشکری عێراق، لە شار و چارۆچکەی سنوور دەگرت. دەیان کەس لە قەڵادزێ بوونەوە قوربانیی ئەو تۆپانە. پێشتریش قەڵادزێ لە ٢٤ نیساندا، بۆردومان کرا، سەدان کەس کوژران و بریندار کران. دوای بۆردومانەکە، نۆرەی ئێران هات، تا بە ناوی هاوکاریکردنی گوایا شۆڕشەوە، لە وێرانکردنی قەڵادزێ و ناوچەی تری سنووری ئێران و لە کوشتنی خەڵک بەردەوام بێت.

له نیسانی ١٩٧٨ به یادی سەعیدی عاشق و ئەو شێتانەی که سیمای شارەکانیان بوون و شەهید کران، هۆنراوەی (سەعیدە شێت)م نووسی، که له کۆمەڵە هۆنراوەی (ڕێژنە)دا بڵاو کرایەوە. سەرەتای هەشتاکانی سەدەی پێشوو، ئەو هۆنراوەیە، لەگەڵ چەند هۆنراوەی تر، وەکوو نامیلکەیەک، له لایەن کۆمەڵەی نووسەران و هونەرمەندان و ڕۆژنامەنووسانی عێراقی، له پاریس، به زمانی فرەنسی و عەرەبی، بڵاو کرایەوە. هونەرمەند فازیل جاف هۆنراوەکانی تەرجومەی عەرەبی و شاعیر شەوقی عەبدولئەمیر تەرجومەی فرەنسی کردبوون. له سەرەتای نەوەتەکان، جارێکی تر هۆنراوەکە، له ئەنتۆلۆگیایەکی شیعری شاعیرانی مەنفا، له سەردەمی گریکەکانەوە تا کۆتایی سەدەی بیستەم، به زمانی فرەنسی، له پاریس چاپ کرایەوە.

سەعیدە شێت!
چ ئازارێک بوو بەرەو ئەم ساتە خەمناکەی هێنایت؟
بەرەو نێو لقوپۆپە چڕەکان
بەرەو ئەو عیشقە و
کەناری شەوی ئەبەدیی هێنایت؟
چ ئازارێک بوو؟ کێوی تەنیایی و
شەپۆلەکانی نایە سەر شانت
لەنێو تاوێر و بەفر و پۆلوودا
نیشتەجێی کردیت؟

تۆ ئەم ئاوازەم مەدە به گوێدا
با لەوە زیاتر وڕوکاس نەبم

بۆنی گۆڕستان نەمکات بە هەڵم.
با لەوە زیاتر لەنێو کۆڵانی غەریبی و شەودا
سەرگەردان نەبم.

ڕۆژێکیان منداڵ بووینەوە
بە یەکەوە بە دوای پەپوولە و گزینگدا ڕامان دەکرد
لە ئاسۆڕا هەورمان بەردەدایەوە
لەنێوان لقەکانەوە، لەپەنای ئەو دیوارەوە
تەماشای گەردوونمان دەکرد
کە بەرەو ماڵ گەڕاینەوە
لەنێو تەم و چراخانی ئەم شارەدا ونم کردیت،
بەدوای تۆدا سەرم بەنێو تونێلی ژیاندا کرد و
پێوەی نەچووم.

تۆ ئەم ئاوازەم مەدە بە گوێدا
ئەوا عیشقی تۆ ئاشنای کێو و بیابانم دەکات
دەمکات بە داستان
دەمکات بە پشکۆ، بە چنگەخۆڵێک
دەمداتە دەستی کڕێوە و باران
لەگەڵ بێدەنگی و تاوێرەکاندا دەمپێچێتەوە
لەنێو سەراب و دۆڵی نەماندا دەمشارێتەوە.

٤

## ستایشی شیعر

*هەر هەنگاوێک بەرەو شیعر، هەنگاوێکە بەرەو جوانی و ئازادی*

شیعر هونەرێکی زمانی و داهێنانە لە زماندا. توانای زمان، سروشتی فرەڕەنگی و فرەمانابییەکەی، لە شیعردا دەردەکەون. زمانی شیعر، ئامرازی پێوەندیکردن نییە، شاعیر ڕوونکردنەوە، لێکدانەوە و زانیاری نادات، لەجیاتیان ئازادانە و بە شێوازی جیاواز زمان بەکار دەهێنێت، توانای داهێنەرانەی زمان زۆرتر دەکات. زمان لە ئامرازی پێوەندیکردنەوە دەگۆڕێت بە هونەرێکی ئەدەبی، بەم کارە گەشە بە زمان دەدات و بەرەو ئاستێکی بڵیندتری دەبات. تێڕوانینی هەر شاعیرێک لەبارەی شیعر، ڕەنگە لە ئاستی ئێستێتیکیی شیعرەکانیدا، لە زمان، ستایل و دنیابینی شیعرییدا، ڕوونتر ببیندرێت. لە شیعردا سنووری زمان فراوان دەبێت، کەچی لە واتا و دەربڕیندا، زمان چڕ و پوخت دەکرێتەوە.

شیعر لە چەند لاوە هونەرێکی دوولایەنەیە:

شیعر لە دەنگ و وێنە پێک دێت، وەکوو بابەت لەبارەی شتگەلێکە هەم بیندراو، یان هەستپێکراو، هەم ئەزموونکراوە. کاتێک شاعیر لە بارەی شتێک دەنووسێت، لە دەرەوەی ئەو شتە

سەرنجی دەدات و تێی ڕادەمێنێت، لە هەمان کاتدا لەگەڵی دەژی و هەستی پێ دەکات. شیعر هەم لایەنی دەروونیی مرۆڤ و هەم دیاردە جیاوازەکانی دەوروبەر و ژیان وێنا دەکات. هەروا شیعر کارێکی بەئاگایانە (هۆشدارانە) و بێئاگایانە (ناهۆشدارانە)یە. شاعیر بێئاگایی (لاوعی) خۆی بە جۆرێکی هۆشدارانە، لە فۆرمێکی هونەریی شیعریدا، چالاک دەکات. فانتازیا سەرمایەی شاعیرە، بەڵام هزر و دەوروبەریش سەرچاوەی بەپێزی شیعرن. شیعر وێنەی هەر هونەرێک، ڕێسا، لۆجیک، تەکنیک و شێوازی تایبەتی خۆی هەیە، بۆیە پشت بە زانیاری و ڕۆشنبیری دەبەستێت. کەچی لایەنێکی گرینگی شیعر ئەو توخمانەن کە ناتوانین لە ڕێگەی خوێندن و زانیارییەوە فێریان ببین، چونکە لە ڕامان، خەیاڵ، هەست، ئیلهام و ئەزموونەوە دێن.

زمان هەر وشە-دەنگ نییە، بەڵکو سیستمێکی ئاخاوتن و ئامرازی بیرکردنەوە و گەیاندن و مەیدانی داهێنانی شیعری، ئەدەبی و هزرییە. وشە-پەیڤ وەکوو ڕەنگ یان بەرد، ئاسن، دار و ماتریاڵی تری ناو سروشت، پاسیڤ و بێ لایەنن، بەڵام وشە لە شیعردا، وەکوو ڕەنگ و ماتریاڵی سروشت لە هونەری نیگارکێشی و پەیکەرتاشیدا، بە بۆچوون و هەست و هزری مرۆڤ جۆش دەدرێن، مانای نوێ و ژیانی نوێیان پێ دەدرێت. ناوی نوێیان بە بەردا دەکرێت و دەگۆڕدرێن بە شیعر- هونەر. بۆیە داهێنان و تایبەتمەندیی هەر شاعیرێک، لە بنەڕەتدا، لە زمانەکەیدا، لە شێوازی بەکارهێنانی داهێنەرانە و تایبەتییانەی زمانەکەیدا دەبیندرێت.[1]

زمانی شیعر جیاواز، پوخت و بژارکراوە، بە گشتی زمانێکی

---

1- لە دیدارێکی ئەدەبیدا فراوانتر باسی ئەم مەسەلەیە کراوە. بڕوانە: ڕەفیق سابیر، ڕوانین لە بولێڵدا، پەخشخانەی مانگ، ئێران ٢٠١٥ ل١٦-١٧

ناڕاستەوخۆ، پڕ میتافۆر و وێنەی تری شیعرییە. لە شیعردا وشە مانای قامووسیی خۆی تێ دەپەڕێنێت و دەتوانێت چەند مانای نوێ و جیاواز بە خۆی بگرێت. لە چەند شیعری مندا وشەی تایبەت هەن چەندان جار، بە واتای جودا و بۆ مەبەستی جۆراوجۆر، دووبارە بوونەتەوە، وشەکە وەکوو سیمبول، یان ئاماژە بۆ بابەت و هزری جیاواز بەکار هێندراوە، ماناکەی بە پێوەندی لەگەڵ بابەت، شوێن و مەبەستەکە، گۆڕانی بەسەردا هاتووە، کە ڕەخنەگری جیدی و شارەزا دەتوانێت دەرکی پێ بکات. نووسەری سوێدی شاشتین هۆگبووم یوهانسۆن، لە وتارێکدا لەبارەی کۆمەڵەهۆنراوەی وەرزی سەهۆڵبەندان، کە شاعیر و نووسەر گۆران مەریوانی کردوویەتی بە سوێدی، نووسیویەتی:

(ژمارەیەک وشەی سەرەکی لە شیعرەکاندا هەن، کە دەگۆڕێن و لە دۆخی تازەدا بەکار دەهێندرێنەوە و مانای تازەیان پێ دەدرێت. هەور لەوجۆرە وشانەیە. ڕەنگە مەبەست لە وشەکە ڤلادیمیر مایاکۆڤسکی بێت، کە لە شیعرەکەیدا *-پەڵەهەورێک لەناو پانتۆڵدا،* بە بیرە بوێر و شۆڕشگێڕانەکانییەوە، لە جێیەکی زۆر بڵندە. توربیۆرن سێففێ و گۆران مەریوانی، هەردووکیان، باسی پێوەندیی نێوان مایاکۆڤسکی و ڕەفیق سابیر دەکەن. شەپۆل و برووسکە دوو وشەی ترن کە لە دووبارەکردنەوەیاندا مانای نوێیان پێ دەدرێن. بەڵام لە هەموو وشەکان باوتر، وشەی "نهێنی"یە، کە لە کۆمەڵەشیعرەکەدا بە کار دەهێنرێتەوە. وشەکە لە عەدەمەوە دێ، لەناو چەند چاوێکدا دەتروسکێتەوە، بە شێوەیەکی سیحری دەتگرێ و زۆر جار بە ڕووناکییەوە دەبەسترێتەوە. "نهێنی" ئاماژەیە بەوەی کە شتێکی نادیار هەیە و مرۆڤ بەرەو

پێشەوە دەبات. شتێک کە دەبێ ئاگامان لێی بێت و بیپارێزین.[1]

لە نووسینی شیعردا زۆر پەنا بۆ میتافۆر و وێنەی شیعری دەبەم، چونکە بە بنچینەی زمانی شیعریی دەزانم، کە مانا و دەربڕینی نوێ دادەهێنێت. زمان لە فۆرمێکی نوێدا دەردەخات، سنووری دەربڕینی بەرینتر، ئاسۆکەی ڕەنگینتر و هزر و فانتازیای مرۆڤ ئازاد و فراوانتر دەکەن. هایدیگەر و نیتشە هەردووکیان لە تێکستە فەلسەفییەکانیاندا، پەنایان بۆ میتافۆر و زمانی شیعر بردووە، (لە هەندێ شوێندا میتافۆر بەسەر نووسینەکانی نیتشەدا زاڵە، کە لە هۆنراوە جیا ناکرێتەوە. ئەو نزیکبوونەوەی فەلسەفە لە هۆنراوەوە لەو بۆچوونەوە سەری هەڵداوە، کە نیتشە و هایدیگەر بانگەشەی بۆ دەکەن، زمانی فەلسەفە و هۆنراوە بە یەک جۆر دەربڕین دادەنێن. هایدیگەر، وەکوو نیتشە، فەلسەفە و هونەر لە هونەریشدا، بە تایبەتی هۆنراوە بە هێزێکی ڕزگاریکەر دادەنێت.)[2]

شیعر و فەلسەفە لە چەند لایەنی ترەوە پێوەندییان پێکەوە هەیە، هەردووکیان پڕن لە هزر و فانتازیا، کە بەرەو بیرکردنەوە، ڕامان و پرسینمان دەبەن. هەردووکیان بە پشتبەستن بە زمانێکی چڕ و تایبەت، بەدوای حەقیقەتدا دەگەڕێن، بایەخ بە لایەنی وجودی، هزری، ڕۆحیی مرۆڤ دەدەن، سوود لە میتافۆر و سیمبول وەردەگرن.

شیعر و فەلسەفە، سروشتێکی کەونییان هەیە. فەلسەفە بایەخ بە پرینسیپەکان دەدات، شیعریش، وەکوو ئەرستۆ تالیس دەڵێت، لە تایبەتەوە بەرەو گشتی دەچێت. شیعر و فەلسەفە، هەردووکیان دەتوانن سەرنجمان بەلای شتە سادە و ئاساییەکاندا ڕابکێشن و

---

1- Kärstin Högbom Johansson Karavan nr. 1, 2000-

2- د.محەمەد کەمال، نیتشە و پاش تازەگەری، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چاپی دووەم، سلێمانی ٢٠٠٩، ل ١٦١

هانمان بدەن، بە بایەخەوە بۆیان بڕوانین و لێیان ورد بینەوە.

شیعر و فەلسەفە بەدوای هەقیقەتدا دەگەڕێن. لەم کارەشدا فەلسەفە پشت بە عەقڵ و لۆجیک دەبەستێت، بەڵام لە هەست، کە بنچینەیەکی بەهێزی شیعرە، بەدوور نییە. شیعریش لۆجیکی خۆی، ڕێسا، تەکنیک و پرینسیپی خۆی هەیە، کە لە ژانرە ئەدەبییەکانی تر جیای دەکەنەوە. بۆیە هەست و لۆجیک دوو خاڵی تری هاوبەشن لەنێوان شیعر و فەلسەفەدا.

بێگومان شیعر و فەلسەفە دوو بابەتی جیاوازن، بەڵام شیعر لە کۆنەوە، لە سەردەمی بابلییەکان و گریکەکانەوە، بوارێکی هزری و فەلسەفی بووە، مرۆڤ هزر و ڕامانی خۆی لەبارەی هەبوون، ژیان، سروشت و مردن، خەونی نەمری و زیندووبوون (خلود)ی لە فۆرمی شیعردا، داڕشتووە.

ئارتۆر شۆپێنهاوەر ۱۷۸۸-۱۸٦۰ لای وایە نەک هەر فەلسەفە، بەڵکو هەر کارێکی تری هونەری، لە بنەڕەتدا بۆ ئەوەیە چارەیەک بۆ گرفتەکانی هەبوون (الوجود) بدۆزێتەوە. هەر هونەرمەند و فەیلەسوفێک، بە شێوازی تایبەتی خۆی، ئەو کارە دەکات.

هزریش یەکێکە لەو بابەتانەی فەلسەفە و شیعر بەیەکەوە دەبەستێتەوە. مەسەلە هزرییەکان لە شیعردا بە شێوازی شاعیرانە و لە فەلسەفەشدا بە میتۆدی فەلسەفییانە باس دەکرێن. هزر و هەستی فەلسەفی و فانتازیای شیعری، لە فەزای شیعردا دەتوانن دوورتر بڕۆن. شیعر، بە هۆی ڕیتم و وەزنەوە، کاریگەرترە و ئاسانتر لەبیر دەمێنێت. چەندان تێکستی فەلسەفی و شیعریی نیتشە ئاوێتەبوونی هزری فەلسەفی و شیعرن، کە بە زمانێکی تایبەتی پڕ لەمیتافۆر نووسراون، تیایاندا فەلسەفە و شیعر پێکەوە کۆک، گونجاو و تەواوکاری یەکترن و جیا ناکرێنەوە.

بەشـێکی گەورەی ئەزمـوونی سـۆفیگەری لە ڕێـگەی شـیعر و زمانی شیعرییەوە خۆی دەرخستووە، هزر و دنیابینیی سۆفیگەریی بەرەوپـێش بـردووە. سـۆفییەکان، لە ڕەوشـی گەڕان بەدوای هەقیقەتی ڕەها و یەکێتیی بوون، بە جیهان و مرۆڤیشەوە، پەنایان بۆ شیعر و زمانی شیعریی بردووە، وەکوو زمانێکی نموونەیی، کە پشت بە سیمبول، میتافۆر، ئیحا، ڕیتم و ئاماژە دەبەستێت. ئەوینی بێسنوور، کە لای سـۆفییەکان لە عیشـقی شـەڕاب و گـوڵەوە تـا خوداوەند دەگرێتەوە، ڕەنگە هەر بە زمانی شیعر بتواندرێت باس بکرێت. تێکستەکانی حەلاج، ئیبن عەرەبی، مەولانا جەلالەدین، یان شـیعرن، یـاخود بە زمـانێکی ڕیتمـدار و پـڕ وێـنەی شـیعریی نووسراون. شیعرەکانی مەلای جەزیری، مەولانا خالید، مەولەوی و مەحوی نموونەی داهێنەرانەی تری ئاوێتەبوونی هزری سۆفیگەری و زمان و هونەری شیعرین لە ئەدەبی کوردیدا.

کەواتـا وەک چـۆن شـیعری فەلسـەفییانە هەیە، فەلسـەفەی شیعرییانەش هەیە.

من لەڕێی شیعرەوە زیاتر هۆگری فەلسەفە بووم. پایزی ١٩٨٢ کاتێک بـۆ تەواوکردنـی خوێنـدن چـوومە بولگارسـتان، بڕیـارم دا لەجیاتی ئەدەبیات، فەلسەفە بخوێنم و بە شێوەیەکی مەنهەجی و زانستی، کەمێک پێی ئاشنا ببم. دوکتۆرنامەکەشم لەبارەی ڕۆڵی کولتوور لە پێکهێنانی هۆشیاریی نەتەوەی کورد نووسی.

* * *

هەر هەنگاوێـک بەرەو شـیعر هەنگـاوێکە بەرەو ئـازادی، هەنگاوێکە بەرەو جوانی. شیعر هزرمان ئازاد و هەستی ئازادیمان گەشـە پـێ دەدات، خولیـای ئازادبوونمـان بەتـین دەکـات، هانمـان

دەدات داکۆکیی لە ڕاستی، داد، ئازادی و جوانی بکەین. ڕێکەوت نییە کە بەرەنگاربوونەوەی دیکتاتۆریا، ستەم و بێدادی، سەرەتا لە شیعردا دەردەکەون. لە دەمی داگیرکاریدا شیعر، لەناو ژانرە ئەدەبییەکاندا، دەبێتە پێشەنگی ئەدەبی بەرگری. سەرەتاکانی بیری ئازادی، ڕۆشنگەری، خەونی نوێخوازی و یاخیبوون لە هزری بەردین و نەریتی دەقگرتووی ئەدەبی و ئایینی و بەرەنگاربوونەوەی ستەمی دەزگا ئاینییەکان، سەرەتا لە شیعردا چەکەرەیان کردووە و شاعیران لەو دیاردانە یاخی بوون. خانی مەزن لە کۆتایی سەدەی حەڤدەیەم چاوی بڕیوەتە دەوڵەتی کوردی، حاجی قادری کۆیی و شاعیرانی تر بەرێگای ئەودا چوون، وەکوو ڕۆشنگەر، لە دژی خورافە و کۆنەپەرسی جەنگاون. سەرەنجام شیعر، لە ئەدەبی کوردیشدا، کرا بە ئامرازێکی خەباتی هزری، ڕووناکبیری و ئازادیخوازی. دیارە ئەوە بە قازانجی شیعر نەبووە، بەڵام بۆ کاتی خۆی، کە میدیا و دەزگای بڵاوکردنەوەی چاپەمەنی نەبوون، کاریگەر بووە، واتا سوودی بۆ ئینسان، ئازادی و ژیان هەبووە. لەوەش زیاتر حورمەت و پێگەی کۆمەڵایەتیی قایمتری بە شاعیر داوە، کە خەڵک لە ڕۆژە سەختەکاندا چاوەڕوانییان لەوان هەبووە. تا ئەمڕۆش ئەو جۆرە چاوەڕوانییە، کەم تا زۆر، لە شاعیر و نووسەری کورد دەکرێت. بۆیە زۆر بە دەگمەن شاعیری ڕاستەقینەی کورد بەرەی دوژمنی گرتووە، یان چۆتە بەرەی ستەم و دیکتاتۆریا. بە پێچەوانەوە زیندان و ئاوارەیی و هەژاری، بەشێک بوون لە چارەنووسی ئەوان. مێژووی شیعری کوردی و هەڵوێست و چارەنووسی زۆر شاعیری کورد، ئەو بۆچوونەی سەرەوە دەسەلمێنن.

زۆر جار لە بەرانبەر ستەم و بێدادی و هەندێک ڕووداودا، کە

پێوەندیی بە ژیانی هەمووان، یان زۆرینەی خەڵکەوە هەبووە، لە خۆم پرسیوە دەبێت، وەکوو مرۆڤ و شاعیر، چی بڵێم؟ یان چۆن ڕەفتار بکەم؟ من لە ژیانمدا هەر هەڵوێستێکی بەرهەڵستکارانەم هەبووبێت، بە پێشمەرگایەتیشەوە، هەر کارێکم بە قازانجی گشتیی کردبێت، هەر باس و بابەتێکی ڕەخنەگرانەم نووسیبێت، لە بەر ئەوە بووە، چونکە نەمتوانیوە نەیکەم، یان نەینووسم، بۆیە نە خۆمی پێ هەڵدەنێم، نە منەت بەسەر کەسدا دەکەم. ئەوانەی لە نزیکەوە من دەناسن، دەزانن من حەزم لە خۆهەڵکێشان نییە. بەڵام لێرەدا دەمەوێت بڵێم شیعر و نووسین تێڕوانینی منیان لەبارەی ژیان، ژن، ئازادی، کۆمەڵ و وڵات ڕوونتر کردووە، زۆر جار وێنەی قیبلەنمایەکی ئەخلاقی و ویژدانییش، کۆمەکم دەکەن، بۆ ئەوەی بەرپرسانە بۆ ڕووداو و دیاردەکان بڕوانم و هەڵوێستی خۆمیان لەبارەوە دیاری بکەم.

شیعر وەکوو هونەر و ئێستێتیکا، لە ژیانی نەتەوە و لە بواری کولتووری و زمانییشەوە، بایەخدارە و دەکرێت بە ئاوێنەیەکی ڕۆحیی نەتەوە دابندرێت. گیانی نەتەوە، خەون و ڕوانینی مرۆڤ بۆ ژیان، مردن، ئەوین، بوون، سروشت و جوانی، لە شیعردا (شیعری فۆلکلۆری و نووسراو) دەردەکەون. زمانی نەتەوە، لەڕێگای شیعرەوە، گۆڕانی بەسەردا دێت، گەشە دەکات، پێش دەکەوێت، بە هەزاران وشەی نوێ، دەربڕین و مێتافۆری تازە و وێنەی تری شیعری، کە یەکەمجار لە شیعردا دەردەکەون، دەوڵەمەند دەکرێت. زمان توانای داهێنەرانەی خۆی دەنوێنێت و جۆش بە هزر و خەیاڵ دەدات. ئاوڕدانەوەیەکی مێژوویی دەیسەلمێنێت کە بوژاندنەوەی شارستانەتی، زمانی، کولتووری و سەرەتای هەست و خۆناسینی نەتەوەیی لە هەندێک وڵاتدا، لەوانە

له کوردستان، له شیعردا دەرکەوتوون. زمانی کوردی له ڕێگەی شیعرەوە، له سێ هەرێمی کوردستاندا، باکوور، ڕۆژهەڵات و باشوور، له زمانی ئاخاوتنەوە گۆڕدراوە بە زمانی نووسین. له سەردەمی میرنشینی بۆتان، ئەردەلان و باباندا، زمانی کوردی لەڕێگای شیعرەوە، وەکوو زمانی نووسین و ئەدەبیات، بە شێوەزاری کرمانجی، دواتر گۆران (هەورامی) و دواتریش کوردیی ناوەڕاست، دەرکەوتن و گەشەیان کرد. ئەو دیاردەیە، گۆڕینی زمانی پەیڤین بۆ زمانی نووسین بە هۆی شیعرەوە، له لای چەند نەتەوەی تریش دەرکەوتووە.[1]

شیعری شاعیرانی کورد، له مەلای جەزیری و خانییەوە بۆ مەولەوی و بێسارانی و خانای قوبادی، تا نالی و کوردی و سالم و حاجی قادر و وەفایی، مەحوی..تاد بە نموونەی شیعری کلاسیکیی کوردی و ڕۆژهەڵات دادەندرێن. بە هۆی ئەو شیعرانەوە هونەری شیعر، مەجاز و ڕەوانبێژی و وێنەی شیعری و جۆرەکانی کێش و قافیە..تاد، له ئەدەب و زمانی کوردیدا، چەسپێندران. لەو شیعرانەدا بە ژیانی هزری، ڕۆحی، کولتووری، کۆمەڵایەتی و ئەتنۆگرافیی کۆمەڵی ئەو سەردەمانەی کوردستان ئاشنا دەبین و سەرەتاکانی دەرکەوتنی هەست و خۆناسینی نەتەوەیی دەبینین.

شیعر، له هەمان کاتدا، بۆ من، کارێکی ئێستێتیکی، ڕووناکبیری و سەرچاوەیەکی ئارامیی ڕەوانی، خۆشی و ئاسوودەییە.

هەر هەنگاوێک بەرەو شیعر هەنگاوێکە بەرەو جوانی. شیعر بە جوانیمان ئاشنا دەکات، ڕۆح، هەست، هزر و خەیاڵمان گەشە پێ دەدات. ڕۆحێکی هۆگری شیعر و هونەر، دەتوانێت ئازاد، جوان،

1- ڕەفیق سابیر، بەستاندارکردنی زمانی کوردی و ئەلفوبێی کوردی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ۲۰۰۸، چاپی ۲ ناوەندی غەزەلنووس ۲۰۱۳ هەروا بڕوانە: د.عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی، بەغدا ۱۹۷۰

ژیاندۆست، مرۆڤدۆست و ئەوینپەروەر بێت، خۆی لە ئیرەیی، کینە و توندوتیژی بەدوور بگرێت، ئارام، ئاسوودە و ڕەنگە بەختەوەریش بێت. شیعر سەرچاوەیەکی جوانییە، جوانی دیارییەکی دەگمەنی سروشت و ژیانە، جوانی دەسەڵاتە، ئارامی و ئاسوودەییە.

لە هەر کوێیەک ژیان هەبێت جوانیی لێیە
بە هەر جێیەک بگەین، نەگەین
لەوێ جوانی چاوەڕێیە
هەر تەمەنێک و جوانیی خۆی
جوانی هاوڕاز و هاوڕێیە.

جوانی جمکی بەختیارییە
روون وەک ئەوین
سادە وێنەی ڕووناکییە.
جوانی وەک ژیان دیارییە.

دەرویشانە وەک دێوانە
بەرەو پیری جوانی دەڕۆم
منداڵانە، عاشقانە
لەبەر گزنگدا بەڕووتی ڕادەکشێم و
دڵم دەشۆم.

***

باسکردنی شیعر، بێ ئاماژەدان بە ڕەخنەی ئەدەبی، دەشێت باسێکی ناتەواو بێت، چونکە ئەو دوو ژانرە ئەدەبییە پێوەندییەکی نێوخۆییان لەگەڵ یەکتر هەیە. ڕەخنەی ئەدەبی دەتوانێت ئاستی هونەریی شیعر دەربخات، لە گەشەپێدان و گۆڕینی شیعر، پێشخستنی هەست و هۆشیاریی جوانناسی خەڵک، کاریگەر بێت.

مێژووی شیعری کوردی لە پێنج سەد ساڵ نزیک دەبێتەوە، بەڵام تا ئێستا ڕەخنەی ئەدەبی لە سەرەتادایە. سەدان ساڵ شیعری کوردی، بە جیا لە ڕەخنەی ئەدەبی و تیئۆری ئەدەب، گەشەی کردووە. نەریت، ڕێسا و پرینسیپی ئێستێتیکیی خۆی چەسپاندووە. چونکە تا کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەم، تەنیا شیعر بە زمانی کوردی نووسراوە. بابەتی تری هزری، مێژوویی، کۆمەڵایەتی و کولتووری، بە زمانانی عەرەبی، فارسی، تورکیی عوسمانی بوون. بۆیە ڕەخنەی ئەدەبی لە کوردستان ساوایە، هێشتا، وەکوو ژانرە ئەدەبییەکانی تر، شێواز، تایبەتمەندی و نەریتی خۆی نەچەسپاندووە. بە دەگمەن لە نووسینی ڕەخنەییدا، تیئۆری و مێتۆدی مۆدێرنی ڕەخنەی ئەدەبی پێڕەو دەکرێن.

ڕەخنەی ئەدەبی زانست و هونەرە، زانستە لە بەر ئەوەی پشت بە تیئۆری و مێتۆدی تایبەت دەبەستێت. هونەرە چونکە گیانێکی نوێ بەبەر تێکستدا دەکات، یان تێکستەکە بەرهەم دەهێنێتەوە. لە هەمان کاتدا ڕەخنەی ئەدەبی بەرپرسیارییە، چونکە ئێتیک و ڕەوشتی تایبەت بە خۆی هەیە. ڕەخنەگری ئەدەبی، بە جۆرێکی ئۆبجێکتیڤانە و بەرپرسانە، لە تێکستی ئەدەبی دەکۆڵێتەوە و لایەنی ئێستێتیکی و بایەخی تێکستەکە دەردەخات، ئاستی هۆشیاریی ئەدەبیی خوێنەر دەباتە سەرێ.

بەشێک لەو جۆرە ڕەخنانە سروشتێکی ئەکادیمیان هەیە، لە زانکۆ و ناوەندی لێکۆڵینەوە دەنووسرێن و بڵاو دەکرێنەوە. تیئۆرییە ئەدەبییەکان، لە دنیادا، لە زانکۆکانەوە سەرهەڵدەدەن، میتۆد و پرینسیپیان دیاری دەکرێن. زانکۆکانی کوردستان لەبواری ڕەخنەی ئەدەبی و ناساندنی تیئۆری و میتۆدی ڕەخنەی ئەدەبی، زۆر هەژار و کەمتەرخەمن، بۆیە لە ژیانی ئەدەبی، هونەری و هزری دابڕاون. ڕاستییەکەی تەنانەت لە بواری زانستی، پزیشکی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، مێژوویی، سایکۆلۆجی و...تاد، شوێنپەنجەیان دیار نییە. ئەو باس و توێژینەوانەی لە زانکۆکانی کوردستان، لە بواری ئەدەبیات و تێکڕای زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا دەنووسرێن، زیاتر بۆ وەرگرتنی تایتلی ئەکادیمیە، نەک بۆ بەشداریکردن و گەشەپێدانی ژیانی کۆمەڵایەتی، ئابووری، زانستی و بزاڤی ئەدەبی و ڕووناکبیری.

شێوازێکی تری ڕەخنەی ئەدەبی ئەو جۆرە نووسینانەن، کە نووسەرێک، بە پشتبەستن بە ئەزموونی ئەدەبیی خۆی و هەندێک زانیاری گشتی، وتارێک لەبارەی بەرهەمێکی ئەدەبی دەنووسێت. لەو ڕێگەیەوە خوێنەر هان دەدرێت بەرهەمە ئەدەبییەکە بناسێت. ئەو جۆرە نووسینانە، کە زیاتر لە ڕۆژنامە و گۆڤارە ئەدەبییەکاندا بڵاو دەکرێنەوە، کاری باشن، بەو مەرجەی ئۆبجێکتیڤانە نووسرابن و مەبەستی تاکەکەسییان لەپشتەوە نەبێت.

کاتێک میتۆد و ڕەوشتی ڕەخنەی ئەدەبی و هەستی بەرپرسیاری پێڕەو ناکرێن، ڕەخنەی ئەدەبی دەشێوێندرێت، بۆ ستایشکردن، یان وەکوو چەکێک بۆ پەلامارێدانی نووسەرانی تر بەکار دەهێندرێت. ئەوە کاری ڕەخنەگر و ڕووناکبیر نییە. دەوترێت، زۆر جار شاعیرە فاشیلەکان دەبن بە ڕەخنەگر. خۆسێ

ساراماگۆ دەڵێ:

کەس هێندەی شاعیری بچووک ڕۆحزل نییە! ڕەنگە لەبەر ئەوە بێت، کە هەندێکیان بەردەوام شەڕ دەفرۆشن.

گرفتی ڕەخنەی ئەدەبی لە کوردستان تەنیا پێوەندیی بە نەبوونی مێتۆدی ڕەخنەی ئەدەبی و پێشێلکردنی پێوانەی هونەری و ئێستێتیکی نییە، بەڵکو پێوەندیشی بە ئێتیکی ڕەخنە و ئەخلاقی ڕوونـاکبیرانەوە هەیە. زۆر جار لەجیاتی بایەخدان بە بەرهەمی داهێنەرانە، کەچی پێوانەی سیاسی، دۆستایەتی، سێکتەچێتی و شارچێتی بەگرینگ دەگیرێن. ئەوەش بێبایەخکردنی ڕەخنەی ئەدەبییە. ڕەنگە لەمەش خراپتر ئەوە بێت کە "ڕەخنەی ئەدەبی" وەکوو ئامرازی تۆڵەستاندنەوە، بەکار دەهێندرێت. ئەوجۆرە ناهەقییانە لەگەڵ چەندان شاعیر و نووسەر، لەوانە لەگەڵ بەندە کراوە.

من وەک شاعیرێک، لە سەردەمی بەعس و لە دوای ڕاپەڕینیش، بە هۆی هەڵوێست و دەنگهەڵبڕینم بەرانبەر ستەم و بێدادی و تیرۆر، بەر پەلامار کەوتووم، هەوڵی کەنارخستنم دراوە. دوای ڕاپەڕین و هەڵگیرسانی شەری نێوخۆ، ئەم جۆرە هەڵوێستە بە جۆرێکی تر بەرامبەرم بەردەوام بوو، لە چاوپێکەوتنێکدا ئاماژەم بە بەشێکی ئەو ناهەقییانە داوە، بۆیە نامەوێ دووبارەی بکەمەوە.[1] بەڵام لێرەدا ئاماژە تەنیا بە کارێکی سەیر دەدەم، کە بە ناوی ڕەخنەی ئەدەبییەوە، بەرانبەرم کراوە.

نووسەرێک لە چاوپێکەوتنێکدا ستایشی منی کردووە و بە (شاعیری گەورە) ناوی بردووم[2]، کەچی دواتر، کە ساردییەک

1- گۆڤاری (ئاینده) ژ. ٨٣ ئاداری ٢٠٠٩

2- گۆڤاری وان، ژ.٩-١٠ ساڵی ١٩٩٤، سوید، ل١٦٧

کەوتە نێوانمـــان، لە چەنـــدان وتـــاردا، دەیـــان لاپەڕەی بە نـــاوی ڕەخنەی ئەدەبییەوە، ڕەش کردەوە بۆ ئەوەی شیعرەکانم وەکوو نموونەی خراپی شیعری کوردی وێنا بکات و منیش بە شاعیرێکی بێتوانا دابنێت، تەنانەت باسی ژیانی تایبەتم بکات!.

هەر کەسێک، خوێنەر یان نووسەر، مافی خۆیەتی شیعری منی بەدڵ بێت، یـان بەدڵ نەبێت، ئەوە لای مـن ئاسـاییە. بۆیە وەڵامـی هیچ کەسێکم نەداوەتەوە، کە ڕەخنەی لە شیعری من گرتبێت. بەڵام نووســەرێک لەبەر خــۆی نابێــت بەم جــۆرە پێکنــاکۆکە باســی نووسەری تر و بەرهەمەکانی بکات، چونکە خوێنەر نازانێت بە کام قسەیان بڕوا بکات! ئەو جۆرە نووسینانە، تەنیا ناهەقی نیین، بەڵکو ئاستی ڕاستگۆیی نووسەرەکەشی دەخەنە ژێر پرسیار.

***

هەر شــاعیر، نووســەر و هونەرمەنـدێک دنیـابینیی و تێڕوانینـی تایبەتی خۆی لەبارەی ژیـان، مرۆڤ، کۆمەڵ و داهێنان هەیە. ئەو تێڕوانینە تایبەتەی، تێکەڵ بە ئەزمـوون و ژیانی دەبن، لە ڕەوشـی کــارکردن و نووســینیدا ڕەنــگ دەدەنەوە. لە ئەزمــوونی خــۆمەوە دەتوانم بڵێم کاتێک کەسێک خۆشـی و ئاسوودەیی لە ئەدەبیاتـدا (یان لە هونەر و ڕەنگە لە کاری داهێنەرانەی تریشدا) دەبینێتەوە و نووسین دەکاتە شێوازی ژیـانی، دەتوانێت سـەرکەوتوو بێت، بەو مەرجەی ئامانجێـــک لە نووســـیندا دیـــاری بکـــات، بـــایەخ بە خۆپێگەیاندن و کوالیتیی نووسینەکەی بدات. چونکە نووسین بۆ ئەو کەسە دەبێتە سەرچاوەی ئارامی، ئاسوودەیی و هەستکردن بە بەختەوەری، خۆی و داهاتووی خۆی لە نووسیندا دەبینێتەوە. ئەو دەنووســێت چــونکە ناتوانێــت نەنووســێت، دەنووســێت چــونکە

نووسین دەبێتە پەنجەرە، ڕووناکی و هەوای پاکی بۆ دێنێت، یان وەکوو پردی پێوەندیی نێوان نووسەر و ژیانی لێدێت. بۆیە ئەگەر بەرهەمەکانی بڵاویش نەکرێنەوە، لە نووسین سارد نابێتەوە. چەندان نووسەری وڵاتانی جیاواز، لە ئاسیا، ئەفریقا، ئەورووپا، چین و یەکێتیی سۆڤیەتی هەڵوەشاوە، تا ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، سالآنێک ڕێگەیان نەدراوە بەرهەمەکانیان بڵاو بکەنەوە، یان زیندانی کراون، بەڵام ئەوان لە نووسین بەردەوام بوون، چونکە نووسین بەشێک بووە لە ژیانیان.

من لە نووسیندا، بە تایبەت لە نووسینی شیعردا، خۆم دەبینمەوە، لە خۆشمدا بۆ خەون و خەمی هاوبەشی مرۆڤ دەگەڕێم. من چەند زمانم خوێندوون، لە خوێندنەوە، نووسینی باس و توێژینەوەدا، بەڕادەی جیاواز، سوودم لێ وەرگرتوون، چەند بابەتی ئەدەبیم لەو زمانانەوە کردوون بە کوردی. بەڵام هەوڵم نەداوە، لە زمانی کوردی زیاتر، بە هیچ زمانێکی تر شیعر بنووسم. لە دیدارێکدا نووسەر و ڕۆژنامەنووسی سوێدی تیا دیربلووم-ئەندێرسۆن، لێی پرسیم: بۆ بە سوێدی شیعر نانووسی؟

وتم: (دەتوانم بە سوێدی بیر بکەمەوە، بەڵام ناتوانم بە سوێدی هەست بکەم، شیعر دەربڕینی هەست و دنیای ناخە.)[1]

لە بەر ئەوەی تەنیا بە زمانی کوردی شیعر دەنووسم، خوێنەری سەرەکیی شیعرەکانم کورد و کوردستانیانن. بەڵام ئەوەی دەینووسم، بەشی زۆری، هەر پێوەندیی بە ئەوانەوە نییە، بەڵکو پێوەندیی بە خودی مرۆڤەوە هەیە، سەر بە هەر وڵات، زمان و

---

1- ڕۆژنامەی ئوپسالا نیا تیدنینگ ٣ی نۆڤەمبەری ١٩٩٩

Uppsala Nya Tidning

بۆ خوێندنەوەی چاوپێکەوتنەکە بڕوانە: ڕەفیق سابیر، ڕوانین بە ڕووناکیدا، ل. ٣٠٢

کولتوورێـک بێـت. خەم و خەون و ئـاوات و گـرفتە ئینسـانی و وجودییەکـانی مـرۆڤ، لە هەر کـوێ بـن، ئەگەر پێـک نەچـن، لە یەکتـری نـزیکن. کاتێـک لە فەزای ئەدەب و هـونەردا دەردەکەون، مرۆڤ دەتوانێت بیانناسێتەوە و خۆی لەناویاندا ببینێتەوە.

ڕاسـتییەکەی خەون و تراجیـدیای گەلانـی سـتەملێکراو و بندەستیش، ئەگەر بە ڕواڵەت جیاوازییـان هەبێت، لە ناوەرۆکدا لە یەکتـر دەچـن. بـۆ نمـوونە ئەنفـال و کـۆڕەوی بەهـاری ۱۹۹۱ جینۆسـایدی ئێزدییەکـان و کوشـتاری دەرسیم، لەگەڵ کوشـتاری ئەرمەنەکان و جینۆسایدی جولەکە، هۆلۆکۆست، لە سێ سەردەم و شـوێنی جیـاواز، لە لایەن گەلانـی جیـاوازەوە کـراون. بەڵام لە ناوەرۆک و ئامانجدا یەکن، واتـا جینۆسـایدن، قوربانیـانیش هـاوژان و هاوچارەنووسـن. بـۆیە وەکـوو تـاوانێکی دژی مرۆڤـایەتی، سروشتێکی جیهانییان پێ دراوە. بەڵام شێوازی کوشتن و بەهـانە و تەکنیکـی لەنـاوبردنی قوربانیـانی ئەو کارەسـاتانە جۆراوجـۆرن. ڕەنـگە ئەوەش پێوەنـدیی بە ئاسـتی پێشـکەوتنی تەکنۆلۆجیـای کوشـتن و فانتازیـای جەلاد و جیـاوازیی کولتـووریی ئەو گەلانە و ئایـدیۆلۆجیای ئەو لایەنـانەوە هەبێـت، کە ئەو جـۆرە تاوانانەیـان ئەنجام داون.

زۆربەی ئەو کارەسـاتانە جێگـای بـایەخی مـن بـوون، لە ئـازاری خـۆم و نەتەوەکەمەوە، هەسـتم پێکـردوون و لەگەڵیـان ژیـاوم. هـاوژانی و هاوچارەنووسـیی گەلەکەم و گەلانـی تـر، لە چەنـدان قەسیدە، هۆنراوە و نووسیندا، ڕاستەخۆ، یان ناڕاسـتەخۆ، ڕەنگیـان داوەتەوە. بۆ نموونە لە وەرزەبەردینە، چەپکە هۆنراوەکانی بەشـی یەکەمی کۆمەڵەهۆنراوەی ڕوونبوونەوە، قەسیدەی لاوکی هەڵەبجە، وەرزی سەهۆڵبەندان و چەندان نووسیندا.

لـە سـەرەتای ئـەزموونی شـیعریمەوە، ویسـتوومە، سـتایل و تایبەتمەنـدیی شـیعریی خـۆمم هـەبێت، شـیعرەکانم لە ئاسـتێکی گونجاوی هونەری و ئێستێتیکیدا بن. ئەو کاتانەی شیعر دەنووسم، لە دەوروبەرم و تەنـانەت تـا ڕادەیەک لە خوێنـدنەوەش دادەبـڕێم، ئازادانە بە دنیای خـۆم و بیرکـردنەوە و فانتازیاکانمـدا دەگەڕێم. لە ڕەوشـی نووسـیندا، چەنـدان جـار بە ڕەشنووسـی هـۆنراوەکەدا دەچـمەوە و دەسـتکاریی دەکەم. بەلامـەوە گرنـگ نییـە چەنـد دەنووسـم، بـەڵکو گرنـگ ئەوەیـە چـۆن و چـی دەنووسـم. دوای بڵاوکردنەوەی هەر کۆمەڵە هۆنراوەیەک سـەرنجی ڕەخنەگرانە لـە شیعرەکانم دەدەم. دەمەوێت لە کاری دواترمـدا شـێواز و زمـانێکی، هـەر نـەبێت بـە نیسبەت خۆمـەوە، نوێ و جیاواز لـە جـاران بـەکار بهێنم.

بە ڕای من گۆڕینی تەکنیک و ستایلی شیعری، شێوازی نووسین و بەکارهێنـانی زمـانی شـیعریی جیـاواز، بەشـێکن لـە پرۆسێسـی داهێنان.

داهێنان هونەرە، خۆدووبارەکردنەوە خوویە.

## ١
## ئەحلام مەنسوور: پەپوولەی بەر زریان

پـایزی ١٩٧٠ دوای دوو سـاڵ چـاوەڕوانی، لە بەشـی کـوردیی کۆلێجی ئادابی زانکۆی بەغدا دەستم بە خوێندن کرد. لە زانکۆ بە جـۆرێکی مەنهەجـی زمـان و ئەدەب و مێـژووی کـورد و زمـانی فارسی و کۆمەڵێک بابەتی ترم خوێند. وانەکان گران نەبوون، بۆیە کاتی باشم بۆ خوێندنەوە هەبوو، کە زیاتر کتێب و گۆڤـاریی نـوێی کوردی و عەرەبیم دەخوێندنەوە.

لە بەشـی کـوردی ئەحـلام مەنسـوورم ناسـی، کە بە ڕێـکەوت هەردووکمان لە پۆلی یەکەمی ئا (ئەلف) بووین. ئەحلام لە خـانەقین بە عەرەبی خوێندبووی، لە ماڵەوەش، وەکوو هەندێک بنەماڵەی ئەو سـەردەمەی خـانەقین، بە تورکمـانی و شـێوەزاری لـوڕی قسـەیان دەکـرد، بـۆیە ئەوەنـدە بە شـێوەزاری کـوردیی ناوەڕاسـت ئاشـنا نەبوو، بەڵام زمانی عەرەبی باش دەزانی.

زۆری نەبـرد لەگەڵ ئەحـلام بـووینە هـاوڕێ. بـۆی گێـڕامەوە کە پێش ئەوەی بێتە زانکۆ، لە خانەقین کوڕێکی بە نـاوی (ی ج) خـۆش ویستووە، کە لە زانکۆی بەغدا بەشـی قـانوونی خوێندبوو، پێکەوە بڕیاریان دابوو زەماوەند بکەن. بەڵام ئەو کوڕە، کە دواتر بـوو بە بەعسـییەکی ناپـاک و لە هەولێـر پۆسـتێکی گرینگـی پـێ درا،

ناپاکییەکی گەورەی لەگەڵ کردبوو. ئەحلام لەو بارەیەوە دایکیشی بە گوناهبار دەزانی. ئەو ڕووداوە برینێکی قووڵی خستبووە دڵ و هەناوی ئەحلام، کە ساڵانێکی زۆر پێیەوە تلایەوە. ئەو کەسەی سەرچاوەی خۆشەویستی و بەختەوەریتە، دەشێت هەمان کەس ببێتە مایەی ئازار و بەدبەختیت.

ڕۆژێک ئەحلام پێی وتم کوڕێکی خانەقینی، کە ئەفسەر بوو، ناوی جەواد بوو، دەیەوێت بیهێنێت. چەند جار لە بەغدا یەکتریان بینی، بەڵام بێ ئەنجام بوو. هاوڕێیەتیی ئەحلام و من بەردەوام بوو، زۆر ڕۆژ پێکەوە لە کتێبخانەی کۆلێجی پەروەردە، یان لە سەنتەری ڕۆشنبیریی بریتانی، کە نزیکی زانکۆ بوو، خەریکی سەعیکردن، خوێندنەوە و قسەکردن بووین. ئەگەر کتێبێکی ئەدەبی یان هزریم بەدڵ بووایە، هانم دەدا بیخوێنێتەوە.

سەرەتا هیچ پێوەندییەکی سۆزداری لە نێوانماندا نەبوو، کەچی قوتابیانی بەشی کوردی و هاوڕێیانمان، ئێمەیان بە دوو دڵدار دەزانی. من ئەوەم بەدڵ نەبوو، چونکە بۆ ناوبانگی ئەحلام خراپ بوو، بۆ منیش باش نەبوو، چونکە لەبەر ئەحلام نەمدەتوانی یارێک پەیدا بکەم، کە زۆر پێویستم بوو. هەوڵم دا پێوەندییەکەمان سنووردار بکەم. دوای تەواوبوونی دەرسەکان، بە بیانووی جۆراوجۆر خۆم لێ دەدزییەوە، بەڵام سوودی نەبوو. لەوە دەچوو هەردووکمان پێویستمان بە یەکتر بوو بێت. هاوڕێیەتی و تەنانەت خۆشەویستییش، بە شێوەیەک لە شێوەکان، جۆرە پێداویستییەکە.

کۆتایی هاوینی ١٩٧٢ پێوەندیی من و ئەحلام، لە ڕەوشی بەردەوامبوونیدا، ئەوینداریی تێکەوت، تا بەهاری ١٩٧٤ بەردەوام بوو. ئەو گۆڕانکارییە زیانی بە هاوڕێیەتیمان گەیاند. ئێمە پلانی پێکەوەژیانمان نەبوو، کەچی هەر یەکەمان چاوەڕوانیی زۆری لە

ئەویتر هەبوو. هەندێک جار لەسەر شتی بچووک و بێبایەخ له یەکتر زیز دەبووین، بەڵام خێرا ئاشت دەبووینەوه.

ئەحلام له بەغدا منی وەکوو هاورێیەک، بە دایک و باوکی ناساند. من حەزم دەکرد ئەو پێوەندییه بپارێزم، بەڵام دەمزانی ڕۆژێک هەر دوایی دێت، چونکه ئەحلام له دڵەڕاوکێدا دەژیا، نەیدەزانی بە دروستی چی دەوێت. هەندێک جار بڕیارێکی دەدا و زوو لێی پەشیمان دەبۆوه. ئەو ناپاکییەی له یەکەم ئەزموونی ئەویندارى لەگەڵی کرابوو، ئازاری دەدا، دەیەویست شوو به کەسێک بکات، که له باری ئابووری و کارەوه له (ی ج) کەمتر نەبێت. تەنانەت له ڕووی تەمەنیشەوه، وەکوو ئەو شەش حەوت ساڵ له خۆی گەورەتر بێت.

ئەحلام هەستی کردبوو که هەندێک گرفتی ڕەوانیی بۆ هاتۆته پێش، ماوەیەکی زۆر سەردانی دوکتۆری ڕەوانیی کرد. چەندان جار تا بەردەرگای کابینەی دوکتۆرەکەی، د.حەقی، که له مەیدانی ئەلتەحریر بوو، لەگەڵی چووم. من هانم دەدا سەرقاڵی خوێندنەوەی ڕۆمان و ئەدەبیات بێت، بۆ ئەوەی بکەوێتە ناو دنیایەکی تر، له ئازار و کارکردی ئەو ناپاکییەی لەگەڵی کرابوو، دەرباز ببێت.

ڕۆژێک ئەحلام زۆر شڵەژاو و بێتاقەت بوو. بۆی گێڕامەوه خوشکی هاوڕێیەکی له بەغدا، کوڕێکی خۆش دەوێت، کوڕەکه بەڵێنی پێ داوه بیهێنێت، بەڵام درۆی لەگەڵ کردووه، کچەکەی کردووه بە ژن و وازی لێ هێناوه. ئەحلام بە جۆرێکی ورد ڕووداوەکەی گێڕایەوه، باسی خەفەت و بێهیوایی کچەکەی کرد. شێوازی گێڕانەوەکه و هەڵچوون و قسەکانی، هێندەی ڕووداوەکه سەرنجیان ڕاکێشام. ئەحلام وتی:

دەبێ یارمەتیی ئەو کچە بدەین.

وتم: چی بۆ بکەین؟

وتی: دەبێ پارەی بۆ کۆ بکەینەوە بچێتە لای دوکتۆر چارەسەری بکات.

ئەو کاتە لە بەغدا دوکتۆرێکی ژن، لە نزیک (مەیدانی ئەلنەسر) کابینەی هەبوو، چارەسەری ئەو کچانەی دەکرد، کە توشی گرفتی لەو جۆرە دەهاتن. ئەو ڕۆژە هەر پێنج دینارم پێ بوو، ئەویشم دا بە ئەحلام و وتم:

ئەو ڕووداوەی بۆت باس کردم، وردتر و فراوانتر بنووسەوە، زیاتر باسی کچەکە و حاڵەتی دەروونیی ئەو بکە، ئەوە بۆ خۆی بابەتی چیرۆکێکە.

ئەحلام سەرەتا دوودڵ بوو، وتی: زەحمەتە هەموو ئەو شتانە بە کوردی بنووسم.

وتم: هەوڵ بدە، ئەوەی نەتتوانی بە شێوازی گونجاو بە کوردی بینووسیت، بە عەرەبی بینووسە و پێکەوە پێیدا دەچینەوە.

دوای دوو هەفتەیەک گرفتی کچەکە چارەسەر کرا. ئەحلام ئارام بۆوە و بەسەرهاتەکەی نووسیبووەوە، پێشانی دام و پێکەوە پێیدا چووینەوە. هەندێک سەرنجی هونەریم لەبارەی چیرۆکەکە وت. چەند بڕگە و کۆپلەمان پاش و پێش خست و ئەو ڕستانەی بە عەرەبی نووسیبوونی کردمانن بە کوردی. ئەوەندەی ئاگادار بم، ئەوە یەکەم چیرۆکی ئەحلام مەنسوور بوو، وا بزانم دواتر ساڵی ١٩٧٤ بە ناوی (خەونێکی ونبوو) بڵاو کرایەوە.

هەر لەو کاتانەدا بوو (پایزی ١٩٧٣) ئەحلام چەند کورتەوتاری بە ناوی (ئافرەت گیانلەبەرێکی چەوساوەیە) بە عەرەبی نووسی، من کردمن بە کوردی، لە ڕۆژنامەی هاوکاریدا بڵاو کرانەوە.

بەیانییەکی ئاداری ١٩٧٤ ئەحلام بە جۆرێکی چاوەڕواننەکراو، بەڵام بڕیاردەرانە وتی:

پـــوورزایەکم هەیە ئەنـــدازیارە و لە یەکێتیـــی ســـۆڤیەت خوێندوویەتی، چەند ساڵێک لە لیبیا کاری کردووە و هاتۆتەوە عێراق. دەیەوێت بمخوازێت، منیش بڕیارم داوە شووی پێ بکەم، بۆیە ناتوانین یەکتر ببینین.

بەو بڕیارە لەناکاوەی ئەحلام حەپەسام! ئەو مافی خۆی بوو شوو بە هەر کەسێک بکات. پێوەندیی ئێمە ئازادانە بوو، هیچ بەڵێنێکمان بە یەکتر نەدابوو کە پێکەوە بژین. بەڵام چۆن ئەحلام توانی بەو ئاسانییە بڕیاری هێندە گرینگ بدات؟ یان بۆ بەو شێوازە زبرە بڕیارەکەی بە من دەڵێت؟!.

دوای نزیکەی دوو مانگ، پلانی شووکردنەکەی ئەحلام سەری نەگرت. پێوەندیی ئێمەش کۆتایی هات. زۆری نەخایاند خوێندنی زانکۆش تەواو بوو. من کرام بە سەرباز و ئەحلام لە بەغدا، لە دەزگـــای هاوکـــاری دامەزرا. دواتـــر وەکـــوو چیرۆکنووســـێک دەرکەوت، تێکەڵـی کەشـوهەوای پڕ لە ئیرەیـی نووسـەران بـوو. ئەوەش بە نۆرەی خۆی گرفتـی زیـاتری بـۆ دروسـت کـرد، بـۆیە بـاری دەروونیـی باشـتر نەبـوو. ئەگەر پێوەنـدیی سـۆزداری لە نێوانماندا نەبووایە، بە دوو هـاوڕێی نزیک دەمـاینەوە و دەمتـوانی پشتی بگرم و هاوکاریی بکەم.

دوای ئەوە لە بەغدا بەڕێکەوت ئەحلامم دەبینی و سڵاومان لە یەکتر دەکرد. هەندێک قسە و قسەڵۆکم لەبارەیەوە دەبیست، کە زۆربەی بەرهەمی خەیاڵی کەسانی تر بوون.

لە ئەیلولی ١٩٧٨ عێراقم بەجێ هێشت، دوای سی ساڵ، پایزی ٢٠٠٨ لە سەنتەری کوردۆلۆجی لە سلێمانی، ئەحلامم بینییەوە، کە

بۆ سەردانم هاتبوو. بە بینینی هەم دڵخۆش و هەم خەمبار بووم. خەمبارییەکەم لە بەر ئەوە بوو کە لە ڕووی ڕەوانییەوە هیلاک بوو، لە ڕووی جەستەییشەوە هێندە گۆڕابوو، کە لانی کەم پازدە ساڵ، لە تەمەنی خۆی گەورەتر دیاربوو. یەکسەر هۆنراوەی (ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان پێک بگەینەوە)م بیر کەوتەوە، کە ساڵی ١٩٩٥ بە یادی ئەو لە سوێد نووسیم.

ئەحلام نزیکەی دوو سەعات لە ژوورەکەم دانیشت. بە درێژایی ئەو ماوەیە قسەی کرد و من گوێم گرت، وەکوو ئەوەی بیەوێت لەو سەردانەیدا، بەسەرهاتی زیاتر لە سی ساڵەی خۆی بۆ من بگێڕێتەوە. لەو ماوە کورتەدا ١٠ جگەرە زیاتری کێشا. ئەحلام بێتاقەت و دڵپڕ دیار بوو، بەزمانێکی زبر و پیاوانە دەدوا. بە ئاشکرا دیاربوو کەسێکی بەختەوەر نییە، بێزار و پەرێشانە. ڕەنگە لەژێر قورسایی ڕابردوو، فشاری تەنیایی و دۆخی دارماوی سیاسی، کۆمەڵایەتی و کولتووریی کوردستاندا، شەکەت و بێ هیوا بووبێت. ئەحلام خواحافیزی کرد و دوای ئەوە نەمبینییەوە.

ئەحلام کەسێکی کراوە، بێ باک، مرۆڤدۆست و میهرەبان بوو. بە سەردەم و کۆمەڵ و دەوروبەری خۆی نامۆ بوو. بە ڕواڵەت ڕووخۆش و شاد دەردەکەوت، بەڵام بەختەوەر نەبوو. بەتەنگ هەر کەسەوە بوو، خۆی و ژیانی تایبەتی خۆی نەبێت. دوای ئەو ناپاکییەی کەسی نزیکی خۆی بەرانبەری کردبوو، هێشتا بە ئاسانی وێنەی منداڵ متمانەی بە هەرکەس دەکرد. ئەوە بەشێک بوو لە سروشت و کەسایەتیی ئەحلام. ڕەنگە ئەو دڵپاکییەی سەرچاوەیەکی تری نارەحەتی و بەدبەختیی ئەو بووبێت، چونکە هەندێک جار، کەسانی بچووک و نەفسنزم، کە تێی نەدەگەیشتن، سوودی خراپیان لە دڵپاکی و متمانەی ئەو دەبینی، یان لە بەرامبەر

چاکەی ئەحلامدا، گرفتیان بۆ دروست دەکرد.

ئەحلام کچێکی بوێر و ڕووناکبیر بوو، بە خێرایی گەشەی کرد. بۆچوونی لەبارەی مەسەلەی دادپەروەری و ئازادی، بوێرانە بوو. یەکسانیی نێوان ژن و پیاوی، مەبەست و ئامانج بوو. ئەو پرینسیپ و بۆچوونانە بناخەیەکی پێوەندیی نێوانمان بوو.

ئەحلام خۆی توانایەکی ڕووناکبیرانە و داهێنەرانەی هەبوو. ڕەنگە من یارمەتیم دابێت ئەو توانایەی چالاک بکات، خۆی لەو بارەیەوە، لە دیداری ئەدەبیدا، قسەی کردووە.

ئەحلام لە ١٠-١-٢٠١٣ کۆچی دوایی کرد. ئەحلام پەپوولەی بەر زریان بوو، مرۆڤانە ژیا و تاسەر وەکوو مرۆڤ مایەوە.

**چەند کۆپلەیەکی هۆنراوەکە:**

ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان پێک بگەینەوە
ئاخۆ یەکتری بناسینەوە؟
ئاخۆ لە زمانی یەکتر بگەین؟
ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان پێک بگەینەوە
ئاخۆ بەهانەیەک بدۆزینەوە بۆ ئاخاوتن؟
یان دەرفەتێک بۆ لێکبوردن؟

ئێمە بە مەیلی شێتبوون دڵداریمان دەکرد
بە مەیلی گومڕابوون باوەڕمان دەهێنا
بە مەیلی کۆچ بە وڵاتێکدا ڕاماندەکرد
کە خووی بە شەڕەوە گرتبوو
وڵاتێک قەت ڕۆژێک لە ڕۆژان
وڵاتی من و تۆ نەبوو!

ئێمە دوو سەرگەردانین لە کۆلانی تەنیاییدا
نە من و تۆ بە یەکتری دەچین، نە خەونەکانمان
نە پەیڤەکان وەک جاران سەرەتایەکن،
نە ئەڤین و باوەڕ مانایەک دەدەن بە ژیان.
وڵاتیش ئێستا حیکایەتێکی خوڕافییە
وڵات کۆلانێکی بەستراوە بۆنی تەنیایی
بۆنی ترس و باروت و نامۆیی لێ دێت
وڵات تەرمێکی هەڵامساوە
شەپۆلێک دوای خۆرئاوابوون بێباکانە
تووڕی دەداتە کەنار
منداڵێکی برسییە وڵات،
لە پێکەنین و گڕوگاڵ کەوتووە
شاعیرێکە
"لە ژانی شەوەکانیدا وشەی بیر چۆتەوە"
گەورەکچێکە
لە فنجانی قاوەدا بۆ داهاتووی خۆی دەگەڕێت
شووشەیەکی بەتاڵە وڵات
بەرەبەیان سەرخۆشێک لە مەیخانەیەکدا بەجێی دێڵێت
بێوەژنێکە
بکوژێک و شاعیرێکی دەربار پێکەوە زەوتی دەکەن
یان وڵات دوو دڵداری لێکدابڕاوی وەک من و تۆیە
کە ڕەنگە یەکتری نەناسنەوە
ئەگەر بە ڕێکەوت ڕۆژێک لە ڕۆژان پێک بگەنەوە.

## ٢
## پرسی نوێخوازیی ئەدەبی و ڕوانگە

سەرەتای حەفتاکان، لە سایەی ئاشتیدا، بزاڤێکی نوێی ئەدەبی، هونەری و ڕووناکبیری، لە کوردستانی عێراق دەستی پێ کرد. لە ماوەیەکی کورتدا وزەی ڕووناکبیریی گەلی کورد، کە نۆ ساڵ بوو سەرکوت و خەفە کرابوو، بە ناوەڕۆکی تازەوە، لە شێوەی ئەو بزاڤەدا دەرکەوتەوە. نەوەیەکی نوێی نووسەران، هونەرمەندان و ڕووناکبیران، کە لەسایەی شەڕدا گەورە بووبوون، لە بواری جۆراوجۆری نووسین، ئەدەبیات و هونەردا دەرکەوتن. ئاشتی و هیوای ژیانێکی نوێ، سەریان هەڵدا. کولتووری شار بووژایەوە، بەرەو ئەوە دەچوو جێگا بە کولتووری شەڕ و زەبرپەروەریی شاخ بگرێت. لەو دۆخەدا نوێکردنەوەی ئەدەب و هونەری کوردی، بوو بە پێداویستییەکی ژیانی ڕووناکبیری و کۆمەڵایەتی.

لە ناوەڕاستی شەستەکانەوە مەسەلەی نوێخوازی و نوێکردنەوەی شیعر و ئەدەبی عەرەبی، لەناو نووسەرانی عەرەب و عێراقدا، بابەتی ڕۆژ بوون. کۆمەڵێک شاعیری نوێخوازی عەرەب لە لوبنان، لەوانە ئەدۆنیس، ئەنسا ئەلحاج، خەلیل ئەلخوری و چەند شاعیری تر، کە ئاگاداری بزاڤە ئەدەبی و هونەرییەکانی ئەورووپا بوون، بانگەشەی نوێخوازی و گۆڕینی

شـیعری عەرەبییـان کـرد، گۆڤارێکیـان بە نـاوی (الشـعر) بـڵاو کردەوە.

سـاڵی ١٩٦٩ سـێ شـاعیری عێراقـی، فازیـل ئەلـعەزاوی، فەوزی کەریـم، سـامی مەهـدی، لەگەڵ شـاعیری فەلەسـتینی خالیـد عەلـی مسـتەفا، بـانگەوازێکی ئەدەبییـان لە بەغـدا، بە نـاوی «بـانگەوازی شـیعر٦٩» ڕاگەیانـد. ئەوان داوای گـۆڕینی شـیعری عەرەبـی و داهێنانی ستایلێکی نوێی شیعرییان کرد. دواتر گۆڤارێکیان بەناوی (شـعر ٦٩) بـڵاو کـردەوە. بـانگەوازەکە زایەڵەی لەنـاو نووسـەرانی عەرەبـدا، لاواز بـوو، ئەوەنـدەی بـزانم شـتی ئەوتـۆی لەبـارەوە نەنووسـرا. بەڵام لەنـاو چەنـد نووسـەری کـورددا، وەکـوو دیـاردەیەکی نـوێ، بـایەخی پـێ درا، مەیلـی نوێخـوازی و خواسـتی گۆڕینی ئەدەبی کوردی، لای کۆمەڵێک نووسەر بزواند.

لەو کەشـوهەوا سیاسـی و ئەدەبییـەدا، پێـنج نووسـەر، شـێرکۆ بێکەس، حوسێن عارف، جەلال میرزا کەریم، جەمـال شـارباژێڕی و کـاکە مەم بۆتـانی، لە ٢٥-٤-١٩٧٠ (بـانگەوازی ڕوانـگەی ئەدەبـی کوردیی نوێ)یان بڵاو کردەوە. بانگەوازەکە بە چاولێکەری، یـان بە هاندانی بـانگەوازی (شـیعر ٦٩) بـوو، بەڵام بە نەفەسـێکی سیاسـیی نەتەوەیـی نووسـرابوو. داوای دەکـرد ئەدەبـی کـوردی گـۆڕانی بەسـەردا بێـت و نـوێ بکـرێتەوە. کۆمەڵێـک نووسـەر، بەتـایبەت نووسەرە لاوەکان، پشتگیریی بانگەوازەکەیان کرد. بەڵام بەشـێکی نووسـەرانی پەنجاکـان و شەسـتەکان و هەنـدێک چەپـی مارکسـی و ماویسـتی، دژی بـانگەوازەکە وەسـتان و کەوتـنە ڕەخنەگـرتن. بەشـێک لەو ڕەخنـانە بە مەبەسـتی، سیاسـی نووسـران، بەشـێکی تریان پشتیان بە تێگەیشتنێکی میکانیکیانەی ئایدیۆلۆجی بەسـتبوو، کە هەنـدێک جـار تـێکەڵ بە کێشـەی کەسـی دەکـران. بەگشـتی

زۆربەی ڕەخنەکـان پێوەنـدییەکی ئەوتۆیـان بە شـیعر و ئەدەبـی مـۆدێرن و لایەنـی ئێسـتێتیکیی ئەدەبیـاتەوە نەبـوو، بەڵکـو زیـاتر نووسینی کۆمەڵایەتی، ئایدیۆلۆجی و سیاسی بوون.
ئەو سەردەمە، لە وڵاتانی ناسراو بە عەرەبی، بەهاری کودێتای عەسکەری و بانگەوازی ئەدەبی بوو. کۆمەڵێک گەنج، بە خەونی گەورەوە چاویان لە داهاتوو بڕی بوو، پێیان وابوو دەبێ مێژوو لە خۆیانەوە دەست پێ بکات. لەناو ئەو نەوە نوێیە، ئەفسەری لاو، یان شاعیر و نووسەری لاو، هەڵپەیان بوو بە کودێتایەک، خێرا نەوەی پێشوو لابدەن خۆیان لەسەر تەختەکە، تەختی پاشایەتی- سیاسی، یان تەختی "پاشایەتی"ی ئەدەبی دابنیشن.[1]

بـانگەوازە ئەدەبییـەکە، کە دواتـر بە بـانگەوازی ڕوانـگە ناسـرا، دەرگای بۆ باس و ڕەخنە و نووسینی ئەدەبی، لەبارەی نوێخوازی و نوێکردنەوەی ئەدەبی کوردی، کردەوە. کەشوهەوای ئەدەبی لە کوردستان، جوڵە و بزاوتێکی نوێ و ڕووناکبیرانەی تێکەوت. ئەو وتـار و نووسـینانەی لایەنگـران و نەیـارانی ڕوانـگە لەبـارەیەوە نووسـییان، زۆر لە بـانگەوازەکە کـاریگەرتر بـوون، چـونکە دەرفەتیان ڕەخساند پرسی نوێخوازی و گۆڕینی ئەدەبی کوردی، وەکوو بابەتی ڕۆژ، بە فراوانی و لە گۆشەنیگای جیاوازەوە باس بکرێن. لە هەمان کاتدا ئەو نووسینانە ڕوانگەیان لە قەبارەی خۆی زۆر زلتـر پێشـان دا. تەنـانەت چەنـد نووسـەر پرۆسێسـی نـوێکردنەوەی شـیعری کوردییـان لە حەفتاکانـدا، بە ڕوانـگەوە

1- لە فیستیڤالی یەکەمی شیعری کوردی (١٩٧١) ڕێگا نەدرا زۆربەی شاعیرە لاوەکان بەشدار بن. شاعیران لەتیف هەڵمەت و ئەنوەر (فەرهاد) شاکەلی پرۆتێستیان کرد و بوو بە دەنگەدەنگ. دواتر هەڵمەت وتی ویستمان (کودەتا) بکەین. شاکەلیش ساڵی ١٩٧٣ یەکەم کۆمەڵەهۆنراوەی خۆی ناو نا: پرۆژەی (کودەتا)یەکی نهێنی.

بەســـتەوە، کە ئەو بۆچـــوونە تەنیـــا نـــاهەقی نیـــیە بەرانـــبەر بە نەوەیەکی ئەدەبی، بەڵکو بۆچوونێکی چیخبڕ، لایەنگرانە و هەڵەیە.

بەشێکی ڕووناکبیرانی کورد ئاگاداری بانگەوازی نوێخوازی و بەرهەمـی شـاعیرانی نوێخـوازی عەرەب و عێراقـی بـوون. بـۆیە وێرای ڕوانگەییەکان، چەند شاعیر و نووسـەری تری لاو هەبوون، کە بە چـاولێکەری، یـان کـارکردی گروپـی شـیعری ٦٩ بانگەشـەی گۆڕین و نوێکردنەوەی شیعر و ئەدەبی کوردییان دەکرد. بەڵام تـا ئەوکـاتە، کە کورسـتان لەنـاو دۆزەخـی شـەڕدا بـوو، نووسـەر و شـاعیری کـورد، ئاگـای لە شـیعری مـۆدێرنی ئەورووپـایی نەبـوو، تەنـانەت بە باشـی بە شـیعری مـۆدێرنی عەرەبـی، دوای قۆنـاخی بەدر شـاکر ئەلسـەیاب، ئاشـنا نەبـوو. هـیچ گروپێکـی ئەدەبـی دەرنەکەوتبوو، کە تیئۆری و تێزێک لەبارەی ئەدەبی مۆدێرن و گۆڕینی شیعر و ئەدەبی کوردی، بخاتە ڕوو. ئەوەی هەبوو تەنیا هەوڵی تاکەکەسی و ئەو نموونە ئەزمـونگەرییە دەگمەنانە بوون، کە لە ڕووی زمان، لایەنـی تەکنیکییەوە، سـەرنجڕاکێش بوون. تـا ڕادەیەک لە شـیعر و کـورتەچیرۆکی پەنجاکـان و شەسـتەکان جیـاواز بـوون، بەڵام شـێعرەکان بە کـارتێکردنی شـیعری نـوێی عەرەبی، بە تایبەت فازیل ئەلعەزاوی و ئەدۆنیس، نووسرابوون. بۆ نموونە کۆمەڵەهۆنراوەی شاعیر لەتیف هەڵمەت (خوا و شـاڕە بچکۆلەکەمان) کە ساڵی ١٩٧٠ بڵاو کرایەوە، سـەرنجڕاکێش بوو، چونکە چەند هۆنراوەیەکیان، لە شیعری کوردیی ئەو سـەردەمە نەدەچوون، سـەرەتای جـۆرە ئەزمـوونگەرییەک بـوون، بەڵام لە کەشـوهەوای شـیعری نـوێی عەرەبـی نزیـک بـوون. چەنـد کـورتەچیرۆکی حوسـێن عـارف و لەتیـف حامیـد بەرزنجـی، لە ڕووی تەکنیـک و بـابەتەوە سـەرنجڕاکێش بوون، وەک هەوڵێکی

گۆڕینی چیرۆکی کوردی دادەندران.

نوێکردنەوەی شیعری کوردی لە حەفتاکاندا، بەردەوامبوونی ئەو پرۆسێسە بوو کە عەبدوڵلا گۆران، پیرەمێرد و شێخ نووری شێخ ساڵح، لە سییەکان و سەرەتای چلەکانی سەدەی پێشوو دەستیان پێ کرد. هەوڵدانیش بوو بۆ داهێنانی شێواز و زمانێکی نوێی شیعری و تێپەڕاندنی ستایلی شیعریی گۆران، کە تا کۆتایی شەستەکان زاڵ بوو.

ئێمە، نەوەی حەفتاکان، لە سایەی شەڕدا گەورە بووبووین. زۆربەمان دنیابینی و تێڕوانینی ئەدەبی و کۆمەڵایەتیمان، هەروا سەرچاوەی ڕۆشنبیری، خەون و ئامانجمان، لە شاعیر و نووسەرانی پێش خۆمان جیاواز بوون. بۆیە ئاسایی بوو، بە شێوازێکی جیاواز لە نەوەی پێشوو بیر بکەینەوە. بە دوای خەونی نوی و ستایلی نوێی شیعری و ئەدەبیی جیاوازدا بگەڕێین و هەوڵ بدەین بە شێوازی تایبەتی خۆمان بنووسین. لەو کەشوهەوا ڕووناکبیرییە باوەی ئەو سەردەمە یاخی ببین. ئەو یاخیبوونە، بۆ هەندێکمان، بەشێک بوو لە یاخیبوونە فراوانەکە، واتا یاخیبوونی کۆمەڵایەتی، سیاسی و کولتووری.

بەشێکمان مەبەستمان بوو بە شێوازێکی جیاواز بنووسین، بەڵام هێشتا لە ڕووی تیئۆری، شێواز و ئێستێتیکییەوە، بەرچاومان ڕوون نەبوو، نەماندەزانی خولیای نوێخوازی بەرەو کوێمان دەبات!. ئەو شێوازە شیعرییەی بە دوایدا وێڵین چۆنە! بە کورتی ئێمە لە بیری جۆرە ئەزموونگەرییەکدا بووین، کە بە تەواوی ڕوون نەبوو چی دەکەین و بە کوێ دەگەین. دوای ماوەیەکی کورت، لە ڕەوشی خوێندنەوە، ئەزموون و نووسیندا، بەرچاومان ڕوونتر و جیهانبینی و تێگەیشتنمان بۆ شیعر فراوانتر بوون، تایبەتمەندیی

شیعرەکانمان باشتر دەرکەوتن.

هەر دیاردەیەکی نوێ سەرەتا نامۆ دیارە و دەشێت ناڕوون دەربکەوێت. زۆر کەس لەجیاتی ئەوەی هەوڵ بدەن تێی بگەن، بە گومانەوە بۆی دەڕوانن. هەندێکی تر دژایەتی دەکەن، چونکە لەگەڵ هزر و تێڕوانینی ئەواندا ناگونجێت و بە هەڕەشەیەکی دەزانن. مرۆڤ ئەگەر وریای خۆی نەبێت، لەوانەیە بە جۆرێک لەناو هەست و هزر و قەناعەتەکانیدا بەند ببێت، کە توانای تێگەیشتن و قبووڵکردنی دیاردەی نوێ و جیاوازی کەم ببێتەوە، یان نەمێنێت.

لە سەرەتای حەفتاکاندا زۆرینەی نووسەرە ناسراوەکانی کوردستان، بە گومانەوە بۆ بزاڤی نوێی شیعری کوردییان دەڕوانی. هەندێکیان پێیان وابوو ئەو شاعیرە لاوانە شیعر و ئەدەبی کوردی دەشێوێنن. دەوترا ئەو شیعرانە بە ئەدەبی کوردی نامۆن، تەماوی و ناڕوونن، خوێنەر بە ئاسانی تێیان ناگات، کەچی ئەو شیعرانە، بە دەگمەنیان تەماوی بوون، بەگشتی لای خوێنەری جیدی و لاوانی ئەدەبدۆست ڕوونبوون و چێژیان لە زۆربەیان دەبینی.

حوکمدان لەسەر کارێکی شیعری، لای ئەرستۆ تالیس، پێوەندی بەوەوە هەیە چۆن کار دەکاتە سەر عەقڵی مرۆڤێکی ساغ، کە ئاستی خوێندەواری باشە، مەرج نییە ئەو کەسە شارەزا یان پسپۆڕ بێت. بەگوێرەی ئەو پێوانەیە شێواز و کارسازی (فەنکشن) دوو دەلالەتی هاوئاهەنگن، یەکێکیان دەتوانێت جێی ئەویتریان بگرێتەوە، شیعرێکی باش و بەپێز، چێژێکی تایبەت بە جۆرەکەی خۆی دەبەخشێت.[1]

1- Peter Adamson, Filosofi i den klassiska världen, Översttning: imJakobson, Bokfölaget Thales, Sveig 2022, III

ڕوونی و ناڕوونی تێکستی شیعری مەسەلەیەکی ئێستێتیکییە و تەنیا لە شیعر و ئەدەبیاتدا نییە، بەڵکو لە هونەریشدا هەیە، بۆیە قسەی زۆری لەبارەوە کراوە و دەکرێت. ئەو مەسەلەیە بە بارێکدا ڕێژەییە، ئەو تێکستەی بە لای منەوە ناڕوون، یان ئاڵۆزە، دەشێت بە لای تۆ یان کەسێکی ترەوە ڕوون و ڕەوان بێت، یان بە پێچەوانەوە. چونکە ئاستی خوێندەواری، ڕووناکبیری و ئاشنابوون بە شیعر و ئەدەبیات، لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاوازە. لە بەرانبەر شیعرێکی ناڕووندا باشترە بە دیقەتەوە لێی بڕوانین، تا بزانین ئایا فۆرمی شیعرەکە، یان ناوەرۆکەکەی، یاخود هەردووکیان ناڕوونن!

شاعیر ت س ئێلیۆت ١٨٨٨-١٩٦٥ پێیوایە کۆمەڵێک هۆکار هەن وا دەکەن تێگەیشتن لە شیعرێک، قورس بێت، ڕەنگە لەبەر هۆکاری تاکەکەسی بێت، واتا شاعیرەکە تەنیا بە شێوازێکی تەماوی بتوانێت خۆی دەرببڕێت، ڕەنگە ئەوە جێگای داخ بێت، بەڵام دەبێت خۆشحاڵ بین بەوەی کە شاعیرەکە، بە گشتی توانیویەتی خۆی دەربڕێت. یان ڕەنگە، زۆر بە ئاسانی، شیعرەکە لە بەر ئەوە قورس بێت و تێی نەگەین، چونکە نوێیە، یان خوێنەر وا بزانێت، یاخود وا تێ بگات، کە شیعرەکە خۆی گرانە... دواجار جۆرە قورسییەک هەیە نووسەر شتێکی بۆ خوێنەر بە جێ هێشتووە، کە دەتوانێت بیدۆزێتەوە، خوێنەر پەرێشان بەدوایدا دەگەڕێت، بەڵام بێ سوودە و خۆی بیری بۆ مانایەک، یان مەبەستێک دەڕوات کە لە تێکستەکەدا نییە.[1]

دەشێت هەندێک تێکستی ناڕوون و تەماوی ئەنجامی هەژاریی خەیاڵ و بێتوانایی و نەبوونی ڕوئیای شیعریی بێت. یان

1- Poul Borum, Poetisk modernism, Stockholm, 1968, s.13

وشەڕیزکردنێکی میکانیکیانە و یاریکردنێکی نەزانانە بێت بە وشە و زمان، کە خوێنەری زیرەک هەستی پێ دەکات. چونکە یاریکردن بە زمان، یان مۆسیقا، یاخود تۆپی پێ و هەر ئامێرێکی تر، لە زانین و توانا و ئەزموونەوە سەرچاوە دەگرێت. کەسێک زمانێک بە باشی نەزانێت، چۆن دەتوانێت یاریی پێ بکات! گەمەی زمان تێکشکاندنی ڕستە و گراماتیک نییە. گۆڕینی ناشییانەی وشە نییە لە ماناوە بۆ دەنگ، کە لە سەرەتای سەدەی بیستەم، لە ئەورووپا، لە شیعری مۆدێرندا دەرکەوت، بەڵام زۆر بەردەوام نەبوو. دواتر لە حەفتاکان و هەشتاکانی سەدەی پێشوو، ئەو جۆرە شیعرە، لە ڕێگەی ئەدەبی عەرەبی و فارسییەوە، گەیشتە کوردستان.

بە ڕای من خوێندنەوە، بە تایبەت خوێندنەوەی شیعر، هونەرە. لە بەرانبەر شیعرێکی تەماوییدا، پێویستە بە پەلە بڕیار نەدەین، لەجیاتیان بە هێمنی و بە وردی سەرنجی تێکستەکە بدەین. دەشێت ناڕوونییەکە بەهۆی یەکێک لەو هۆکارانە بێت، کە باس کران.

شیعر بایەخ بە کۆمەڵێک مەسەلەی ئاڵۆز دەدات، کە پێوەندییان بە لایەنی سایکۆلۆجی و ڕۆحیی مرۆڤ، بوون، ژیان، مردن، مەسەلە وجودی و فەلسەفییەکانی ترەوە هەیە. بە زمانێکی پوختە و پەنابردن بۆ ڕەمز، مێتافۆر و جۆرەکانی تری وێنەی شیعری، لەبارەیانەوە دەدوێت. بۆیە دەشێت ئەو جۆرە تێکستانە، بە ئاسانی خۆیان بۆ خوێنەر نەکەوە. هەروا شیعر تەنیا لە مانا پێک نەهاتووە. شیعر، وەکوو لە بەشی پێشتردا ئاماژەم پێ دا، هونەرێکی دوولایەنەیە- دەنگ و وێنە پێکەوە لە شیعردا یەکدەگرن و یەکتری تەواو دەکەن. دەنگ ڕیتمێک بەرهەم دەهێنێت کە هەست و خەیاڵمان دەجوڵێنێت و بەرەو پێشی دەبات. وێنەش نیگارێکمان پێشان دەدات، کە بە شێوازی تایبەتی خۆی دەدوێت. ڕەنگە وێنەکە

ڕوون و مانادار، یان ناڕوون و ئەبستراکت (تەجریدی) بێت. لە تێکستی شیعریدا بەگشتی مانا هەیە، بەڵام مانا بە مەرجێکی هونەری دانانرێت. بایەخی هەر تێکستێکی شیعری، پێش هەر شتێک، پێوەندیی بە ئاستی داهێنان، زمان و لایەنی ئیستێتیکیی تێکستەکەوە هەیە.

پیرەمێرد، کە دیاردەیەکی دەگمەنی ئەدەبی و کولتووریی کوردییە، ساڵی ١٩٣١، بە بۆنەی چاپی یەکەمی دیوانی نالی، نووسیویەتی:

(ئەگەر شیعر بە غایە-وەسیلە نا- عەد بکرێت و ئەگەر شیعر عیبارەت بێ لە سەنعەتێکی بەرزی بەدیعی... و ئەگەر لە شیعردا ئیبداع شەرتێکی ئەعزەم بێت، بێ گومان نالی گەورەترین شاعیری کوردە.... لە نەزەر نالیدا شیعر ئەسڵ و غایەیە، قەت بە وەسیلەی لە عەمەل نەهێناوە.)[1]

من بەشێک نەبووم لە گرووپی ڕوانگە، بەڵام کار و ئامانجی ئەدەبیی ئەوانم بە باش دەزانی. دوای ئەو هۆنراوەیەی لە بارەگای یەکێتیی نووسەران خوێندمەوە، پێوەندیم لەگەڵیان زیاتر بوو. لەگەڵ ئەوان بەشداریی چەند چالاکیی ئەدەبیم کرد، بۆیە زۆر کەس منیان بە یەکێک لە ڕوانگەییەکان دەزانی.

ساڵی ١٩٧١ لە ژمارەی دووەمی گۆڤاری ڕوانگە، کە تەنیا سێ ژمارەی لێ دەرچوو، شیعرم بڵاو کردەوە. لەگەڵ مامۆستایان حوسێن عارف و جەلال میرزا کەریم برادەر بووم، هەردووکیان نموونەی مرۆڤی بە پرینسیپ و نووسەری داهێنەر بوون، بەڕێزەوە بۆ نووسەرە لاوەکانیان دەڕوانی و پشتگیرییان دەکردن.

---

1- دیوانی نالی، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و فاتح عەبدولکەریم، انتشارات کردستان، سنە ١٣٨٧ ل٧٢٧-٧٢٨

جەلالی میرزا کەریم بەرپرسی گۆڤاری ئەدەبیی بەیان و بەشی ئەدەب و هونەری ڕۆژنامەی هاوکاری بوو. دەسەڵاتی ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی بەرهەمی نووسەرانی هەبوو. بەڵام ئەو دەسەڵاتەی بۆ سوودی خۆی بەکار نەهێنا، چونکە خۆپەرست نەبوو، لەجیاتیان بایەخی زۆری بە بەرهەمی نووسەرە لاوەکان و ڕوانگەییەکان دەدا.

لە پایزی ١٩٧٢ ڕوانگەییەکان کۆڕێکی فراوانیان، لە بەغدا، لەبارەی ئەدەبی کوردی ساز کرد. لەو کۆڕەدا، کە ڕۆژێکی خایاند، کۆمەڵێک نووسین و لێکۆڵینەوە، لەبارەی شیعر و ئەدەبی کوردی و ڕەخنەی ئەدەبی پێشکەش کران. چەندان نووسەر و شاعیر، لەوانە حوسێن عارف، شێرکۆ بێکەس، جەلال میرزا کەریم، سەلاح شوان، ئەنوەر قادر محەمەد، عەبدوڵڵا عەباس و نووسەری تر، کە بەداخەوە ناویانم لەبیر نین، بەشدار بوون. منیش باسێکم لەبارەی ڕەخنەی شیعری کوردی پێشکەش کرد.

ساڵی ١٩٧٣ بە دەستپێشخەری جەلال میرزا کەریم، ژمارەیەکی تایبەتی گۆڤاری بەیان، ژمارە هەشت، بۆ ئەدەبی نوێ و بەرهەمی شاعیرانی نوێخواز تەرخان کرا. تیایدا شیعری زۆربەی شاعیرە نوێخوازەکان بڵاو کرانەوە. لە هەمان ژمارەدا دوکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، خوێندنەوەیەکی ڕەخنەگرانەی بۆ هۆنراوەکان کردبوو. ئەوە یەکەمجار بوو، گۆڤارێکی ئەدەبیی کوردی، ژمارەی تایبەت بۆ شیعری نوێ، تەرخان بکات و باسێکی ڕەخنەییش لەبارەی شیعرەکان، هاوپێچ بکات.

ئەوەی سەرنجی من و چەند نووسەری ڕاکێشا دوکتۆر عیزەدین، لە نووسینەکەیدا، تەنیا هۆنراوەکەی منی (لەناو دڵۆپە فرمێسکێکدا) باس نەکردبوو! هۆنراوەکە باسی ڕابەرێک دەکات،

که له بەرامبەر ستەم و بێدادی وەستاوە و پەیامی ئازادی و هیوا بۆ خەڵک دەهێنێت. لەبری ئەوەی پشتگیری بکرێت، ناپاکی بەرامبەر دەکرێت و لەناو دەبردرێت.

لەو کارەی د.عیزەدین سەرم سوڕما، چونکە هۆنراوەکە، لە ڕووی هونەری و لایەنی شیعرییەوە هیچی لە هۆنراوەکانی تر کەمتر نەبوو. بۆیە تێنەگەیشتم بۆچی د.عیزەدین بە تەواوی پشتگوێی خستبوو، تەنانەت بە وشەیەک ناوی نەبردبوو! ئەو کاتە بەسەر خۆم نەهێنا و باسم نەکرد. دواتر لە بۆنەیەک لەو بارەوە پرسیارم لێ کرد، د.عیزەدین وتی:

بۆیە باسی شیعرەکەتم نەکرد، چونکە تۆ مەبەستت لەو سەرکردە شەهیدە سلێمانی موعینییە.

سلێمانی موعینی ڕابەری بزاڤی چەکداریی گەلی کورد بوو، لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان.ساڵی ١٩٦٩ مەلا مستەفای بارزانی، بەدیلی تیرۆری کرد و تەرمەکەشی، لەگەڵ پۆلێک پێشمەرگەی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، ڕادەستی حکومەتی ئێران کرد و هەموو پێشمەرگەکان لەسێدارە دران.

لە کوژرانی مەسیح، سپارتاکۆس و حەلاجەوە تا فەهد، پێشەوا قازی محەمەد، گیڤارا، سلێمانی موعینی و دەیان ڕابەری سیاسی و پێشەنگی هزر و پەیامی مرۆیی، بە غەدر شەهید کراون. د.عیزەدین دەیتوانی بە گشتی باسی ئەو مەسەلەیە بکات، بێ ئەوەی ئاماژە بە ناوی هیچ ڕابەرێکیان بدات، بەڵام لەجیاتیان بەلای هۆنراوەکەدا نەچوو!

ئەو کاتە د.عیزەدین پێوەندیی بە حزبی شیوعی- قیادە مەرکەزییەوە نەمابوو، زۆر لە پارتی نزیک بووبۆوە. کاتێک نووسەرێک، بۆ خاتری دەسەڵاتێک، هزری خۆی سانسۆر دەکات،

زۆر لەوە زیاتر دەست دادەگرێت، کە دەسەڵاتەکە دەیەوێت. خۆسانسۆرکردن لە سانسۆری دەسەڵات ترسناکترە، چونکە سنووری نییە، بۆیە هزر، داهێنان و فانتازیا فەلەج دەکات.

چالاکییەکی تری ڕوانگەییەکان بانگەوازی (ئەی قەڵەمە نەترسەکان یەکگرن) بوو، کە بەشداریم کرد. بانگەوازەکە ڕۆژی ٨-٥-١٩٧١ لە ڕۆژنامەی هاوکاری، ژ. ١٧، لە دژی هەندێک مەلای کۆنەپەرست و شەرفرۆشی کوردستان بڵاو کرایەوە. ئەو مەلایانە، کە خۆیان بە نوێنەری خودا لەسەر زەوی دەزانی، لە بڵندگۆی مزگەوتەکانەوە، بە ناوی ئاینەوە، شاڵاوی فراوانیان دەکردە سەر ژنان و ماف و ئازادیی ژن و ڕووناکبیرانی ئازادیخواز.[1]

ئەو ساڵانە لە سایەی ئاشتی و بوژانەوەی ژیانی ئابووری و کولتووری، سەرەتای گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی دەستی پێ کردبوو. ژنان بە جۆرێکی فراوان، لە بواری خوێندن و کارکردندا دەرکەوتبوون. پرسی ئازادیی ژن، یەکسانبوونی نێوان ژن و پیاو، بە گەرمی باس دەکران. لەو دۆخە نوێیەدا، چەند مەلای توندڕەو ویستیان ڕێگای ئەو پێشکەوتنە کۆمەڵایەتی و کولتوورییە بگرن. بە هەڕەشە، جنێو، تۆمەت و بوختان، کە لە مەلای بەحورمەت ناوەشێتەوە، ژنانی ئازادیخواز و ڕووناکبیر چاوترسێن بکەن.

بانگەوازەکە ناوەرۆکێکی پێشکەوتنخوازانە و بوێرانەی هەبوو، بەڵام بە زمانێکی توند نووسرابوو. لەگەڵ بۆچوونی چەپ و مارکسییانەی من، سەبارەت بە ئازادیی ژن و بەرەنگاربوونەوەی کۆنەپەرستی، دەگونجا، بۆیە پشتگیریم کرد. بانگەوازەکە، لە ٨ی ئایاری ١٩٧١، لە ژمارە ١٧ی ڕۆژنامەی هاوکاری، بە ناوی ئەم نووسەر و هونەرمەندانەوە، بڵاو کرایەوە:

---

1- وێنەی بانگەوازەکە، لە کۆتایی ئەم کتێبەدا هەیە، بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە ١.

شێرکۆ بێکەس، حوسێن عارف، جەلال میرزا کەریم، کاکەمەم بۆتانی، تاهیر سالح سەعید، سەلاح شوان، عەبدوللا عەباس، ڕەفیق سابیر و ئەحمەد سالار.

بانگەوازەکە کاردانەوەی توند و چاوەڕواننەکراوی بە دوای خۆیدا هێنا. ئەو مەلا شەڕفرۆشانە، هێرشی فراوانیان دژی ئێمە دەست پێ کرد. ناوی ناوی ئێمەیان بلاو کردەوە و داوای سزادان، تەنانەت لە سێدارەدانی ئێمەیان کردبوو. پەنایان بۆ مەلا شیعەکانی نەجەف و کەربەلا برد، تا دژی ئێمە بوەستن و پشتگیرییان بکەن. ئەو مەلایانەی ئەندامی ئەنجومەنی زانایانی ئیسلامی، لەوانە مەلا عەلی هەڵەبجە، سەر بە پارتی بوون و هێزی خۆیان لە پارتی وەردەگرت. داوایان لە سەرۆکی پارتی، مەلا مستەفای بارزانی، کرد سزامان بدات. چەند تومەتیان دایە پاڵ ئێمە. بێویژدانییان گەیشتە ئاستێک دەیانوت، ئێمە، بە هاندانی حکومەتی عێراق ئەو کارەمان کردووە. لە بەرانبەر ئەواندا چەندان لایەنگری بانگەوازەکە، کە ڕووناکبیر، گەنج و قوتابی زانکۆ بوون، لە ڕێگەی ڕۆژنامەی هاوکارییەوە، پشتگیریی بانگەوازەکەیان کرد.

ئەو کێشەیە چەند هەفتەی خایاند. موفتیی ئەودەمی هەولێر، موفتی ڕەشاد، فەتوایەکی دا، ناوەڕۆکەکەی ئەوە بوو:

"بانگەوازی قەڵەمە نەترسەکان، دژی ئایینی ئیسلام نییە".

دوای ئەوە دۆخەکە کەمێک ئارام بۆوە، بەڵام کێشەکە تەواو نەبوو، هێشتا لەژێر هەڕەشەدا بووین. من لە دیمانەیەکدا وتوومە:

هەر ئاین و هزر و فەلسەفەیەک، چەند مەزن بن، سەرەنجام هێندەی سەری ئەو کەسانەیان لێ دێت، کە پێڕەوی دەکەن. لەناو سەری گەورە، ڕووناک و کراوەدا ئاین، هزر و فەلسەفە، گەورە و ڕووناک و مرۆڤدۆستانە دەنوێنن، لەناو سەری بچووک، بەتاڵ و

تاریکدا، وەکوو ئەوانیان لێ دێت.

ئێمە هەموومان، بە ڕادەی جیاواز نیگەران بووین، نەماندەزانی ئەو پەلامار و تومەتانە بە کوێ دەگەن، چۆن و کەی دواییان دێت! بەڵام شێرکۆ بێکەس، لە هەموومان نیگەرانتر بوو. چونکە ئەو پێشتر لە ڕادیۆی پارتی لە شاخ، کاری کردبوو، لە شەڕی نێوان مەلایی و جەلالیدا، شیعری لە دژی جەلالییەکان نووسیبوو، بۆیە پشتی بە پارتی قایم بوو. مەبەستی بوو پێوەندیی خۆی لەگەڵ پارتی بپارێزێت. لەو دۆخەدا، بە ئەو شاڵاوە و ئەنجامە نادیارەکانی، کاک شێرکۆ هۆنراوەیەکی زۆر کورتی بۆ مەلا مستەفای بارزانی نووسی، کە لە ٤ی ئەیلولی ١٩٧١ لەگەڵ چاوپێکەوتنێکی خێرا، لە ڕۆژنامەی هاوکاری بڵاو کرایەوە:

خۆشمان ئەوێی
ئەمانەوێی
وەک گولله بۆ چەکەکانمان
وەک باران بۆ کێڵگەکانمان
وەک بەفر بۆ چیاکانمان
هەر بۆ مەرگە نامانەوێی
ئەی بەرزانی.)[1]

هەروا کاک شێرکۆ، لە چاوپێکەوتنەکەدا لەبارەی بارزانی وتی:

(لە هەر کاتێکا ئەو بەرهەمانەی لە ئەدەبا و کە پەیوەنییان بە شۆڕشی کوردەوە هەیە، ئەی هێنمە کایەوە، لە کاتی لەدایک بوونیانا، لە گەرمەی ژانی هەڵچوونیانا، وێنەی زیندووی سەرۆک بارزانیم لە بەر چاوە و لە باڵا و ئاوینەی هۆشما لە هات و چۆ کردندایە، من هەر بەرهەمێ کە بۆ شۆڕشم ووتبێ، واتا بۆ

1- هاوکاری، ژ. ٣١، ٤ی ئەیلولی ١٩٧١ لاپەڕەی ئەدەب و ژیان.

سەرۆک بارزانیشە، وە ئەمە لە ناخی دڵمەوە سەر هەڵ ئەدا.)

لەناو شاعیرە گەنجە نوێخوازەکانی ئەو ساڵانەدا، جەلال میرزا کەریم و عەبدوڵلا پەشێو، کە پێشتر لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسی بوو، شیعریان بۆ ستایشی مەلا مستەفای بارزانی نووسی.

دوای ئاشبەتاڵ، کاک شێرکۆ لە قەسیدەی کۆچدا، بە توندی ڕەخنەی لە مەلا مستەفای بارزانی گرت. وتی گوایا ئەو شیعرەی دوای پیلانی کوشتنی بارزانی، کە لە ۲۹ی ئەیلولی ۱۹۷۱ڕووی دا، نووسیوە. کەچی شیعرەکە و چاوپێکەوتنەکە ۲۵ ڕۆژ پێش ئەو پیلانە، لە ٤ی ئەیلولی ۱۹۷۱ بڵاو کراونەتەوە.[1]

ئەو ئەزموونەی کاک شێرکۆ، ڕەنگە بۆ ئەو تاڵ بووبێت، بەڵام بۆ شاعیرانی تر، دوو جار بەسوودە. یەکەم، نووسینی شیعری ستایشئامێز، لەبارەی سەرکردەی سیاسی، کە هێشتا لە ژیاندایە، یان بنەماڵەکەی دەسەڵاتدارە، کاری شاعیری داهێنەری وەک ئەو نییە. ئەو کارە بەشێک نەبووە و نییە لە نەریتی شیعری کوردی. دووەم، ئەگەر شاعیر بە هەر مەبەستێک پەنا بۆ ئەو جۆرە کارە نەشیاوە ببات، هەق نییە بەهانەی بێ بنەمای بۆ بدۆزێتەوە.

چارلی چاپلین، کاتێک سەردانی ماهاتما گاندی ۱۸٦۹-۱۹٤۸ دەکات، گاندی دەستی چاپلین ماچ دەکات، چاپلین پێی دەڵێت:

-مۆڵەتم پێ بدە منیش دەستت ماچ بکەم.

گاندی دەڵێ:

-نا، نابێت هونەرمەند تا ئەو ڕادەیە، لە سیاسەتمەدار، دڵنیا بێت.

***

1- بڕوانە: هاوکاری ژ. ۳۵ ڕۆژی ۲ی تشرینی دووەم ۱۹۷۱ سەروتاری ئەو ژمارەیەی هاوکاری لەبارەی ئەوڕووداوە نووسراوە.

لەگەڵ ئەو بزاڤە نوێیە ئەدەبی و هونەرییەی لە سەرەتای حەفتاکاندا سەری هەڵدا، دیاردەی فرەدەنگی و فرەڕەنگیی شیعری، ڕوونتر و فراوانتر لە شیعری کوردیدا دەرکەوتن. شاعیرە دیارەکانی حەفتاکان کۆمەڵێک دەنگی نوێی جیاواز و تایبەتن، لاسایی شاعیری تری کورد، یان لاسایی یەکتریان نەکردۆتەوە. خولیای نوێخوازی و گۆڕینی شیعری کوردی، ئامانجی زۆرینەیان بوو. شاعیرە نوێخوازەکان، بەوانەشەوە کە لە کۆتایی شەستەکان کۆمەڵەهۆنراوەیان بڵاو کردبۆوە، لە یەک قۆناخدا، سەرەتای حەفتاکان، ڕوویان لە نوێخوازی کرد. بەڵام هەر شاعیرە بەپێی پاشخانی هزری، ڕووناکبیری و تێگەیشتنی خۆی لە شیعری مۆدێرن و ئەزموون و دنیابینیی خۆی، شیعری نووسی و بەشداریی بزاڤەکەی کرد. ڕەخنەگری ئەدەبی دەتوانێت لەم بارەیەوە دادوەری بکات. بۆیە شێواز و دنیابینیی شیعریی چەندان شاعیری نوێخوازی حەفتاکان، کەم تا زۆر، لە یەکتر جیاوازن و تایبەتمەندیی خۆیان هەیە.

ڕاستییەکەی هەر شاعیرێک دەبێت دەنگێکی سەربەخۆ بێت و لە شاعیری تر نەچێت. فرەدەنگی و جیاوازیی شێواز و زمانی شیعری، جۆرە تایبەتمەندییەکی بەشێکی شاعیرانی حەفتاکانە و نیشانەی جۆراوجۆریی دەنگە شیعرییەکانە. ئەوەش ئەنجامێکی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی، خوێندەواری و بەمۆدێرنبوونی شیعر و ئەدەبیاتی کوردییە. ئەو فرەڕەنگی و فرەدەنگییە، دەرفەتی گەشەپێدانی فرەچێژی لای خوێنەر دروست کردووە. واتا لە پێشخستنی هۆشیاریی ئەدەبی و هەستی جوانناسیی خوێنەراندا بەشدار بووە. بۆیە ناکرێت داهێنانی شیعریی نەوەیەک، بەپێی میزاجی تاکەکەسی، یان بەگوێرەی عەقڵی تەسکی شارچێتی،

ناوچەگەری و سیاسی، بە ناوی ئەم یان ئەو شاعیر تۆمار بکرێت. یان شیعرەکانیان بە تاکە پێوەری شیعری مۆدێرن و نموونەی نوێخوازی دابندرین.

چەند شاعیری حەفتاکان، زوو لە شیعر دوور کەوتنەوە، یان سەرقاڵی کاری ئەکادیمی و تەرجومە بوون، بەڵام زۆربەیان درێژەیان بە شیعرنووسین دا. بەشێکیان زیاتر خۆیان دووبارە کردەوە. ڕەنگە باشترین بەرهەمییان ئەو تێکستانە بن، کە لە حەفتاکان و سەرەتای هەشتاکان نووسیویانن. چەند شاعیری تر لە هەشتاکان و دواتریش، ئەزموونی نوێ و جیاوازیان خستە ڕوو. ئەو دیاردەیە بەشێکە لە سروشتی ژیان و داهێنان، بۆیە لەناو هونەرمەند، شاعیر و نووسەرانی هەر نەوەیەکدا دەبیندرێت.

هەندێک جار بە جۆرە حەماسەت و هەناسەسوارییەوە، قسە لەبارەی ئەم یان ئەو پێشەنگی نوێکردنەوەی شیعری کوردی لەحەفتاکان دەکرێت، وەک ئەوەی باسی داهێنەری ڕادیۆ، تەلەڤزیۆن، دینامێت، فڕۆکە، تەلەفۆن و کۆمپیوتەر بکرێت. لاموایە ئەو قسانەش بەرهەمهێنانەوەی ئەو لێدوان و باسانەن، کە لە کۆتایی پەنجاکانی سەدەی پێشوو بەدواوە، چەند نووسەری عێراقی و عەرەبی، لەبارەی پێشەنگی شیعری نوێی عەرەبی، بڵاویان کردنەوە. بەدر شاکر ئەلسەیاب، کە بە ئەدەبی ئینگلیزی ئاشنا بوو، توانی سەرەتایەکی نوێ بۆ گۆڕینی شیعری عەرەبی پێشنیاز بکات، کە دواتر بە کۆششی چەندان شاعیری تریش، شیعری عەرەبی گۆڕانکاریی ڕیشەیی بەخۆیەوە بینی. کەچی هەندێک نووسەر، ڕەنگە لە دژی ئەلسەیاب، دەیانوت نازک ئەلمەلائیکە پێشەنگی شیعری نوێی عەرەبییە، چونکە ئەو یەکەمجار تەفعیلەی کێشی عەرەبی دەستکاری و بەش بەش کردووە، وەک

ئەوەی مۆدێرنیزمی شیعری و گۆڕینی شیعر، تەنیا مەسەلەیەکی تەکنیکی و پێوەندیی بە ژمارەی تەفعیلەی دێڕەکانەوە هەبێت!.

لە ئەدەبیات و هونەردا، پێوانەی ئێستێتیکی بە گرینگ دەگیرێت. شوێن و ئاستی داهێنانی هەر شاعیر و هونەرمەندێک، بە کۆی ئەنجامی کارەکانی دەپێورێت. دوای تێپەڕبوونی نیو سەدە، ئێستا بە ڕوونی دیارە هەر کام لە شاعیرانی حەفتاکان، چی کردووە؟ دوای حەفتاکان بەرهەمەکانی بە کوێ گەیشتوون؟ کام بەرهەمانەی هێشتا بە بایەخەوە دەخوێندرێنەوە و کار لە خوێنەری ئەمڕۆ دەکەن؟ چ بەرهەمێکی هەر کام لەو شاعیرانە دەتواندرێت بە نموونەی شیعری مۆدێرن دابندرێت؟ یان ئەو شاعیرە تا چەند توانیویەتی داهێنانی نوێ لە شیعری کوردیدا بکات؟ ئەوەی لە کاری ئەدەبی و هونەریدا بایەخدارە و دەمێنێتەوە ئێستێتیکا و داهێنانە.

هەر نەوەیەکی نوێ خەون، ئامانج و پەیامی خۆی هەیە، کە کاریان بۆ دەکات. لە دەمی گۆڕانکاری و وەرچەرخانی گرینگدا، دەشێت نەوەی نوێ خۆی بە نامۆ ببینێت. نەتوانێت لەگەڵ کولتووری باو، شێوەژیانی کۆمەڵایەتی، سیاسی و کولتووریی سەپاودا بگونجێت، بۆیە چاو دەبڕێتە گۆڕانکاری. ژیانێکی باشتر و کۆمەڵێکی پێشکەوتووتر دەکاتە ئامانج. ئەوەش بەشێکە لە کێشەی نێوان کۆن و نوێ و ناکۆکیی نێوان نەوەکان. بەلای زۆرەوە ئەو نەوەیەی ئێمە، نەوەی هەشتاکانیش، کە لە سایەی شەڕدا گەورە بووین، ئەو جۆرە خەون و ئامانجانەمان دیارتر و بەجۆشتر بوون. بەشێکمان زیاتر بە ڕێگای ئەدەبیات، هونەر و کاری ڕووناکبیریدا بەرەو ئامانجەکانمان چووین، بەشە گەورەکەشی ڕووی لە کاری سیاسی و خەباتی چەکداری کرد، کە بە لاڕێدا براردان. هەزارانیان

لە شەڕی نێوخۆ و شەڕی عێراق و ئێراندا، بەکوشت دران، یان ڕەنجبەخەسار و هیواکوژراو کران. بەشێکی گەورەی وزەی مرۆیی چەندان ساڵەی نەتەوەیەک، بەفیرۆ درا.

ئەو چوار ساڵەی ئاشتی لە کوردستان و عێراقدا چەسپێندرا، گۆڕانکاریی بەرچاو، لە بواری کۆمەڵایەتی، ئابووری، ئاوەدانی، خوێندەواری، ئەدەبی و هونەریدا ڕوویان دا. توندوتیژی و خولیای تۆڵەستاندنەوە و کولتووری بەخوێنئاودراوی شاخ، ڕوویان لە لاوازی کرد. لە جێگەی ئەوان ئاشتبوونەوە، تەبایی، کولتووری مەدەنیی شار و هەستکردن بە هاوچارەنووسیی نەتەوەیی گەشەیان کرد. ئەگەر لە ئاداری ١٩٧٤ شەڕ دەستی پێ نەکردبایەتەوە، بە دڵنیاییەوە کۆمەڵی کوردستان بەرەو شارستانەتی و قۆناخێکی نوێی مێژوویی دەچوو. بەڵام هەڵگیرساندنەوەی شەڕ، کوردستانی بەسەر گەلی کورددا ڕوخاند، هیوا و داهاتووی نەتەوەیەکیشی کوشت.

٣

## ڕەتکردنەوەی کەلەپور

بەهاری ١٩٧٣ لە بارەگای کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی کورد لە بەغدا، کۆڕێکی ئەدەبی لەبارەی فۆلکلۆر و کەلەپوری کوردی بۆ د.مارف خەزنەدار ساز کرا. دوکتۆر مارف بە کورتی و گشتی، لەبارەی کەلەپوری ئەدەبیی کوردی دوا، هەموو کەلەپوری کوردی، نووسراو و زارەکی، وەکوو سامانێکی گرنگی نەتەوەیی ناساند، بێ ئەوەی ئاماژە بە توخم و لایەنێکی دواکەوتووانە، کۆنخوازانە و نەگەتیڤانەی کەلەپوری نەتەوەیی بدات. یان هیچ سەرنج و ڕەخنە لە بارەیانەوە بڵێت. پوختەی قسەکانی دوکتۆر مارف ستایشی کەلەپور و تەواوی میراتی ئەدەبیی کوردی بوو.

من چاوەڕێ بووم د.مارف باسێکی ئەکادێمی و ڕەخنەگرانە، لەبارەی کەلەپوری کوردی، پێشکەش بکات. دوای ئەوە دەرفەت درا بە ئامادەبووان سەرنجیان دەرببڕن. کاتێک نۆرەی من هات ڕەخنەم لە باسەکە گرت و لە دیدێکی مێژوویی و کۆمەڵایەتییەوە باسی کەلەپوری کوردیم کرد، ئاماژەم بەوە دا لە کەلەپوری هەر نەتەوەیەکدا، لایەنی گەشەدار و دواکەوتوو، پێشکەوتنخواز و کۆنەخواز هەن، پێویستە باس بکرێن و جیا بکرێنەوە. سوود لە لایەنی گەشەدارەکە ببیندرێت، لایەنە کۆنەخوازەکەش، کە داکۆکی

لە ستەمکاری و چینی دەسەڵاتدار دەکەن، ڕەت بکرێنەوە، چونکە شایەنی ئەوەن فڕێ بدرێنە ناو دەریا.

دوای ئەو کۆڕە قسەکەی من، بە مەبەست و بۆ دژایەتیی شاعیرە لاوەکان شێوێندرا. وتارێک لە ڕۆژنامەی ئەلتەئاخی بڵاو کرایەوە، تیایدا شاعیرە نوێخوازەکانی بەوە تومەتبار کرد کە گوایا ئەوان کەلەپوری نەتەوەیی ڕەت دەکەنەوە، دەیانەوێت (کەلەپوری کوردی فڕێ بدەنە ناو دەریا)!. دواتر ئەو قسەیەی من، کە بە نیوەچڵی هێندرابوو، لە نووسینی تردا، وەکوو تومەت بۆ دژایەتیی شاعیرە نوێخوازەکان، دووبارە کرایەوە.

ئەو هەوڵەی لە سەرەتای حەفتاکانەوە، بۆ تازەگەری لە ئەدەب و هونەری کوردیدا دەدرا، لە دژی کەلەپور و میراتی ئەدەبی و هونەریی کوردی نەبوو. شاعیر هەبوو لە بەر کەمئەزموونی، یان هۆکاری تر، کەلەپوری بە بێبایەخ دەزانی، بە ناوی نوێخوازییەوە، ڕەتی دەکردەوە. بەڵام زۆربەی شاعیران، لەوانە من، کە لە مێرمنداڵییەوە هۆگری ئەدەب و فۆلکلۆری کوردی بووم، ڕەتکردنەوەی کەلەپورمان، بە هەڵە دادەنا. چونکە بە سروشتی ئەدەب و هونەر و داهێنان نامۆیە، بۆیە هیچی لێ بەرهەم نایەت.

ئەدەبیات و هونەر لە بنەڕەتدا مەسەلەی جوانی، ئێستێتیکا و داهێنانە، کە لە هیچەوە نایەن، بەڵکو لەسەر بناخەیەکی کولتووری و میراتێکی هزری، ئێستێتیکی هەڵدەچندرێن. ئەدەب و هونەر لە بەرامبەر زەماندا دەتوانن خۆیان بگرن و زەمانی خۆیان تێپەڕێنن. بۆیە هەڵەیە ئەگەر پێمان وابێت تازەگەری لەوەدایە، کە پشت لە میراتی ئەدەبی و کولتووریی بکەین، لە جیاتیان هەر بەرهەمێکی تازە، تەنیا لەبەر ئەوەی تازەیە، بە گرنگ بگرین.

ئەو تومەتەی درایە پاڵ من و شاعیرە لاوەکان، زۆر دووبارە

کرایەوە، لە ئابی ١٩٧٣ لە دیمانەیەکی ئەدەبیدا، کە ئەحمەد ڕێبوار سازی کرد، لەو بارەیەوە لێی پرسیم:

(-کاک ڕەفیق وەکوو دەڵێن: تۆ (توراس- کەلەپور) ڕەفز دەکەیت و هەڵوێستێکی پێچەوانەت بەرانبەری هەیە، خۆت لەم بارەیەوە چی دەڵێیت)؟

وتم: (ئەگەر عیبادەت نەکردنی کوێرانە و سەرنەلەقاندن، بۆ هەموو شیعرێکی کۆن -بە چاک و خراپییەوە- ڕەفزکردنی کەلەپور بێت، ئەوا من شانازیی بەو ڕەفزکردنەوە دەکەم... بە لای منەوە، خزمەتکردنی کەلەپور لەوەدایە، کە ئاشکرای بکەیت ئەو کەلەپورە تا چەند خزمەتی مرۆڤی سەردەمی خۆی کردووە و چەند خزمەتی مرۆڤی ئەم سەردەمە دەکات، ڕێ لە شۆڕش و پێشکەوتنی ئەم سەردەمە ناگرێت. ئەوانەی ئەم تومەتە دەدەنە پاڵ ئێمە، دەیانەوێ کەلەپور بکەن بە چەکێک و سەری هەموو تاقیکردنەوەیەکی نوێ، پان بکەنەوە. ئایا ئەوان تا چەند توانیویانە لەم لایەنەوە کەلەپورمان بۆ یەکلا بکەنەوە و بژاری بکەن؟ یان ئاشکراتر بڵێم: خزمەتی ڕاستەقینەی کەلەپور بکەن.![1]

دوکتۆر مارف لەو قسانەی لە کۆڕەکە کردم، دڵگران بوو، ساردییەک کەوتە نێوانمان. بەلای زۆرەوە چاوەڕێی ئەو جۆرە ڕەخنەیەی لە قوتابییەکی خۆی نەکردبوو.

من لە زانکۆ زۆر ڕێزی مامۆستاکانم دەگرت، لەگەڵ هیچیان گرفتم نەبوو، بەڵام بەشێکیان بە مێتۆدی کۆن، وەکوو مامۆستای قۆناخی ناوەندی و ئامادەیی، لەگەڵ قوتابیان ڕەفتاریان دەکرد.

1- ئەحمەد ڕیبوار، وتوویژێکی والا لەبارەی ئەمڕۆ و ئەدەب و ژیان، هاوکاری ژ. ١٨٠ لە ١٧-٨-١٩٧٣، هەروا ڕەفیق سابیر، پەیڤ و پەیام، نووسینەکانی ١٩٧٠-١٩٨١، سەرچاوەی پێشوو.

حەزیـان دەکـرد قوتـابی زیـاتر گـوێ بگرێـت، نەک سـەرنج و ڕای جیـاواز، لەبـارەی بۆچـوون و قسـەکانیان دەرببڕێـت. مـن لەو قوتابیـانە بـووم کە بێدەنگ دانەدەنیشـتن. چـونکە هەنـدێک هـزری ئەدەبـی و پێـوانەی ڕەخنەیـی ئەوانـم لە لا ڕوون نەبـوون، یـان بە کـۆنم دەزانـین. زۆربەی مامۆسـتاکانمان نووسـەری دیـاری ئەو سـەردەمە و پسـپۆڕ و بە توانـابوون، شـارەزای ئەدەب، مێـژوو و زمـانی کـوردی بـوون و زۆریـان لـێ فێـر بـووم. بەڵام لە هەنـدێک لایەنەوە دنیابینی و بۆچوونی ئەدەبی و ڕەخنەییمان جیاواز بوون. ڕەنگە هەنـدێک لەو بۆچوونـانەم هەڵە بـووبن، یـان باسـکردنیان لە پۆلدا گونجاو نەبووبن، بەڵام قوتابی بۆ ئەوە لە پۆل دانیشـتووە تـا فێر ببێت، ئەگەر هەڵەی کرد، مامۆستا هەڵەکانی بۆ ڕاست بکاتەوە.

دواتـر هەسـتم کـرد لە نمـرەی تـاقیکردنەوەدی سـەری سـاڵدا، نـاهەقیم بەرانـبەر دەکرێـت. بـۆ نمـوونە، لە دوا سـاڵی خوێندنـدا، د.مـارف وانەی وەزن و قـافییەی شـیعری کـوردیی پـێ دەوتـین. نامیلکەیەکی خۆی بە ناوی (کێش و قافیە لە شیعری کوردی دا) بۆ بـاس دەکـردین و نمـوونەی شـیعریی دەخوێنـدەوە. ئەو نـامیلکەیە ساڵی ١٩٦٢ بڵاو کراوەتەوە. تـا سـەرەتای شەسـتەکان، باسـی کێش (وەزن)ی شـیعری کـوردیی کـردووە . بەڵام دواتـر گـۆڕانی زۆر بەسـەر جـۆری وەزن و قـافیەی شـیعری نـوێی کوردیـدا هـات، کە لەوێـدا بـاس نەکـراون. لە تـاقیکردنەوەی کۆتـایی سـاڵدا، مـن لەو وانەیەدا تەنیـا ٦٠ لە سـەدم وەرگـرت. کەچـی پێش چـوونە زانکـۆ تەکنیکـی قـافییە و وەزنەکـانی شـیعری نـوێی کـوردی و زۆربەی جۆرەکانی وەزنی عەروزی عەرەبیم دەزانی. چەنـدان شـیعرم بـڵاو کردبوونەوە، کە هەڵە لە وەزنەکانیاندا نەبوون.

هەرچەنـدە مـن بـایەخم بە نمـرە نەدەدا، بەڵام ئەو ئەنجـامەم بە

لاوە سـەیر بـوو. ئەگەر لە وانەی مێـژوو، ڕەخـنەی ئەدەبـی و مێژووی ئەدەبیات، دەرفەت بۆ زانیاریی زیاتر و بۆچوونی جیاواز هەبێت، لە باسـی وەزن و قافییەدا ئەو جۆرە دەرفەتە نییە. چونکە وەزن و قـافییە، وێـنەی ماتماتیـک (بیرکـاری) سیسـتمێکی تـایبەتی خۆیان هەیە، هەر هەڵەیەک بە زەقی دەردەکەوێت.

مـن بە هەق یـان بە نـاهەق، ئەو ڕۆژەم بیـر کەوتەوە کە لە کـۆمەڵەی ڕۆشـنبیریی کـوردی، وەکـوو لاوێکـی کەمئەزمـوون، هەندێک ڕەخنەم لە باسـەکەی د. مـارف گـرت. بەڵام لەو بـارەیەوە هیچم نەوت. دوکتۆر مارف لای من لەوە ئازیزتر بوو، کە لەبـارەی مەسەلەیەکی بچووکی لەو جۆرە پرسیاری لێ بکەم.

دواجـار بە پێوەنـدی لەگەڵ ڕوانـگە و شـیعری نـوێ، دوو شـتی تایبەت باس دەکەم:

لە هـاوینی ١٩٧٢ لە ڕۆژنـامەی بیـری نـوێ، کە حزبـی شـیوعیی عێـراق بـڵاوی دەکـردەوە، دەسـتم بەکـار کردبـوو. ئەو کـاتە هـیچ پێوەنـدییەکم بە یەکێتیـی گشـتیی قوتابیـان و حزبـی شـیوعییەوە نەمـابوو، بەڵام وەکـوو کەسـێکی چەپ و مارکسـی بـۆ دنیـام دەڕوانی. ڕێکخستنی حزبی شیوعی لە بەغدا، نامەیان بۆ لیژنەی قەزای حـزب لە قەڵادزێ نـاردبوو، تـا زانیارییـان لەبـارەی مـن بـۆ بنێرن. دواتـر هـاوڕێم جەلال دەبـاغ پێـی وتـم، لیژنەکە ڕاپـۆرتێکی باشـیان لەبـارەی مـن و بنەماڵەکەمـان نووسـیبوو، بەڵام تـاکە سەرنجیان، ئەوە بوو کە من لە جەماعەتی ڕوانگەم.

سـەیرە، سـاڵێک دواتـر لە کۆتـایی سـاڵی ١٩٧٣، یـان سـەرەتای ١٩٧٤ کۆنگرەی یەکێتیی نووسـەرانی کـورد لە بەغدا بەسـترا. مـن قوتـابیی دواسـاڵی زانکـۆ بـووم، بـۆ لیـژنەی بەڕێوەبردنی یەکێتیـی نووسەران پێشنیار کرام. پێموابوو ڕوانگەییەکان پشتگیریم دەکەن،

بەڵام داوام لێ نەکردن دەنگم بۆ بدەن.

ئەو کاتە گرژیی لەنێوان حزبی شیوعی و پارتیدا دروست بووبوو. ڕوانگەییەکان و لایەنگرانیان، وا بزانم جگە لە مامۆستا حوسێن عارف، دەنگیان پێ نەدام. نووسەرێکیان ڕاشکاوانە وتی: ئێمە بڕیارمان دا دەنگ بە تۆ نەدەین، چونکە تۆ شیوعیت!

ڕوانگەییەکان و بەندە، پێکەوە بانگەشەی نوێخوازی و ئازادیخوازییمان دەکرد، هاوپەیام و هاوئامانج بووین. کەچی ئەوان، وەکوو لیژنەی قەزای حزبی شیوعی لە قەڵادزێ، بە عەقڵییەتی تەسکی حزبیایەتی بۆ منیان دەڕوانی. هاوڕێیانی قەڵادزێ، لەبەر گوایا ڕوانگەییبوونی من، بە نامۆیان دانابووم. کەچی ڕوانگەییەکان و لایەنگرانیان، جگە لە حوسێن عارف، کە خۆیان بە پارتی هەڵواسیبوو، لەبەر کۆمۆنیستبوونی من، بە نەیاری خۆیانیان دانابووم.! بەڵام بۆ ئەوەی ناهەقی نەکەم، دەبێ بڵێم کە هاوڕێیانی لیژنەی قەزای قەڵادزێ، کە زۆربەیان پیشەوەر، کاسبکار و جووتیار بوون، پێچەوانەی هاوڕێ نووسەرە ڕوانگەییەکانم، ڤیتۆیان لە دژم بەکار نەهێنابوو.

ئەو هەڵوێستە بەرهەمی یەک جۆرە بیرکردنەوە و کولتوورە، کە بە ڕواڵەت لێک جیاوازن، کەچی لە ناوەرۆکدا لە یەکتر دەچن!

لەبەر بەحزبیکردنی (ڕوانگە) و ئەو جۆرە بیرکردنەوە تەسکانە، لە بەهاری ١٩٧٤ ڕوانگە مردار بۆوە.

ڕووداوی دووەمیان ئەوەیە، ڕۆژێکی بەهاری١٩٧٣ ئەندامێکی دێرینی حزبی شیوعی، لە سلێمانییەوە هاتبوو بۆ بەغدا. بە سەردان، بۆ بینینی محەمەد کەریم فەتحوڵڵا و جەلال دەباغ، هاتە نووسینگەی ڕۆژنامەی (بیری نوێ). میوانەکە لە ژوورەکەی تەنیشتمان، کە ژووری هەردوو هاوڕێ بوو، دانیشتبوو. دەرگای

ژوورەکەیان کەوتبووە گۆشەی ئەو ژوورەی شوێنی کارکردنی من و دوو هاوڕێی تر بوو. قسەی ناو ژوورەکە لە لای ئێمەوە دەبیسترا. گوێم لێ بوو لێیان پرسی: چۆنە هاتویتە بەغدا؟ وتی: کوڕەکەم بۆ لای دوکتۆر هێناوە.

لێیان پرسی: خێرە، چییەتی؟ دەنگی هەڵبڕی و وتی: ئەو سەگباوکانەی ڕوانگە شێتیان کردووە! لێیان پرسی: چۆن؟ وتی: قسەی پڕوپوچ و بێسەروبەری وەکوو شیعری ڕوانگەییەکان ڕیز ئەکات، لە کۆڵان بە دەنگی بەرز ئەیخوێنێتەوە، گەنج و منداڵ لێی کۆ ئەبنەوە و چەپڵەی بۆ لێ ئەدەن. کەمێک بێدەنگ بوو، نموونەیەکی "شیعر"ی کوڕەکەی وت. ڕستەکان ناڕوون و وشەکان بەجۆرێکی خۆڕسکی و بێئامانج خرابوونە سەر یەکتر و بەدوای یەکدا ڕیز کرابوون، بێ ئەوەی مانایەکیان هەبێت، کەچی ریتم و ناڕوونیی "شیعر"ەکە، سەرنجی خوێنەریان ڕادەکێشا.

بە داخەوە تەنیا چەند وێنەی سەیر و وشەی "شیعر"ەکەم لەبیر ماوە، کە بەهرە، خەیاڵ و توانای دەربڕینی شیعریی پێوە دیار بوو، تا ڕادەیەک بەم شێوازە بوو:

بارانی چاوی چیای ناو ڕوباری دڵی وشە ئاوارەکانم
لە پەنجەرەی خۆڵەمێشی هەنسکی یاخی هەتاوا ئەرژێ
ئاسۆی زامی نەشتەری ژەهراوی
لە سێبەری شەقامە تاریکەکانی دڵم پاڵ ئەکەوێ...
دڵدارەکەم هەر تۆم ئەوێ!

## ١
## بەرەو کاری ڕۆژنامەنووسی

هاوینی ١٩٧٢ کاک مەعروف حەمەدەمین کۆیی، کە کادیری دیاری حزبی شیوعی بوو، ئێستا لە ئەڵمانیا دەژی، پێشنیازی پێ کردم لە ڕۆژنامەی بیری نوێ، کە مانگێک بوو بە زمانی کوردی و عەرەبی دەردەچوو، کار بکەم. بە پێشنیازەکەی ڕازی بووم، بەڵام پێم وت من هیچ پێوەندییەکم بە حزبی شیوعییەوە نەماوە.

لە ناوەڕاستی ئابی ١٩٧٢ لە ڕۆژنامەی بیری نوێ، دەستبەکار بووم. لە بەرانبەر ئەوەدا مانگانە دوازدە دینارم وەردەگرت. ئەو پارەیە لەوە زیاتر بوو کە حکومەت مانگانە بە قەرز بە قوتابیانی زانکۆی دەدا، بەڵام قەت داوای نەکردەوە. دوای ئەوە، هەر کتێب و گۆڤارێکم بویستایە دەمتوانی بیکڕم.

لە تەمووزی ١٩٦٨ حزبی بەعس، بۆ جاری دووەم دەسەڵاتی سیاسیی زەوت کردەوە. جاری یەکەم لە ساڵی ١٩٦٣ بە کۆمەکی ئەمریکا و بە کودێتایەکی خوێناوی، ساڵێک حوکمڕان بوو. لەو ساڵەدا بە هەزاران ئەندام و کادیری حزبی شیوعی کوشت و زیندانیی کرد و پەلاماری گەلی کوردستانی دا. دوای ئەوەی کارەکەی خۆی تەواو کرد، ڕوخێندرا. بەعسییەکان، ئەم جارە بە شێوازێکی تر خۆیان پێشان دا، حکومەتەکەیان دوژمنایەتیی

ئەمریکا و ئیسرائیلی دەکرد. لە ئاداری ١٩٧٠ مافی ئۆتۆنۆمی بۆ گەلی کورد لە عێراق، قبووڵ کرد. نەوتی عێراقی خۆماڵی (تەئمیم) کرد و دەستی بەسەر تەواوی کۆمپانیا بیانییەکانی نەوت لە عێراقدا گرت، کە بریتانیا و چەند وڵاتی ڕۆژئاوایی خاوەنی بوون. دوای ئەوە ئابووریی عێراق بە خێرایی گەشەی کرد، بێکاری کەم کرایەوە و گوزەرانی خەڵک بەرەو باشی چوو. لە هەمان کاتدا بەعس خۆی لە یەکێتیی سۆڤیەت نزیک کردەوە، ویستی پێوەندیی خۆی لەگەڵ حزبی شیوعی ئاسایی بکاتەوە. حکومەتی سۆڤیت کۆمەکی زۆری بە عێراق کرد. سەرکردایەتیی حزبی شیوعیی هان دا، لەگەڵ حزبی بەعس ڕێک بکەوێت.

لەو دۆخە سیاسییە نوێیەدا، حزبی شیوعی دەرفەتی بۆ ڕەخسابوو نیوەئاشکرا کار بکات. سەرەتا ڕێگەی پێ درابوو، گۆڤارێکی مانگانە، (الثقافه الجديدة) بڵاو بکاتەوە. دواتر لە ناوەڕاستی حوزەیرانی ١٩٧٢ ڕۆژنامەیەکی هەفتەیی، بە ناوی ئەلفکر ئەلجەدید- بیری نوێ- بە عەرەبی و کوردی بڵاو کردەوە. هێشتا حزبی شیوعی نووسینگە، یان بارەگای تایبەتی نەبوو. نووسینگەی بیری نوێ، لە ساحەی ئەلنەسر لە بەغدا، وەکوو بارەگای حزبی شیوعی بوو. بەردەوام چەند ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و کۆمیتەی ناوەندی، لەوێ یەکتریان دەبینی و ڕووناکبیرانی چەپ و ئازادیخوازیش، ڕوویان تێ دەکرد. سەرەنجام کۆمیتەی ناوەندیی حزبی شیوعی، بە کاریگەریی حکومەتی سۆڤیەت، بە زۆرینەی یەک دەنگ، بڕیاری دا هاوپەیمانیی نیشتمانی لەگەڵ حزبی بەعس مۆر بکات. لە تەمووزی ١٩٧٣ (بەرەی نیشتمانیی پێشکەوتنخوازی عێراقی) لەنێوان ئەو دوو حزبەدا پێک هات. بارەگای حزبی شیوعی لە شارەکان

کرایەوە، ڕۆژنامەی (تەریق ئەلشەعب) مۆڵەتی پێ درا ڕۆژانە، وەکوو ئۆرگانی سیاسیی حزبی شیوعیی عێراق، دەربچێت.

پارتی دیموکراتی کوردستان ئەو کاتە هاوپەیمانی بەعس بوو، کۆمەڵێک وەزیر و پارێزگاری لە حکومەتدا هەبوو، لە کوردستان تاکە دەسەڵاتدار بوو. بۆیە چاوەڕوان دەکرا ئەویش بچێتە ناو ئەو بەرەیە. کەچی زۆر بە توندیی دژی ئەو هاوپەیمانییەی بەعس و حزبی شیوعی وەستا. لە کاتێکدا حزبی شیوعی، لە ساڵی ١٩٦٣ تا ئەو کاتە، دۆستی نزیک و هاوسەنگەری پارتی بوو.

پارتی لە کوردستان کەوتە فشارهێنان بۆ حزبی شیوعی و گرتنی ئەندامانی. مانگێک دوای پێکهێنانی ئەو بەرەیە، دوازدە کادیری حزبی شیوعی، کە خەڵکی هەشت پارێزگای عێراق بوون، دوای تەواوکردنی خوێندن، لە یەکێتیی سۆڤیەت و وڵاتانی سۆشیالیستی، بە ڕێگای سووریادا گەڕانەوە عێراق. عیسا سوار، کە فەرماندەی پارتی بوو لە بادینان، هەموویانی گرت و بە بڕیاری مەلا مستەفا، بە دیلی کوشتنی. کەریم ئەحمەد، لە کتێبی بیرەوەرییەکانیدا، باسی کوژرانی ئەو هاوڕێیانە دەکات و بە سەرسوڕمانەوە دەنووسێت:

(سەیر ئەوەیە تا ئێستا کەس نازانێت تەرمی ئەو هاوڕێیانە لەکوێ نێژراون)[1]

پارتی لە کوردستان کەوتە گرتن و پەلاماردانی ئەندامانی حزبی شیوعی و تۆمەتی جاشایەتیی دایە پاڵ ئەو حزبە. کەچی خۆی

---

1- كريم أحمد، المسيره، صفحات من نضال كريم أحمد، مطبعه شهاب أربيل ٢٠٠٦، ص١٨٢

بۆ ناوی ئەو شەهیدانە کە خەڵکی هەشت پارێزگای عێراق بوون، بڕوانە: عەلی حامید، یاداشت- بولێڵە، ٢٠٢٠ چاپخانەی تاران، ل. ٨١

سێ ساڵ بوو بەشداری حکومەت بوو، لەگەڵ حزبی بەعس هاوپەیمان بوو. پارتی دەیان کادیر و ئەندامی حزبی شیوعی بۆ زیندانی بەدناوی خەلان و رایات نارد و لەوێ ئەشکەنجە دران. هاورێ عەبدولرەحمان خدر بانەیی، کە هاوشاریم بوو، لەوێ بە ئەشکەنجەدان شەهید کرا. دواتر شیعرێکم پێشکەش کرد، کە لە کۆمەڵەهۆنراوەی (رێژنە)دا بڵاو کرایەوە. دوای هەڵگیرسانەوەی شەر، لە چەند ناوچە پێکدادانی چەکداری، لەنێوان هەردوو لایەندا، روویان دا و چەندان کەس کوژران.

رۆژانە لای عەسر دەچووم بۆ نووسینگەی (الفکر الجدید- بیری نوێ) کە سەرەتا فەخری کەریم بەرپرسی چاپە عەرەبییەکە و محەمەد کەریم فەتحوڵڵا بەرپرسی چاپە کوردییەکەی بوو. جەلال دەباغ، دواتریش جەوهەر شاوەیس، جێگری بوون. ئێواران نووسەران کەمال غەمبار، عەبدولرەزاق بیمار، حەمە رەشید هەورامی، لەوێ کاریان دەکرد. دوای ساڵێک نووسەر حوسێن محەمەد سەعید، کە دواتر بە رووداوی ئۆتۆمبێل جوانەمەرگ بوو، هاشم کۆچانی و تەحسین محەمەد خەلیل و حاجی جەمال، لە بیری نوێ دەستبەکار بوون. هەرسێک هاورێ، تا بەهاری ١٩٧٩ کە رۆژانەمەکە داخرا، بەردەوام بوون، دواتر روویان لە شاخ کرد. پایزی ١٩٧٣ هەردوو شاعیر و نووسەر فەرهاد (ئەنوەر) شاکەلی و گۆران مەریوانی، ماوەیەک وەک هەڵەچنی چاپ، لە بیری نوێ کاریان کرد.

لە سەرەتادا کاری جۆراوجۆرم دەکرد، هەڵەچنی، گۆرینی رێکلام و هەواڵ و کورتەنووسین لە عەرەبییەوە بۆ کوردی، سەرپەرشتیی دیزاین و چاپکردنی رۆژنامەکە. لەگەڵ ئەو کارانەدا، نووسین و بابەتی ئەدەبیی خۆم، یان تەرجومەکراوم بڵاو

دەکردەوە. دوای ساڵێک بوومە بەرپرسی بەشی ئەدەب و هونەری ڕۆژنامەکە، بەڵام وەکوو جاران سەرپەرشتیی دیزاین و چاپی ڕۆژنامەکەشم دەکرد. دواتر لاپەڕەیەکی تایبەتمان بۆ منداڵان تەرخان کرد، کە سەرەتا من ئامادەم دەکرد، دوای ماوەیەکی کورت هاوڕێم هاشم کۆچانی بوو بە بەرپرسی ئەو لاپەڕەیە، تا ڕۆژنامەکە داخرا بەردەوام بوو.

بەشی ئەدەب و هونەر بەو ئامانجە بوو بەشداریی گەشەپێدانی بزووتنەوەی ڕۆشنبیریی کوردی بکات، هزر و هۆشیارییەکی پێشکەوتنخوازانە و نوێی هونەری و ڕووناکبیری بڵاو بکاتەوە. لە سەرەتاوە هەوڵمان دا، نووسەران و شاعیرانی کورد، لە پێشخستنی لاپەڕەکەدا بەشدار بن. زۆری نەبرد لاپەڕەی ئەدەب و هونەر بوو بە شوێنێکی باش و گونجاو، کە نووسەران بیروڕا و بەرهەمی ئەدەبیی خۆیان و بەرهەمی تەرجومەکراوی چەندان شاعیر و نووسەری بیانی تێدا بڵاو بکەنەوە. لەپاڵ ئەوانەدا دەیان کتێبی نوێی ئەدەبی و ڕۆشنبیری، کە لەو ساڵانەدا چاپ کران، بە جۆرێکی ئۆبجەکتیڤانە و بەرپرسانە بە خوێنەران ناسێندران. بەشێکی ئەو وتارانە، من وەکوو بەرپرسی لاپەڕەکە، نووسیمن.

ڕۆژنامەی بیری نوێ و تەریق ئەلشەعب لە پارێزگای سلێمانی، هەولێر، کەرکووک و دهۆک پەیامنێریان هەبوون. هەروا نووسینی زۆرمان بە پۆست بۆ دەهات، کە لە سەدا نەوەتی شیعر بوون. زۆربەی شیعرەکان شایەنی بڵاوکردنەوە نەبوون. هەندێک جار لەناویاندا کۆپلە "شیعر"ی زۆر سەیر و سەمەرە هەبوون کە، وەکوو کورد دەڵێت، سەربەقوڕی دەهێنایە پێکەنین. من بەشێک لەو برگە و کۆپلانەم، بۆ خۆشی جیا دەکردنەوە و دەمدان بە خۆشنووسەکەمان، کە هاوڕێیەکی عەرەب بوو، ناوی فەلاح بوو،

بۆ ئەوەی بە خەتی خۆش و گەورە بیاننووسێتەوە. منیش لەسەر کارتۆنێکی سپی چەسپم دەکردن، بە ناوی بەرهەمی (شاعیرانی خوانەناس) لەپشت سەرم، بە دیواردا هەڵمدەواسین. تیپی یەکەمی ناوی کەسەکە و باوکیانم لە خوارەوە دەنووسین. هاوڕێم جەلال دەباغ کە دەهاتە ژوورەکەمان، پێش هەر شتێک چاوی لە کارتۆنەکە دەکرد و بەدوای دوا بەرهەمی بڵاوکراوەدا دەگەڕا!.

فەلاح سەرەتا وای زانی ئەو کۆپلەشیعرانە زۆر جوان، پڕ حیکمەت و دەگمەنن، بۆیە ئەو بایەخەیان پێ دەدەم. دیاربوو هاوکارێکمان دووزمانی لێ کردبووم، ڕۆژێک فەلاح بە توڕەیی هاتە ژووری و وتی:

تۆ چەند وەختە بە من ڕادەبوێری و ئەو شتە و بێنرخانە بە من دەنووسییەوە.!

دوای ئەوە، ئەگەر کۆپلەشیعری لەو جۆرە هەبووایە، بێنازانە

بە خەتی خاوەنەکەی، بە کارتۆنەکەوە چەسپم دەکرد.

ئەو ساڵانەی لە بەغدا ژیام، خوێندم و لە بیری نوێ کارم کرد، گرینگترین ساڵانی ژیانم بوون، تا ئەو دەمە خۆشترینیشیان بوون. هەموو کاتی خۆم بۆ خوێندن، فێربوون، خوێندنەوە، نووسین و کاری ڕۆژنامەنووسی تەرخان کردبوو. ژیانێکی تایبەتی بێ گرفتم هەبوو. لە بەغدا هەموو دەرفەتێک ڕەخسابوو بۆ ئەوەی مرۆڤ، ئەگەر بخوازێت، ڕێگای ژیانی خۆی بدۆزێتەوە. بەغدا سەنتەری ڕۆشنبیریی عێراق و ناوەندی دەزگا ڕووناکبیرییەکان و ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکانیش بوو.

ئەو ساڵانە زۆر دڵم بە بەغدا دەکرایەوە، ئارام و ئاسوودە بووم. بایەخم بە کارەکەم دەدا و باوەشم بۆ ژیان گرتبۆوە. لە ڕەوشی خوێندن، خوێندنەوە و کارکردندا، هەستم دەکرد فێر دەبم،

پێش دەکەوم، زانیاری و ئەزموونم زیاتر و ئاسۆی بیرکردنەوەم ڕونتر و بەرین دەبن، ئەمەش بایەخدارترین لایەنی هەر کار و چالاکییەکی مرۆڤە.

شاری بەغدا لە هەموو ڕوویەکەوە لە گەشەکردن، نوێبوونەوە و گەورەبووندا بوو. خۆماڵیکردنی نەوت و ڕاگرتنی شەڕ دژی گەلی کوردستان، ژیانی ئابووری، کۆمەڵایەتی، خوێندەواری و کولتووریی لە بەغدا و زۆر ناوچەی تری عێراق، بە کوردستانیشەوە، گەشە پێ دا. خەڵک تینووی خوێندنەوە، فێربوون و زانین بوون. بەردەوام شانۆگەری و فیلمی نوێی میسری و جیهانی لە سینەماکانی بەغدا پێشان دەدران. دەسەڵات و ئایدیۆلۆجیای ئیستیبدادیی حزبی بەعس، تا نیوەی دووەمی حەفتاکان، لاواز بوو. بیری سۆشیالیستی، مارکسی و ئازادیخوازی بەهێز بوون. ئازادیی نووسین و دەربڕین، تا ڕادەیەک هەبوو. لەناو ڕووناکبیرانی عەرەبدا دەوترا کتێب لە میسر دەنووسرێن، لە لوبنان چاپ دەکرێن و لە عێراق دەخوێندرێنەوە.

لەو هەشت ساڵەی لە بەغدا ژیام، گۆڕانی بنەڕەتی لە ژیانمدا ڕووی دا. باشتر خۆم ناسی، بناخەی کەسایەتیم وەکوو شاعیر و نووسەر داڕێژرا و متمانەم بە خۆم بەهێزتر بوو. بۆچوونی سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئەخلاقیم بۆ ژیان، ژن، کۆمەڵ و مافی ئازادیی گەلان، ڕوونتر و سەقامگیر بوون. تا ئەو کاتە من وەک نەمام، لەسەر زەمینەی فۆلکلۆر و ئەدەبی نووسراوی کوردی باڵام کردبوو، لە بەغدا ئاوێزانی ئەدەبی نوێی عەرەبی و بیانیی بووم. تێڕوانیم بۆ شیعر و ئەدەبیات گۆڕانیان بەسەردا هات. ئەزموونی شیعری، ئەدەبی و شێوازی بیرکردنەوەم گەشەیان کرد. باشتر فێری زمانی عەرەبی و ئاشنای ئەدەبی مۆدێرنی عەرەبی و تا ڕادەیەک ئەدەبی بیانی بووم. بەو ئەنجامەش گەیشتم کە نووسەر، یان ڕووناکبیر، دەبێت قسە، نووسین و ڕەفتاری تەبا و هاوئاهەنگ

بن. وێرای ئەوانە لە بەغدا فێری ئەویندارییی بووم. زیاتر لە کچێکم ناسی، کە شادی، وزەی کارکردن و ئیلهامی نووسینیان پێ بەخشیم. ئەو گۆڕانکاری و گەشەکردنە هزری، ئەدەبی و کۆمەڵایەتییە، بە زەقی لە هۆنراوەکانی ئەو سەردەمە و لە چەندان وتاری ئەدەبی، ڕەخنەیی و نووسینی تردا، دەردەکەون، کە لە حەفتاکان لە بیری نوێ، هاوکاری، بەیان، ڕۆشنبیری نوێ، ڕۆژی کوردستان و شوێنی تر، بڵاو کراونەوە.[1]

---

1- بۆ خوێندنەوەی ئەو نووسینانە بڕوانە:
ڕەفیق سابیر، پەیڤ و پەیام، نووسینەکانی ١٩٧٠-١٩٨١، سەرچاوەی پێشوو.

## ٢
## مەڕ لە گورگ تۆقیوە
## کەچی شوانەکەی دەیخوات

لە ١١ی ئاداری ١٩٧٤ چوار ساڵ بەسەر ڕێککەوتنی نێوان حکومەتی عێراق و پارتیدا تێپەری. حکومەتی عێراق قانوونی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان خستە ڕوو، کە چەند ناتەواویی تێدا بوو. بەڵام ئەوە یەکەم جار بوو، بە قانوون گەلی کوردستان، مافێکی نەتەوەیی لەم جۆرە بە دەست بهێنێت. سەرکردایەتیی پارتی، بێ ئەوەی لەگەڵ بەغدا درێژە بە وتووێژ بدات، یان هەوڵی چارەسەری ناتەواوییەکانی بدات، بە توندی قانوونەکەی ڕەت کردەوە. وەزیرە کوردەکان و نوێنەرانی خۆی لە حکومەت و لە بەغدا و شارەکانی کوردستان، کشاندەوە و یاخیبوونی خۆی ڕاگەیاند.

پارتی لە کوردستان حوکمڕان بوو. دەوڵەتی عێراق بە بێ کورد، نەیدەتوانی لە کوردستان هیچ کارێک بکات. پارتی دەیتوانی بە ڕێگای مەدەنی و فشاری جەماوەری، دەستکەوتەکانی گەلی کوردستان بچەسپێنێت.

بەپێی ئاگاداریم، کە لە ڕۆژنامەی حزبی شیوعی کارم دەکرد، دەتواندرا پێش بە هەڵگیرسانەوەی شەڕ بگیرێت. ئەو

دەستکەوتانەی گەلی کوردستان، بە خەبات و خوێن دەستی خستبوون، بە ئاسانی بەفیڕۆ نەدرێن. لە سەرەتای ١٩٧٤ پێش هەڵگیرسانەوەی شەڕ، چەندان وەفدی بیانی، نوێنەرانی یەکێتیی سۆڤیەت، وڵاتانی سۆشیالیستی، حزبە کۆمۆنیست و بزووتنەوە ڕزگاریخوازەکانی وڵاتانی جۆراوجۆر، هاتن بۆ بەغدا. زۆربەیان چوونە لای سەرۆکی پارتی، مەلا مستەفای بارزانی، داوایان لێ کرد پەلە نەکات و بە دایەلۆگ کێشەکان، لەگەڵ دەوڵەتی عێراق، چارەسەر بکات.

ئەو کاتە حکومەتی سۆڤیەت، پێوەندیی باشی ئابووری، سیاسی و سەربازی لەگەڵ دەوڵەتی عێراق هەبوو. لە ٩ی نیسانی ١٩٧٢ ڕێککەوتنی دۆستایەتی و هاوکاری، بۆ ماوەی پازدە ساڵ، لەنێوان یەکێتیی سۆڤیەت و حکومەتی عێراق مۆر کرابوو. ئێران و ئەمریکا بەهێزبوونی پێگەی سۆڤییەتیان لە عێراق و ناوچەکە، بە هەڕەشەیەک دەزانی بۆ سەر بەرژەوەندیی خۆیان. کاتێک حزبی شیوعی و بەعس بەرەی نیشتمانییان پێک هێنا، چاوەڕوان دەکرا پارتیش بچێتە ناو ئەو بەرەیە. بەڵام ئێران هەوڵی دا پارتی لەو بەرەیە دوور بخاتەوە.

(لە کاتی سەردانی سەرۆکی ئەمریکا نیکسۆن و ڕاوێژکاری ئاساییشی نەتەوەیی هینری کیسینجەر بۆ تاران، لە ئایاری ١٩٧٢ شا توانی نیکسۆن ڕازی بکات کە ئەمریکاش، وەکوو ئێران و ئیسرائیل، کۆمەک بە بزووتنەوەی کورد بکەن، دەزگای سی ئای ئەی ئەمریکا دژی ئەو کارە بوون، چونکە دڵنیابوون شا خیانەت لە کورد دەکات. بەڵام کیسینجەر، بە پێچەوانەوە ڕازی بوو، وتی ئەوە هۆکارێکی باشە بۆ ئەمریکا کە پشتگیریی خۆی بۆ ئێران پیشان

بدات.)[1]. ئەو هاوکاری و پێوەندییە، کە بە داوای شا بوو، لە ڕێگای دەزگای (سی ئای ئەی) بوو، ئەمریکا هیچ گفت و بەڵێنێکی سیاسی بە کورد نەدابوو.

سۆڤییەتەکان دەیانەویست پارتی بێتە نێو ئەو بەرەیە. بەڵێنیان بە سەرکردایەتیی پارتی دابوو کۆمەک بە چارەسەری کێشەی کورد و سەقامگیریی ئاشتی لە عێراق و کوردستان بکەن. ئەمەش ئەگەر سەری بگرتایە، بە قازانجی گەلی کورد و تەواوی گەلی عێراق بوو. بەڵام مەلا مستەفای بارزانی بەتەواوی پشتی بە ئێران و ئیسرائیل و دواتر ئەمریکا بەستبوو. جڵەوی بزووتنەوە چەکدارییەکە و بڕیاری ئاشتی، یان شەڕ، کەوتبووە دەستی دەوڵەتی ئێران، کە ساڵانێک بوو کۆمەکی زۆری سەربازی، مادی، لۆجستیکی و موخابەراتیی بەو بزاڤە چەکدارییە دەکرد، بۆ ئەوەی عێراق بە جۆرێک لاواز بکات، بە ناچاری داخوازییەکانی ئێران قبووڵ بکات.

ئێران و عێراق چەند کێشەی سیاسی و سنوورییان هەبوو، گرینگترینیان دیاریکردنی سنووری (شەتی عەرەب) بوو، کە لە ئەنجامی تێکەڵبوونی دیجلە و فورات، لە باشووری عێراق، دروستبووە و عێراق و ئێران لێک جیا دەکاتەوە. ساڵی ١٩٣٧ ڕێککەوتنێک لەبارەی شەتی عەرەب، لەنێوان ئەو دوو وڵاتەدا، مۆر کرابوو. ئەو کاتە عێراق ڕاستەوخۆ و ئێران ناڕاستەوخۆ بندەستی بریتانیا بوون. بریتانیا لەو ڕێککەوتنەدا بە مەبەست و بۆ ئاژاوەنانەوە لە ئایندەدا، مافی ئێرانیان لە (شەتی عەرەب) پێشێل کردبوو. ئەوە مین (لوغم)ێک بوو بریتانیا، بۆ ئەو دوو وڵاتەی

---

1-أيوب بارزاني، الحركه التحرريه الكرديه و صراع القوى الاقليميه، ١٩٥٨-١٩٧٥، دار نشر حقائق المشرق، جنيف/سويسرا، ص٤٦٣

چانــدبوو. ڕاســتییەکەی بریتانییەکــان هەر وڵاتێکیــان بندەســت کردبێت، لە بەر ناپاکی و ڕۆحی شەڕخوازییان، چەندان مینی لەو جۆرەیــان چانــدووە، تــا لە داهــاتوودا بە ڕووی ئەو وڵاتــانەدا بتەقنەوە. دەوڵەتی ئێران، کە هەمیشە لە عێراق بەهێزتر بووە، لەو ڕێکەتنەدا خۆی بە غەدرلێکراو دەزانی، دەیەویست لە ڕێگەی بزاڤی چەکداریی کوردەوە، فشار بۆ عێراق بەرێت، بۆ ئەوەی ناچاری بکات ڕێککەوتنێکی نوێ، بە قازانجی ئێران، مۆر بکات.

باسکار و سیاسەتمەدار ئەیوب بارزانی دەنووسێت:

(ئێران کۆششی کرد، کورد لە هاوپەیمانیی سێ قۆڵی -کوردی، شیوعی، بەعسی بکێشێتەوە، کە سۆڤیەتییەکان دەیانویست. ئێران بە هۆی سێ هۆکار توانی لەم کارەیدا سەرکەوتوو بێت: پێدانی پارەی زۆر، گوێڕایەڵی -ئیتاعەتکردنی مەلا مستەفا بۆ شای ئێران، نەبوونی متمانە لەنێوان بەغدا و سەرکردایەتیی کورد، کە لە ئەنجامی چەند ڕووداوی وەکوو هەوڵی کوشتن و خۆدزینەوە لە جێبەجێ کردنی ڕێککەوتنی ئاداری ١٩٧٠، دروست بووبوو. شا زانی چۆن مەلا مستەفا لەو هاوپەیمانییە بکشێنێتەوە، ئەو دەرکی دەکرد کە بەلای سەرکردایەتیی کوردەوە گرینگە ئەمریکا دڵنیاییان پێ بدات، ئەو نیاز و کەسایەتیی مەلا مستەفای بە وردیی دەزانی.)[1]

لەو دیدارەدا، وەکوو کیسنجەر دەڵێت، شا بە نیکسۆنی وتبوو (سۆڤیەتەکان کار دەکەن بەرەیەک لە کورد و شیوعییەکان و بەعسییەکان پێک بهێنن، لەجیاتی ئەوەی گرفتی کورد خەنجەرێک بێت لە پشتی ئەوان بدرێت، دەبێتە سەرچاوەی بەهێزبوونی شیوعییەکان... نیکسۆن چووە سەر ئەو باوەڕەی کە ڕاپەڕینی

1- هەمان سەرچاوە، ل ٤٦٣

کورد لە ڕووی بەغدا، بۆ کۆمەکی ئەمریکا هەرەس دەهێنێت.)[1]

بەهاری ١٩٧٤ شەڕ دەستی پێ کردەوە. سەدان هەزار کەس، بۆ ئەوەی مەترسیی گرتن، ڕاونان و کوشتنیان لەسەر بێت، لە کوردستانەوە بەرەو ئێران بران. حکومەتی ئێران، کە لە وڵاتی خۆی بەرگی کوردی، نووسین و خوێندنی کوردیی یاساخ کردبوو، پارتی و پێشمەرگەی پڕچەک دەکرد، لەگەڵ ئەو سەدان هەزار کەسەی لە ئۆردوگای تایبەت حەوێندرابوونەوە، بەخێوی دەکردن. ئەو خەڵکە ئاوارەیە وەکوو بارمتەیەک و فاکتەری فشاربردن، لای ساواک و دەوڵەتی ئێران بوون. ئەگەر ئێران مانگێک پارە و خۆراکی لێ ببڕیبان، زۆربەیان لەبرسان دەمردن.

دوای هەڵگیرسانەوەی شەڕ، شای ئێران لە پەیامێکی ڕاستەوخۆدا بۆ دەوڵەتی عێراق، ڕووقایمانە، چەند جار وتی:

ئەو بزووتنەوە چەکدارییەی باکووری عێراق وەکوو بەلوعەیەکە، کەی بمەوێ دەیکەمەوە، کەی بمەوێ دەیگرمەوە.

سەرکردایەتیی بزافی چەکداریی کورد، ئەو قسانەی شای ئێرانیان بە هەند نەگرت و وەڵامیان نەدایەوە. خۆیان بۆ ئەو ڕۆژە ئامادە نەکرد کە (شا بەلوعەکە دەگرێتەوە)، وەکوو ئەوەی مەسەلەکە پێوەندیی بە ئەوان و گەلی کوردستانەوە نەبێت. یان خۆیان ئەو ڕاستییە بزانن، کە چارەنووسی خۆیان و گەلەکەیان خستۆتە ناودەستی دەوڵەتی ئێران!

سەرانی پارتی نامەسئولانە زانکۆی سلێمانییان گواستەوە بۆ قەڵادزێ، بێ ئەوەی هیچ حیسابێک بۆ عاقیبەتی ئەو کارە بکەن، یان بتوانن لە بۆردومانی فڕۆکەی عێراقی بیپارێزن. شەر دەستی

1- هەمان سەرچاوە، ل ٤٦٤

پێ کـردەوە، لە ٢٤ی نیسـانی ١٩٧٤ شـاری قەڵادزێ، بە هـۆی گواستنەوەی زانکۆی سلێمانییەوە بۆ ئەوێ، بۆردومان کرا، سەدان کەس کوژران و بریندار بوون و ماڵوێران کران. چەندان خێزان بە کۆمەڵ شەهیدیان دا، لەوانە لە خێزانی ئەحمەدی حاجی سابیر ٩ کەس شەهید کران، لە خێزانی قادری وەستا ئەحمەد ٦ کەس، لە خێزانیی عەبدولڕەزاق سەراج ٥ کەس و لە خێزانی جەمال کابانی هونەرمەند ٤ کەسیان شەهید بوون. هەروا بۆمبایەکی ناپاڵم بە ماڵی خاڵە حەسەنم کەوت، کچە گەورەکەیان، گوڵەباغ، بە سێ منداڵەوە لەگەڵ قوبادی برای، شەهید بوون. خاڵۆژنە فەخریم، لەگەڵ سێ منداڵی تری، فوئاد، چیمەن و ناسکە، بە سەختی بریندار بوون. چیمەن، کە ئێستا دوکتۆرێکی ناسراو و لێهاتووی ئێسقان و جومگەیە لە سلێمانی، هاوینی ١٩٦٣ لە دەربەدەریدا، لە سونێ، لەژێر خێوەتێکدا، بێ مامان لەدایک بوو، لە بۆردومانەکەشدا قاچێکی لەدەست دا.

دوای بۆردومانەکە هۆنراوەیەکم بۆ قوبادی خاڵۆزام نووسی، کە یەکێک بوو لە زیرەکترین قوتابیانی ئامادەیی قەڵادزێ و وەکوو سیمبولێکی دیاری شەهیدانی قەڵادزێ ناسرا. بەردەوام لە ڕادیۆی شاخ ناوی دەهێندرا. هۆنراوەکە لە یادی یەکساڵەی بۆردومانی قەڵادزێ، لە گۆڤاری ڕۆشنبیریی نوێ، ژ. ٤٠ لە ١٩٧٥/٤/٢١ بە ناوی ئارام بگرە و لە کۆمەڵەهۆنراوەی پشکۆکان دەگەشێنەوە، بە ناوی دەرگا لە ڕووی ئەو کزەبایە پێوەدە! بڵاو کرایەوە. ئەمە دواکۆپلەی هۆنراوەکەیە:

ڕووبارت بۆ دەریا گواستەوە
ئەم شەوە هەر دوایی نەهات

بۆنی کفنە زەرد هەڵگەڕاوەکانت
لە سییەکانتدا تواندەوە
کەچی ئەم شەوە هەر دوایی نەهات.
ئەم کێلە هەڵمەقەنە!
گیانە تۆ بۆ ئەوەندە لاساریت
سەری ئەم گۆڕەشت هەڵدایەوە؟
رەنگە ئێستا (قوباد) لێرە باری کردبێت و
لە کەناری مێژوو پیاسە بکات
یان نیشتمانێکی دی بۆ ئاوارەکان بنیات بنێت،
دووریش نییە ئێستا
لەنێو دڵی مندا ڕاکشابێت.

دوای هەڵگیرسانەوەی شەر، ئەمریکا هەستی کردبوو ئەو شەرە نفوزی یەکێتیی سۆڤیەتی لە عێراق بەهێز کردووە. چونکە عێراق، لە ڕووی ئابووری و سەربازییەوە، پشتی بە یەکێتیی سۆڤیەت بەستبوو. ئەوە بە قازانجی ئەمریکا نەبوو، بۆیە دەیەویست شەڕەکە کۆتایی بێت و عێراق لە یەکێتیی سۆڤیەت دوور بکەوێتەوە، ڕوو لە ئەمریکا و وڵاتانی ڕۆژئاوا بکات.

(کیسینجەر بە شای وتبوو: دەبێت ئاشتی و ئارامی لە ناوچەکە هەبێت بۆ ئەوەی پێی سۆڤیەت لە عێراق ببڕین و دەری بکەین. فاکتەری نفوزی سۆڤیەت لە عێراق شەڕی بەڕواڵەت کوردەکانە، بەڵام دنیا دەزانێت ئێران سەرچاوەی سەرەکیی ئەو شەڕەیە. من قسەم لەگەڵ بۆمیدێن، سەرۆکی ئەلجەزایر، کردووە تا کارێک بکات تۆ و سەدام لێک نزیک بکاتەوە، شا ئەمەی قبووڵ کرد.)[1]

---

1-عرفان قانعی فرد، تندباد حوادث، گفت و گو با عیسی پژمان سەرچاوەی پێشوو١٧٦

حامید ئەلجبوری، کە ساڵی ١٩٧٤-١٩٧٥ وەزیری ڕاگەیاندن بوو لە عێراق، لە چاوپێکەوتنێکدا، لە کەناڵی تەلەڤزیۆنی ئەلجزیرە، بەرنامەی (شاهد علی العصر)، دەگێڕێتەوە کە لە یادی ڕزگاربوونی گەلی ئەلجەزایر لە کۆلۆنیالیزمی فەرەنسی، سەرۆککۆمار، ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر، ئەوی بۆ ئەلجەزایر ناردبوو، بۆ ئەوەی بە ناوی عێراقەوە، لەو بۆنەیەدا بەشدار بێت. لەوێ سەرۆکی ئەلجەزایر، بۆمیدێن، جیای کردبۆوە و پێی وتبوو:

(شای ئێران ئامادەیە لاپەڕەیەکی نوێ لەگەڵ عێراق هەڵبداتەوە. شا بە شێوازێکی تەنزئامێز پێی وتم بزووتنەوەی کورد لە عێراق وەکوو بەلوعەیەکە، کەی بمەوێ دەیکەمەوە، کەی بمەوێ دەیگرمەوە، جا کەیفی خۆیانە، دەیانەوێت بیکەمەوە، یان بیگرمەوە.)[1]

ئێران و ئەمریکا ڕۆڵی سەرەکییان لە هەڵگیرساندنەوەی شەڕ و ڕێکەوتنەکەی ئەلجەزائیر و هەرەسپێهێنانی ئەو بزاڤە چەکدارییە بینیوە، چونکە چارەنووسی بزاڤەکە خرابووە ناو دەستی ئێران و ئەمریکا. وەزیری دەرەوەی ئەو کاتەی ئەمریکا، هێنری کیسنجەر دەڵێ: (سیاسەتی ئێمە بەرانبەر بە کورد بێ ئەخلاقانەیە، ئێمە نە یارمەتیمان دان، نە لێیان گەڕاین خۆیان بە وتوویژ کێشەکانیان لەگەڵ حکومەتی عێراق چارەسەر بکەن، ئێمە لە دژی عێراق تیژمان کردن و دوای ئەوە وازمان لێ هێنان.)[2]

---

1- تلفزیون الجزیرة، احمد منصور، شاهد علی العصر، مع حامد الجبوری، الحلقة السابعة، ٩-٦-٢٠٠٨

2- محەمەد حسنین الهیکل، الحل والحرب، ص 140، هەروا جلال طالبانی، اغد ودیموقراطی وحرمان شعب حتی من حق الحلم، منشورات الاتحاد الوطنی الکردستانی ١٩٨٩، ص٦٠

لە بەهــاری ١٩٧٥ پەیماننــامەی ئەلجەزایــر، لەنێــوان ئێــران و عێراقــدا مــۆر کــرا. بەپێــی پەیماننــامەکە، حکــومەتی عێــراق دەسـتبەرداری زیـاتر لە نیوەی نـاوچەی (شـەتی عەرەب) بـوو بۆ ئێران، ئەوەی ئێران لە حکومەتی عێراقی دەیوست، دەستی کەوت و بەلـوعەکەی گـرتەوە. ڕۆژی ١٩ی ئـاداری ١٩٧٥ سـەرکردایەتیی بزاڤی چەکداری، جاڕی ئاشبەتاڵی دا.

مرۆڤ لە سەرەتایەکی هەڵەوە، قەت ناگاتە ئەنجامێکی دروست.

هەر کارێک، باشی و خراپییەکەی، دروستی و چەوتییەکەی، لە ئەنجامەکەیـدا دەردەکەوێـت. چـوارده سـاڵ ڕەنـج و قوربـانی و بەکوشـتدانی دەیـان هەزار کەس، هەڵگیرسـانی شـەڕی نێوخـۆ و لەتکردنـی گەلـی کوردسـتانی عێـراق و وێرانکردنـی کوردسـتان، ئەنجـامەکەی ئەوەبـوو دەوڵەتـی ئێـران نیـوەی شـەتی عەرەبـی لە عێراق ستاند. لە بەرامبەر ئەوەدا ئاشبەتاڵی بە بزاڤە چەکدارییەکە کرد، کە ئـامرازێکی دەستی خۆی بـوو. دەیان هەزار پێشمەرگە و هەزاران خێـزان، کە ژیـان و کەرامەت و چارەنووسـیان خسـتبووە نـاو دەسـتی سـەرانی بزووتنەوەکە، ناچـار کران زەلیل، سـەرکز و بێهیوا، خۆیان ڕادەستی حکومەتی عێراق بکەنەوە. دەوترێت:

مەڕ لەگورگ تۆقیوە، کەچی شوانەکەی دەیخوات.

بە کورتی، ئەو کاتە لە عێراقدا، دوو بەرەی سیاسی پێک هاتبوو، بەرەی یەکێتیـی سـۆڤیەت و حکـومەتی عێـراق، بەرەی ئەمریکـا و ئێـران. حزبـی شـیوعی کەوتە بەرەی یەکەم، کەچـی پـارتی کەوتە بەرەی دووەم. ئەمە ناوەرۆکی کێشەی سیاسیی ئەو کـاتەی عێراق بوو. حزبی شیوعی و پارتی دوو ئەکتەری دیار، یان دوو ئـامرازی ئەو کێشەیە بوون لە عێراقدا. دواتریش هەردووکیان، بە دۆڕاوی و تێکشـکاوی لە کێشـەکە هـاتنە دەر. دەوڵەتـی ئێـران، بە قەولـی شـا،

بەلوعەکەی گرتەوە، دەوڵەتی عێراقیش پەلاماری شیوعییەکانی دا. لە ئەنجامدا خەڵکی کوردستان و عێراقیش بوونە قوربانی.

دوای شکستی بزاڤی چەکداری، لە بەهاری ١٩٧٥ پارتی هەڵوەشایەوە. هیچ هێزێکی سیاسیی چەکدار لە عێراقدا نەما، کە بتوانێت بە دەیان هەزار کەس بهێنێتە سەر شەقام و لە ڕووی حکومەتی عێراق بوەستێت. حکومەتی عێراق پێوەندیی لەگەڵ وڵاتانی ڕۆژئاوا بەهێز کرد. پێویستیی بە یەکێتیی سۆڤیەت و هاوپەیمانیی حزبی شیوعی نەما. پەلاماری ئەو حزبەی دا و لە مەیدانی سیاسیی عێراق، دەری پەڕاند.

ئاشبەتاڵی بزاڤی چەکداریی کورد، زەمینەی بۆ بەعس ئامادە کرد کە دیکتاتۆریا لە سەرانسەری عێراقدا بسەپێنێت. بەغدای ئەدەب و هونەر و ڕووناکبیری، بگۆڕێت بە پایتەختی ستەم و تیرۆر و لەناوبردنی ئازادیخوازان. لەوێوە شەڕ و تیرۆر بۆ تەواوی عێراق ڕەوانە بکات.

## ٣
## کولتووری کاولییەکان و شیعری دەربار

هاوینی ١٩٧٤ خوێندنی زانکۆم تەواو کرد، هەشت مانگ کرام بە سەرباز. دوای ئەوە بە لێبووردنی گشتی، لەگەڵ ئەوانەی وەکوو من لە سەربازی دوا کەوتبوون، یان هەڵاتبوون، ئیزن درام. جاران دەرچووی زانکۆکان وەکوو ئەفسەر، شەش مانگ یان ساڵێک، لە سوپادا کاریان دەکرد، بەڵام لە حەفتاکانەوە دەرچووانی زانکۆش بە سەربازی ئاسایی دادەندران، بەڵام لە بەشی کارگێڕی، تەجنید و ژمێریاری کاریان پێ دەکردن.

سەرەتا ڕەوانەی سەربازگەی درهەمیە کرام، کە لە خوار شاری بەسرایە. لەوێ لەگەڵ زیاتر لە سەد دەرچووی زانکۆ، نزیکەی چوار مانگ ڕاهێنانی سەربازییم کرد. ئەو ماوەیەی لە بەسرا بووم، لە سەربازگە ژیام. بەڵام شەوانی هەینی، بۆمان هەبوو لە دەرەوەی سەربازگە بمێنینەوە. هەموو هەفتەیەک، دوای نیوەڕۆی پێنجشەمە، بۆ پشوودان دەچوومە بەسرا. زۆر جار شەوێک لە هۆتێلێکی هەرزان دەنووستم، ئێوارەی هەینی دەگەڕامەوە سەربازگە.

لە بەسرا بڕیارم دا ئەو ماوەیەی لەوێم، ڕۆمانەکانی نەجیب

مەحفوز بخوێنمەوە، کە لە کتێبفرۆشییەکان هەبوون، خوێندنەوەیان لە سەربازگە، ئازاد بوو. لەگەڵ کتێبفرۆشییەک ڕێک کەوتم، هەر جارە ڕۆمانێکی نەجیب مەحفوزم لێ وەردەگرت، دوای خوێندنەوەی بۆیم دەگێڕایەوە و ڕۆمانێکی ترم لێ دەخواست. لە بەرانبەر ئەوەدا، نیودینارم بە باربوو لە لا دادەنا، لەبری هەر کتێبێکیش، پەنجا فلسم دەدایە.

لە ڕۆژانی خوێندنی زانکۆ فێری ئەو سەودایە و کتێبفرۆشتنەوە بووم. کاتێک کتێبێکم دەکری و دوای خوێندنەوەی کارم پێی نەدەما، بە نیوەی نرخەکەی دەمدایەوە بە کتێبفرۆشییەکە، گۆڤارێک یان کتێبێکی ترم لێ دەکڕی. جارێک مامۆستا توفیق وردی کتێبێکی خۆی، کە تێکستی فۆلکلۆری بوو، بە دیاری پێ دام. دوای خوێندنەوەی کتێبەکە، بە نیوەی نرخەکەی خۆی، دامەوە بە کتێبفرۆشییەکی سەرجادە، کە لە شەقامی ئەلڕەشید، ساحەی ئەلڕەسافی، کتێبی کوردیی دەفرۆشت. ڕۆژێک مامۆستا وردی هاتە چایخانەی پەرلەمان، زۆر توڕە بوو، وتی:

ئەو سەگباوکە، چوار مانگە دە کتێبم بۆ فرۆشتن لە لا داناوە، چووم حیسابی لەگەڵ بکەم، کەچی یازدە کتێبی لە لایە!.

لەماوەی سەربازیدا بۆم نەبوو بە هیچ جۆرێک پێوەندیی بە ڕۆژنامەی بیری نوێ و حزبی شیوعییەوە بکەم، چونکە ئەو کارە یاساخ کرابوو، سزای توندی بەدواوە بوو. ئەو ماوەیە لە ڕۆژنامەی هاوکاری، چەندان نووسین و بابەتی تەرجومەکراوم بڵاو کردەوە. بۆ هەر نووسینێک پاداشتێکی ماقوولیان دەدا.

ڕۆژێک سەربازێک، کە ناوی حوسێن بوو، خەڵکی بەسرا و دەرچووی بەشی زمانی عەرەبی بوو، سڵاوی لێ کردم. دوای تاوێک باسی شیعر و ئەدەبیات و شاعیران بەدر شاکر ئەلسەیاب

و سەعدی یوسفی کرد، کە خەڵکی ناوچەی بەسران. لە پڕ وتی شیعرەکانی تۆم لە ڕۆژنامەی (تەریق ئەلشەعب) و (ئەلفکر ئەلجەدید) خوێندوونەوە و بەدڵمن. سەرەتا کەمێک لێی بەگومان بووم، وتم لەناو کوردا ڕەنگە سەد ڕەفیق سابیر هەبێت، بەڵام باوەڕی نەکرد. دواتر بۆم دەرکەوت، کە کوڕێکی ڕووناکبیر و چەپە، بە هاوڕێیەکی خۆی ناساندم، کە ناوی مەهدی بوو، لەگەڵ ئێمە سەرباز بوو، ئەویش بەشی زمانی عەرەبیی لە بەسرا تەواو کردبوو. هەردووکیان زۆر بەڕێز بوون، زانیاریی زۆریان لەبارەی ئەدەبی عەرەبی هەبوو، تەنانەت ئاگاداری زۆربەی ئەو بەرهەمە ئەدەبییە کوردییانە بوون، کە بە عەرەبی بڵاو کرابوونەوە.

لەگەڵ حوسێن چەند جارێک ڕۆژانی هەینی لە بەسرا یەکترمان بینی و بە شارەکەدا گەڕاین، سەردانی کتێبفرۆشیمان کرد. شەوێک لەماڵی خۆیان، بانگهێشتنی کردم. بە برادەرێکی خۆی ناساندم، کە سایەقی پاس بوو. بەڵام کەسێکی خوێندەوار، هۆشیار و ئاگای لە دنیای دنیای سیاسی و ڕۆشنبیریی بوو، ناوی محەمەد بوو. دوای ئەوە شەوێک میوانی محەمەد بووین. کوڕێکی بچووک و دوو کچی هەراشتری هەبوون. محەمەد بانگی کوڕەکەی کرد، کە ناوی عەزیز بوو، بە شانازییەوە وتی:

کوڕەکەم بە ناوی هاوڕێ عەزیز محەمەدەوە، کردووە.

محەمەد، وێنەی حوسێن و زۆرینەی خەڵکی بەسرا، نموونەی کەسی دڵپاک، ڕاستگۆ و ڕەفیقدۆست بوو. ڕەفتار و هۆشیاری و شێوەی ژیانی، هەندێک لەو کرێکارانەی بە بیر دەهێنامەوە، کە ماکسیم گۆرکی لە ڕۆمانەکانیدا باسی کردوون. ئەو بەو هیوایە ئەو ناوەی لە کوڕەکەی نابوو، تا ڕێگای باوکی بگرێت. وەکوو عەزیز محەمەد، ببێتە کەسایەتییەکی دیاری کۆمۆنیستی و عێراق.

کاتێک ئەو برادەرە بەسراوییانەم دێنەوە یاد، بیرم بۆ لای عەزیز محەمەدەکەی بەسرا دەچێت. هەندێک جار لەخۆم دەپرسم تۆ بڵێی، لە شەڕی عێراق و ئێران، یان شەڕی کەنداودا، یان لە ڕاپەڕینەکەی باشووری عێراقدا، لە ١٩٩١، جوانەمەرگ نەبووبێت؟ ئەگەر مابێت ئایا ڕێگای باوکی گرتووە، یان ئێستا بۆتە کەسێکی ئاینی و لەگەڵ حزبێکی ئیسلامی، کە لە عێراق وەکوو کوارگی بەهاران هەڵتۆقیون، کار دەکات.

مـرۆڤ بە خەونـی زۆرەوە دەژی، بەڵام تەنیـا بەشـێکی کەمـی خەونەکانی شین دەبن. بۆیە دەیەوێت لەجیاتی خۆی، منداڵەکانی ئەو خەونـــانەی بهێنـــنە دی. بەڵام لە بیـــری دەچێـــت کە ئەوان نەوەیەکی ترن، لە دۆخ و سـەردەمێکی جیاوازدا دەژین. ئەوانیش خەون و ئامانجی خۆیان هەیە، لەپێناویاندا کار دەکەن و دەژین.

ڕۆژێـک حوسـێن وتـی دەتـبەمە جێیەک پێشـتر نەتـدیوە، هێنـدە سەرسـام دەبیـت قەت لە بیـرت نـاچێتەوە. بە تاکسـیی فـرەنەفەری، چـووینە گونـدێکی کاولینشـینی نزیـک بەسـرە، کە نـاوی (حەی ئەلتەرەب) بوو.

کاولییەکـان، گروپێکـی کـۆمەڵایەتی و کولتـووریی عەرەبیـی گەڕۆکـن، تـا ڕادەیەک، لە قەرەج یـان دۆم دەچـن، بەڵام سـەما، گۆرانی، ڕابـواردن و ئـاهەنگگێڕان لە زەماوەند و بۆنەی تـایبەتیی خەڵکدا، کار و چاوگەیەکی گرینگی داهاتیـانن. ئەو سـاڵانە بەشـێکی کاولییەکـان لە قەراخـی هەنـدێک شـاری گەورە، لەوانە ناسـریە، بەسـرا و شـوێنی تـر، دەژیـان. دواتـر حکـومەتی عێـراق زۆربەی کاولییەکانی، لە ناوچەی جیاواز نیشتەجێ کردن.

حوسێن پێی وتم خەڵک بۆ ڕابواردن و دەستبازی لەگەڵ کچان و ژنان ڕوو لەو گوندە دەکەن. بە هەر کۆڵانێکدا بڕۆین ژن، کچ و

منداڵ بانگمان دەکەن بڕۆینە ماڵیان. کچان لەبەر چاوی کەسێک یان چەند کەسی خێزانەکەیان، لەگەڵ میوانەکە دادەنیشن. دەرفەتی دەستبازی و ماچکردنی کچەکە دەبێت. بەڵام لەگەڵ ژنان، دەشێت سنوورەکە فراوانتر بێت.

بە کۆڵانێکدا ڕۆیشتین، دوو کچی گەنجی چاوباز و ڕووخۆش، لەبەر دەرگای ماڵەکەیان ڕاوەستابوون. دۆستانە، وەکوو لەمێژبێت یەکتر بناسین و بە تایبەت بۆ سەردانیان چووبین، فەرموویان لێ کردین و بەرەو ژووری میوانیان بردین. لەوێ کابرایەکی کەتەی بەساڵداچووی سمێڵ بابڕ، لەسەر دۆشەگێک دانیشتبوو، شمشێرێک لە پشت سەریەوە هەڵواسرابوو. پیاوەکە هیچ خۆی نەجوڵاند و بەخێریشی نەهێنایین. دوو کچەکە یەکسەر لە تەنیشت من و حوسێن، بەرامبەر بە پیاوەکە، دانیشتن و دەستیان خستە سەر شان و ڕانمان. لە بەرانبەر دیمەنی کابرای سمێڵبابڕ و شمشێرەکەی ژوورسەری و، دیمەنی کچە بزۆزەکانی تەنیشمان، دامابووم. داوامان لێ کردن بڕۆینە ژوورێکی تر، بەڵام ڕازی نەبوون. کچەکان هانیان دەداین ماچیان بکەین، لە ئامێزیان بگرین و دەستبازییان لەگەڵ بکەین. کەچی کابرا، وەکوو ئەوەی تەماشای فیلمێک بکات، یان لە بەرانبەر تەلەڤزیۆن دانیشتبێت، بێدەنگ و بێلایەن، چاوی تێبڕیبووین و مژی لە دارجگەرەکەی دەدا. من حەپەسابووم و شەرمم کرد دەستبازی لەگەڵ کچەکە بکەم، بە تایبەت کە ئێمە بەو نیازە نەچووبووین. هەروا پێوەندیی من و حوسێن جێگەی ئەوەی تێدا نەدەبۆوە، کە لەبەرچاوی یەکتر، ئەو جۆرەکارانە بکەین. بە هێمنی دەستم بە پرچ و ڕوومەتی کچەکەی تەنیشتم داهێنا، کەمێک پارەم بۆ بە جێ هێشت و بە خێرایی لەگەڵ حوسێن چووینە دەرێ.

بە چەند کۆڵانی تردا گەڕاین. دوو کوڕ کە تەمەنیان پێنج شەش ساڵ بوو، پێمانەوە نووسان و پێداگریان کرد بڕۆینە ماڵیان، گوایا لەوێ دایکیان چاوەڕێمانە. یەکێکیان لەکۆڵمان نەبۆوە. پاشەوپاش بە بازدان لە بەردەممان دەکشایەوە، بە قسەی لووس هانی دەداین لابدەین. ئێمە گوێمان پێ نەدەدا، لە ناکاو ڕاوەستا، سەرەپەنجەی دۆشاومژەی خۆی پیشانداین و وتی:

بۆ نایەن؟ هینەکەی دایکم (کە ناوی هێنا) هێندە چکۆلەیە!

تێر بە ریکلامەکە پێکەنین و لە دوو منداڵەکە دوور کەوتینەوە.

ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام لەبەر دەرگای چەندان ماڵ، قەمەرەی نوێی مارکەی داتسۆنی ژاپۆنی، کە ئەو کاتە لە عێراق نەبوو، بە نمرەی (کوەیت)ەوە، ڕاگیرابوون. حوسێن وتی پیاوانی کوێتی ئێرە بە بەهەشت دەزانن، هەندێکیان لە پاشنیوەڕۆی پێنجشەمەوە دێنە ئێرە و شەممە دەگەڕێنەوە بۆ کوەیت.

کاولییەکان وەکوو گروپێکی کۆمەڵایەتی و کولتووری، لە کۆتایی حەفتاکانەوە، لە عێراق، زیاتر دەرکەوتن. ئەو ساڵانە سەما و گۆرانیی کاولییانە، نەریت و کولتووری خێڵەکی و بەدەوییانە، لە عێراق ڕەواجیان پەیدا کرد. کولتووری شار، لە بەرانبەر کولتووری لادێ و بەدووەکان، پاشەکشەی کرد. چونکە زۆرینەی بەرپرسانی حزبی بەعس و دەسەڵات کەسانی خێڵەکی، گوندی و بە ڕەچەڵەک بەدوو، کۆلکەخوێندەوار و زەوقسز بوون. ئەوان، وەکوو بەشێکی بەرپرسانی ئێستای کوردستان، بە کولتووری شار، هونەر و ئەدەبیاتی مۆدێرن و ئێستێتیکا نامۆ بوون. لای ئەوان هونەر، سەما، مۆسیقا و گۆرانی، تەنیا بۆ ڕابواردن، هەڵپەڕین، سێکس و بەسەربردنی شەوەکانیان بوو. سەما و گۆرانیی هەرزانبەهای کچە کاولییەکان، لەگەڵ زەوقی بێزەوقانەی ئەوان و ئاستی نزمی

ڕووناکبیری و پاشخانی کۆمەڵایەتییاندا دەگونجان. بۆیە شەوانی خۆیان بە گۆرانی و سەمای ئەوان و ڕابواردن لەگەڵیان، دەڕازاندەوە. هەندێک لەو کچەکاولییانە، وەکوو گۆرانیبێژ و سەماکار، کرابوونە ئەستێرەی تەلەڤزیۆن. لە دوای ڕوخاندنی دەوڵەتی بەعس، چەندان ڤیدیۆی ئەو جۆرە ئاهەنگە هەرزانبەهایانە بڵاو کرانەوە، کە بەرپرسانی بەعس، لەوانە عەلی حەسەن ئەلمەجید و وەتبانی برای سەدام و بەرپرسانی تری بەعس شەوەکانی خۆیان پێ ڕازاندبوونەوە.

هاوینی ١٩٧٩ سەدام بوو بە سەرۆککۆماری عێراق. لە ئەنجامی زاڵبوونی کولتووری گوند و بەدووەکان، شیعری شەعبی، کە بە شێوەزاری عێراقی (عامی) دەوترێت، برەوی زۆری پێ درا. چەندان شاعیری شەعبی و شاعیری تر، کە ستایشی سەدام و شەڕی عێراق و ئێرانیان دەکرد، وەکوو شاعیری دەربار دەرکەوتن. لە بەردەم سەدامدا شیعریان دەخوێندنەوە، کە زۆر جار لە کەناڵی تەلەڤزیۆنی بەغدا پێشان دەدران و سەدام پارە و ئۆتۆمبێلی، وەکوو پاداشت پێ دەدان. دیاردەی شیعری دەربار، کە لەبارەی ستایشی سەدام و شەڕی عێراق و ئێران دەنووسران، کرا بە سەرچاوەیەکی خۆژیاندن و هۆکارێکی تری دارمانی کولتووری، ئەخلاقی و زەوقی گشتیی لە عێراق. سەدام بەو کارەی نەریتێکی کۆنی خێڵەکی و بەدەویی عەرەبیی ژیاندەوە.

شیعری ستایش (مەدح) شوێنی فراوانی لە ئەدەبی عەرەبیدا گرتووە. شیعر لای عەرەب لە کۆنەوە سروشتی وتاردان (خوتبەدان) و ستایشکردنی هەبووە. شاعیر شیعری وەکوو ئامرازێک بۆ هەڵنان و ستایشی خێڵەکەی و شکاندنی خێڵی نەیار، بەکار هێناوە. بە شیعری حەماسەتئامێز، ورەی ئەندامانی خێڵەکەی

خۆی بەرز کردۆتەوە. بۆیە شاعیر شوێن و پێگەی تایبەتی لەناو خێڵەکەیدا هەبووە. کاتێک خێڵێک شاعیرێکی باشی لێ هەڵکەوتووە، خێڵە دۆستەکانیان پیرۆزباییان لێ کردوون.

دوای دەرکەوتنی ئاینی ئیسلام، شیعر بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو ئاینە و ستایشکردنی ڕابەرانی و دژایەتیکردنی نەیارانی ئیسلام، بەکار هێندرا. شیعری ستایش، لە بنەڕەتدا بۆ مەبەست و ئامانجی بەکۆمەڵ و دەسەڵاتداران، تەرخان کراون. بۆیە شاعیر بە دەگمەن هزر، هەست و دنیابینیی تایبەتی خۆی دەربڕیوە.

شاعیری گەورەی عەرەب ئەلموتەنەبی ٩١٥-٩٦٥ چەندان شیعری ستایشئامێزی بۆ دەسەڵاتدارانی وەکوو سەیف ئەلدەولە ئەلحەمدانی و دەسەڵاتداری میسر (کافوور ئەلئەخشیدی) کە ڕەشپێست بوو، نووسیووە. موتەنەبی ساڵانێک لە دەرباری کافوور ژیا. لە شیعرەکانیدا کافووری بە باوکی میسک (ابو المیسک) و باوکی پیاوچاکان و چاکەکاران ناو بردووە. کاتێک کافوور کاری پێی نەما و پارەی لێ بڕی، لە شیعرێکیدا، جنێوبارانی کرد. بە هۆی ڕەشپێستییەکەی، بە عەبدێکی گڵاو و چرووک ناوی بردووە، وەک لەم بەیتە بەناوبانگەیدا دەڵێت:

لا تشتری العبد الا والعصی معه
إن العبید لأنجاس ومناکید.

نەکەی کۆیلەیەک بکڕی بێ کوتەک
کۆیلە چرووکن، گڵاون وەک سەگ.

شیعری دەربار بەشێکی بەربڵاوی ئەدەبی عەرەبی و کولتووری دەرباری خەلیفەکانی ئومەوی و عەباسی بوو. لە

دەربـاری خەلیفەکانـدا، چەنـدان شـاعیر کـۆ کرابـوونەوە، کـار و پیشـەیان ستایشـی ئەوان بـوو. دواتـریش ئەو جـۆرە ئەدەبیـاتە، بە فراوانی لە دەرباری شایانی ئێرانیشدا دەرکەوت.

دەوڵەت، یـان ئیمپراتۆریـای عەرەبـی و ئێرانـی سـەدان سـاڵ بەردەوام بوون. ئەوان سیسـتمی هـزری، ئایـدیۆلۆجی و ئێپسـتیمی (المعرفــی)ی تــایبەت بەخۆیــان هەبــوو. مەلای ســاختەچی و پاتـاڵخۆری دەسـەلات و شـاعیری دەربـار، بەشـێک بـوون لەو سیسـتمە هــزرییە- ئایــدیۆلۆجییە. بەڵام لە دەرەوەی دەربــار، هەمیشـە کۆمەڵێـک شـاعیر، بیرمەنـد، مەلا و خوێنـدەواری تـر هەبـوون، کە سـەربەخۆیانە و ڕاسـتگۆیانە، هـزر و ڕۆشـنبیرییەکی جیاوازیـان بەرهەم هێنـاوە. ئەوان بەو دەسـەڵاتە ئـاینی و سیسـتمە کولتووری و ئایدیۆلۆجییە ناکۆک، یان نامۆ بوون. بە هـۆی هـزر و نووسین و شیعرەکانیانەوە ئەشکەنجە دراون، گیراون و کوژراون، لەوانە حەلاج، عەبـدوڵڵای کـوری مـوقەفەع، وەزاح ئەلـیەمەن و چەنــدانی تــر. شـێوازی کوشــتنی حەلاج لە بەغــدا، ترۆپکــی وەحشـیەتگەری و سـادیەتی ئـاینیی بـوو. دوو قـازیی حەنەفـی بڕیاریان دا سەرەتا هەزار جەڵد (قامچی)ی لێ بدرێت، دوای ئەوە هەرچــوار پەلــی ببــڕدرێتەوە، ســەری بپەڕێنــدرێت، تەرمەکەی بسووتێندرێت و خۆڵەمێشەکەشی فڕێ بدرێتە ڕوباری دیجلە.

بەڵام لەناو کورددا شاعیر ئەو ڕۆڵەی نەبینیوە، چونکە نوێنەری خێـڵ و دەربـڕی خواسـت و ئامـانجی خـێڵەکەی نەبـووە. هەروا لە کوردستان دەوڵەت، پاشا، مەلیک و خەلیفە نەبوون تا شـاعیران، بە ئامانجی ژیانێکی باشتر، لە دەوریان کۆ ببنەوە و ستایشیان بکەن. یـان وەکـوو نەیـار لە دژیـان بوەسـتن و بە هـۆی شـیعرەکانیانەوە ئەشکەنجە بدرێن و بکوژرێن. لە کوردسـتان دەسـەڵاتی میرنشـینی

هەبوو، کە فۆرمێکی هەڵامساوی عەشیرەت و بنەماڵە بووە، نەک دەوڵەت و حوکمڕانی. ئەوانیش، وەکوو پێشتر ئاماژەم پێ دا، بە هاندانی ئێران، یان عوسمانییەکان، لەناو خۆیان و لەگەڵ میرنشینیی هاوشێوەیان، ناکۆک و ناتەبا بوون. لە پەراوێز و سایەی دەوڵەتی عوسمانی و ئێراندا بوون و هەڕەشەی ئەوانیان لەسەر بووە. کولتووری سیاسی و سیستمێکی هزری-ئایدیۆلۆجییان نەبووە، کە ئەو سەردەمە ئایدیۆلۆجیای ئاینی باوبوو. هەروا بایەخی هزر و ئەدەبیاتیان نەزانیوە و بۆ پاراستنی دەسەڵاتیان پێویستییان نەبووە. بۆیە ئەوان نەیانتوانی میراتێکی ئەدەبی و کولتووریی میرخانە، کە لە ناوەرۆکدا دیوەخان بووە، بەرهەم بهێنن. بۆیە نەیانتوانی کاریگەر و بەردەوام بن.

ئەوەندەی بزانم، لەناو شاعیرانی کلاسیکیی کوردیدا مەلای جەزیری دوو شیعری لە ستایشی میر شەرەفەدین نووسیوە، هەروا نالی ستایشی بابانەکان دەکات. ئەو شاعیرانە تاوان و ستەمی دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانیان دیبوو، بۆیە هیوایەکیان بەو میر و میرنشینانە هەبووە، کە بتوانن لە ستەم و تاوانی داگیرکاران بەدووریان بگرن. ئەو شاعیرانە زانا و خوێندەواری سەردەمی خۆیان بوون، پێوەندییان لەگەڵ میرەکان هەبووە. ڕەنگە لەبەر ئەو هۆکارانە، ئەو شیعرانەیان نووسیبن. دووریش نییە بە چاولێکەریی شاعیرانی عەرەب و فارس ئەو کارەیان کردبێت و چاویان لە دەستی میر بووبێت. هەرچۆنێک بێت ئەو هۆنراوانە، بە ڕای من، بە شیعری دەربار داناندرێن و بەشێک نین لە سیستمی کولتووری و هزریی دەسەڵاتێکی سیاسی، چونکە لە بنەڕەتدا ئەو دەسەڵاتە سیاسییە نەبووە.

شاعیرانی کورد، تا سەرەتای سەدەی بیستەم، زانا و

خوێندەواری دیار و ناسراو بوون. ساڵانێکی زۆر لە مزگەوت و خانەقا خوێندبوویان. بە دوای زانین و زانست و فێربووندا، ناوچەی جیاوازی کوردستان گەڕابوون. بە شێوەژیان و شێوەزاری خەڵکی ئەو ناوچانە ئاشنا بووبوون. لە حوجرە و خوێندنگا ئایینییەکاندا، مامۆستای جۆراوجۆر دەرسیان پێ وتبوون. لەپاڵ خوێندنی ئاینی، لۆجیک، بەلاغەت، ئەدەبیات و زمانانی عەرەبی، فارسی، هەندێکیان تورکیی عوسمانیشیان خوێندبوو. بە ئەدەبیاتی ئەو گەلانە ئاشنا بووبوون و تەنانەت بەشێکیان بەو زمانانە شیعریان نووسیوە. دوای تەواوکردنی خوێندنەکەیان، وەکوو مامۆستای ئەو خوێندنگا ئاینییانە و مەلای بەحورمەتی مزگەوت، کاری خۆیان کردووە. زۆریان کەسایەتیی ئەدەبی، ئاینی و کۆمەڵایەتی بوون، پێگەی کۆمەڵایەتیی خۆیان هەبوو، لای خەڵک ڕێزدار بوون.

کۆمەڵی کوردستان ناسێنترال و پەرتەوازە بووە، لە ڕووی سیاسییەوە یەکگرتوو نەبووە، بەڵکو لە خێڵ و تیرەی پێک ناکۆک و جۆراوجۆر پێک هاتووە. بەڵام بە هۆی زمان و کولتوورەکەیەوە توانیویەتی خۆی و تایبەتمەندیی نەتەوەیی خۆی بپارێزێت. بۆیە شاعیر لە کوردستان، کە دەستەیەکی خوێندەواری دەگمەن بووە، ڕۆڵی لەژیانی کۆمەڵایەتی، خوێندەواری، ڕۆحی و کولتووریدا هەبووە. ڕەنگە لەبەر ئەو هۆکارە و دۆخی سیاسیی کوردستان بێت، کە هێشتا شیعر لەناو کورددا، ئەرکی سیاسیی بۆ دادەندرێت، داوا دەکرێت شاعیر و نووسەر، بەهەڵوێست بن، لە دژی ستەمکاران بن، داکۆکی لە داد و ئازادی بکەن. زۆرینە لەو باوەڕەدان شیعر دەبێت وێنەی ئامرازێک، لە کێشە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکاندا، بە قازانجی خەڵک، بەکار بهێندرێت.

لەبەر ئەو هۆکارانەی سەرەوە، ڕەنگە هۆکاری تریش، شیعری پێداهەڵدان و ستایشکردنی دەسەلاتدار و سەرکردەی سیاسی، کە هێشتا خۆیان، یان وەچەکانیان دەسەلاتدارن، بە نەریت و مێژووی شیعری کوردی نامۆن.

شاعیر فەقێ تەیران ١٥٩٠-١٦٦٠ لە شیعرێکیدا دەڵێ، من ناچم بۆ دیوانی میر و حاکمان، ئەو شاعیرانەی گۆرانییان بەسەر میر و بەگدا هەڵداوە، ئەوان بە ڕۆح و دڵ فەقیرن:

ئەز ناچم دیوانێ میرا     نابم شارووێ کۆچ و سەرا
ناچم دیوانێ میر و حاکما     فەقێی تەیران ڕەبەنێ دلا
هەبوونە دەنگبێژ و شاعیر     برووح و دلا پڕ فەقیر
میر و بەگا ڕا سترانە     بێ قیمەت و مەلوول مانە.

١

## جێگیربوون لە بەغدا

پاش ئازادبوون لە سەربازی، بڕیارم دا لە بەغدا بمێنمەوە و درێژە بە کاری ڕۆژنامەنووسی بدەم. لە ڕۆژنامەی بیری نوێ بە گەرمی پێشوازییان لێ کردمەوە. سەرەتا ویستم لە دەزگایەکی حکومەت کار بکەم، ئێوارانیش وەکوو جاران، لە بیری نوێ ئیش بکەم. دەزگای هاوکاری چەند دەرچووی بەشی زمانی کوردی دامەزراندبوو، پێویستیی بە کەسانی تریش هەبوو، لەوێ داوای کارم کرد. هەرچەندە وەکوو نووسەر ناسرا بووم، دوو ساڵ زیاتر ئەزموونی ڕۆژنامەنووسیم هەبوو، بەڵام کاریان نەدامێ.

دواتر لە وەزارەتی شارەوانی لە بەغدا، لە بەشی بەڕێوەبردن، دامەزرام، ئێوارانیش وەکوو جاران لە بیری نوێ کارم کرد. بەڵام زوو لەو کارەی وەزارەتی شارەوانی بێزار بووم، ڕۆژانە کات و وزەی زۆرم بەفیڕۆ دەچوون. پاش چەند مانگ وازم لە کارەکە هێنا، بە تەواوی خۆم بۆ ڕۆژنامەی بیری نوێ تەرخان کرد. ڕۆژنامەکە پێویستی بە من بوو، ڕاستییەکەی منیش پێویستم بەو بوو. بەڵام باری ئابووریی ڕۆژنامەکە باش نەبوو. مانگانە، بۆ کاری بەیانی و ئێوارانم، تەنیا سی دیناریان بۆ بڕیمەوە، کە نیوەی ئەو پارەیە بوو لە وەزارەتی شارەوانی و لە بری کاری ئێواران لە

بیری نوی وەرم دەگرت.

مـن لە (بیـری نـویَ) کـارەکەم بەدڵ بـوو، کـاتی زۆرم بـۆ خوێنـدنەوە و نووسـین هەبـوو. نـزیکەی دوو سـاڵێک بـوو چووبـوومەوە ڕیزی حزبـی شیوعی. ئەو کـارەم بە ئەرکـی خـۆم دەزانی. هەستم دەکرد خاوەنێکی ڕۆژنامەکەم، بەو جۆرەش کـار و ڕەفتـارم دەکـرد. بـۆیە خۆتەرخـانکردن بـۆ نووسـین و کـاری ڕۆژنامەنووسی لە بیری نـویَ و مـانەوە لە بەغدا، بۆ مـن وەکوو نووسەر و ڕۆژنامەنووس، باشتر و بەسوودتر بوو. بەتـایبەت ئەو مـووچەیەی مانگـانە لە بیـری نـویَ وەرم دەگـرت لـێم زیـاد بـوو، چـونکە مـن زیادەمەسـرەف و هەڵـپەی پـارە و سـامانم نەبـوو. لە بەغدا لە ماڵی کاکە مـحەمەدی بـرام و بـراژنە نەسـرینم دەژیـام، کە قەت پرسی پارە لەنێوانماندا نەبووە.

ساڵی ١٩٧٦ یەکەم کۆمەڵەهۆنراوەم (پشکۆکان دەگەشێنەوە)، بە کۆمەکی کۆڕی زانیاریی کـورد، چاپ کرا. بەڵام دەزگـای سانسـۆر (ڕەقـابە)ی چـاپەمەنی، کە نووسـەر نەریمـان بەرپرسـی بەشـە کـوردییەکەی بـوو، حەوت هـۆنراوەی لـیَ لابـردن، لەوانە: شـەوێک لەسـەر گـۆڕی وەلـی دێـوانە، سکاڵای ئەسـتێرەیەکی تاسـاو، لەنـاو دڵـۆپە فرمێسـکێکدا، بەسـەرهاتی نیگاکـانم، تـابلۆیەکی شـارەکەم و دوو هـۆنراوەی تـر. ئەو کـارە کەلەبەری گەورەی خسـتە کۆمەڵەهـۆنراوەکە و ئاسـتەکەی دابەزانـد، بەڵام بە ناچـاری قبـووڵم کرد، چونکە لەوە باشتر بوو چـاپ نەکرێت. کـورد دەڵێت زەرەر لە نیوەی بگەڕێتەوە. دواتـر سـاڵی ١٩٧٩ ئەو هـۆنراوە یاسـاخکراوانە، لەگەڵ کـۆمەڵە هـۆنراوەی ڕێـژنە و چـاپی دووەمـی پشـکۆکان دەگەشێنەوە، لە مهاباد بڵاو کرانەوە.

لەو دەستنووسەی لە بەغدا بۆ دەزگای سانسۆر (ڕەقابە)م نـارد،

چەنـدان هـۆنراوە، بە فیلمکـردن تێپەڕێنـدران. لە سـەرەتای چەنـد هۆنراوەیەکدا، لەوانە هۆنراوەی پشکۆکان دەگەشێنەوە، دەرگا لە ڕووی ئەم کزەبایە دامەخە و چەند بیرەوەرییەک لە ژوورێکی بێ دیـواردا، نووسـیبووم (پێشکەشـە بە شـەهیدی فەلەسـتینی فلانـی کـوری فـلان، یـان شـەهیدێکی ڤێتنـامی). بەڵام دواتـر، لە کـاتی نووسـینەوەی هۆنراوەکـان بـۆ چـاپکردن، ئەو پێشکەشـکردنانەم لابردن. کتێبەکە لە چاپخانە تایپ نەکرا، بەڵکو بە خەتی هونەرمەند وەلید محەمەد ستی، کە لە ڕۆژنامەی بیری نوێ کاری دیزاین و خۆشنووسـیی دەکـرد، نووسـرایەوە. ئەمەش دەرفەتـی ئەو فیلمکردنەی ئاسان کرد. بەڵام پێشـەکییەکی فراوان و هەمەلایەنە، کە ڕەخنەگـر و شـاعیر کەمـال میراودەلـی بـۆ کۆمەڵەهـۆنراوەکەی نووسـیبوو، نەتوانـدرا لەگەڵ شـیعرەکاندا، بـڵاو بکـرێتەوە، چـونکە درێژ و فراوان بـوو. چاپخـانەکە داوای پارەی زۆرتری دەکرد، کە نەمبوو بیدەمێ. دواتر ئەو باسە لە هیچ شوێنێک بڵاو نەکرایەوە و لەناوچوو. تەنیا ئەم چەند دێڕەی خوارەوەی مایەوە، کە لە بەرگی پشتەوەی کۆمەڵەهۆنراوەکە چاپ کراوە:

(لەگەڵ ئەوەشـدا زۆربەی تاقیکردنەوەکـانی لە سـەرەتایەکی تراجیـدییەوە دەسـت پـێ دەکەن، بەڵام ڕەفیـق وەکـو مرۆڤێکـی لایەنگیـر و خەبـاتگێڕ هەلسـوکەوت لەگەڵ شـتەکان و مەسـەلەکاندا دەکات، بۆیە سـەیر نییە "خۆبەختکردن لەپێنـاوی ژیـانێکی نوێدا" وەکو لافیتەیەکی خۆسەپێنەر لە سەرانسـەری بیرکردنەوەیدا خۆی بنوێنێ و هەر لێرەوە هەستێکی گەرمی مرۆڤایەتی لە هۆنراوەکانیدا هەڵـدەقوڵێ و ئێسـتێتیکیەتی شیعرەکانیشـی هەر ئەو هەسـت و شێوەی نوێی دەربڕینەکەی، لە ڕێگەی مۆنۆلۆگ و ڕەمز و دیمەنـی ئەدەبییەوە دیاری دەکەن.

ڕەفیق دەنگێکە کە ڕەنگی تایبەتی و چاوگەی نەوەستانی خۆی لە شۆڕبوونەوە بۆ ناخی هەقیقەت، کۆمەڵ و چینە زەحمەتکێشەکانیدا دەدۆزێتەوە).

دەزگای سانسۆر زیانی زۆری بە کۆمەڵەهۆنراوەی (پشکۆکان دەگەشێنەوە) گەیاند، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا پێشوازییەکی باشی لە لایەن خوێنەرانەوە لێ کرا، دوای بڵاوبوونەوەی دوو وتار لەبارەیەوە نووسرا، کە بۆ ئەو کاتە کەم نەبوو. ئەگەر ئەو فێڵەم لە دەزگای سانسۆر نەکردایە، مەحاڵ بوو ڕێگای چاپکردنی کۆمەڵەهۆنراوەکە بدرێت.

چەند سەیرە! نەریمان کتێبناس (بیبلیۆگراف) بوو. بیبلیۆگرافیای کتیبی کوردی نووسیوە، کەچی خۆی لە دەزگای سانسۆر، دەیان کتێبی کوردیی تیرۆر کرد! دووفاقییەکی سەیر لە کەسایەتیی مرۆڤی کورددا هەیە، کە لە باشووری کوردستاندا بینیومە، کەسێک، گوایا کوردایەتی دەکات یان پێشمەرگەیە، کەچی دەبێتە جاش. بەو چەکەی بۆ پێشمەرگایەتی هەڵی گرتووە، دەتوانێت بە هەمان چەک و لە هەمان کاتدا، پێشمەرگە بکوژێت یان بۆ پارە سەروگیانی کوردی بەشەکانی تری کوردستان بفرۆشێت.

ئەو سەردەمە بە تەواوی سەرقاڵی کاری ڕۆژنامەی بیری نوێ و نووسینی وتاری ئەدەبی و شیعر بووم. چالاکیی سیاسی، پلەی بەرزی حزبی و بەرپرسیاریی سیاسیم نەبوو. کاری حزبی لای من بەشێک بوو لە کاری ڕۆژنامەنووسی و ڕووناکبیری. لەگەڵ چەند نووسەر و ڕۆژنامەنووس، کە لە بیری نوێ و تەریق ئەلشەعب کارمان دەکرد، پێکەوە لە لیژنەیەکی تایبەتیی حزبیدا بووین، لەوانە فایەق بەتی، کە بە عەمیدی ڕۆژنامەنووسیی عێراق ناو دەبرا، شاعیر و ڕۆژنامەنووس یوسف ئەلسائیغ، فالح عەبدولجەبار،

زوهێر ئه‌لجه‌زائیری، عه‌دنـان حوسـێن، مـن و هـاوڕێیه‌کی تـر، که ناوی ڕه‌عد بـوو. ڕۆژنامه‌نووسـی ناسـراو مـونعیم ئه‌لئه‌عسـه‌م، که ئێستا له له‌نده‌ن ده‌ژی، به‌رپرسـمان بـوو. ئه‌وانه نمـوونه‌ی دیـار و ده‌سته‌بژێری ڕووناکبیری و ڕۆژنامه‌نووسیی عێراق بوون، تا سه‌ر ئازادیخواز و دۆستی گه‌لی کورد مانه‌وه.

ئـێمه ناوبه‌نـاو کۆبـوونه‌وه‌ی حزبیمـان بـۆ کتێبێکـی هـزری، فه‌لسه‌فی، ئابووری، یان ئه‌ده‌بی و کولتووری، ته‌رخان ده‌کرد. هه‌ر جاره‌ی هاوڕێیه‌ک دیاری ده‌کرا کتێبه‌که به‌وردی بخوێنێته‌وه و له کۆبوونه‌وه‌ی داهـاتوودا باسـی بکـات، بۆ ئه‌وه‌ی لێدوانی له‌بـاره‌وه بکه‌یـن. یه‌کێـک له‌و کتێبـانه‌ی، که له‌و کۆبـوونه‌وانه‌دا مـن بـۆ هاوڕێیانم باس کرد، کتێبی (دراسات ماركسية في الشعر والرواية) بـوو، که جـۆرج تۆمسـۆن نووسـیویه‌تی، د. میشـال سـلێمان کردوویه‌تی به عه‌ره‌بی.

بـاش بوو له ده‌زگای هاوکاری کاریان پێ نه‌دام، دوای ساڵێک عوسمان فایه‌ق کرا به به‌رپرسی ده‌زگاکه، به شێوازێکی پۆلیسییانه له‌گه‌ڵ کارمه‌نـدان، به تـایبه‌ت ئه‌وانه‌ی به‌عسـی نه‌بـوون، ڕه‌فتـاری ده‌کرد و فشاری بۆ ده‌هێنـان. ده‌یه‌ویست ڕۆژنـامه‌ی هاوکـاری، که تا ئه‌و کاته ڕۆڵێکی باشـی له ژیانی ئه‌ده‌بی و ڕۆشنبیریدا هه‌بوو، بکاته بڵێندگۆی حزبی به‌عس و کارمه‌ندان ناچـار بکـات، به مه‌یلـی ئه‌و بنووسن.

عوسـمان فـایه‌ق کـورد بـوو، به‌ڵام خـۆی عه‌ره‌بانـدبوو (خـۆی کردبـوو به عه‌ره‌ب). بـۆ ئه‌وه‌ی متمـانه‌ی پـێ بـکه‌ن، له هه‌ر به‌عسییه‌کی شۆڤینی خراپتر ڕه‌فتاری ده‌کرد. ده‌ڵێن ئه‌و مـاوه‌یه‌ی به‌ڕێوه‌به‌ری گشتیی ده‌زگاکه بوو، تا ناوه‌ڕاستی حوزه‌یرانی ١٩٧٧ که له به‌غدا کـوژرا، یه‌ک جـار قسـه‌یه‌کی به زمـانی کـوردی له زار

دەرچووبـوو، ئەویـش ئەو سـاتەی تەقەیـان لـێ کردبـوو، لە بەر ئازاری گوللەکان هاواری کردبوو: ئای دایکە!

شاعیرێکی کۆنی عەرەب وتوویەتی:

لا تخاف الحية والعقربا

احذر الكردي إذا إستعربا!

(لە مار و دووپشک مەترسە

لە کوردی بەعەرەب بوو خۆت بپارێزە!)

پاش کوژرانی عوسمان فایەق، دەزگای ئەمن (ئاسـایش) چەندان کارمەندی دەزگای هاوکاریی گرت، لەوانە حوسێن عـارف، حەمید عەزیز، ڕەئووف حەسەن و چەندانی تر، کە ناویانم لەبیر نین. ئایا بەڕاستی دەزگـای ئەمـن گومـانی لەو نووسـەر و ڕۆژنامەنووسـانە هەبـوو، یـان سـوودیان لەو دەرفەتە وەرگـرت، بـۆ ئەوەی سـزایان بدەن و نووسەرانی تریش چاوترسێن بکەن؟!

دوو سـێ هەفـتە دوای ئەو ڕووداوە، لە یەکـی تەمـووز، مـن و شـاعیر مـوخلیس خەلیل، کە لە ڕۆژنـامەی تەریق ئەلشـەعب کـاری دەکـرد، لەگەڵ کۆمەڵێـک کـادیری حزبـی شـیوعی، بـۆ کۆرسـێکی خوێنـدنی دوو مـانگی، نێـردراین بـۆ پەیمانگـای زانسـتە کۆمەڵایەتییەکـان لە مۆسـکۆ. گـروپەکەمـان نزیکەی ٢٠ تـا ٢٥ کەس بـوو. د. سـەباح دوڕڕە، کە کەسـێکی زۆر بەڕێـز و هێـژا بـوو، لە ئەڵمانیـا خوێنـدنی دوکتـۆرای لە بـواری ئابووریـدا تەواو کردبـوو، بەرپرسـی گروپەکەمـان بـوو. بە داخەوە د.سـەباح لە هـاوینی ١٩٨٠ لە بەغدا گیرا و شەهید کرا.

ئەوە یەکەم جار بوو سەردانی دەرەوەی وڵات بکەم. ئەو ساڵە

یـادی شەسـت سـاڵەی شۆڕشـی ئۆکتـۆبەر بـوو. مۆسـکۆ وەکـوو بـووک ڕازێنـدرابۆوە و بـۆ ئەو یـادە ئامـادە دەکرا. لە مۆسـکۆ لە پەیمـانگەکە، کە لە سـەنتەری مۆسـکۆوە دوور نەبـوو، ژیـاین، هەر لەوێش خوێنـدمان. هەفتەی پێنج ڕۆژ بـابەتی تیئـۆری، فەلسـەفی، ئـابووری و مێـژووی بـزووتنەوەی چەپ و کرێکارییـان پێ وتـین. مامۆسـتاکان وانەیـان بە زمـانی ڕووسـی دەوتەوە، کەسـێکیش ڕاستەوخۆ دەیکرد بە عەرەبی.

ئەو دوو مانگە بۆ من بەسوود بوو، زانیاریم لە هەندێک بواری فەلسـەفی، ئـابووری، مێـژووی بـزووتنەوەی چەپ و ئـازادیخوازیی دنیـا، زیـاتر بـوون. سـەردانی چەند شـوێن و کـارگە و کۆلخۆزمـان کرد، مۆزەخـانە و مـاڵی چەند نووسـەری کۆچکردوو و بەڵشـەوی تیاترمـان بینـی، کە درامـا و بـالێتی ڕووسـی لەوێـوە بەرەو دنیـا پەلیان هاویشت. لە مۆسکۆ بڕیـارم دا کە گەڕامەوە عێراق، داوا لە هاوڕێیـان بکەم، سـاڵی داهـاتوو بـۆ خوێندنی دوکتـۆرا، بمنێرن بـۆ یەکێتیی سۆڤیەت، لە ئینستیتوتی ڕۆژهەڵاتناسی بخوێنم.

ئەو ماوەیەی لە مۆسکۆ بووم کچێکی بریتـانیم ناسـی، بە نـاوی فــرانس هــازڵتۆن، کە هــاوتەمەنم بــوو، لە ڕۆژنــامەی حزبــی کۆمۆنیسـتی بریتـانی مۆرنینـگ سـتار کـاری دەکـرد، بەڵام لەگەڵ گرووپـی حزبـی کۆمۆنیسـتی ئایرلانـدا، هـاتبوو. ئەویـش لە هەمـان شـوێن دەیخوێنـد و دەژیـا. دواتـر هاوڕێیەتیمـان بەردەوام بـوو. کاتێـک لە کۆتـایی ١٩٧٨ تیـرۆری بەعس دژی حزبـی شـیوعی و گەلی کـورد پەرەی گرت و ڕووم لە سۆفیا کرد، چەند زانیـاری و بەڵگەنامەم لەبارەی تیرۆری بەعس پێ دا. هاوڕێ سامی خالید، کە مامۆسـتای زمـانی ئینگلیـزی بـوو، لە بولگارسـتان لەگەڵ مـن دەیخوێند، بەڵگەنامەکانی کردن بە ئینگلیزی، فرانس بۆ نووسینی

چەند وتار و ڕیپۆرتاجی ڕۆژنامەوانی، سودی لی وەرگرتن. دواتر فرانس بوو بە دۆستێکی ناسراوی گەلانی عێراق، لەگەڵ چەند کەسی تر ڕێکخراوی (کاردیری)یان، بۆ داکۆکی لە گەلی عێراق، لە بریتانیا دامەزراند. پاش ڕاپەڕین سەردانی هەرێمی کوردستانی کرد. لە سەرەتای دوو هەزارەکاندا، لە چاوپێکەوتنێک، لە کەناڵی کوردسات ئاماژەی بە هەندێک کار و چالاکیی ئەو ڕۆژانە و دواتر دا، کە لە دژی دەسەڵاتی بەعس و بۆ داکۆکیکردن لە گەلانی عێراق کردبوونی.

کاتێک گەڕامەوە عێراق، ئەو کەسانەی عوسمان فایەقیان کوشتبوو گیرابوون. نووسەر و ڕۆژنامەنووسە بەندکراوەکانیش، ئازاد کرابوون. عوسمان فایەق، لە بەردەمی دەزگای هاوکاری، کە لە ناوەڕاستی بەغدا و نزیکی وەزارەتی ڕاگەیاندن بوو، لە لایەن کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان، کوژرا. ئەو ڕووداوە زایەڵەیەکی بەهێزی لە بەغدا و لەنێو ڕۆشنبیرانی کورد و عەرەبدا هەبوو. بەرپرسانی بەعس و هاوشێوەکانی عوسمان فایەق ترسی زۆریان کەوتبووە دڵ. چاوەڕێ دەکرا کاری تری لەم جۆرە لە بەغدا دووبارە ببێتەوە.

دوای کوژرانی عوسمان فایەق لە پایزی ١٩٧٧ بەڕێوەبەرایەتیی ئیستگەی ڕادیۆی کوردی لە بەغدا، کۆبوونەوەیەکی فراوانی لەگەڵ نووسەران، هونەرمەندان و ڕۆژنامەنووسانی کورد ساز کرد. ئەو سالانە ئیستگەی ڕادیۆی کوردیی بەغدا، تاکە کەناڵێکی هەوایی ڕاگەیاندنی کوردی بوو، کە ڕۆژانە لە بەیانییەوە تا درەنگانی شەو، لە کوردستان دەبیسترا و خەڵک گوێی لێ دەگرت. هەفتانەش تەلەڤزیۆنی کەرکووک، چەند سەعات بە زمانی کوردی بەرنامەکانی پەخش دەکران.

لەو کۆبوونەوەیەدا کێشە و گرفتەکانی ئیستگەی ڕادیۆی کوردی، بە فراوانی باس کران و ڕەخنەی زۆر گیرا. ئەو دەزگایە توانای گەورەی ئابووری و تەکنیکیی هەبوو، کەچی لە ئاستێکی نزمدا چەقیبوو، لە ژیانی هونەری، ئەدەبی و ڕۆشنبیریی کوردستان دابڕابوو. لە کۆبوونەوەکەدا بڕیار درا لیژنەیەک هەڵببژێردرێت، بۆ چارەسەرکردنی گرفتی ئیستگەی ڕادیۆی کوردی و سەرپەرشتیکردنی پرۆگرامەکانی. لەوێ ئەندامانی لیژنەکە بە پێشنیازی ئامادەبووان کاندید کران و هەڵبژێردران، منیش یەکێک بووم لەو ئەندامانە، کە لاموایە حەوت کەس بووین.

لە ماوەیەکی کورتدا، بە پێشنیازی لیژنەکە، هەندێک گۆڕانکاری لە پرۆگرام و بەرنامەکانی ئیستگەدا کرا، چەند بەرنامەی نوێ زیاد کران. داوا لە من و چەند کەسی تر کرا، بەرنامەی تایبەت ئامادە بکەین. من بەرنامەیەکم بە ناوی (لە ئەدەبی گەلانەوە) دەست پێ کرد، کە دوو هەفتە جارێک پێشکەش دەکرا. هەر جارەی باسی ژیان و بەرهەم و ئەزموونی شاعیرێک، یان چیرۆکنووسێکی بیانیم دەکرد، چەپکە هۆنراوەیەکی شاعیرەکە، یان کورتەچیرۆکێکی نووسەرەکەم دەخوێندەوە. لە هەر پرۆگرامێک دە دینار پاداشتم وەردەگرت. هەروا مانگانە هەر ئەندامێکی لیژنەکە سێ دیناری وەکوو پاداشت پێ دەدرا.

بەرنامەکەی ڕادیۆی کوردی کاتی زۆری دەبردم، چونکە خۆم پێوە ماندوو دەکرد. دوای نزیکەی سێ مانگ، لەگەڵ چیرۆکنووس ڕەئووف حەسەن ڕێک کەوتین، کە هەر جارەی یەکێکمان بەرنامەکە ئامادە بکەین، جارێک من بابەتێک لەبارەی شاعیرێکی جیهانی ئامادە بکەم و چەند نموونەی شیعرەکانی بکەم بە کوردی. جارەکەی تر ئەو نووسینێک لەبارەی چیرۆکنووسێکی بیانی و

نمـوونەی چیرۆکێکـی بە کـوردی، ئامـادە بکـات، بەڵام پـێکەوە بەرنامەکە پێشکەش بکەین و پاداشتەکەش بەش بکەین.

لە کۆتایی ئایاری ١٩٧٨ بە کاک ڕەئووفم وت خۆت ئاگاداریت تا دێـت دۆخـی کوردسـتان و عێـراق خراپتـر دەبێـت، گـرتن و لەسـێدارەدان پەرە دەگرێـت. مـن نامەوێـت لەمەودوا درێـژە بەو بەرنامەیە بدەم و دەنگم لە ڕادیۆی عێراقەوە ببیسترێت. داوام لێ کرد ئەو واز نەهێنێت، چونکە بەرنامەکە گوێگری زۆری هەبوو، نامەی جۆراوجۆرمان لە بیسـەرانەوە بۆ دەهات. بەڵام ڕەئـووف حەسەن وتی:

منیش واز دێنم و بەرنامەکە ڕادەگرین.

دوای ئەوە نەچوومەوە ئیستگەی ڕادیۆی بەغدا.

ئـازادیی نووسـین و دەربـڕین زۆر سنووردار کرابـوو. بەڵام لە ئەدەبیـات و هـونەردا، هێشـتا دەرفەت مـابوو کە مـرۆڤ هـزر و بۆچـوونی ئـازادیخوانە دەرببڕێت، ڕاسـتەوخۆ، یـان ناڕاسـتەوخۆ ڕەخنە لە دەسـەڵات بگرێت. بۆیە لە هەنـدێک چـالاکیی ئەدەبی و کۆڕی شـیعری، سـەدان کەس، بە تـایبەتی لاوان، ئامـادە دەبـوون. چاوەڕێ بوون لەوێ، لە شیعر و تێکستی تری ئەدەبی و هونەریدا، تروسکەی هیوا و بەرەنگاری ببینن.

ئێـــوارەی ڕۆژی ٧-٥-١٩٧٨ بەڕێـــوەبەرایەتیی ڕۆشـــنبیریی جەماوەر لە سلێمانی، کۆڕێکی، بۆ یادی سی ساڵەی کۆچی دوایی شـاعیری ناسـراو قـانیع، ڕێـک خسـت. لە کـۆڕەکەدا نووسـەران شوکر مستەفا، محەمەدی مەلا کەریم، کاکەی فەلاح، کەریـم زەند و نوسـەری تـر، وتـار و باسـیان لەبـارەی شـیعر و هەڵوێسـتی شۆڕشگێڕانەی قانیع، پێشکەش کرد.

مـن وەکـوو پەیـامنێری ڕۆژنـامەی بیـری نـوێ، لە بەغـداوە

چووبووم. کۆڕەکە لە هۆڵی ئامادەیی سلێمانی بوو، کە خەڵکی زۆر، بە تایبەت گەنج، هاتبوون، تەنانەت لە دەرەوەش، زۆر کەس ڕاوەستابوون. باسکردنی هەڵوێستی ئازادیخوازانەی قانیع و خوێندنەوەی چەند نموونەی شۆڕشگێرانەی هۆنراوەکانی، خەڵکەکەی جوولاند. لەنێوان خوێندنەوەی باس و وتاری ئەو نووسەرانەدا، ئامادەبووان، بە جۆرێکی چاوەڕواننەکراو، چوار جار بەدەم چەپڵەڕێزانەوە، داوایان کرد شاعیران هێمن، شێرکۆ بێکەس، لەتیف هەڵمەت و ڕەفیق سابیر، شیعر بخوێننەوە. ئێمەش بە نۆرە شیعرمان خوێندەوە و کۆڕەکە گەرمتر بوو. ئەوە ڕووداوێکی نوێ بوو. یەکەمجار بوو ببینم، لە کۆڕی ئەدەبیی تایبەت بە بابەت و نووسەری تر، داوا لە چەند شاعیری ئامادەبووی کۆڕەکە بکرێت، شیعر بخوێننەوە.

ئەو وتار و تێکستە ئەدەبییانەی لە ئیستگەی ڕادیۆی کوردی لە بەغدا، ئامادە و پێشکەشم کردن، بە نووسراوی بڵاو نەکرانەوە. کاتێک ڕووم لە هەندەران کرد، لە ترسی پشکنینی فڕینگەی بەغدا، دەستنووسی ئەو بەرنامانە، چەند نووسینی نیوەچڵ، کۆمەڵێ نامەی تایبەتی، لەگەڵ تێکڕای کتێبەکانم، لە عێراق بەجێ مان. دوای چواردە ساڵ، کە گەڕامەوە وڵات، دە پازدە کتێبێک نەبێت، هیچی ترم دەست نەکەوتەوە.

## ٢
## له لێواری هەڵدێردا

دۆخی سیاسیی عێراق بەرەو دارمان دەچوو، حزبی بەعس دەسەڵاتی خۆی بەسەر دەزگاکانی دەوڵەت و کۆمەڵدا سەپاندبوو. شار و شارۆچکەکانی کوردستان، لەژێر کۆنترۆڵی دەزگای ئەمن و دەسەڵاتی حکومەتدا بوون. سەرۆککۆمار ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر، وەکوو دیکۆرێک مابۆوە و سەدام حوسێن دەسەڵاتداری ڕاستەقینەی عێراق بوو.

لەو دۆخەدا سەرەتای بزاڤی چەکداری، لە کوردستان سەری هەڵدابۆوە. ڕاگوێزان و وێرانکردنی گوندەکانی کوردستان، بە مەبەستی ڕێگرتن لە بزاڤی چەکداری، پەرەی گرت. هەواڵی تیرۆر، گرتن و لەسێدارەدانی ئەندامانی کۆمەڵە، حزبی سۆشیالیست و حزبی دەعوە، دەبیستران. حکومەتی عێراق پێوەندیی لەگەڵ وڵاتانی ڕۆژئاوا بەهێز کردبوو، پشتی بە یەکێتیی سۆڤیەت نەدەبەست. بۆیە پێویستی بە حزبی شیوعی نەمابوو، هیچ حیسابێکی بۆ حزبی شیوعی نەدەکرد. مەجبوور نەبوو ڕێگە بدات ئەو حزبە ئازادانە کار بکات، بیر و ئامانجی خۆی بڵاو بکاتەوە و ڕەخنە لە هەندێک کاری حکومەت بگرێت! لە بەهانەیەک دەگەڕا پەلاماری بدات و لە شانۆی سیاسیی عێراق، دووری بخاتەوە. بە بەڵگە بیسەلمێنێت و

پێشانی بدات کە عێراق لە فەلەکی یەکێتیی سۆڤیەتدا نەماوە و دوژمنایەتیی کۆمۆنیزم دەکات.

لە ئاداری ١٩٧٨ کۆمیتەی ناوەندیی حزبی شیوعی کۆبۆوە، ڕاپۆرتێکی بڵاو کردەوە، تیایدا ڕەخنەی نەرم و دۆستانەی لە سیاسەتی حکومەت، بەرانبەر دۆخی عێراق و کوردستان گرتبوو. حزبی بەعس، لە ڕۆژنامەی (الراصد) زۆر توند وەڵامی حزبی شیوعیی دایەوە و وەکوو مەترسییەک بۆ عێراق ناوی برد.

دوای ئەوە گرژی کەوتە نێوان حزبی بەعس و حزبی شیوعی. زۆری نەخایاند حکومەتی عێراق، دەستی بە شاڵاوی گرتن و ڕاونانی ئەندامانی حزبی شیوعی کرد.

بە ڕای من پەلەکردن لە پەلاماردانی حزبی شیوعیی عێراق پێوەندیی بە ڕووداوی کودێتای ئەفغانستانەوە هەبوو، کە لە ٢٨ی نیسانی ١٩٧٨ ڕووی دا. لە ئەنجامدا حزبی خەڵکی ئەفغانستان، کە حزبێکی کۆمۆنیستی و لایەنگری یەکێتیی سۆڤیەت بوو، بە کودێتایەکی سەربازی دەسەڵاتی سیاسیی گرتە دەست. داود خان کە لە بنەماڵەی مەلیکی ئەڤغانستان بوو، ساڵی ١٩٧٣ بە کودێتایەک بووبوو بە سەرۆکی ئەفغانستان، کوژرا. تێکڕای بنەماڵەکەشی، کە ٢٢ کەس بوون، لەناو بران. لێرەوە سەرەتای لافاوی خوێن لە ئەفغانستان، وێنەی عێراق، دەستی پێ کرد و تا ئێستا بەردەوامە.

کۆمۆنیستانی ئەفغانستان، ڕەنگە ئیلهامی ئەو کۆمەڵکوژییەیان لە بەلشەفیکەکان وەرگرتبێت، چونکە ئەوانیش، لە شۆڕشی ئوکتۆبەری ١٩١٧ قەیسەری ڕووسیا (ڕۆمانۆف) و ژن و منداڵ و بنەماڵەکەیان لەناو بردن، بۆ ئەوەی کەسی ئەو بنەماڵەیە نەمێنێت، سبەینێ داوای گەڕانەوەی سیستمی حوکمڕانیی لە ڕووسیا بکات.

داود خان سەرەتا دۆستی سۆڤییەت و حزبی خەڵکی

ئەفغانستان بوو، بەڵام دواتر، بە فشاری ئێران، پاکستان و ئەمریکا، پشتی تێکردن. دە ڕۆژ پێش کودێتاکە، لە ١٨ی نیسان، میر ئەکبەر خەیبەر، کە کەسی دووەمی حزبی خەڵک و سەرکردەی سەندیکاش بوو، بە جۆرێکی تەماوی تیرۆر کرا. ئەو ڕووداوە کاردانەوەی توندی بەدوادا هات. حزبی خەڵکی ئەفغانستان داوای کرد بکوژانی میر ئەکبەر بدۆزنەوە و دادگایی بکەن. دوو ڕۆژ پێش کودێتاکە سکرتێری حزبی خەڵکی ئەفغانستان، نور محەمەد تەرەکی، زیندانی کرا. ڕێکخستنی حزبەکەی لەناو سوپادا، خێرا و بە جۆرێکی چاوەڕواننەکراو، پەنای بۆ کودێتای سەربازی برد و دەسەڵاتی گرتە دەست. نور محەمەد تەرەکی کرا بە سەرۆک کۆمار. زۆری پێ نەچوو، ناکۆکی و شەر کەوتە نێوان سەرانی حزبەکە. لەشکری سۆڤییەت، بۆ کۆمەکی حکومەت، ئەفغانستانی داگیر کرد.

ئەو ڕووداوە حزبی بەعسی عێراقی تۆقاند و بێداری کردەوە. سێ هەفتەیەک دوای کودێتاکەی ئەفغانستان، حکومەتی عێراق ٣١ ئەندام و لایەنگری حزبی شیوعی، کە ئەفسەر و پلەداری سەربازی بوون، زیندانی کرد. بە پەلە لە دادگای سەربازیدا، بەو تومەتەی گوایا لەناو سوپادا ڕێکخستنی حزبییان دروست کردووە، بڕیاری لەسێدارەدانیان درا و یەکسەر بڕیارەکە جێ بە جێ کرا. بەپێی قانوونی ئەو کاتەی عێراق، تەنیا حزبی بەعس بۆی هەبوو، لە سوپادا ڕێکخستنی حزبیی هەبێت. بەم تاوانە سەرەتای وەرزی کوشتن و تیرۆری شیوعییەکانی عێراق، دەستی پێ کردەوە.

نزیکەی مانگێک دوای کودێتاکە، وەفدێکی حکومەتی نوێی ئەفغانستان هاتە عێراق و بەرپرسانی حکومەتی عێراقیان بینی. دوو ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی حزبی شیوعی، فەخری کەریم و ماجید عەبدولڕەزا، سەردانی وەفدەکەیان کرد. دەزگای ئەمنیی

عێراق وەکوو کاردانەوە چەند سەعات، یان ڕۆژێک، هەردوو سەرکردەکەی حزبیان دەستبەسەر کردن و لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ کردن. بەرپرسانی یەکێتیی سۆڤیەت، کەوتنە نێوان و گرفتەکەیان چارەسەر کرد. ئەوە پەیامێکی سیاسیی ڕوون بوو، کە حزبی بەعس بۆ حزبی شیوعی و تەنانەت بۆ سۆڤییەتەکانی نارد.

لە ناوەڕاستی هاویندا فشاری دەسەڵات بۆسەر حزبی شیوعی زیادی کرد و دۆخی سیاسی گرژتر بوو. دەزگای ئەمنیی عێراق، سەرەتا لە شارەکانی باشووری عێراق، دەستی بە گرتنی ئەندامانی حزبی شیوعی کرد و بەرەو ناوەڕاست و کوردستان چوو. هەزاران کادیر و ئەندامی حزب ڕفێندران، گیران و ئەشکەنجە دران، یان پاکانەیان پێ کرا و بە ناچاری لە کاری سیاسی دوور کەوتنەوە. جاسووسانی دەزگای ئەمن لە نزیک بارەگای حزبی شیوعی و نووسینگەی ڕۆژنامەکانی دەسووڕانەوە، بەڵام ڕۆژنامەنووسانیان نەدەگرت. ڕۆژنامەکانی حزبی شیوعی دەردەچوون، کەچی لە زۆر شار و ناوچەی عێراق، پێش دابەشکردنیان، دەستیان بەسەردا دەگیرا. دیاربوو ئاگرەکە بەرەو ئێمەش دێت، ڕۆژنامەکانمان ڕادەگیرێن و ئێمەش زیندانی دەکرێین.

حزبی بەعس سەرەتا بەلای ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی و مەکتەبی سیاسیی حزبی شیوعیدا نەچوون. سکرتێری حزب، عەزیز محمەد و چەند ئەندامی مەکتەبی سیاسی، چوونە دەرەوەی عێراق. بەعس بڕیاری خۆی دابوو، کەچی سەرکردایەتیی حزبی شیوعی دەستەپاچە و شڵەژاو، دامابوو. هیچ کاردانەوەیەکی پیشان نەدا، ڕێنمایی و بڕیارێکی ڕوونی، لەو بارەیەوە، بۆ ڕێکخستنەکانی نەنارد.!

ئەو ساڵە هاوڕێیان ناوی منیان خستبووە لیستی ئەو کەسانەی

که دەبوو لە یەکێتیی سۆڤیەت بخوێنن. لە ناوەڕاستی ئابی ١٩٧٨ ئاگادار کرام کە بۆ خوێندنی دوکتۆرا، لە یەکێتیی سۆڤیەت، قبووڵ کراوم، دەبێت بچم بۆ بارەگای ناوەندیی حزب، بۆ لای هاوڕێیان ئەبو نەجاح (ئەسعەد خدر) و ئەبو ستار، کە هەردووکیان کورد بوون و بەرپرسی ئەو کارانە بوون، بەڵام نەمدەناسین. لەوێ چاویان لە لیستی ناوەکان کرد و پێیان وتم: بەڵێ، ئەوەتا ناوت بۆ خوێندن لە یەکێتیی سۆڤیەت هاتۆتەوە. دەبێت پاسپۆرت، کۆپی بڕوانامەی زانکۆ و چەند وێنەی خۆتمان بۆ بهێنی، بۆ ئەوەی ڤیزای یەکێتیی سۆڤیەت و بلیتی فڕۆکەت بۆ ئامادە بکرێت.

دوای چەند ڕۆژ سەردانم کردنەوە، ئەو شتانەم بۆ بردن کە داوایان کردبوو. ئەبو نەجاح وتی:

هاوڕێ ناوەکەت بە هەڵە هاتبۆوە، ئەمساڵ تۆ قبووڵ نەکراویت!.

من چاوەڕێی ئەو وەڵامە نەبووم، بۆیە تاسام. نەمدەتوانی باوەڕ بەو قسەیە بهێنم، چونکە ناوی خۆم لە لیستەکەدا بینی بوو، بەڵام هیچم نەوت. بیرم بۆ ئەوە چوو کە لەوانەیە جێگەکەی من بدەن بە کەسێکی تر، چونکە ئەو کاتە ئەو جۆرە قسە و ڕەخنانە هەبوون، کە هەندێک ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و مەکتەبی سیاسی، بەوە نەدەوەستان تەنیا منداڵەکانیان بۆ خوێندن بۆ دەرەوەی وڵات بنێرن، تەنانەت هەندێکیان، برازا و ئامۆزا و خوشکەزا و خزمی تریان، کە پێوەندییان بە حزبی شیوعییەوە نەبوو، لە جێگەی ئەندام و کادیری حزبی شیوعی، بۆ خوێندن دەناردن بۆ یەکێتیی سۆڤیەت و وڵاتانی سۆشیالیستی.

من هیوام بەو سەفەرە هەبوو، بە تایبەت دوای ئەوەی پێیان وتم کە قبووڵ کراوم. خۆم ئامادە کردبوو، بە چەند برادەری نزیکم وتبوو. لە لایەکی ترەوە تا دەهات دۆخی سیاسیی کوردستان و

عێراق ئاڵۆزتر و تاریکتر دەبوو. گرتن و ڕاونانی شیوعییەکان پەرەی دەستاند، بۆیە هەواڵی سەرنەگرتنی خوێندنەکەم بێتاقەتی کردم. مەسەلەکە هەر خوێندنەکە نەبوو، کە دەکرا هەر نەچم. بەڵام دۆخەکە نائاسایی بوو، بۆیە درەنگ یان زوو دەبوو خۆم بشارمەوە، یان ڕوو لە دەرەوەی عێراق بکەم، چونکە دەگیرام.

بەدەم ئەو بیرکردنەوە و خەیاڵاتانەوە، لە بارەگاکە دەرچووم. نەمویست بەو بێتاقەتییە بگەڕێمەوە بۆ بیری نوێ، تاکسییەکم ڕاگرت و چوومەوە ماڵێ، تا کەمێک پشوو بدەم.

هەر کەسێک لە بەرانبەر پێشهات و هەواڵی ناخۆشدا، ڕەنگە پەنا بۆ میکانیزمی گونجاوی خۆپاراستن ببات، بۆ ئەوەی زەبری هەواڵەکە، یان ڕووداوەکە، سووک بکات. من لە بەرانبەر هەواڵ و پێشهاتی ناخۆشدا پێویستم بەوەیە، ئەگەر بۆ دە دەقیقەش بێت، سەرخەوێک بشکێنم. کاتێک بێدار دەبمەوە، زەبری پێشهاتەکە کەمێک سووک دەبێت، وەکوو ئەوەی یەک دوو ڕۆژ پێشتر ڕووی دابێت. زۆر جار کورتەخەو بۆ من جۆرە دەرمانێک بووە و کۆمەکی پێ کردووم. سەیر ئەوەیە، لە ساتی ئاوادا، بە ئاسانی "دەرمان"ەکەم دەست دەکەوێت. هەر دەرفەتم بۆ بڕەخسێت سەرم بخەمە سەر سەرینێک، تۆپەڵەپەڕۆیەک، تەنانەت بەردێک، یان پاڵ بە شتێکەوە بدەم و چاو بنووقێنم، وەکوو منداڵ بە ئاسانی خەوم لێ دەکەوێت.

عەسرەکەی چوومە بیری نوێ، هەواڵەکەم بە محەمەد کەریم فەتحوڵڵا وت، داوام لێ کرد سۆراخی مەسەلەکە بکات. دواتر هیچ ڕوونکردنەوەیەکم لەو بارەیەوە نەبیست!

## ٣

## هەڵاتن لە تیرۆر

تا دەهات گرتن و تیرۆر زیادیان دەکرد. سەرکردایەتیی حزبی شیوعی بەرانبەر دەستدرێژی و پەلاماری بەعس دامابوو، هیچ هەڵوێست و پەرچەکردارێکی پێشیان نەدەدا. ئەندام و ڕێکخراوەکانی حزبی شیوعی زیاتر توشی شڵەژان، سەرگەردانی و بێهیوایی بووبوون. ئێمە لە لیژنە حزبییەکەمان بێتاقەت و حەپەساو، نەماندەزانی چی بکەین و تا کەی ئەو شاڵاوی پەلامار و گرتنە بەردەوام دەبێت! یوسف ئەلسائیغ، کە یەکێک بوو لە داهێنەرترین نووسەر، شاعیر و ڕۆژنامەنووسی عێراق، لە ئێمە زیاتر شڵەژان و پەشۆکاویی پێوە دیار بوو. بە پێداگرییەوە دەیپرسی چی بکەین؟ بۆ سەرکردایەتیی حزب هەڵوێستێک وەرناگرێت؟ یوسف ئەلسایغ ناهەقی نەبوو، چونکە لە دۆخێکی ڕەوانی و ڕۆحیی باشدا نەبوو. ماوەیەکی کورت بوو هاوژینەکەی، بە ڕوداوی ئۆتۆمبێل، کۆچی دوایی کردبوو، کۆمەڵەشیعرێکی ناسک و پرسۆزی لەبارەیەوە نووسیبوو، کە تازە بڵاو کرابۆوە. هەروا پێشتر ساڵی ١٩٦٣ زیندان و ئەشکەنجەی بەعسی بینی بوو. لەژێر قورسایی ئەو ئازارانە و بێهەڵوێستیی سەرکردایەتیی حزبەکەی و هەڕەشەی گرتن، سوکایەتیپێکردن و ئەشکەنجەدان، لە

حزبی شیوعی دوور کەوتەوە.

ئەو ڕۆژە تەمـــاوی و درێـــژانە، چـــارەنووس بە ڕێـــکەوت و چاوەڕوانی سپێردرا بوو. زۆر جار لە خۆم دەپرسی ئایا دەتوانم بەرگەی ئەشکەنجەی جەستەیی، دەروونـی و سـوکایەتیی زینـدان بگـرم؟ بیـرم لەوە دەکـردەوە کە ئەو ئەشـکەنجە و ئەنجامەکـانی، تەنیا پێوەندییان بە ئازادی و ژیانی منەوە نییە، بەڵکو پێوەندییان بە ئازادی و ژیانی کەسانی تریشـەوە هەیە. لە خـۆم دەپرسی تـۆ بڵێی لە ساتێکی لاوازیی ئینسـانییدا، بروخێم و پاکانە بکەم؟ ئایا مافی ئەوەم هەیە لەپێناو خۆدەربازکردن و پاراستنی ژیانی خۆمدا، هاوڕێ و هاوکارانم بەرەو گرتن و ئەشکەنجەدان بەرم؟

من پلەی بەرزی حزبی و بەرپرسیاریی سیاسیم نەبوو، نهێنیی حزبیم نەدەزانی. هەموو ئەندامانی لیژنە حزبییەکەمان، جگە لە من، هـاوڕێی عەرەب بـوون. زۆربەیـان لای دەزگـای ئەمنیی عێـراق، لە مـن ناسـراوتر و بەرچـاوتر بـوون. بەڵام گـرفتەکە لێـرە دوایـی نەدەهات، بیر و خەیاڵم بۆ لای خراپترین گریمانە دەچوو. کاتێک کەسـێک لەترسـان، یـان لەبەر ئـازار و ئەشـکەنجەی جەسـتەیی و ڕۆحی، لەبەردەم جەللادەکەیدا دەروخێت، دەشـێت چۆنیان بوێت، وەکـوو ئامرازێـک بەکـاری بهێـنن. هەر شـتێک، ئەگەر دارمـا ناتوانـدرێت پێشـوەخت ئاسـتی دارمـانەکەی بزانـدرێت. مرۆڤـی ڕوخێندراو ناتوانێت خۆی سنووری ڕوخان و تێکشکانەکەی دیاری بکات، بەڵکو جەللادەکەی لەجیاتی ئەو بڕیار دەدات. تا دەتوانێت لە لاوازیی قوربانییەکەی سـوود و چێژ وەردەگرێت. چەندان نموونە بە بەڵگەوە هەبوون، کە لە زیندانـدا قوربانییەکـان ناچـار کرابـوون، وەکوو شـایەتی سـاختە، هەنـدێک تـومەت و بوختـان بسـەلمێنن، کە دەزگـای ئەمـن بـۆ قوربانیـانی تریـان هەڵبەسـتبوون. یـان ناچـار

کرابـوون شـایەتیی نـاهەق لەسـەر کەسـانێک بـدەن کە پێشـتر نەیانناسیبوون!

مـن هۆشـدارانە ئەو ڕێگـایەم هەڵبژاردبـوو، پێشـتر بەو هـۆیەوە ئەشکەنجە درابووم و زینـدانیی کرابـووم. ئامـادە بـووم لەپێناویـدا قوربانی تـریش بـدەم. لەگەڵ ئەوەشـدا، نـاو بە نـاو خەیاڵاتی گـرتن، ڕووخــان یــان خــۆڕاگرتن، ســەریان هەڵـدەدایەوە و بێتاقەتیــان دەکـردم. هەنـدێک جـار هـاوڕێ فەهـد، سـەلام عـادل، جەمـال حەیـدەری، شـێخ عەلـی بەرزنجـی، یـان شـەهاب شـێخ نـووری و هاوڕێکانی، کە تازە لە سێدارە درابوون، بە یادمدا دەهـاتن، ورەی زیاتریان پێ دەدام و کەمێک ئارامیان دەکردمەوە. لە خۆم دەپرسی من چیم لەوان زیاترە؟ چۆن دەبێت پێچەوانەی ڕەوشت، نووسـین و کـردارم ڕەفتـار بکەم؟ ئایـا دەتـوانم بەرگەی شکسـتی سیاسـی، ئەخلاقی و ئازارە ڕۆحییەکانی دوای ڕوخـان بگـرم؟ دوای ڕوخـان چـۆن لەڕووم بێت، لە بەردەم هاوڕێکانمـدا، سـەر هەڵببـڕم؟ چـۆن بتوانم شیعر بنووسم؟

دوای ئەو جۆرە بیرکردنەوانە، بەو ئەنجامە گەیشتم کە باشـترە هێنـدە بیـر لەو مەسـەلەیە نەکەمەوە، بە هیـوا بـووم بتـوانم ڕوو لە دەرەوەی وڵات بــکەم. پــاش ئەوەی خوێنــدنەکەم لە یەکێتیــی سـۆڤیەت، کە لە گـرتن دەربـازی دەکـردم، سـەری نەگـرت، تـاکە پەناگەیەک مـابوو ڕووی تـێ بکەم، ئەویش لەندەنی قەڵای دێرینـی کاپیتالیزم بوو، کە فرانسیس پێی باش بوو ماوەیەک بچم بۆ ئەوێ. ئەو کاتە ڤیزاوەرگرتن و سەفەرکردن وەک گەشتیار، بۆ بریتانیـا و وڵاتانی ئەوروپا، ئاسان بوو.

لە ناکاو ڕووداوێـک هـاتە پێش کە گریمـانەی گرتنـی منـی زیـاتر کـرد. لە نووسـینگەی بیـری نـوێ لیژنەیەکـی حزبـی بۆ کارمەندانی

پرستگه، پاسەوان، چایچی و پۆستەبەری ڕۆژنامەکه هەبوو، من بەرپرسیان بووم. کار و کۆبوونەوەکانمان زیاتر پێوەندیی به کاری ئیداری و کاری ڕۆژانەی ئەو هاوڕێیانەوه هەبوو. ڕۆژێک یەکێک لەو کارمەندانه، حوسێن، که پاسەوان بوو، هاته ژوورەکەم زۆر پەشۆکا بوو، ڕوخساری سوور هەڵگەڕابوو، وتی:

هاوڕێ ئەوڕۆ چووم بۆ ئەبوغرێب، تا سەردانی ناسیاوێکم بکەم که لەوێ له زیندانه. دوای ئەوەی لەوێ دەرچووم گرتیانم و کەوتنه لێپێچینەوەم. که زانییان له بیری نوێ کار دەکەم، ئەشکەنجەیان دام. به ناچاری پێم وتن که تۆ بەرپرسی حزبیمانی.

هەوڵم دا ئارامی بکەمەوه، بەڵام زۆر ترسابوو، پێی وتم:

هاوڕێ ئەوانه تازه له کۆڵم نابنەوه، بۆیه لێره نامێنم و به یەکجاری دەچمەوه بۆ کوردستان.

شاڵاوی دەزگای ئەمن و گرتنی ئەندام و کادیرانی حزبی شیوعی بەردەوام بوو. لەناو هاوڕێیانی ڕاگەیاندن و لیژنه حزبییەکەمان، له یەکترمان دەپرسی چی بکەین؟! ئایا ماقووله له نووسینگەی ڕۆژنامه، یان لەماڵ دابنیشین و چاوەڕێی جەلادەکانمان بکەین، تا دێن دەستگیرمان دەکەن؟. چەند ئەندامێکی لیژنەکه بەنیاز بوون بچن بۆ لوبنان، لای ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینی، که ناوەندەکەی لەوی بوو، یان له وڵاتێکی تری عەرەبی، وەکوو ڕۆژنامەنووس کار بکەن. من پاسپۆرتم هەبوو، بەڵام سەرەتا بیرم لەوه کردەوه ماوەیەک بچمەوه کوردستان و لەوێ خۆم بشارمەوه. بەڵام زوو پەشیمان بوومەوه، چونکه له قەڵادزێ و له سلێمانی دەناسرامەوه. له هەولێریش تەنیاماڵی حاکم بەکر ئیسماعیل و پوره حەنیفه هەبوو ڕووی تێ بکەم، بەڵام ماقوول نەبوو، بۆ سێیەم جار سەرئێشه و گرفتیان بۆ زیاد بکەم.

دوای ئەو خەیاڵ و بیرکردنەوانە، لەسەر ئەوە ساخ بوومەوە بچم بۆ لەندەن. ئەو دەمەی فەرمانبەر بووم و دواتریش لە ئیستگەی ڕادیۆی بەغدا کارم دەکرد، پارەیەکی باشم بە دەست کەوت، زۆربەیم پاشەکەوت کردبوو. ئەو نیازەم بە جیا بە محەمەد کەریم فەتحوڵڵا و جەلال دەباغ وت. محەمەد کەریم فەتحوڵڵا زۆر میهرەبانانە تەماشای کردم و هیچی نەوت. بێدەنگییەکەیم وا لێک دایەوە کە خۆمی سەرپشک کردووە. کەچی جەلال دەباغ، کە هاوڕێی نزیکم بوو، پێی باش نەبوو بچم بۆ لەندەن. بەڵام دوابڕیار لای خۆم بوو.

لەو سەروبەندەدا باسی کۆنگرەی یەکێتیی نووسەرانی کوردمان دەکرد، کە لە ناوەڕاستی مانگی ئەیلول، لە هەولێر دەبەسترا. دوو هەفتە پێش کۆنگرە، محەمەد کەریم فەتحوڵڵا پێی وتم:

هاوڕێ خۆت ئامادە بکە، بڕیار دراوە بۆ خوێندن بتنێرین بۆ بولگارستان.

بەو هەواڵە زۆر دڵخۆش بووم. لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا خۆم ئامادە کرد و ڤیزای بولگارستان و بلیتیان بۆ وەرگرتم. ئێوارەی ڕۆژی ٩ی ئەیلولی ١٩٧٨ کە جەژنی سەربەخۆبوونی بولگارستان بوو، بەرەو فرینگەی بەغدا بەڕێکەوتم. باوەڕم نەدەکرد، کە دوای چەند سەعاتێک، لە مەترسی گرتن و ئەشکەنجەدان ڕزگار دەبم، بە ئاسوودەیی لە ئاسمانەوە تەماشای بەغدا دەکەم، بۆیە دەترسام ڕێگەم نەدەن سەفەر بکەم.

هەردوو هاوڕێم کەمال میراودەلی و جەزا عەلی ئەمین، بڕیاریان دا لە سلێمانییەوە بێن، لەگەڵ کاکە محەمەدم، بمگەیەننە فرینگەی بەغدا و بەڕێم بکەن. مامۆستا جەزا هات، بەڵام کەمال، نامەیەکی پڕ مەحەبەتی بۆ ناردم، کە لێرەدا وەکوو خۆی دەینووسمەوە:

**ڕەفیق گیان**

ئەوەی نەدەبوو ببێ بوو. بەجێمان دێڵی، کەلێنێکی گەورەمان تێبوو.. ساڵێک و کێ دەزانێ؟! بەغدا بوو بە شاری نامۆیی و غەم.. هەست دەکەم بەشێک لە ژیان و بوونم جیا دەبێتەوە. لەگەڵ ئەوەشا شادم بەوەی کە تۆ شاد دەبی.. کە تۆ زیاتر وەک ڕەفیق دروست دەبی. هیوام بە ڕەوشت و ڕەفتار و باوەڕت زۆرە. ئەوندەت لەبیر بێ کە تۆ (........)ێکت بە هەموو مانای وشە بەجێ هێشتووە، چاوەڕێت دەبین.

ڕەفیق گیان پێویست ناکات بڵێم چۆن بیرت لێ دەکەمەوە. تەنها ئەوەندە دەڵێم هەر وەختێک لەگەڵ تۆ بوو بم هەستم کردووە لەگەڵ خۆمم و لەخۆم جیا نەبوومەوە، واتا بچووکترین هەستێکم بە نامۆیی نەکردووە... بۆیە ئێستا هەقمە ئەو هەستە لە ناخما بهاروژێ..

بە داخەوە کۆنگرەش بێ دیداری تۆ بۆشاییەکی گەورەی تێکەوت، بەتایبەت بە نیسبەت خۆمانەوە... هیوام زۆرە کە تاقیکردنەوەیەکی گەورەت لەبەردەمە. تۆش هەمیشە ئەو توانا و لێهاتووییەت هەیە کە ئەوپەڕی کەڵک لە تاقیکردنەوەکان وەربگری.. بەتایبەتی بەنیسبەت شیعرەوە... هەر بە گەیشتنت بە ناونیشانی سانەوی ئەزمر ئاگادارم بکە، هەر بەرهەمێکی نوێت هەبوو دەبێ دەستبەجێ بۆم بنێری... هەر کاتێک چاپکردنی شیعرەکانت بە چاک زانی- پێش هاتنەوەی خۆت- ئەوا وەڵام بنێرە تا ئەو ئەرکە بگرمە ئەستۆی خۆم. بۆ مەسەلەکانی تریش پێویست ناکا بڵێم، دڵنیا بە لە خۆت زیاتر بەتەنگ بەجێگەیاندنی هەر ئیشێکتەوە دەبم. هەر کاتێ نامەت بۆ (........) نووسی، بە هۆی منەوە بینووسە.

کاکە بەڕاستی باوەڕم نەدەکرد هەروا زوو بڕۆی و مەسەلەکە هەمووی ببێتە ڕاستی. بەڵام ئێستا تەواو هەست دەکەم. ببورە کە نەهاتم تا ئەو لەحزە قورسانەی جیابوونەوە ببینم- مادام هەر دەڕۆی چار نییە. هیوادارم ئەم چەند وشەیە ڕووی بەڕێکردنی تۆیان هەبێت.

کاغەزیشم نووسی بۆ فرانسیس، تکایا عینوانێکی ئەوم لای کاک جەزا بۆ بە جێ بهێڵە. کاکە هەر کە گەیشتیتە سۆفیا، ناونیشانی یەکەم ڕستوڕانت، یان گازینۆمان بۆ بنووسە کە یەکەم جار بۆی دەچی، ئیدی کە هاتین دەتبینینەوە، چونکە ئەو کوردە هەر ئەوەتا بە شوێنێکی فێر بوو.

به هیوای سەرکەوتن و دیدار.

کەمال

شەوی ٧-٩-١٩٧٨ سەعات ١٠،٤٥

لە فڕینگەی بەغدا خواحافیزیم لە کاکە محەمەدم و مامۆستا جەزا کرد، بەرەو شوێنی کۆنترۆڵی پاسپۆرت ڕۆیشتم، کە خەڵکی کەمی لێ بوو. لە دوورەوە کچێکی هاوڕێی ڕۆژانی زانکۆم بینی ناوی فاتیمە بوو، لەگەڵ کەسێکی تر لە شوێنی کۆنترۆڵی پاسپۆرت و پشکنینی جانتا دەستییەکان ڕاوەستا بوو. دڵم داخورپا، زۆرم پێ سەیر بوو لەو شوێنە گرینگەدا فاتیمە دەبینم، کە چوار ساڵ بوو نە دیبووم، نە هەواڵیم بیستبوو. لە خۆم پرسی تۆ بڵێی فاتیمە بووبێتە بەعسی و بۆ چاوساغی لێرە داندرابێت؟ ئایا گرفتم بۆ دروست ناکات؟ ئەو گومانکردنەم پێ خۆش نەبوو، چونکە فاتیمەم دەناسی، کەسێکی باش و ڕاستگۆ بوو. بەڵام ئەو ڕۆژە سەختانە دەکرا مرۆڤ، تەنانەت لە چەند هەفتە و مانگدا، تەواو بگۆڕدرێت.

لەژێر فشار و ئەشکەنجەدا، یان لەبەر هەلپەرستی، دەستبەرداری باوەڕ و ئینتیمای سیاسیی خۆی ببێت، بچێتە بەرەکەی تر. تەنانەت لە فریشتەوە ببێتە بەڵایەک و سەری هاوڕێیانی بە قوڕدا بکات.

من لەناو هۆڵی فڕینگە بووم، هیچم پێ نەدەکرا. لە نزیک کۆنترۆڵەکە، تەماشای فاتیمەم کرد، دۆستانە بەڕوومەوە پێکەنی. کەمێک ئارام بوومەوە، بەڵام گومان و ترسم نەڕەوینەوە.

فاتیمە لە بەشی زمانی عەرەبی دەیخوێند. خەڵکی حیلە و لە حزبی شیوعی نزیک بوو. ئەو و چەند قوتابی تری کچ و کوڕی عەرەب و کورد، هاوڕێی ئەحلام مەنسوور و من بوون، بەردەوام یەکترمان دەبینی. ئەو لە هەمووومان قسەخۆشتر بوو، بە ناوی بچووکراوەی (فەتوومی) بانگمان دەکرد. تەعلیقی لە هەمووان دەدا. هەر کچێکی گروپەکەی بدیتایە کە جگەرەی بە دەمەوەیە، قسەیەکی ئیرۆنیکیی باوی عەرەبی، بە دیالێکتی عێراقی، پێ دەوت:

(الیوم تنیچ، بکرە تدخن السیگارە) واتا ئەمڕۆ گان دەدەیت، سبەینێ جگەرەش دەکێشیت!. دوای زانکۆ هەمووومان لە یەکتری دابڕاین، ڕۆژانی خۆش و پڕهیوای زانکۆمان، لەدوای خۆمان جێ هێشت، گیرۆدەی کار، خەم و گرفتی خۆمان و وڵات بووین.

ئێستا لەم فڕینگەیە، کە بۆ من سنووری نێوانی زیندان و ئازادییە، هاوڕێیەکی ئازیز دەبینمەوە. لەجیاتی ئەوەی بە بینینی دڵخۆش بم، لێی دەترسم، ئاوات دەخوازم کە نەمدیتبایەوە.

دەسەڵاتی دیکتاتۆری هەر ئازادیمان زەوت ناکات، بەڵکو هەوڵیش دەدات شتە جوانەکانی هەناومان، کە سەرمایەی ڕۆحی و چاوگەی هێزی مەعنەویمانن، ناشرین بکات، بۆ ئەوەی متمانەمان بە هیچ شتێک و کەسێک، تەنانەت متمانەمان بەخۆشمان نەمێنێت. گومان، گۆشەگیری و بێئومێدی، بەجۆرێک بنکۆڵ و کلۆرمان

بکەن، کە بە فوویەکی دەسەڵات بەلادا بێین.
کاتێک گەیشتمە لای فاتمە سڵاوم لێ کرد و جانتاکەم بۆ کردەوە، بە دەنگی نزم وتی:
ئەم وڵاتە جێگای تۆشی تێدا نابێتەوە!
بێ ئەوەی خۆم تێک بدەم، وتم:
هاوینەکەی زۆر گەرمە، بۆ پشوودان دەچم بۆ بولگارستان.
فاتیمە بەدەم خۆخەریکردن بە پشکنینی جانتاکەوە، بە دەنگێکی نزم وتی:
من لێرەم و ڕۆژانە دەبینم کێ بێرەدا سەفەر دەکات.
دوای تاوێک سەری جانتاکەی دادایەوە و لەبەر خۆیەوە وتی:
بۆ هەر جێیەک بچیت لێرە باشترە، خوات لەگەڵ.
جانتاکەم داخستەوە و سوپاسم کرد.
ئەو ئێوارەیەی لە دوای خۆم بیری نوێ، بەغدا، کەسوکار و خۆشەویسترین ئازیزم، کە بڕیارمان دابوو پێکەوە بژین، بە جێ هێشت، نەمدەزانی ئەو سەفەرکردنە، ژیانی من بە جۆرێک هەڵدەگێڕێتەوە، کە قەت وەکوو خۆی لێ نایەتەوە. نەمدەزانی جارێکی دی چاوم بە دایکم ناکەوێتەوە، سێ مانگ پاش مردنی، بە ڕێکەوت لە پێشمەرگایەتیدا، هەواڵی مەرگی دەبیستم. نەمدەزانی دڵخوازەکەم لە دەست دەدەم. قەڵادزێی جاران نابینمەوە و یادوەرییەکانی منداڵی، مێرمنداڵی و سەرەتای گەنجیم، لەژێر کەلاوەکانیدا دەنێژرێن. نەمدەزانی و نەمدەزانی وەکوو نەمامێکی لەڕەگەوە هەڵکەندراو، ناتوانم جارێکی دی لە وڵاتەکەم، کە قەت نەبۆتە وڵاتی من، بڕوێمەوە.

١

# خوێندن لە بولگارستان

لە سۆفیا لە ئەکادێمیای زانستە کۆمەڵایەتییەکان، دەستم بە خوێندن کرد. ئەکادێمیا سەنتەرێکی زانستیی کۆمەڵایەتی بوو، قوتابیانی بولگار و بیانی لەوێ خوێندنی زانکۆ و دوکتۆرایان تەواو دەکرد. هەروا لە ئەکادیمیا کۆرسی خوێندنی جۆراوجۆری مانگانە و سالانە، بۆ کادیری حکومی، ئیداری و حزبیی بولگار و بیانی، لەوانە کادیر و ئەندامی حزبی شیوعیی عێراق، ڕێک دەخرا و سەدان کەس بەشدار دەبوون.

ئەکادێمیا ڕێسا و دیسپلینی تایبەتی هەبوو، چواردەوری تەلبەند کرابوو. ئەگەر میوانمان بهاتایە دەبوو پێشوەخت مۆڵەتی بۆ وەربگرین و ناوەکەی لە پرسگە بنووسرێت. شەوانی هەینی و شەمە دەمانتوانی لە دەرەوە بمێنینەوە. شەوانی تر دەبوو پێش سەعاتی دوازدەی شەو بگەڕێینەوە ئەوێ. چونکە دوای ئەوە دەرگا دادەخرا و کەس بۆی نەبوو بچێتە ژوورێ. بەڵام یاسا و ڕێساکان چەند توندوتۆڵ بن، هەمیشە کەسانێک هەن بتوانن یاسا بشکێنن. زۆر جار تەلبەندی دیوی پشتەوەی ئەکادێمیا، کە لە باڵەخانەکان دوور بوو، درزێکی شاردراوەی تێ دەکرا. ئەوە 'دەروازەی نهێنی'ی دوای سەعاتی دوازدەی شەو بوو. کاتێک

ئاشکرا دەکرا، دوای ماوەیەک، لە جێیەکی تر، دەروازەیەکی تری لەو جۆرە دروست دەکرایەوە.

لە سۆفیا سەرەتا دڵخۆش و ئاسوودە بووم، بە نیاز بووم بە تەواوی سەرقاڵی خوێندن بم. چەند هاوڕێ و دۆستم بینینەوە، کە پێش من چووبوونە بولگارستان، لە زانکۆ دەیانخوێند. لەوێ مامۆستا حەسەنی قزڵجیم ناسی، کە لە سۆفیا دەژیا. هەروا مامۆستا کەریمی حیسامی، لەگەڵ خەجیجە خانی هاوسەری و کوڕ و کچەکەیان، کەماڵ و شلێر، لەوێ نیشتەجێ بوون.

ئەو دوو نووسەرە، قزڵجی و حیسامی، لە تەمەنی لاویەوە لە کوردستانی ئێران دەربەدەر بووبوون، ماوەیەک لە عێراق ژیان. سەرەتای شەستەکانی سەدەی پێشوو لە پراگ، بەشی کوردی ئیستگەی ڕادیۆی پەیکی ئێرانیان، بەڕێوە برد. من ئەو کاتە هێشتا منداڵ بووم، زۆربەی خەڵکی قەڵادزێ، بە پەرۆشەوە گوێیان لەو ئیستگەیە دەگرت. لەوێوە هێرشی زۆر توند دەکرایە سەر حکومەتی بەعس، کە لە شوبات (فابریوەری) ١٩٦٣ دەسەڵاتی گرتبووە دەست. دواتر هەردوو نووسەر لە سۆفیا نیشتەجێ بوون.

مامۆستا قزڵجی لە سەنتەری سۆفیا، لە قاتی سەرەوەی گالێرییەکی گەورە، کە ناوی (تسووم) بوو، لە شوقەیەکی بچووکی ژوورونیوی، بە تەنیا دەژیا. ئەو ماوەیەی لە سۆفیا بووم، بەردەوام بە تەلەفۆن هەواڵیم دەپرسی و سەردانم دەکرد. هەندێک جار نەیدەهێشت زوو بڕۆم، ئێوارەکەی پێکەوە ڤۆدگامان دەخواردەوە، برنجی لێ دەنا و لەگەڵ مریشکی پێشاو دەمانخوارد.

قزڵجی لە سەردەمی کۆماری مهاباد، سەرنووسەری گۆڤاری هەڵاڵە بوو. چیرۆکنووس و ڕووناکبیرێکی شارەزا، ئەزموونـدار، قسەخۆش و بێفیز بوو. چیرۆکەکانی ڕەنگدانەوەیەکی هونەرییانەی

ژیانی کوردەواری و گرفتی کۆمەڵایەتیی لادێکانی کوردستانن. لەو ستەم و بێدادی و فەسادییە دەدوێن، کە لە کۆمەڵێکی نەخۆش و دواکەوتوودا دەردەکەون.

له ســـۆفیا چەنـــد هـــۆنراوەیەکم نووســـی، کە کـــاریگەریی ڕووداوەکـانی ئەو ڕۆژانە و هەسـتی بەرگرییـان پێوە دیـار بـوون. دوو شـیعرم بـۆ مامۆسـتا مـحەمەدی مەلا کەریـم نـارد، بـۆ ئەوەی بڵاویان بکاتەوە. شیعرێکیان (هۆنراوەیەک بۆ هاوڕێ فەهد)ی کردە عەرەبی، لە ڕۆژنامەی (تەریق ئەلشەعب) بە ناوی خۆمەوە چاپ کـرا. ئەوی تریـان (ڕێـژنە) لە ئـاداری ١٩٧٩ لە گۆڤـاری ڕۆژی کوردســتان، کە کـۆمەڵەی ڕۆشــنبیریی کــوردی لە بەغــدا دەری دەکـرد، بـڵاو کـرایەوە. بەڵام لەجیـاتی نـاوی مـن نووسـیبوویان (شاعیرێکی دووروڵات). هۆنراوەکە، دواتر لە شاخ چەند دێڕێکی بۆ زیاد کرا، ساڵی ١٩٧٩ لە کۆمەڵەهۆنراوەی (ڕێژنە)دا بڵاو کرایەوە.

لەو ڕۆژەوە نووســینم بـۆ بڵاوکـردنەوە لە عێـراق، نەنــارد. لە ڕۆژنامەکانیشدا، ناوی من و شیعرەکانم نەدەهات. یان ناڕاستەوخۆ وەکوو یاساخکراوی لێ هات. ئەوەندەی بینیومە، ئەو ساڵانە، تەنیا ڕەخنەگر و شـاعیر د.کەمـال میراودەلـی، لە چاوپێکەوتنێکدا، لەگەڵ مامۆسـتا مسـتەفا سـاڵح کەریـم، باسـی مـن و چەنـد تایبەتمەنـدیی شیعری منی کردووە.[1]

له سۆفیا ماوەیەکی کورت بە خۆشی و ئارامی ژیام. تا دەهـات ستەم و تیرۆری بەعس زیادی دەکرد. بەردەوام هەواڵی نـاخۆش و دڵـتەزین لە وڵاتەوە دەگەیشـتن. بە پـۆل هاوڕێیانمــان ڕوویــان لە سـۆفیا دەکـرد، دەبـوو شـوێنی حەوانەوەیـان بـۆ دابـین بکرێـت.

---

1- پاشکۆی عێراق، ژمارە ٢٣ لە ٢١-١- ١٩٧٩ هەروا کەمال میراودەلی، ئەدەبناسی، ئەدەب و ڕەخنەی ئەدەبی- نووسینەکانی کەمال میراودەلی ١٩٧٠-١٩٨١) ل٤٤

بڵاوکـراوەی یەکێتیـی نیشـتمانیی کوردسـتان، لە سـۆفیا دەسـت دەکەوت، هەواڵی ناخۆشیان لەبارەی وێرانکردنی کوردستان، گرتن و لەسـێدارەدانی خەڵـک و چـالاکیی پێشـمەرگە، بـڵاو دەکـردەوە. هەروا گرتن و ئەشکەنجەدانی ئەندام و کادیرانی حزبی شیوعی، هەمـوو سـنوورێکی بەزانـدبوو. سـتەمی دەوڵەتـی بەعـس و ئەو هەواڵ و ڕووداوە ناخۆشـانە، بێتاقەتیـان کردبـووم. هەسـتی بەرپرسیاری و مەیلی سیاسی و بەرەنگارییان دەوروژاندم.

مـن لەو بـاوەڕەدا بـووم کە نووسـەر و ڕووناکبیر، پێویسـتە پەیڤـین، نووسـین و کـرداری هاوئاهەنـگ بـن. ئەوەی دەیڵێـت و دەینووسـێت، ئەگەر پێویسـت بێـت و بتوانێـت، هەقە بە کـردەوە پێشـانی بـدات. ئەو بۆچـوونەم نـوێ نەبـوو، لە چەنـدان نووسـینی ساڵانی حەفتاکاندا، بە ڕوونی دەبیندرێن.[1]

هەروا ئەو ساڵانە باوەڕم بەوە هەبوو کە دەتواندرێ و ڕەوایە، لە ڕێگەی توندوتیژیی شۆڕشگێڕییەوە، سیستمی سیاسی و کۆمەڵ و ژیان بگۆڕدرێن. بۆیە لە بەرانبەر تیرۆر، ستەم و شەڕی دەوڵەتی بەعس، بەرەنگاربوونەوەی چەکداریم بە ڕەوا و گونجاو دەزانی. ئەو بۆچوونەم لەگەڵ هەندێک هاوڕێ، لەوانە بەهادین نووری باس کرد، کە لە سۆفیا بوو، هیچ بەرپرسیارییەکی سیاسی نەبوو. چاوەڕێی دەکرد پەلاماری بەعس و دۆخی سیاسیی عێراق، بە کوێ دەگات.

هزر و تێڕوانینی سیاسی، ڕۆشنبیری و ئەخلاقیم، لە ڕەوشی ڕووداوەکاندا، شێوەژیانی منیان گۆڕی، بەرەو ئەوەیان بردم بڕیار بدەم، بۆ پێشمەرگایەتی بچمەوە کوردستان. ئەو بڕیارە پەلەکردن و سەرەڕۆیی پێوە دیار بوو، چونکە هێشتا وەزیرەکانی حزبی

---

1- -ڕەفیق سابیر، پەیڤ و پەیام، سەرچاوەی پێشتر.

شیوعی، له حکومەتی عێراق و نوێنەرانی له دەزگاکانی ئۆتۆنۆمی له هەولێر، له کارەکانیان بەردەوام بوون.

ڕۆژی ١٠ی ئاداری ١٩٧٩ لەگەڵ بەهادین نووری، کەریمی حیسامی، عەبدوڵڵا قەرەداخی (مەلا عەلی) و ئەبو حاتەم، که هاوڕێیەکی عەرەب بوو، شاری سۆفیای دڵگیرمان بەجێ هێشت، تا بەرەو کوردستان بچین. چەند شەوێک له بەیروت ماینەوە و به پاسپۆرتی ئوردونی، که ڕێکخراوی ئازادیبەخشی فەلەستینی، به ناوی ساختە بۆیان ئامادەکردین، چووینە تاران.

مانگێک بوو شۆڕشی گەلانی ئێران کرابوو. جگە له مەیخانەکان، که داخرابوون، هەموو شتێک جوان مابوو. تاران، به تایبەت باکووری شارەکە، له ڕووی ڕێکوپێکیی شەقام و جوانیی باڵەخانەکانی، هەڵسوکەوت و ڕەفتاری هێمنانەی خەڵکەکەی، له سۆفیا و مۆسکۆ دەچوو. کەچی هاتوچۆی بێسەروبەری ئۆتۆمبێل، له شەقامەکانی تاراندا، بەغدای به بیر دەهێنامەوە. خەڵکی تاران وەکوو له زیندانێکی گەورە ئازاد کرابن، دڵخۆش و چالاک ڕژابوونە سەر شەقامەکان. به درێژایی شەقامی فیردەوسی و شەقامی درێژ و بەرینی تر، هەزاران کەس، به گرووپی بچووکی جیاواز کۆ بووبوونەوە و باسی دۆخی سیاسی و داهاتووی ئێرانیان دەکرد. کەسێک بیروباوەڕی خۆی بۆ ڕوون دەکردنەوە، خەلکەکەش پرسیاریان لێ دەکرد، یان له دژی دەوەستانەوە و هیچ گرفت و کێشەیەک له نێوانیاندا ڕووی نەدەدا. ئەوە دیاردەیەکی باش و سەرنجراکێش بوو، که پێشتر نەمدیتبوو. بەڵام ئەو دۆخە پڕهیوا و ئازادییە، زۆری نەخایاند، ئیسلامییەکان دەسەڵاتیان گرتە دەست. شۆڕشی گەلانی ئێران، کۆماری ئیسلامیی لێ هاتە بەرهەم.

دوای چەند ڕۆژ هەموومان، لەگەڵ جەلیل گادانی، ئەندامی

پێشــووی مەکتەبــی سیاســیی حزبــی دیمــوکراتی ئێـران، چـووینە مهابــاد، کە تــازە ئــازاد کرابــوو. شــەوەکەی لە مــاڵی بــاوکی حەمەدەمین سیراجی، ئەندامی پێشووی مەکتەبی سیاسیی حزبی دیمــوکراتی کوردســتانی ئێـران، میـوان بـووین. زۆر بە گەرمــی، نەجیبانە و میواندۆستانە، پێشوازییان کردین.

پـێش ئـێمە، چەنـد کـادیر و ئەنـدامی حزبـی شـیوعی چووبـوونە شــاخ، لەنــاو ئەوانــدا ســێ ئەنــدامی کـۆمیتەی ناوەنـدی هەبـوون، دووانیان فـاتیح ڕەسـووڵ، تۆمـا تۆمـاس، کە هـاوڕێیەکی مەسـیحیی نــاوچەی ئەلقـووش بـوو، لە خـڕی نێوزەنـگ بـوون، بەڵام ئەحـمەد بــانیخێڵانی و چەنــد هــاوڕێیەک لە مهابــاد خانوویەکیــان، وەکــوو نووسینگەی حزب، بەکرێ گرتبوو، ئێمە چووینە ئەوێ.

چەنـد ڕۆژ بـوو سـەربازگەی مهابـاد کەوتبـووە دەسـتی حزبـی دیمــوکرات، چەک و کەلــوپەلی ســەربازگەکە، دەســتیان بەســەردا گیرابـوو. بەشـێکیان وێنەی تـاڵانی، لە بـازاڕی مهابـاد دەفرۆشـران. هەر چەکێکــت بویســتایە لەوێ دەســت دەکەوت. دواتــر دەوتــرا تانکیان بۆ فرۆشتن هێناوەتە بازاڕ، بەڵام من ئەوەم نەدی.

خەڵکــی شــاری مهابــاد زۆر شــاد و گەشــبین بــوون، لە دوای ڕوخانــدنی کۆمــاری کوردســتان و لەسـێدارەدانی پێشــەوا قــازی محەمەد و هاوڕێکانی، لە چوارچرای مهاباد، خەڵکی پایتەختەکەی کۆمار، ئازادی و خۆشیی لەو جۆرەیان بەخۆیانەوە نەدیبوو.

چەنـد ڕۆژێـک لە مهابـاد مـاینەوە. لە یەکـی نیسـان هـاوڕێ مەلا عەلی، لەگەڵ نەسرەدین هەورامی و چەند هـاوڕێی تر کە هـاتبوونە مهابـاد، بە چەکەوە نێردرانە نـاوچەی هەورامـان، بۆ ئەوەی لەوێ بــنکەیەک دابمەزرێــنن، پێشــوازیی ئەو هاوڕێیــانە بــکەن، کە لە سلێمانی و شاری تری عێراقەوە، ڕوو لە شاخ دەکەن.

له مهاباد له‌گه‌ڵ ئه‌بو حاته‌م، به گوێزان سه‌رمان تاشی. ڕۆژی دووی نیسان، هه‌رسێکمان، به‌هادین نووری، ئه‌بو حاته‌م و من، له‌گه‌ڵ دوو هاوڕێی تر، که له مهاباد بوون، به چوار تفه‌نگی گ ی۳، (له ئێران به ژ ی۳ ناو ده‌بردرێت)، که حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران پێی دابووین، چووینه سه‌رده‌شت. له‌وێوه به‌ره‌و خڕی نێوزه‌نگ به‌ڕێ که‌وتین، ئێواره‌که‌ی گه‌یشتینه ئه‌وێ.

ئاسمانێکی شین و خنجیلانه‌م هه‌بوو
داگیرکه‌ران به‌سه‌ر سه‌رمیاندا ڕوخاند
چۆڕه‌خوێنێکی ڕه‌ش و
چه‌پکێک خه‌ونی هه‌نگوینی و
چه‌ند کتێبێکم هه‌بوو
ئه‌ویشیان برد به تاڵان.
به‌ڵام کاتێک هاتن پێسته‌که‌م بگۆڕن
ده‌موچاوم بشێوێنن
به‌فر و بروسکه‌م کرده به‌ر
وڵاته‌که‌م نایه کۆڵ و
ڕێگای تفه‌نگم گرته به‌ر.

## ٢
## بە ڕێگای تفەنگدا

خڕی نێوزەنگ ناوچەیەکی شاخاوییە لە سنووری عێراق و ئێرانە، دەکەوێتە دامێنی چیای مامەندە، کە لە ڕۆژهەڵاتی قەڵادزێیە. لەوێ چەند بارەگای پێشمەرگە هەبوون، بە هۆیانەوە ناوچەکە جووڵەی زۆری تێکەوتبوو، دوکان و چایخانە و کەبابخانەی لێ کرابۆوە. نێوزەنگ لەودیو گوندی شێنێیە، کە نزیکترین گوندی ناوچەی پشدەرە لە ئێران. ئەو کاتە خەڵکی زۆربەی گوندەکانی پشدەر ڕاگوێزرابوون، بەڵام خەڵکی شێنێ و چەند گوندی ناوچەی سەنگەسەر و بناری ئاسۆس، لە جێی خۆیان مابوونەوە. من بە منداڵی شێنێ و نزیکەی زۆربەی گوندی تری پشدەرم بینیبوو، بە ناوچەکە ئاشنابووم.

لە خڕی نێوزەنگ بارەگای مام جەلال، مەکتەبی سیاسیی یەکێتیی نیشتمانیی لێ بوو. مانگێک زیاتر بوو چەندان ئەندام و کادیری حزبی شیوعی، ڕوویان لەوێ کردبوو. مام جەلال بە گەرمی پێشوازیی کردبوون. بە کۆمەکی یەکێتیی نیشتمانی بارەگایەکی بچووکیان کردبۆوە و چەند پارچە چەکیان وەرگرتبوو. بارەگاکە دوو ژووری گەورە بوو، لەگەڵ نیمچە ئەشکەوتێک کە پێشەکەی دیوارێکی بە کەڵەکەبەرد بۆ کرابوو. ئەشکەوتەکە، بە

ئەشکەوتی کونە بزنان ناو دەبرا، لە جێیەکی لاچەپ و دە پازدە مەترێک لە سەرووی ژوورەکانەوە بوو، بەڕاستی هەر بۆ ئەوە دەشیا بزنی تێدا مۆڵ بدرێت. بەهادین نووری، ئەبو حاتەم و منیان بردە ئەشکەوتەکە، کە جێگای حەوت تا هەشت کەسی تێدا دەبۆوە، بەڵام بە ئێمەوە بووینە دە یان یازدە کەس. لەوێ ناوی خۆم گۆڕی بۆ کاوە، تا لە شاخ بووم (بە هاوڕێ کاوە) ناو دەبرام. ئەو ناوەم لەبەر کاوەی ئاسنگەر هەڵنەبژارد بوو، بەڵکو ڕێزلێنانێک بوو لە بەرپرسێکی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، لە قەڵادزێ، کە ناوی کاوە بوو، کۆتایی ساڵی ١٩٦٩ تیرۆریان کرد. ئەو سەردەمەش وەکوو ئێستا، لە باشووری کوردستان، سەر و گیانی کوردی نەیاری دەوڵەتی ئێران و تورکیا، پارەی چاکیان دەکرد!.

دوای دە ڕۆژێک بەهادین نووری دیار نەما. سەرەتا لام وابوو بە کارێکی حزبی، بۆ ناو شار، یان بۆ جێیەکی تر چووە. دوای دوو سێ هەفتە لە فاتیح ڕەسووڵم بیست، کە ڕۆیشتووە بۆ ئێران، تا لەوێوە بگەڕێتەوە دەرەوەی وڵات. زۆرم پێ سەیر بوو، چونکە ئێمە پێکەوە بە پلان بۆ خەباتی چەکداری گەڕابووینەوە، بیرمان لە هەندێک کار کردبۆوە. کەچی وەکوو ئەوەی چاوساخی ڕێگامان بووبێت، بە خێرایی، بێ ئەوەی خواحافیزی لە ئەبو حاتەم و من بکات، ئێمەی بەجێ هێشت و گەڕایەوە دەرەوەی وڵات! دیار بوو دۆخەکەی بەدڵ نەبوو. من بڕیارم دابوو بمێنمەوە، بەڵام خەمی ئەبو حاتەمم بوو، کە بەردەوام لە منی دەپرسی ئەبو سەلام بۆ کوێ چوو؟ ئەبو حاتەم خەڵکی شاری سەماوە و دووەم هاوڕێی عەرەب بوو لە شاخ. بەو هیوایە لەگەڵ ئێمە گەڕابۆوە، کە بە شۆڕشی چەکداری، عێراق لە بەعس ڕزگار بکات و شانازانە، بگەڕێتەوە بۆ شارەکەی.

له سۆفیا به بەهادین نووریم وت بۆچی له ئێستاوه ئەبو حاتەم لەگەڵ خۆمان بەرین؟ نه زمانی کوردی دەزانێ و نه شارەزای ناوچەکەیه، ڕەنگه ببێته بارگرانییەک بۆ ئێمه. کەچی وتی:

له بواری میکانیکیدا شارەزایه و لەوێ پێویستمان پێی دەبێت.

بەڵام تا له شاخ بووم ئەبو حاتەم، له بەشی ئیداره و ئازوقه کاری کرد. دواتر له شەڕی پشتئاشان، لەگەڵ چەندان هاوڕێی تر، شەهید کرا.

پاش دەوروبەری ساڵونیوێک بەهادین نووری هاتەوه کوردستان. نزیکەی ساڵێک پێکەوه کارمان کرد، بەڵام وەکوو جاران متمانەم پێی نەبوو. ئەو سکرتێری لیژنەی هەرێمی کوردستان بوو، که بەرپرسی ڕێکخستنی نهێنی نێو شارەکانی کوردستان بوو. من بەرپرسی ڕاگەیاندنی هەرێم و بارەگاکه بووم. بەهادین نووری و من به گشتی پێوەندیمان باش بوو، بەڵام له زۆر مەسەلەدا ناکۆک بووین، کارکردن لەگەڵ ئەو ئاسان نەبوو. توانای گوێگرتنی کەم و مەیلی تاکڕەوانەی بەهێز بوو. تەنیا ڕای خۆی به دروست دەزانی. ئەگەر کەسی یەکەمی حزبی شیوعی بووایه، دەیتوانی ناعادیلانه لەگەڵ ئەو هاوڕێیانەیدا ڕەفتار بکات، که وەکوو ئەو بیر ناکەنەوه. بەڵام بەهادین نووری کەسێکی بوێر، به هەڵوێست، مەیدانی و دڵسۆز بوو. ساڵی ١٩٨٤ دوای چل ساڵ کار و خەبات له ڕیزی حزبی شیوعی، به شێوازێکی ناڕەوا و نابەرپرسانه، لەو حزبه بەدەریان نا. بەهادین نووری، تا سەر جوامێرانه ژیا، لەگەڵ خۆی و باوەر و بەهاکانیدا ڕاستگۆ، لەگەڵ گەلەکەیدا وەفادار مایەوه.

ڕۆژانه چەندان هاوڕێی نوێ، له ترسی تیرۆری حکومەتی عێراق دەهاتنه خڕی نێوزەنگ. بەشێکیان له زیندان ئازاد کرابوون، یان بۆ

خۆپاراستن روویان لە شاخ کردبوو، بەو هیوایەی رەوانەی دەرەوەی وڵات بکرێن، یان پەلاماری بەعس کۆتایی بێت و بتوانن بگەڕێنەوە ناو ماڵی خۆیان. بەڵام بەردەوام شاڵاوی گرتن و راونان زیاتر دەبوو، هاوڕێی نوێ دەهاتن و جێگامان بەرتەسک و خۆراکمان زۆر خراپتر دەبوو. بە هەمووی پازدە بیست تفەنگ و کلاشینکۆفمان هەبوو. زۆر بە پەرۆشەوە چاوەڕێ بووین چەکمان بۆ بێت، یان بتوانین چەک بکڕین و پێشمەرگە دەست بە چالاکیی بکەن. ئەحمەد بانیخێلانی، بەو ناوەی کە چەک لە حیزبی دیموکرات وەردەگرێت و بۆمان دەنێرێت لە مهاباد مابۆوە. رۆژێک چەند پێشمەرگەیەک پێنج تفەنگی (گێ ٣)یان لە مهابادەوە هێنا. تۆما تۆماس، کە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و ئەفسەرێکی کۆنی سوپا و پێشمەرگەی دێرین بوو، لە بەردەمی ژوورەکەمان و لە بەر چاوی کۆمەڵێک هاوڕێ تفەنگەکانی پشکنی و بێ فیشەک تاقی کردنەوە. سێیەم تفەنگی پشکنی و بە تووڕەیی فڕێی دا و وتی دەرزییەکەی دەرهێندراوە. تفەنگی چوارەمیان چەخماخەکەی خراپ بووبوو، تۆما تۆماس خۆی بۆ نەگیرا، بە هەموو هێزییەوە تفەنگەکەی بە زەوییدا کێشا، بە دەنگی بڵند، وتی:

ئەبو سەرباز (ئەحمەد بانیخێلانی) ئەو چەکانەمان بۆ دەنێرێت، کە لە بازاڕی مهاباد بۆی نافرۆشرێن!

رۆژی یەکی ئایار، بە بۆنەی جەژنی کرێکارانی جیهانەوە، ئاهەنگێکی خنجیلانەمان رێک خست کە هاوڕێیان و چەند میوان، لەوانە مام جەلال و مەلا بەختیار بەشدار بوون. سەرەتا من بە زمانی کوردی وتاری حزبی شیوعیم، خوێندەوە. لە وتارەکەدا ئاماژەم بە دۆخی عێراق و کوردستان و تیرۆری دەسەڵات دا و هەڵوێست و رێبازی نوێی حزبی شیوعیم باس کرد. دواتر ئەبو

شاکر، بە عەرەبی هەمان وتاری خوێندەوە. دوای ئەو مام جەلال بە ناوی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و مەلا بەختیار بە ناوی کۆمەڵە وتاریان پێشکەش کرد.

لە نێوزەنگ بێکار و چاوەڕێ، کاتمان بەسەر دەبرد. برادەرانی یەکێتیی نیشتمانی داوایان کرد، لە کاری ڕاگەیاندندا یارمەتییان بدەین. من و ئەبو سەربەست، کە هاوڕێیەکی ڕووناکبیری ئێزیدی بوو، بە عەرەبی دەینووسی، چووینە ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستان، نزیکەی دوو مانگ لەوێ هاوکاریمان کردن.

دوای چەند مانگێک چەک پەیدا کرا. پێشمەرگەکان بە گوێرەی ناوچەکانیان، بە شێوەی پەلی تایبەت ڕێک خران. چەند خانووی نوێ بۆ بارەگای هێزەکانی پێشمەرگە دروست کران، من بوومە بەرپرسی سیاسیی پێشمەرگەکانی ناوچەی پشدەر، کە هاوڕێ سەلیم، ناسراو بە سەلیمە سوور، بەرپرسی عەسکەری و هاوڕێ ڕەسووڵ سۆفی یاریدەری بوو. سەرەتا ٢٠ تا ٢٥ پێشمەرگە بووین و بنەکەکەمان لە زەڵێ بوو. بەشێکی پێشمەرگەکان خەڵکی قەڵادزێ بوون و دەمناسین، بەشێکی تریان خەڵکی گوندەکانی پشدەر و ناوچەی سەنگەسەر بوون، لەوێ ناسیمن.

لە سەرەتای پایزی ئەو ساڵەدا، یەکەمین جەولەمان کرد. دەبوو لە زێی سندۆڵان بپەڕینەوە، بەرەو چیای ئاسۆس بچین. لە دەمی پەڕینەوەدا، هاوڕێ حەسەن خدر، کە خەڵکی ناوچەی سەنگەسەرە و ئێستا لە هەولێر دەژی، هاواری لێ کردم:

هاوڕێ کاوە زێیەکە زۆر قووڵە، دەبێ وەکوو موسەقفان قونان ڕووت کەین.

وتم: باشە هاوڕێ، ئەگەر پێویست بێت ڕووتی دەکەین.

شەوێک لە بناری ئاسۆس ماینەوە و قسەمان بۆ خەڵک کرد.

ڕۆژی دوایی چووینە بنگرد، لەوێوە بە بەلەم پەڕیینەوە بەری چیای کۆسرەت. لەوێ لەگەڵ دەستەیەک پێشمەرگەی ناوچەی بیتوێن، کە چاوەڕێمان بوون، یەکمان گرتەوە. دوای چەند ڕۆژێک، پێکەوە درێژەمان بە جەولەکەمان دا، بە چوارقوڕنەدا پەڕینەوە ناوچەی دۆڵەڕەقە و ئاکۆیان. خەڵکەکە ئێمەیان نەدەناسی، یەکەم پرسیار کە لێیان دەکردین ئەوە بوو ئێمە جەماعەتی کێین؟! لەو گوندانە پێشمەرگە بە ناوی بەرپرس، یان سەرۆکی حزبەکەیان، دەناسران.

ئێمە بەو مەبەستە چووبووین خۆمان بە خەڵکی ئەو گوندانە بناسێنین، لە نزیکەوە بیانناسین و زانیاریی زیاتر لەبارەی ئەو ناوچانە پەیدا بکەین. سیاسەتی نوێی حزبی شیوعی بۆ خەڵک ڕوون بکەینەوە و بزانن کە ئێمەش دەستمان بە چالاکیی چەکداری کردووە. لە چەندان گوند، شەوانە خەڵکمان لە مزگەوت کۆ دەکردەوە، سەعاتێک قسەم بۆ دەکردن. لەبارەی تاوانەکانی دەسەڵاتی بەعس دەدوام، سیاسەت و ڕێبازی نوێی حزبی شیوعی و ئامانجی خەباتی چەکداریم بۆ ڕوون دەکردنەوە. داوام لێ دەکردن کە کۆمەکمان بکەن و بە هیچ شێوەیەک هاوکاریی حکومەت نەکەن. دواتر وەڵامی پرسیاری ئامادەبووانم دەدایەوە.

لە دۆڵەڕەقە بڕیارمان دا، چەند پێشمەرگە بچنە شاری ڕانیە، ئارپێچی بە ماڵی سەرۆکجاش، هەباس باڵواغای ئاکۆوە بنێن، کە چەند مانگێک بوو پۆلێک پێشمەرگەی بزووتنەوەی سۆشیالیستی گرتبوون، ڕادەستی حکومەتی بەعسی کردبوون، ڕاستییەکەی پێی فرۆشتبوون و لەسێدارە درابوون. دەستەیەک پێشمەرگە چوونە ناو شاری ڕانیە، کارەکەیان ئەنجام دا و بە سەلامەتی گەڕانەوە.

هێشتا لە ناوچەی دۆڵەڕەقە بووین، ئاگادار کراین، کە ئەندامێکی

کۆمیتەی ناوەندیی حزبی شیوعی، بە نهێنی گەیشتۆتە ڕانیە و دەبێ لەگەڵ خۆمان بیبەین بۆ نێوزەنگ. کاتێک بینیم عەبدولوەهاب تاهیر بوو، کە خەڵکی بەسرا بوو. لە ماوەی ئەو ساڵەی خۆی شاردبۆوە، ڕەنگی پیریی لێ نیشتبوو.

خەڵکی ئەو گوندانەی کوردستان هەژارانە و لە دۆخێکی زۆر دواکەوتووانەدا دەژیان، لە سادەترین جۆری خزمەتگوزاری بێ بەش کرابوون. هاتوچۆی بەردەوامی پێشمەرگە و مانەوەیان لەو گوندانە، بارگرانیی ئابووریيان بۆ خەڵک دروست کردبوو. لەوەش زیاتر پێشمەرگە ژیانی کۆمەڵایەتی، گوزەران و ئاسایشی خەڵکی ئەو ناوچانەیان تێک دابوو. لە چەند گونددا شەڕی قورس لەنێوان پێشمەرگە و هێزی سەربازی و جاشی ڕێژیمدا، یان لەنێوان پێشمەرگەدا ڕوویان دابوو، خەڵکی ئەو گوندانە زیانی گیانی و مادییان پێ گەیشتبوو.

لەو گەڕانەدا باشتر پێشمەرگەکانم ناسین، پێکەوە زۆر گونجاو بووین. من خەڵکی ناوچەکەم، تایبەتمەندیی کۆمەڵایەتی و عەشایەریی خەڵکەکە دەزانم و ڕێزی هەموویانم دەگرت. ئەوان نموونەی پێشمەرگەی ئازا، جوامێر، وەفادار و دڵسۆز بوون و دەمتوانی سەر و گیانی خۆمیان پێ بسپێرم. بە داخەوە دواتر کۆمەڵێک لەو هاوڕێ جوامێرانە، مام ڕەسووڵ سۆفی، عەلی حاجی نادر، عەبدوڵڵا حەسەن دەڵگەیی، ڕەحمان حاجی حەمە لۆز، کە پورزام بوو، لەگەڵ چەندان هاوڕێی تر، کە ناوەکانیانم لەبیر نین، لە چالاکیی جۆراوجۆردا، شەهید بوون. ساڵی ١٩٨٤ لە شاری سۆفیا، بۆ یادی مام ڕەسووڵ، کە جووتیارێکی جوامێر بوو، هۆنراوەی (ماڵئاوایی) و دواتر بۆ یادی ڕەحمان هۆنراوەی (تەرم)م نووسی. ئەمە هۆنراوەی ماڵئاواییە:

روخسارمان هێشتا نوقمی هەڵچوونە
نوقمی سەرسامی و لە دایکبوونە
بە جێمان دێڵی
لە دورگەی خۆڵدا
لە هەرێمێکی پڕ لە هەرەسدا
لە دەشتی زوقما بە جێمان دێڵی.
هێشتا وەرزەکان لە خوێندا دەگلێن
بەجێمان دێڵی.

دوای تۆ بەرەو کوێ وڵات هەڵبگرین؟
تاریکەشەوان چۆن بەرەو بنکە بگەڕێینەوە؟
لەپاڵ کام دوند و پەڵە هەوردا بحەسێینەوە
کام خەون و ئاسۆ لە ئامێز بگرین؟

بە جێمان دێڵی
هێشتا کوردستان لانکەی ئازارە
گەرووبەکی پڕ خۆڵ و هاوارە
هێشتا کوردستان، عاشق و حەیران
وێڵی مەدارە.

بە جێمان دێڵی
لوتکە و وەرزەکان دادەگیرسێنی
لەنێو گیانماندا لافاو دەچێنی.

## ٣
## نووسین لە پەنای چیادا

لە کۆتــایی نــۆڤەمبەری ١٩٧٩ چەنــد ڕۆژێــک بــوو لە جەولە گەڕابوومەوە، بڕیار درا نووسینگەی ڕاگەیاندنی حزبی شیوعی لە شاخ دابمەزرێندرێت. لیژنەیەک لە سێ کەس پێک هێندرا، مـن و تەحسین محەمەد خەلیل، کە پێشتر لە بیری نوێ پێکەوە کارمان کردبوو، لەگەڵ هاوڕێ نەجیب (ئەبو جینان) کە وتار و هەواڵی لە کوردییەوە دەکرد بە عەرەبی و نووسینەکانی تایپ و چاپ دەکرد.

هاوڕێ عومەر عەلی شێخ (ئەبو فاروق)، کە ئەو کاتە بەرپرسی ڕێکخستنی حزبی شیوعی بوو لە کوردستان، یەکەم کۆبوونەوەی لەگەڵ لیژنەکەمـان کـرد، بە فراوانـی باسـی سیاسـەتی ڕاگەیانـدنی حــزب و پێداویســتییەکانی کــارەکە کــرا. بڕیــار درا پلانێــک بــۆ کارەکانمان دابنێین، بە زوویی کەرەستەی پێویست، تایپ، ڕۆنیۆ، مەرەکەب و کاغەز ...تاد لە ئێرانەوە بهێندرێن. دوای کۆبوونەوەکە بە ئەبـو فـاڕووقم وت، هاوڕێیـانی ڕێکخسـتنی نهێنـی لە قەڵادزێ، پێویستیان بە دەمانچەیەکە بۆیان بنێرین.

ئەبــو فــاڕووق وتــی: هەر دەمــانچەیەک؟ لەمەودوا لەجیــاتی دەمـانچەیەک و دوو دەمـانچە، سـەد دەمـانچە زیـاتر بـۆ نـاوەوە دەنێرین، لە قەڵادزێوە تا کەرکووک، بەسـەر ڕێکخراوەکانی حزبدا

دابەشیان دەکەین.

من حەپەسام، ئێمە بۆ دەمانچەیەک، یان کلاشینکۆفێک، ئامادە بووین سوالّ بکەین! تۆ بلّێی ئەو ماوەیەی لە نێوزەنگ نەبووم چەکمان بۆ هاتبێت و ئاگادار نەبم! تەماشای هەردوو هاوڕێم کرد، ئەوانیش سەریان سورمابوو.! ئەبو فارووق وتی:

من سەدان دانە لە بڵاوکراوەکانی حزب چاپ دەکەم، بۆ ناو شارەکانی دەنێرم، هەر دانەیەکی هێندەی دەمانچەیەک و زیاتریش کاری خۆی دەکات!

دوای ئەو وەڵامە، بیرم بۆ ئەوە چوو کە سەرکردایەتیی حزبی شیوعی خەباتی چەکداری، وەکوو بەشێکی سەرەکیی خەباتی سیاسی، لە دژی دەسەڵاتی بەعس، بەجیدی نەگرتووە. بەڵکو بە شێوەی ساڵانی شەستەکان، بۆ خۆپاراستن و وەکوو پەناگەیەک بۆ ئەو هاوڕێیانەی ناتوانن لە شارەکان بمێننەوە، بەکاری دەهێنێت. ئەو بۆچوونە دڵخۆشی نەکردم و نەمویست بە جیدیی بگرم. زۆر جار مرۆڤ نایەوێت بڕوا بە هەندێک قسە، هەواڵ و پێشبینی بکات، کە لەگەڵ بۆچوونی خۆیدا ناگونجێن.

لە بارەگای سەرکردایەتیی هەرێم لە توژەڵە، ژوورێک بۆ ڕاگەیاندن تەرخان کرا. ئامێری چاپ و کەرەستەی تری پێویست ئامادە کران. بڕیارمان دا دوو بڵاوکراوە بە زمانی کوردی و عەرەبی دەربکەین، ڕێگای کوردستان، کە ئۆرگانی ڕێکخراوی هەرێمی کوردستانی حزبی شیوعی بوو، لەگەڵ ڕێبازی پێشمەرگە، کە بۆ کاروباری پێشمەرگایەتی تەرخان کرا بوو. ڕۆژی ١٤-١-١٩٨٠ یەکەم ژمارەی ڕێگای کوردستان، بە زمانی کوردی و عەرەبی چاپ کرا. سێ هەفتە دواتر لە ٨-٢ یەکەم ژمارەی ڕێبازی پێشمەرگە- نهج الانصار، کە ئۆرگانی هێزی پێشمەرگە بوو، بە

هەردوو زمانەکە دەرچوو. دوای ساڵێک، یان زیاتر (ڕێبازی پێشمەرگە) بە مەکتەبی عەسکەریی حزبی شیوعی سپێردرا. دواتر ئیستگەی ڕادیۆی دەنگی گەلی عێراق دامەزرێندرا، کە بە کوردی و عەرەبی بەرنامەکانی پەخش دەکرد. ئیستگەکە سەرەتا لە ناوچەی بێتووش بوو، ستاقی خۆی هەبوو، دواتر گوێزرایەوە بۆ نۆکان. هەروا ڕاگەیاندنی هەرێمی کوردستان جیا کرایەوە، چەند هاوڕێی لاو هاتنە ڕاگەیاندن، لەوانە ئاسۆ کەریم، دارا مەحموود، مستەفا غەفور و ڕێبوار.

هێشتا کۆمیتەی ناوەندیی حزبی شیوعی بە تەواوی لە حزبی بەعس بێ هیوا نەبووبوو. چاوەڕێ بووین حزبی شیوعی، لە کۆبوونەوەی داهاتووی کۆمیتەی ناوەندی، بە بەیاننامەیەک هاوپەیمانیی خۆی لەگەڵ حزبی بەعس کۆتایی پێ بهێنێت و خەباتی چەکداری، وەکوو بەشێک لە خەبات بۆ ڕوخاندنی ڕێژیمی عێراق، بڕیار بدات. ئەو کاتە وتارێکم لەبارەی خەباتی چەکداری، لە ڕێبازی پێشمەرگەدا، بڵاو کردەوە. تیایدا توندوتیژیی شۆڕشگێڕی و خەباتی چەکدارییم بە شێوازێکی بایەخدار و ڕەوای ڕوخاندنی دیکتاتۆریا و گەیشتنە دەسەڵات، دانابوو. لە وتارەکەدا ئەزموونی چەند وڵاتم لەو بارەوە باس کردبوو، کە لەو ڕێگەیەوە توانیویانە ئازاد ببن. هەروا ئاماژەم بە قسەیەکی کارل مارکس دابوو، کە دەڵێ (شۆڕش شەمەندەفەر -قیتار-ی مێژوویە). چەند ئەندامی سەرکردایەتیی ئەو وتارەیان بەدڵ نەبوو، پێیان وابوو هێشتا کاتی ئەو جۆرە نووسینە نەهاتووە.

ئەو کاتە من، وەکوو ملیۆنان گەنجی کوردستان، عێراق و دنیا، باوەڕم بە بیری چەپی مارکسی و شۆڕشگێڕی هەبوو، بە هزر و کرداری گیانفیدایانەی گیڤارا سەرسام بووم. ئەمەش یەکێک بوو

لەو هۆکارانەی ڕوو لە خەباتی چەکداری بکەم.

دیارە بەرەنگاربوونەوەی ستەم و بێدادی و دیکتاتۆریا، بە هەر شێوازێک بێت کارێکی ڕەوایە. بەڵام بە ئەزموون دەرکەوتووە گۆڕینی کۆمەڵ لە ڕێگای شۆڕش و توندوتیژیی شۆڕشگێرییەوە، ڕەوشی گەشەکردنی سروشتیی کۆمەڵ تێک دەدات. کێشەی قووڵی ئابووری، کۆمەڵایەتی و سیاسی دروست دەکات و توندوتیژی بەدوای خۆیدا دەهێنێت. ئەو کارە وەکوو ئەوەیە منداڵێک، پێش وادەی لەدایکبوونی، بە خواستی دایکوباوکی، لە سکی دایکی بهێندرێتە دەرێ.

چەپی مارکسی، لە بنەڕەتدا باوەڕی بە توندوتیژیی شۆشگێڕی و دیکتاتۆریای پرۆلیتاریا هەیە. هەروا ئایدیۆلۆجیای ناسیۆنالیزم، فاشیزم و ئیسلامیزم.. بە هەمان شێوە، باوەڕیان بە توندوتیژی و پەلاماری چەکداریی هەیە. ئەم شێوازە لە دژی نەیاران و بۆ گەیشتنە دەسەڵات، گۆڕین و دارشتنەوەی کۆمەڵ، بە ڕەوا دەزانن. دەیانەوێت، بەپێی تیئۆری باخچە، کۆمەڵگا (باخچە) لە گژوگیای بێفەر و زیانبەخش (نەیار و بەرهەڵستکاران) پاک بکەنەوە. سەرلەنوێ لەبەر ڕۆشنایی مۆدێلێکی دیاریکراوی ئایدۆلۆجی و سیاسی، کە لە سەری ئەواندایە، ڕێکی بخەنەوە.

ڕاستییەکەی ئەوەی ناوی (شۆرش)ی لێ نراوە، بە گشتی جەلادێکی بە جەلادێکی تر گۆڕیوە. شۆڕشگێران، بە ناوی شۆڕشەوە، کار و تاوانی هێندە درندانەیان کردووە، کە ڕەنگە دیکتاتۆران، یان داگیرکاران نەیان کردبێت. ئەزموونی گەلان لە شۆڕشی فەڕەنسا و شۆڕشی ئوکتوبەرەوە، تا شۆڕشی تەمووزی عێراق، ئەلجەزایر، لیبیا، ئێران و زۆر وڵاتی ئاسیا و ئەفریقا و ئەمریکای لاتین، دەتوانن بەڵگەی ئەو قسەیە بن.

لە بەشی ڕاگەیاندن کات و دەرفەتی باشم بۆ خوێندنەوە و شیعرنووسین هەبوو. تا کۆتایی هاوینی ١٩٨٠ کۆمەڵە هۆنراوەیەکی نوێم نووسی، کە لە ڕووی بابەت، زمان و ستایلەوە، لە هۆنراوەکانی پێشووم جیاواز بوون. لە شاخ بۆچوونم لەبارەی مرۆڤ، ژیان و شیعر، گۆڕانیان بەسەردا هات، کە لە دنیابینیی من و شیعرەکانمدا ڕەنگیان دایەوە. ئەوە سەرەتای ئەزموونێکی نوێی شیعریی من بوو، کە دواتر ئاماژەی پێ دەدەم.

لە شاخ بەدەگمەن کتێبی کوردی و عەرەبیمان دەست دەکەوتن. هەندێک جار لە قەڵادزێوە کتێب و گۆڤاری نوێیان بۆ دەناردم، بەڵام کەم بوون، هەر بەشی چەند ڕۆژێکیان دەکرد. ئەوە بۆ من گرفتێکی گەورە بوو، چونکە ڕانەهاتبووم بە بێ کتێب و خوێندنەوە هەڵبکەم. ئەو گرفتە بەوە چارەسەر دەکرا، کە پەنا بۆ کتێبی فارسی بەرم، چونکە بە ئاسانی دەست دەکەوتن و تا ڕادەیەک لە زمانی فارسی دەگەیشتم.

کەریمی حیسامی دەیوت کوردی عێراق ئەگەر تەنانەت بە تەیارە بە سەر ئێراندا بفڕن، پێیان وایە فارسی دەزانن. بەڵام قسەکەی ئەو منی نەدەگرتەوە، چونکە تارانم دی بوو! چوار ساڵ، هەفتەی سەعاتێک، لە زانکۆی بەغدا، بەشی کوردی، زمانی فارسیم خوێندبوو، هەرچوار ساڵەکە، لە تاقیکردنەوەی کۆتایی ساڵدا، سەرکەوتوو بووم. بۆیە ئاشنایەتییەکم لەگەڵ زمانەکەدا هەبوو. وێرای ئەوە زمانی فارسی پڕە لە وشەی عەرەبی، زۆر وشەی هاوبەشیش لەزمانی کوردی و فارسیدا هەن. بۆیە کەسێک کە کوردی و عەرەبی بزانێت، دەشێت بە زەحمەتی کەمتر فێری زمانی فارسی ببێت. لە لاپەڕەی هەر کتێبێکی فارسیدا، بە دەگمەن دوو دێڕ دەبینیتەوە، کە وشەی عەرەبی تێدا نەبێت. زۆر جار هەموو

وشەکانی ڕستەکە عەرەبین، بەڵام ڕستەبەندییەکەی و کردارەکە فارسین. واتا وشە عەرەبییەکان ملکەچی سیستمی ڕستەبەندی و ڕێزمانی فارسی کراون، ئەوە لایەنی بەهێزی زمانی فارسییە. فارسەکان دەوڵەتیان هەیە، وەکوو ئێمە لە سایەی زۆرایەتیی عەرەبیدا ناژین، بۆیە لە بەرانبەر عەرەبدا گرێکوێرەی خۆبەکەمزانینیان نییە، بگرە خۆیان لە عەرەب بە فەرهەنگدارتر دادەنێن. ئەوەی کاتی خۆی فیردەوسی و شاعیری تری ئێرانی، بە خەڵکی عەرەبیان وتووە، لەناو سەری زۆرینەی گەلی فارسدا، نەوە دوای نەوە، چەسپیوە. بۆیە فارسەکان، وەکوو ئێمە تووشی فۆبیای وشەی عەرەبی نەبوون و ئەو وشە عەرەبیانەیان نەگۆڕیون، بەڵکو فارساندوویانن. بەمەش زمانەکە بەو وشە عەرەبییانە، کە ڕەنگە لەسەدا چلی وشەی زمانی فارسی بن، دەوڵەمەند کراوە. کەچی لە باشووری کوردستان بە جۆرێکی زۆر نەفامانە و نابەرپرسانە، بە کاریگەریی کوردایەتییەکی کوێرانە و جاهیلانە، سەدان وشەی عەرەبی، کە خوێندەوار و نەخوێندەوار، بەکاریان دەهێنن، لە نووسیندا لابراون. لە جیاتییان بە تۆپەڵ وشەی سەقەت و ناقۆڵا، دوور لە بنەمای ئێتیمۆلۆگیی زمانی کوردی، داتاشراون و داندراون. لە بەرامبەر ئەوەدا زمانی کوردی، لە باشووری کوردستان، لە ڕووی ڕستەبەندییەوە شێوێندراوە و ملکەچی ڕێسای زمانی عەرەبی کراوە. بۆ نموونە زۆر جار لە بڵاوکراوە و مێدیای کوردیدا، کە زۆربەیان کراونەتە ماشێنی شێواندنی زمانی کوردی و تێکدانی زەوقی گشتی، دەبینی وشەکان هەموویان کوردین، کەچی ڕستەکان بە شێوازی عەرەبی داڕێژراون. ئەمە هەڕەشە لە زمان دەکات و زمان تێک دەشکێنێت، نەک وشەی بیانی. چونکە هیچ زمانێک نییە هەزاران وشەی بیانی

تێدا نەبێت. ئەو وشانە بوونەتە بەشێکی دانەبڕاو لەو زمانانە. زۆر جار د.عیزەدین لە پۆلدا دووپاتی دەکردەوە، کە هەر وشەیەک لە هەر زمانێکەوە هاتبێتە ناو زمانی کوردی، ئەگەر زۆربەی خەڵکی لادێ و شار، خوێندەوار و نەخوێندەوار تێی بگەن، ئەو وشەیە کوردییە، یان بۆتە کوردی.

لە شاخ گوێم لە ئیستگەی ڕادیۆی تاران دەگرت، بێ گرفتی گەورە لە هەواڵ، ڕیپۆرتاجی ڕۆژنامەنووسی، بابەتی سیاسی و مێژوویی دەگەیشتم. بەڵام کتێبی ئەدەبی، بە تایبەت شیعر و ڕۆمان، ماندوویان دەکردم، دەبوو زوو زوو چاو لە فەرهەنگ (قاموس) بکەم، ئەو گرفتە ڕێگەی لێ نەگرتم بەردەوام بم. بە تایبەت کتێبی ئەدەبی، بە زمانی فارسی، بە ئاسانی دەست دەکەوتن. هەروا لە نێوزەنگەوە هاوڕێیان دەچوونە ئێران، کتێبیان لەگەل خۆیان دەهێنا. بۆیە کاتی زۆرم بۆ خوێندنەوەی کتێبی فارسی تەرخان کرد.

لە ناوەڕاستی کانونی دووەم (جەنیوەری)ی ١٩٨١ بۆ چارەسەری پزیشکی چوومە تاران و دوو مانگ زیاتر، لەوێ مامەوە. سێ هەفتە لە باکووری تاران، لە نەخۆشخانە کەوتم. زۆربەی ڕۆژ کتێب و ڕۆژنامەی فارسیم دەخوێندەوە. لەوێ لە ژوورێکی گەورە، لەگەڵ سێ کەسی دی، کە فارس بوون، دایاننابووم. یەکێکیان تلیاکی بوو، ناوی ئاغای ساڵحی بوو، تەمەنی پەنجا ساڵ زیاتر بوو، بەڵام تلیاک لەڕ و پیری کردبوو. هەمیشە نائارام و شپرزە دیاربوو، بەردەوام بۆڵەبۆڵ و قسەی دەکرد، لە کۆماری ئیسلامی تورە و بێزار بوو. شێوەی قسەکردنی سەرنجی منی ڕاکێشابوو، بۆیە گوێم لێ دەگرت. شەوان بە زەحمەت دەنووست. کاتێک سیستەر و کارمەندی نەخۆشخانە دیار

نەدەبوون، ڕەخنەی توندی لە کۆماری ئیسلامی دەگرت. قسەی ناشیرینی بە ئاخوندەکان دەوت، چونکە تلیاکیان یاساخ کردبوو، ئەویان لە نەخۆشخانە، وەکوو خۆی دەیوت، بەند کردبوو. هەروا ستایشی ڕێژیمی پێشووی دەکرد، چونکە جاران ئازادانە دەژیا و بە پسوولەی تایبەت، تلیاکی لە دەرمانخانە وەردەگرت. تا لە نەخۆشخانە دەرچووم، ئاغای سالْحی هەر لەوێ بوو.

من بەوردی گوێم لە قسەکانی دەگرت و سەرم بۆ دەلەقاند. ئەوەی جێی بایەخی من بوو توانای گێڕانەوە و شێوازی قسەکردنی ئاغای سالْحی بوو، نەک ناوەرۆکی قسەکانی. ئەو وەکوو حیکایەتخوان دەدوا، هەر تیپێکی وشەکەی بە ڕوونی دەوت، دەنگەکان لە گەروویەوە وەکوو باڵندەی ناو هێلانە، بە نۆرە بە دوای یەکدا دەهاتنە دەرێ. ڕەوانبێژانە و لەسەرخۆ قسەی دەکرد، بە باشی گوێم لە هەر تیپێکی وشەکان دەبوو، بۆیە ئاسانتر لە قسەکانی دەگەیشتم. دوای نزیکەی دوو هەفتە هەستم کرد زمانم بە فارسی دەپژێ و دەتوانم پرسیاری لێ بکەم، یان قسەی لەگەڵ بکەم و وەڵامی پرسیارەکانی بدەمەوە. ساڵانێک دواتر کە زمانی ترم خوێند، بیرم بۆ ئەوە چوو کە ڕەنگە ئاغای سالْحی، لەو مامۆستایانەی زمانی فارسی بووبێت، کە کەسانی بیانی فێری زمان دەکەن. چونکە زیاتر ئەو جۆرە مامۆستایانە، بەو شێواز و تەکنیکە تایبەتە، قسە دەکەن و هەر دەنگێک بەڕوونی دەڵێن.

لە بەغدا لە بەشی کوردی، چوار ساڵ، هەفتەی سەعاتێک، زمانی فارسیم خوێند، دوو مامۆستا، دوکتۆر ئەمینی موتابچی، کە کورد بوو، دوکتۆر سالْح تەقی، کە عەرەب و خەڵکی نەجەف بوو، زمانی فارسییان پێ وتم. هەردووکیان پسپۆڕی زمان و ئەدەبی فارسی بوون، لە ئێران بڕوانامەی دوکتۆرایان وەرگرتبوو. بە کۆششی

ئەوان و ڕەنجی خۆم، چەند لایەنی سەرەتایی ڕێزمانی فارسی، شێوازی ڕستەبەندی، تەکنیکی خوێندنەوەی تێکستی فارسی و زۆر وشەی فارسی فێر بووم، کەمێک بە شیعری کلاسیکیی فارسی ئاشنا بووم. بەڵام لە وڵاتی فیردەوسی، حافز و شاملوودا، تلیاکییەک فێری کردم، بێ ترس بە فارسی بدوێم، لەوە سڵ نەکەمەوە ئەگەر لە قسەکردندا هەڵە بکەم.

لەو سەفەرەی تاراندا، ڕۆژێکی مانگی شوبات (فابریوەری، یان ئادار) لە گەڵ حەسەن ماوەرانی، سەردانی مامۆستا حەسەن قزڵجیم کرد، کە گەڕابۆوە ئێران. لەوێ بەرپرسی ڕۆژنامەیەکی هەفتانەی کوردی بوو، کە حزبی تودە دەری دەکرد. ڕۆژنامەکە زیاتر وتاری ڕۆژنامەی (مەردوم)ی حزبی تودە و بەیاننامەی حزبەکەی بڵاو دەکردەوە. مامۆستا قزڵجی لە شوقەیەکدا بوو، دیاربوو لەوێ دەژیا و هەر لەوێش لەگەڵ حەسەن ماوەرانی ڕۆژنامەکەیان ئامادە دەکرد. مامۆستا پیرتر دیار بوو، بێتاقەت و ناساخ هاتە بەر چاوم. بەردەوام دەستی دەخوراند. دوای هەندێک قسەوباس، وتی:

چۆن ئەو بولگاریا خۆشەمان لە کیس خۆمان دا.

لە ناکاو هەردوو پشتەدەستی، کە پڕبرین بوون، پیشان دام و وتی: چاوت لێیە لێرە چیم لێهاتووە! ئایا حزبی شیوعی دەتوانێت بمگەیەنێتەوە بولگارستان؟

زۆرم پێ ناخۆش بوو کە لەو دۆخە نالەبارەدا مامۆستا قزڵجیم بینی. دیار بوو پەشیمانە لەوەی گەڕاوەتەوە بۆ ئێران. هەقی بوو، ژیان لە تاران، بۆ کەسێکی وەکوو ئەو بەتەمەن، ناساخ و بێ کەس، سەخت بوو. ڕاستییەکەی تاران بۆ ئەو وەکوو زیندانێکی گەورە بوو، بەڵام کلیلی ژوورەکەی لای خۆی بوو.

ئەو دەمە تاکە ڕێگایەک، کە هاوڕێیانی ئێمە، لەنێوان کوردستان و دەرەوەدا، هاتووچۆیـان پێـدا دەکـرد، ڕێگـای بادینـان بـوو، کە دوور، سـەخت و پـڕ مەترسـیی بـوو. لە نێـوزەنگەوە چەنـد ڕۆژ هاوڕێیان بە پێ، بە لای ڕەبایای سوپای عێراقدا، ڕەت دەبوون تا دەگەیشتنە بادینـان. لەوێشـەوە تـا سـووریا دەبوو بەنێو کەمـین و ڕەبایای سوپا و جاشدا، تێبپەڕن. دوای ئەو ڕوونکردنەوەیە، وتم:

مامۆسـتا لەگەڵ هاوڕێیـان قسـە دەکەم، ئەگەر لە توانـادا بێـت کارێک بکرێت، ئاگادارت دەکەینەوە.

مامۆستا قزڵجی، دوای ئەو تەمەنە درێژە و ئەو هەموو چیرۆک و وتار و باسە زمانەوانییەی نووسیبوونی، هـاتبووە سـەر ئەوەی، بە ناسـاخی لە شـوقەیەکدا، بەیاننـامەی حزبـی تـودە و وتارەکـانی ڕۆژنـامەی مەردوم، بکـاتە کـوردی. قزڵجـی نمـوونەی ئەو کەسـانە بـوو کە بە دوای بـاوەڕ و پرینسـیپەکانی خـۆی کەوتبـوو، نەک بە دوای بەرژەوەنـدییە تایبەتەکـانی. پـاش دەوروبەری ٢٥ سـاڵ دەربەدەری، لە تەمەنـی نزیـک هەشـتا سـاڵیدا گەڕابـۆوە ئێـران. ئەنـدامی کـۆمیتەی ناوەنـدیی حزبـی تـودە بـوو. سـاڵی ١٩٨٣ لە شـاڵاوێکی تیرۆریسـتانەی کۆمـاری ئیسـلامیی ئێـران، لەگەڵ زۆرینەی سـەرکردەکانی حزبـی تـودە گیـران. ئەشـکەنجە دران و سـووکایەتییان پـێ کـرا. مامۆسـتا قزڵجـی و زۆربەی سـەرکردە دیلەکانی حزبی تودە، لە زینداندا شەهید کران.

شـەهید حەسـەنی قزڵجـی گـوڵێکی دەگمەن بـوو، لەسـەر تـاوێر ڕوابوو.

## ٤
## دامەزراندنی یەکێتیی نووسەران لە شاخ

لە ساڵی ١٩٨٠ ڕێژیمی بەعس بڕیاری دا یەکێتیی نووسەرانی کورد هەڵبوەشێنێتەوە و بیکات بە لقێکی یەکێتیی نووسەرانی عێراق. چونکە ئەو سەردەمە حزبی بەعس دەستی بەسەر یەکێتیی نووسەرانی عێراقدا گرتبوو. کەچی یەکێتیی نووسەرانی کورد گۆڕدرابوو بە سەکۆی دەربڕینی هزری ئازاد و بوێرانە. زۆربەی نووسەرانی کورد نەیاندەویست یەکێتییەکەیان ببێت بە لقێکی یەکێتیی نووسەرانی عێراق.

لە پایزی ١٩٨٠ چەند نووسەرێکی پێشمەرگەی حزبی شیوعی و یەکێتیی نیشتیمانی، لە نێوزەنگ بووین و لە ڕاگەیاندن کارمان دەکرد. هەندێک جار یەکترمان دەبینی، بەڵام هیچ کار و چالاکیی هاوبەشی ئەدەبی، لە نێوانماندا نەبوو. ئەو کاتە بیرۆکەی دامەزراندنی یەکێتییەک بۆ نووسەرانی شاخ سەری هەڵدا، بۆ ئەوەی پێکەوە هەندێک کار و چالاکیی هاوبەش بکەین. لە هەمان کاتدا بیسەلمێنین کە یەکێتیی نووسەران، هەر دەمێنێت و لە کار و چالاکیی خۆی بەردەوام دەبێت.

ئەو کاتە کۆمەڵێک نووسەر، هونەرمەند و ڕۆژنامەنووسی دیموکرات، ئازادیخواز و کۆمۆنیستی عێراقی، لە تیرۆری بەعس

هەڵاتبـــوون و لە لوبنـــان و ســـووریا گیرســـابوونەوە. ئەوان ڕێکخراوێکیان بە ناوی کۆمەڵەی نووسـەران و ڕۆژنامەنووسـان و هونەرمەنــدانی عێــراق (رابطــة الکتــاب والصــحفیین و والفنــانین العراقیین) پێک هێنابوو. چالاکانە کاریان دەکرد، گۆڤارێکی ئەدەبی و کولتـووری و کتێـب و نامیلکەیـان بـڵاو دەکـردەوە. بەشـێک لەو ڕووناکبیرانە، هـاوڕێم بـوون و لە بەغدا پێکەوە کارمـان کردبـوو. ئەوان نامەیەکیـان لە ڕێـگەی حزبـی شـیوعییەوە نـارد، بـۆ ئەوەی ئێمەیش لقێکـی ڕێکخـراوەکە لە شـاخ دابمەزرێنـین. مـن بە باشـم دەزانی لە شـاخ، ڕێکخراوێکی ئەدەبیمـان هەبێت، بەڵام لەگەڵ ئەوە نەبووم ئێمە لقێکی ئەو ڕێکخـراوە ئەدەبی و هـونەرییە بـین، کە لە دەرەوەی وڵات، پێک هێندرابوو. چونکە ئێمەش، وەکوو نووسەرانی شار، دەبووینە لقی ڕێکخراوی نووسـەرانی عێراقی، واتـا شـتێک بە ناوی یەکێتیی نووسەرانی کورد نەدەما.

پێکهێنانی ڕێکخراوێکی وەکوو یەکێتیی نووسـەرانی کوردسـتان، لە پێشـمەرگایەتیدا، هەر کـارێکی ئەدەبـی و ئیـداری نەبـوو، بەڵـکو سیاسییش بوو. چونکە ئێمە ئەندام و پێشمەرگەی حزبـی سیاسـی بووین، نەماندەتوانی خۆمان ئامێری چاپ بکڕین، گۆڤـار و کتێـب و نامیلکە چاپ بکەین و بۆ شار و شـارۆچکە و ئۆردوگـا و بنکەکـانی پێشمەرگەیان بنێرین. بۆیە پێش ئەوەی لەگەڵ نووسەرانی یەکێتیی نیشتمانی ئەو باسە بکەیـن و ڕێـک بکەویـن، ئەو مەسـەلەیەم لەگەڵ عومەر عەلی شێخ باس کرد. ئامـانج و لایەنە باشـەکانی ئەو کـارەم بۆ ڕوون کردەوە. هاوڕێ عومەر وا ناو دەبرا کە زۆر بە زەحمەت بڕیـار دەدا، کەچـی یەکسـەر دامەزرانـدنی یەکێتیـی نووسـەرانی بە باش زانی و بەڵێنی دا کە پشتگیری ئەو ڕێکخراوە بکەن.

لە کۆتـایی نـۆڤەمبەری ١٩٨٠ لەگەڵ شـاعیر ئەحـمەد دڵـزار،

سەردانی ڕاگەیاندنی یەکێتیی نیشتمانیمان کرد و لەگەڵ ئەرسەلان بایز و نووسەران حاجی مەمۆ و هەڤاڵ کوێستانی، دانیشتین. هەروا شاعیر و نووسەر ناسر حەفید، کە وەکوو نووسەرێکی سەربەخۆ لە شاخ بوو، بەشدار بوو. پێکەوە دۆخی سیاسی و ڕووناکبیریی کوردستان و دامەزراندنی ڕێکخراوێکی ئەدەبیمان لە شاخ باس کرد. ئەوانیش، ئەو کارەیان بە گرنگ و پێویست زانی. لەسەر کۆمەڵێک پرەنسیپ و شێوازی کار و سروشتی ڕێکخراوەکە ڕێک کەوتین. بڕیارمان دا ڕێکخراوێکی ئەدەبی دابمەزرێنین، بۆ ئەوەی بتوانین کەشوهەوایەکی ئازادانە بۆ نووسین و داهێنان و بڵاوکردنەوەی کاری ئەدەبی لە شاخ برەخسێنین. پێوەندی لەگەڵ نووسەرانی کور، لە شارەکان و نووسەران و ڕووناکبیرانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، دروست بکەین.

لەو دانیشتنەدا منیان ڕاسپارد بانگەوازی دامەزراندنی (یەکێتیی نووسەرانی کوردستان) بنووسم، بۆ ئەوەی لە کۆبوونەوەی داهاتوودا، بڕیاری لەبارەوە بدەین. دوای چەند ڕۆژێک، لە دانیشتنی دووەمدا، لە ٣-١٢-١٩٨٠ بانگەوازەکە، پاش ئاڵوگۆڕکردنی چەند وشە و ڕستە، بە کۆی دەنگ پەسەند کرا و دامەزراندنی یەکێتیی نووسەرانی کوردستان ڕاگەیەندرا. بڕیارمان دا لە ڕێگەی ڕێکخستنی تایبەتی خۆمانەوە، بانگەوازەکە بۆ شار و بنکەکانی پێشمەرگە بنێرین. هەروا هەندێک بنەما و شێوازی کارکردن و بەڕێوەبردنی ڕێکخراوەکەمان دیاری کرد، لەوانە:

- ڕێکخراوەکە ناوی (یەکێتیی نووسەرانی کوردستان)ی لێ نرا، بۆ ئەوەی نووسەرانی نەتەوەکانی تری کوردستانیش، کە لە شاخن، یان دواتر دێنە شاخ، ئەگەر بیانەوێت، بتوانن ببن بە ئەندام.
- ڕێکخراوەکە سەربەخۆ بێت، نەبێتە بەشێک لەو کێشە سیاسی

و عەسکەرییانەی لە شاخ، لەنێوان لایەنە سیاسییەکاندا هەن.

-تەنیا ئەو کەسانە ببن بە ئەندامی ڕێکخراوەکە کە نووسەر (ئەدیب)ن، واتا چیرۆکنووس، شاعیر، شانۆنووس، وەرگێری ئەدەبی و ڕەخنەگری ئەدەبی.

- گۆڤارێکی تایبەت بە ڕێکخراوەکە دەربکرێت، کتێب و نامیلکەی ئەدەبی، لە لایەن یەکێتیی نووسەرانەوە بڵاو بکرێنەوە.

-ئەرکی چاپ و بڵاوکردنەوەی گۆڤارەکە و کتێب و نامیلکەکان بە هاوبەشی بێت، هەر جارەی لایەنێکمان ئەرکی تایپکردن و چاپکردنی هەر ژمارەیەکی گۆڤارەکە بگرێتە ئەستۆ. کتێب و نامیلکەکانیش ئەو لایەنە سیاسییە چاپی بکات، کە نووسەرەکەی کاریان لەگەڵ دەکات.

لەو کۆبوونەوەیەدا، دەستەیەکی بەڕێوەبردن، لە چوار کەس، پێک هێندرا: ئەحمەد دڵزار، حاجی مەمۆ، هەڤاڵ کوێستانی و ڕەفیق سابیر. هەر ئەو دەستەیەش بوو بە دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکە. بۆ ئەوەی خۆمان لە گرفتی لاوەکی لا بدەین، باسی سەرۆکی ڕێکخراوەکە و سەرنووسەری گۆڤارەکەمان نەکرد. لەجیاتیان بڕیامان دا کار و بڕیارەکانمان بەکۆمەڵ بێت.

لە ئایاری ١٩٨١ دا شاعیر و نووسەر حەمەی حەمە باقی هاتە نێوزەنگ، لە لای یەکێتیی نیشتمانی مایەوە. هەر زوو هاتە دەستەی بەڕێوەبردنی یەکێتیی نووسەران و دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکە، چالاکانە لەگەڵ ئێمە کەوتە کارکردن. هەروا شاعیر و نووسەر ناسر حەفید، تا لە شاخ بوو، لە دامەزراندنی یەکێتیی نووسەران و گۆڤارەکەدا، بەشداریی کردین.

کۆمەڵێک نووسەر، بە تایبەت لە شاری سلێمانی، بە گەرمی پێشوازییان لەو کارە کرد. هەر زوو، لە ڕێگەی ڕێکخستنەکانی

یەکێتیی نیشتمانییەوە، پێوەندییان پێوەکردین، بە ناوی خوازراوەوە بەرهەمی ئەدەبیی خۆیان، بۆ ناردین. لەوانە شێرکۆ بێکەس، دڵشاد مەریوانی، ڕەئووف بێگەرد، و نووسەری تر. ئەو کۆمەک و پشتگیرییەی ئەوان، ئێمەی لە دروستیی کارەکەمان دڵنیاتر کرد.

لیژنەی بەڕێوەبەری یەکێتیی نووسەران، چەند کۆبوونەوەیەکی تری کرد، ژمارەی یەکەمی گۆڤاری یەکێتیی نووسەرانی کوردستان لە ئاداری ١٩٨١ بە ناوی (پێرو) چاپ و بڵاو کردەوە. دواتر ناوی گۆڤارەکە گۆڕدرا بە (نووسەری کوردستان).

یەکێتیی نووسەرانی کوردستان، لە ماوەیەکی کورتدا، خۆی ناساند. پرۆژەی پێڕەوی ناوخۆی یەکێتی، نووسرایەوە. ژمارەی یەکەمی گۆڤاری (نووسەری کوردستان) لە ئابی ١٩٨١ لە ڕاگەیاندنی ئێمە چاپ کرا و بڵاو کرایەوە، کە لە چاو (پێرو)دا بەپێزتر و کامڵتر بوو. نووسەری تری شاخ و شار (بە ناوی خۆیان، یان ناوی خوازراو) بەشدارییان تێدا کردبوو. هەروا چەند کتێب و نامیلکەیەک بۆ بڵاو کردنەوە ئامادە کران. ویستمان پێوەندیی لەگەڵ نووسەران و ڕووناکبیرانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، کە لە شاخ بوون، ببەستین. لەگەڵ چەند ڕووناکبیری کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی ئێران، کە هاتبوونە نێوزەنگ، کۆ بووینەوە. ڕێککەوتین پێکەوە هەندێک کۆڕ و سێمینار، لە چەند ناوچەیەکی ئازادکراوی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، ڕێک بخەین. دوای چەند هەفتە حەمەی حەمە باقی پێی وتم، برادەرانی کۆمەڵەی ئێران وتوویانە نامانەوێ مامۆستا دڵزار و ڕەفیق سابیر بەشدار بن، چونکە ئەوان شیوعین. من ئەو قسەیەم بە ئاسایی وەرگرت، وتم جا چی تێدایە ئێمە بەشدار نابین، گرنگ ئەوەیە ئەو کۆڕە ئەدەبییانە لەو ناوچانە بکرێن.

کاکه حەمه وتی نا، ئێمه چۆن به بێ ئێوه دەچین! ئەوانه خۆیان به چی دەزانن، تا مەرجمان بۆ دابنێن.

له کاتی نووسینەوەی ئەم چەند دێڕەدا، ڕووداوێکی تری لەو جۆرەم بیر کەوتەوە، که خراپ نییه باسی بکەم، چونکه هەردوو ڕووداوەکه پێوەندییان به یەکێتیی نووسەرانەوە هەیە، هەروا هەردووکیان بەرهەمی یەک کولتووری سیاسی، یەک جۆره شێوازی بیرکردنەوه بوون.

له ژمارەی یەکەمی (نووسەری کوردستان)دا سەلاحەدینی موهتەدی، وتارێکی لەبارەی هۆنراوەی (خەوەبەردینه)ی شاعیر سوارەی ئێلخانیزاده نووسیبوو، که لەگەڵ شیعرەکە، بڵاو کرایەوە. دوای دوو هەفته عومەر عەلی شێخ، یان فاتیح ڕەسووڵ، پێی وتم، برادەرانی حزبی تودەی ئێران گلەییمان لێ دەکەن. له نامەیەکدا نووسیویانه چۆن ئێمه ڕێگامان داوه له گۆڤاری (نووسەری کوردستان)دا، نووسینی کەسێک بڵاو بکەینه، که دژی حزبی توده و شۆرشی ئێرانه.

من پێکەنیم، پێم سەیر بوو ڕێبەرایەتیی حزبی توده ڕێگه بەخۆی دەدات، تا ئەو ڕادەیه دەست بخاته کاروبارمان!. وا دیار بوو گەلانی ئێران گرفتێکیان نەمابوو لەو وتارەی کاک سەلاح و گۆڤاری نووسەری کوردستان گرنگتر بێت، تا سەرکردایەتیی حزبی توده خۆی پێوه ماندوو بکات!

تا کۆتایی تەمووزی ١٩٨٢ که کوردستانم بەجێ هێشت، ئەو بەرهەمه ئەدەبییانەی نووسەرانی شار، که به ناوی نهێنییەوه دەنێردران، به هۆی ڕێکخستنەکانی یەکێتیی نیشتمانییەوه دەگەیشتن. دیاربوو ئەو نووسەرانه پێوەندییان بەوانەوه هەبوو. باکیان نەبوو ئەگەر ناردنی ئەو بەرهەمانەیان ئاشکرا بێت، چییان

بەسەر دێت. زۆرم پێ سەیر بوو، برادەرانی یەکێتیی نیشتمانی، ناوی ڕاستەقینەی ئەو نووسەرانەی بەرهەمیان ناردبوو، دەوت!.

تا لە شاخ بووم، یەک بەرهەمی ئەدەبیی هیچ نووسەرێکی ئەندام، یان دۆستی حزبی شیوعی، لە شارەکانەوە نەگەیشت. من لەم دیاردەیە هەم نیگەران بووم، هەم هەستم بە کەمایەسی دەکرد. نیگەران بووم چونکە پێوەندیی حزبی شیوعی، لەگەڵ نووسەرانی دۆست و ئەندامی حزبی شیوعی، بەو جۆرەی لێ هاتووە. هەستم بە کەمایەسییش دەکرد، چونکە لەناو شارەکاندا نووسەرێکمان نەبوو، شیعرێک، یان نووسینێکمان بۆ بنێرێت.!

ئێمە، وەکوو یەکێتیی نووسەرانی کوردستان، لە دۆخێکی سیاسیی نەخۆش، پڕ لە ناتەبایی و شەڕدا، کارمان دەکرد. گرفتەکان بە ئاسانی ناکۆکییان لێ دەکەوتەوە، ناکۆکییش شەڕی دەنایەوە. ئەندامانی لیژنەی بەڕێوەبەری یەکێتیی نووسەران، لە ڕووی فیکری، سیاسی و تێڕوانیی ئەدەبییەوە جیاواز بووین، بەڵام لەناو خۆماندا گونجاو بووین. لەو ماوەیەدا هیچ گرفتێک لە نێوانماندا دروست نەبوو. ئێمە وەکوو کۆمەڵێک برادەر و تیمێکی یەکسان و هاوئامانج کارمان دەکرد. لە کارەکانماندا متمانەمان بە یەکتر هەبوو، مەبەستمان بوو مۆدێلێکی باشی هاریکاری و پێکەوەهەڵکردن بخەینە ڕوو. باوەڕبوون بە ئازادیی نووسین، ڕێزگرتن و قبووڵکردنی یەکتری و هەستکردن بە بەرپرسیاری، بنچینەی کارمان بوون. بۆیە کێشەی سیاسی، لە کار و پێوەندیی نێوانماندا، ڕەنگی نەدایەوە. بەڵام دواتر، لە بەهاری ١٩٨٣ کاتێک شەڕ لە نێوان حزبی شیوعی و یەکێتیی نیشتمانی هەڵگیرسا، فەزای داهێنان و پێکەوەهەڵکردن شەڕاوی کرا، دووبەرەکی کەوتە نێو نووسەران. یەکێتیی نووسەرانی کوردستان ڕاکێشرایە ناو

شـــه‌ڕه‌كه‌، وه‌كـــوو بلێنـــدگۆ و ڕێكخراوێكـــی یه‌كێتیـــی نیشـــمانیی كوردســـتانی لـــێ هـــات. ئه‌و نووســـه‌رانه‌، له‌به‌ر خۆیـــان، نه‌ده‌بـــوو كێشـــه‌ی حزبـی بهێننه نێـو یه‌كێتیی نووسـه‌ران، چـونكه ئه‌و كـاره پـێچه‌وانه‌ی پرینسـیپ و پێـڕه‌وی نێوخـۆی یه‌كێتیـی نووسـه‌رانی كوردستان بوو، هه‌روا بۆخۆشیان باش نه‌بوو.

ســـاڵی ١٩٩٦ له دیمـــانه‌یه‌كی ئه‌ده‌بیـــدا، له وه‌ڵامـــی پرســـیارێك له‌باره‌ی شیعر و ئه‌زموونی پێشمه‌رگایه‌تی و شاخ، وتوومه:

(كاتێك بوومه پێشمه‌رگه به هیوا بووم نه‌ك ته‌نیا من بتـوانم، وه‌كـــوو نویســـكارێك، خزمه‌تێـــك به (شـــۆڕش) و وڵاته‌كه‌م بـــكه‌م، به‌ڵكو پێم وا بوو، له سایه‌ی (شۆڕش)دا، ئه‌زموونی شیعریی منیش ده‌وڵه‌مه‌نـــدتر ده‌بێـــت، واته (شـــۆڕش)یش ته‌كانێـــك به ئه‌زمـــوونی شـــــیعری و داهێنـــــانی مـــــن ده‌دات. مێـــــژووی ئه‌ده‌بـــــی گه‌لانـــــی ڕزگاریخواز، زۆر نموونه‌ی گرنگ و پۆزه‌تیڤی له‌م باره‌یه‌وه پێشان داوه. به‌ڵام خه‌بـــاتی چه‌كـــداری، له باشـــووری كوردســـتاندا، به درێژایی زیاتر له سی ساڵ، نه‌یتوانی گه‌شه‌یه‌ك به ئه‌ده‌بی كوردی بدات و ته‌نانه‌ت نیمچه ئه‌ده‌بێكی شۆڕشگێڕ، به مانا هونه‌رییه‌كه‌ی، بێنێته به‌رهه‌م. ئه‌وه‌ش خۆی ناوه‌ڕۆكی (شۆڕش)ه‌كه ده‌خاته ژێر پرسیار. ئایا ئه‌و خه‌باته چه‌كدارییه، شۆڕش بوو، یان بزاڤێكی چه‌ته‌گه‌ری، خێڵه‌كـــی و دواكه‌وتـــوو، كه له ســـایه‌یدا نه فیكـــر، نه شارستانه‌تی، نه كولتوور و شیعر جێیان ده‌بۆوه؟[1]

---

1- هه‌ر شیعرێك ڕه‌نگێكی تایبه‌ته، ئاماده‌كردنی: سیروان ڕه‌حیم، ڕۆژنامه‌ی وڵات، ژ. ٦٧ ساڵی دووه‌م ١٩٩٧، به كرمانجی و تیپی لاتینی- هه‌روا ڕه‌فیق سابیر، ڕوانین به ڕووناكیدا، سه‌رچاوی پێشوو.

## ١
## لە بەرانبەر زەماوەندی خوێندا

کاتێک ڕووم لە شاخ کرد، کێشە و ناکۆکیی نێوان یەکێتیی نیشتمانی و قیادە موەقەتەی پارتی دیموکراتی کوردستان، لەوپەڕی توندیدا بوو. زۆر نەبوو کارەساتی هەکاری ڕووی دابوو. یەکێتیی نیشتمانی دەیوت، قیادە موەقەتەی پارتی، بە کۆمەکی ئێران و تورکیا دەیان پێشمەرگەی یەکێتیی شەهید کردوون، چەندانی تری بە دیلی کوشتوون. بەشێکی زۆریشی ناچار کردوون خۆیان ڕادەستی حکومەتی عێراق بکەنەوە. کورد دەڵێت شەڕ بە کۆنەقین دەکرێت. ئەو شەڕە لە ناوەرۆکدا، درێژەپێدانی شەڕی مەلایی و جەلالی بوو.

لە ئەنجامی کارەساتی هەکاری، بزووتنەوەی سۆشیالیستی، کە باڵێکی ناو یەکێتیی نیشتمانی بوو، دوو سەرکردەی ناسراوی لەدەست دا. لەوانە دوکتۆر خالید سەعید و عەلی عەسکەری، کە بە دیل گیران و شەهید کران. دوای ئەوە لە کۆتایی ١٩٧٨ بەشێکی بزووتنەوەی سۆشیالیستی، کە ڕەسووڵ مامەند بەرپرسیان بوو، لەگەڵ پێشمەرگەکانی، لە یەکێتیی نیشتمانی جیا بوونەوە. بارەگایان بردە گۆڕەشێر، کە لە خڕی نێوزەنگ دوور نەبوو.

هەر جیابوونەوەیەکی حزبی، لە عێراق و ناوچەکە ڕووی دابێت،

به دوژمنـــایەتی تەواو بـــووە. ســـەرەتا هەردوو لایەن، یەکێتیـــی نیشتمانی و بزووتنەوەی سۆشیالیست، کە دواتر ناوەکەی گۆڕدرا بە حزبی سۆشیالیسی کوردستان، بە توندی شەڕی ڕاگەیاندنیان لە دژی یەکتـر دەسـت پـێ کـرد. بەخێرایـی شـەڕەکە گـۆڕدرا بە شەڕی چەکداریی نێوان هەردوو لایەن.

لەو دۆخە ناسکەدا حزبی شیوعی، دوای شەش ساڵ هاوپەیمانی لەگەڵ بەعس، ڕاونراو و تێکشکاو، ڕووی لە شاخ کرد. دەیەویست لە چیاکانی کوردستان خۆی کۆ بکاتەوە، تا بتوانێت بە شێوازی چەکـداری، بەرەنگـاری دەسـەڵاتی بەعـس و دیکتاتۆریـا ببێـتەوە. سـەرکردایەتیی حزبـی شـیوعی بڕیـاری دابـوو بێلایەنـانە، لەگەڵ کێشـە و نـاکۆکیی نێـوان ئەو سێ هێـزە بەشـەڕهاتووە، یەکێتـی، پارتی و سۆشیالیست، ڕەفتار بکات. هەوڵی نێوانگیری بدات، بۆ ئەوەی شەڕەکە ڕابگیرێت و تەباییەک لەنێوان هەمواندا دروست ببێت. سەرەتا ئەوە سیاسەتی حزبی شیوعیی عێراق بوو لە شاخ.

حـزبە کوردسـتانییەکان، هەموویـان هیوایـان بە حزبـی شـیوعی بوو، کە لەو بوارەدا ڕۆڵێکی گرنگ ببینێت. لە هەمان کاتدا پارتی و یەکێتی، مەبەسـتیان بـوو حزبـی شـیوعی بەلای خۆیاندا ڕابکێشـن. چـونکە وەکـوو حزبێکـی عێراقـی، شـوێن و پـێگەی لە نـاوچەکە و لەنــاو بــزووتنەوەی نیشــتمانیی عەرەبــدا، دیــار بــوو. لە ئاســتی نێودەوڵەتیشـــدا، پێوەنـــدیی لەگەڵ یەکێتیـــی ســـۆڤیەت و وڵاتـــانی سۆشیالیستی بەتین بوو. ئەوان لە ڕووی سیاسـی و ئابوورییەوە کۆمەکیان پێ دەکرد. بزووتنەوەی چەکداریی کورد، پێویستی بەوە هەبوو پێوەندیی لەگەڵ هێزە ئازادیخوازەکانی ناوچەکە و وڵاتانی سۆشیالیستی هەبێت. بە کورتی حزبی شیوعی سێ خاڵی بەهێزی هەبوو، کە دەکرا سوودی لێ ببینێت:

یەکەم، حزبێکی بە ئەزموونی عێراقی بوو، پێگەی لە کوردستان بەهێز بوو، لە شارەکانی عێراق ڕێکخراوی نهێنیی هەبوو.
دووەم، پێوەندیی فراوانی عەرەبی و ناوچەیی و جیهانیی هەبوو، بە تایبەت لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەت و وڵاتانی سۆشیالیستی و بزاڤی ئازادیخوازی عەرەبی، وەکوو باس کرا.
سێیەم، بەشێک نەبوو لە شەڕ و کێشەی نێوان ئەو هێزە سیاسییانەی کوردستان.
لەبەر ئەو هۆکارانە، سەرەتا هەموو لایەنە سیاسییەکان و حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانیش، کە کێشەی لەگەڵ پارتیدا هەبوو، وەکوو ناوبژیوانێکی بێلایەن بۆیان دەڕوانی. گوێیان لە ڕەخنە و پێشنیار و سەرنجی دەگرت. چەندان پێشمەرگەی دیلی پارتی، یەکێتی، سۆشیالیست و حزبی دیموکراتی ئێران، بە داوای حزبی شیوعی ئازاد و ئاڵوگۆڕ کران.
بەڵام لە بەرانبەر ئەو سێ خاڵە بەهێزەدا، حزبی شیوعی لە شاخ، لانی کەم سێ خاڵی لاواز، یان سێ گرفتی هەبوو:

**یەکەم- گرفتی سەرکردایەتی**

زۆرینەی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و کۆمیتەی ناوەندیی حزبی شیوعی، لە پەنجاکان و شەستەکانی سەدەی پێشووەوە، ڕابەرایەتیی حزبیان دەکرد. دوای شۆڕشی ١٤ی تەمووز، باشترین دەرفەتیان بۆ ڕەخسا دەسەڵات بگرنە دەست، بەڵام نەیان کرد. ساڵی ١٩٦٣ حزبی بەعس بە کودەتایەکی خوێناوی دەسەڵاتی زەوت کرد، بە توندی پەلاماری حزبی شیوعی دا. هەمان سەرکردایەتی، لە ساڵی ١٩٧٣ بەرەیەکی سیاسیی بە ناوی (بەرەی نیشتمانی و نەتەوەیی پێشکەوتنخواز) لەگەڵ حزبی بەعس پێک

هێنا، کە ساڵی ۱۹۷۹ کۆتایی هات. پاش ئەو زنجیرە شکستە، چەند کەسی هەمان سەرکردایەتی، کرانە بەرپرسی خەباتی چەکداری لە کوردستان.

ئەو ساڵانە کوردستان لەناو ژانی سێ شەڕدا دەتلایەوە، شەڕی دەوڵەتی عێراق و کورد، شەڕی نێوخۆی هێزە چەکدارەکانی شاخ، شەڕی عێراق و ئێران، کە لە ئەیلولی ۱۹۸۰ دەستی پێ کرد. سەرکردایەتیی خەباتی چەکداری بە حەوت هەشت ئەندامی شەکەت و بەساڵداچووی کۆمیتەی ناوەندی و مەکتەبی سیاسی سپێردرا بوو، کە هەموویان کورد و کلدۆ ئاشووری بوون. ئەندامانی تری کۆمیتەی ناوەندی و مەکتەبی سیاسی، تاکوتەرایان بە نهێنی لەناو شارەکان مابوونەوە. زۆربەیان بۆ دەرەوەی وڵات چووبوون. هەندێکیان جار بە جار، وەکوو گەشتیار، بۆ ماوەیەکی کورت، دەهاتن بۆ شاخ و دەگەڕانەوە دەرەوەی وڵات. زۆربەیان خەباتی چەکدارییان بە گرینگ نەگرتبوو، یان باوەڕیان پێی نەبوو، بەڵام لە ناچاری، بە فشاری دۆخی سیاسی و پێشمەرگە و کادیرانی هەرێمی کوردستان، ئەو شێوە خەباتەیان قبووڵ کردبوو. ئەندامانی سەرکردایەتیی حزبی شیوعی لە کوردستان، کەسانی دڵسۆز بوون، بەڵام کەمتوانا و کورتبین بوون. زۆربەی ژیانی سیاسییان لە کاری نهێنی، یان لە شاخ و گوند، دوور لە خەڵک و کولتووری شار، بەسەر بردبوو. بۆیە بیرکردنەوە و لێکدانەوە و پێشبینییان، هێندەی ئاستی سنوورداری ئەو ژینگە و فەزا تەسکەی لێ هاتبوو، کە تیایدا ژیابوون.

لەناو حزبی شیوعی و ڕەنگە حزبەکانی کوردستانیشدا، هەندێک کەس لەبەر توانا، شارەزایی و لێهاتووییان نەکرابوون بە ئەندامی سەرکردایەتی و کاری گرینگیان پێ درابوو، بەڵکو لەبەر لاوازی،

دەستەبەندی و گوێڕایەڵیی کوێرانە، یان بەهۆی جاسووسیکردن بەسەر هاوڕێکانیانەوە، خرابوونە ئەو شوێنە.[1]

ئەو هاوڕێیانە، لە ڕووی سیاسی، هزری و خوێندەوارییەوە، لەچاو زۆرینەی سەرکردە عەرەبەکانی ناو حزبی شیوعی، کۆلکەخوێندەوار بوون. پێنج کەسیان تەنانەت قۆناخی خوێندنی سەرەتایی، یان ناوەندییان تەواو نەکردبوو. توانای لێکدانەوە، پێشبینی و مناوەرەکردنیان زۆر کەمبوو. بە باشی بیریان لە عاقیبەتی بڕیار و کارەکانیان نەدەکردەوە. ئەوان ڕاهاتبوون لە سەرووی خۆیانەوە بڕیاریان بۆ بێت و وەکوو سەرباز جێبەجێی بکەن. بۆیە لە هونەری بڕیاردان شارەزا نەبوون. هەروا ئەو بەڕێزانە سەرکردەی مەیدانی و هەڵسوڕاو و شارەزای کاروباری پارتیزانی نەبوون، بۆ ئەو کات و شوێنە نەدەگونجان. چونکە لەتوانایاندا نەبوو، لێهاتووانە و سەرکەوتووانە، سەرکردایەتیی خەباتی چەکداری و هێزی پێشمەرگەی حزبی شیوعی بکەن، کە لە سەرەتادا هەتا شەڕی پشتئاشان، بەردەوام لە فراوانبووندا بوو.

---

1- بەهادین نووری لە بیرەوەرییەکانیدا باسی ئەندامێکی کۆمیتەی ناوەندی دەکات، کە جاسوسیی بەسەرەوە کردووە. ئەو کارە لەگەڵ منیش دەکرا، ماوەیەک نامەکانم دەخوێندرانەوە. زۆر تووڕە بووم و پرۆتێستم کرد. لە سەرەتای ١٩٨٩ لە سوریا ئەندامی لیژنەی ڕاگەیاندنی حزبی شیوعی بووم، ڕۆژێک لە کۆبوونەوەدا باسی چەند کێشە و ناتەواویی سەرکردایەتیی حزب کرا. هاوڕێ فەخری کەریم، کە بەرپرسی لیژنەکە بوو، پێی وتم هەمووی خەتای تۆیە. من قسەکەم بە سوعبەت زانی، وتم دیارە خەتای منە! کەچی ئەو وتی بەڕاستمە. من حەپەسام، پرسیم مەبەستت چییە؟ وتی لە کوردستانەوە هاوڕێیان، لە نامەیەکدا نووسیبوویان، کە تۆ لەناو پێشمەرگە وتووتە، ئەو سەرکردانەی لەوێن، بۆ ئەوە باشن لەو دۆڵەدا گوللەباران بکرێن. دوای ئەوە، بۆ سوعبەت، بە پێکەنینەوە وتی: بۆ ئەوانەت لەکۆڵ حزب نەکردەوە؟

لە شاخ بە ئاشکرا ڕەخنە لە سەرکردایەتیی حیزب دەگیرا، منیش ڕەخنەم دەگرت. بەڵام گوللەبارانکردنی سەرکردایەتیی حزب، بوختانێک بوو پاشملە بۆم هەڵبەسترابوو.

ئەو پێشـمەرگە گەنـج، خوێنگەرمـانە، دەیانەویسـت لە ئـازایەتی و نەبەردیـدا، لە پێشـمەرگەکانی کـۆمەڵەی ڕەنجـدەران چـالاکتر بـن، بـۆیە پێویسـتیان بە سـەرکردەی مەیـدانی هەبـوو، کە لە گەڕان بە ناوچەکـان و چـالاکیی سـەربازیدا، لەگەڵیـان بـن، ورە و هیـوا و ئەزموونیان پێ ببەخشن. ئەو سەرکردانە، خۆیان ئەهلی ئەو کارە نەبـوون، نەشـیان دەهێشـت، لە ترسـی لەدەسـتدانی پـێگە و ئیمتیازاتیان، سەرکردەی سیاسی- مەیدانیی لاو دەربکەون. ئەوان هێندە بە خەباتی چەکداری نامۆ بوون، کە بۆ نموونە کەسێکیان، جگە لە بەهـادین نـووری، لەخـۆی ڕانەدی لەگەڵ پێشـمەرگەدا، بە گوندەکانی کوردستاندا بگەڕێت و تێکەڵاوی خەڵک ببێت، یان لەگەڵ پێشمەرگەکاندا چالاکیی سەربازی بکات. پێشمەرگەکان ئەوەیان بە کەمایەسـیی دەزانـی. ئەوان دەیـانبینی چەنـدان ئەنـدامی سـەرکردایەتیی کـۆمەڵە و یەکێتـی و سۆشیالیسـت، شانبەشـانی پێشـمەرگەکانیان، لە گەرمیـانەوە تـا دەشـتی هەولێـر، دەگەڕێـن و بەشـداریی چـالاکیی سـەربازیی دەکەن، هەنـدێکیان لەگەڵ پێشـمەرگەکان برینـدار و شـەهید دەبـن. کەچـی زۆریـنەی سـەرکردایەتیی حزبـی شـیوعی لە دەرەوەی وڵاتـن، یـان لەسـەر سنووری ئێران خۆیان مەڵاس داوە، چاوەڕێ دەکەن کەی نۆرەیان بێت، بۆ چارەسەری پزیشکی، یان کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندی، بچن بۆ سووریا، یەکێتیی سۆڤیەت و وڵاتانی سۆشیالیستی، چوار مانگ زیاتر لە دەرەوەی وڵات بمێننەوە.

بەشـێک لەو هاوڕێیـانە بە عەقڵیەتـی سـاڵانی شەسـتەکان، بـۆ نـاکۆکیی نێوان پـارتی و یەکێتییـان دەڕوانـی. ئەو سـاڵانە حزبـی شیوعی، لە کێشە و شەڕی نێوان هەدوو باڵی پارتیدا، لایەنـی بـاڵی مەلا مستەفای گرتبوو، دژایەتیی بـاڵی مەکتەبی سیاسـیی کردبوو.

چەند ئەندامی سەرکردایەتی لە سەرەتاوە ویستیان حزبی شیوعی بە لای پارتیدا بەرن. بۆ نموونە لە کۆتایی مانگی نیسانی ١٩٧٩ هەموو هێزی چەکداری ئێمە لە سەد پێشمەرگە زیاتر نەبوو. لە خڕی نێوزەنگ، لە نزیک بارەگای مەکتەبی سیاسیی یەکێتی بووین. تەنیا یەک بارەگا و پازدە بیست پارچە چەکمان هەبوو. لەو دۆخەدا بەهادین نووری و ئەحمەد بانیخێلانی لە تاران، ڕێککەوتننامەیان لەگەڵ سکرتێری قیادە موەقەتەی پارتی، سامی عەبدولڕەحمان، ئیمزا کرد، بێ ئەوەی حیساب بۆ کێشە و شەڕی نێوان قیادە موەقەتەی پارتی و یەکێتیی نیشتمانی بکەن، کە جۆگەلەی خوێن لە نوانیاندا بوو. لە ڕێککەوتننامەکەدا هاتبوو:

١-حزبی شیوعی مەفرەزەیەک بنێرێ بۆ بادینان.

٢-هاوکاری لەگەڵ پارتی بەهێز بکەن.

٣-پارتی لە هاتوچۆکردن بە ئێراندا، یارمەتیی حزبی شیوعی بدات.

دواتر مەکتەبی سیاسی، بە نامەیەک، کە بۆ کوردستانی نارد، ڕێککەوتنەکەی ڕەت کردەوە، چونکە بە بێ ڕەزامەندیی ئەوان کرابوو.

بە کورتی ئەو هاوڕێیانە، بۆ ڕابەریکردنی بزاڤی چەکداری گونجاو نەبوون. لە ڕووی سیاسییەوە کورتبین، لە بواری سەربازی و مەیدانییەوە دەستوپێ سپی بوون. بە عەقڵییەتێکی فەلاحی، تەسک و دواکەوتووانە بیریان دەکردەوە. سەریان لە دۆخی سیاسی و عەسکەریی فرەئاڵۆز و فرەناسک و پڕ کێشەی ئەو ڕۆژانەی کوردستان دەرنەکرد، گوێشیان لە کەس نەدەگرت، بۆیە زوو سەرەتای شکستی ئەوان دەرکەوت.

**دووەم: دژایەتی ئایدیۆلۆجی:**

زۆربەی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی، هەڵویستێکی توندیان بەرانبەر بە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان هەبوو، کە بڕبڕەی پشتی یەکێتیی بوو، چونکە ڕێکخراوێکی مارکسی لینینی (ماوی) بوو. بەپێی تێزێکی ستالین، دەبوو لە هەر وڵاتێکدا، تەنیا یەک ڕێکخراوی مارکسی- لینینی هەبێت. ئەگەر ڕێکخراوی دووەم دەرکەوت، بە لەڕێلادەر دادەندرێت و دەبێت دژایەتیی بکرێت.

کورد دەڵێت، دوو دەروێش پێکەوە لەسەر بەرماڵێک جێگایان دەبێتەوە، کەچی دوو پاشا لە وڵاتێکدا ناحەوێنەوە.

بەپێی ئەو عەقڵییەتە، لە عێراقدا، بە کوردستانیشەوە، جێگای دوو حزبی مارکسی-لینینی نەدەبۆوە! دەبوو یەکێکیان مەیدانەکە چۆڵ بکات. دوو جار لەناو حزبی شیوعیدا، بەشێکی کادیرە کوردستانییەکان، داوایان کرد کە ڕێکخراوی هەرێمی کوردستان، وەکوو حزبێک کار بکات و سەربەخۆیی ڕێکخراوەیی و سیاسیی هەبێت و هاوپەیمانی حزبی شیوعیی عێراق بێت. بەڵام سەرکردایەتیی حزبی شیوعی، بێ ئەوەی هیچ دایەلۆگێکی فیکری، ئایدیۆلۆجی و سیاسییان لەگەڵ بکەن، بە لادەر، دوژمنی حزب و ئامرازی لایەنی تر، تومەتباریان کردن. جاری یەکەم لە ساڵی ١٩٥٧ بوو، جاری دووەمیش دوای ڕاپەڕین بوو. لە ساڵی ١٩٩٢ بەزەبری فشاری هێزێکی چەکداری، کە هەندێکیان کۆنەبەعسی بوون، شیوعییە کوردستانییەکان لە بارەگای حزبی شیوعی لە هەولێر دەرپەڕاند. ئەگەر ئەندامانی سەرکردایەتیی حزبی شیوعی لەگەڵ کادیر و پێشمەرگە و ڕۆشنبیری ناو حزبەکەی خۆی، هێندە توندە و نامەسئولانە ڕەفتار بکەن، چۆن دەتوانن کۆمەڵەیەکی مارکسی لینینی، کە ڕەوتێکی ماویستیی هەبوو، قبووڵ بکەن؟!.

زۆربەیان کۆمەڵەیان بە نەیار دەزانی. بە تایبەت کە دەیانبینی زۆرینەی گەنجی مارکسیی کوردستان، ڕوویان لە کۆمەڵە کردبوو. تەنانەت هەندێک لەو گەنجانە، بە بنەماڵە لەگەڵ حزبی شیوعی بوون، کەچی ئەوان چووبوونە ڕیزی کۆمەڵە.

لەو کاتانەدا، کە شەڕی نێوان یەکێتی لەگەڵ پارتی و سۆشیالیست زۆر توند بوو، ئەو هەڵوێستە ئایدیۆلۆجییە تەسکە، بەرانبەر بە کۆمەڵە، کە هێزی سەرەکی ناو یەکێتی بوو، دەرفەتی بەو هاوڕێیانە نەدەدا، بە جۆرێکی سیاسییانە، بۆ کۆمەڵە بڕوانن. وەکوو دیاردەیەکی نوێی سیاسی کە هەیە، تێی بگەن و پراگماتییانە ڕەفتاری لەگەڵ بکەن، لە شەڕی نێوان پارتی و یەکێتیدا بێ لایەن بمێننەوە.

لە هەمان کاتدا، لەناو کۆمەڵەش بەشێک لە سەرکردەکانیان، کە بە عەقڵییەتێکی سیاسیی ماویستی و توندڕەوانە بیریان دەکردەوە، حزبی شیوعییان بە نەیار و لادەر لە مارکسیزم دادەنا، وەکوو ئەوەی لە کوردستان، ئەوان مەرجەعی "فەتوا"ی ئایدۆلۆجیای مارکسیزم بن. بۆیە پێشمەرگەکانیان بە ڕقبوونەوە لە حزبی شیوعی پەروەردە دەکرد. ئەوان، کە چەکیان لە دژی ڕێژیمی عێراق هەڵگرتبوو، پارتییان بە دوژمنی سەرەکیی گەلی کورد دەزانی و شەڕی ئەوانیان بە ڕەوا دادەنا و دەیانویست حزبی شیوعی وەکوو ئەوان بۆ پارتی بڕوانێت.

بەشێکی سەرکردایەتیی کۆمەڵە ویستیان لە حزبی شیوعی نزیک ببنەوە. فاتیح ڕەسووڵ باس دەکات، کە ئێوارەی ١١-٦-١٩٨٠ نەوشیروان مستەفا چۆتە لای پێی وتووە کە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، بەتایبەتی کۆمەڵە، حزبی شیوعی بە نزیکترین دۆستیان دەزانن و خۆیان بە جێگری ئەو حزبە دانانێن. ئامادەن

پێوەندییان لەگەڵ حزبی شیوعی عێراق بەهێز بکەن و دەیانەوێت حزبی شیوعی یارمەتییان بدات، ڕاستەوخۆ پێوەندیی لەگەڵ سۆڤیەت و وڵاتانی سۆشیالیست ببەستن. تەنانەت وتبووی کە ئەوان دژی بیر و ئایدیۆلۆجیای (ماو)ین.[1]

فاتیح ڕەسووڵ داوای لێ دەکات سەبارەت بە پێوەندیکردن لەگەڵ وڵاتە سۆشیالیست و حزبە کۆمۆنیستەکان، نامە بۆ کۆمیتەی ناوەندیی حزبی شیوعی بنووسن. چەند ڕۆژ دواتر دوو ئەندامی ناوەندیی کۆمەڵە، دوو نامە بۆ فاتیح ڕەسووڵ دەبەن، یەکێکیان بۆ حزبی شیوعی عێراق، ئەوی تریان بۆ کۆمیتەی ناوەندیی حزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەت، نووسراون. هەروا پێی دەڵێن: (دوو سێ مانگ پێش تۆش، هەندێ هاوڕێیانی ئەندامی سەرکردایەتیی کۆمەڵە ئەم داخوازییەیان بە چەند هاوڕێیەکی ترتان ڕاگەیاندووە). فاتیح ڕەسووڵ دەنووسێت: (بەڕاستی تا نەوشیروان ئەم داوایەی کۆمەڵەی لەگەڵ باس نەکردبووم، نە لە کۆبوونەوەکانی مەکتەبی هەرێم و نە لەدەمی هاوڕێیانی تری لیژنەی مەرکەزی ئەمەم نەبیستبوو.)[2]

وا دیارە ئەو هاوڕێیانە مەسەلەکەیان لە ئەندامانی تری کۆمیتەی ناوەندی شاردۆتەوە و نەیان ویستووە، کۆمەڵە وەکوو ڕێکخراوێکی مارکسی- لینینی پێوەندیی لەگەڵ وڵاتانی سۆشیالیستی و حزبە کۆمۆنیستەکان ببەستێت. فاتیح ڕەسووڵ دەنووسێت:

(دەقی هەردوو نامەکەم لەگەڵ ڕاو بۆچوونی خۆمدا بۆ مەکتەبی

---

1- فاتیح ڕەسول، چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی خەباتی گەلی کورد، بەرگی دووەم، سوێد ١٩٩١، ل١١٤-١١٧، تەواوی قسەکانی نەوشیروان مستەفا لەوێدا نووسراون.

2- بۆ خوێندنەوەی هەردوو نامەکە و زانیاریی زیاتر، بڕوانە، فاتیح ڕەسوول، چەند لاپەڕەیەک لە... بەرگی دووەم ل. ١١٦-١٢٠

سیاسی نارد، بە قەناعەتەوە لەگەڵ یارمەتیدانیان بووم... لە هیچ کۆبوونەوەیەکی سەرکردایەتیی حزب و لە هیچ چاوپێکەوتنێکدا، لە کدولەی تەرپیشدا ناوی ئەو دوو نامە و داوایانەی کۆمەڵەم نەبیستەوە، دوو سێ جاریش پرسیارم کرد، وەرام نەبوو)[1]

ڕەنگە ئەو کارەی نەوشیروان مستەفا و هاوڕێکانی مناوەرەیەکی سیاسی، یان لە ناچاری بووبێت، بەڵام باشتر بوو ئەو دەرفەتەیان پێ بدرێت، کە پێوەندیی لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەت و وڵاتانی سۆشیالیستی دروست بکەن. ئەگەر ئەو پێوەندییە سیاسییە ئەنجامێکی باشی هەبووایە، بەلای زۆرەوە بە قازانجی ڕاگرتنی شەڕی نێوخۆ دەبوو.

سێیەم: گرفتی هاتوچۆ و پێداویستیی پێشمەرگە:

باشووری کوردستان، بە سێ وڵات دەورە دراوە، ئێران، تورکیا و سووریا. هەرسێکیان دژی کوردن، هیچیان لە دەستوورەکەیاندا دانیان بە هەبوونی کورد لە وڵاتەکەیان و کەمترین مافی گەلی کوردستاندا نەناوە. بۆیە باشووری کوردستان- تەنانەت بەشەکانی تری کوردستان- لە ڕووی جیوپۆلیتیکییەوە، بۆ خەباتی چەکداری دەست نادات. پەنابردن بۆ چەک دوو ئەنجامی هەیە، یان خۆکوژی و ئاشبەتاڵ، یاخود خۆدانە پاڵ دەوڵەتێکی دراوسێ، ئێران، تورکیا، سووریا، کە دژی هەر مافێکی نەتەوەیی گەلی کوردستانن، بۆیە بزاڤەکە بۆ بەرژەوەندیی خۆیان و لە دژی گەلی کوردستان بەکار دەهێنن. ئەو دەوڵەتانە چەند کیشە و ناکۆکییان لەگەڵ یەکتر هەبێت، هەموویان لەسەر جەستەی زامداری کورد یەک دەگرنەوە. لە بەر ئەوە پرسی کورد لەو وڵاتانەدا، تەنیا بە ڕێگای ئاشتی و

---

1- سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٠-١٢١

ڕێککەوتن لەگەڵ دەسەڵاتی ناوەندیی چارەسەر دەکرێت، نەک بە زەبری چەک و چەکبازی.

لە سەرەتای ساڵانی شەستەکانەوە تا ئێستا، هەر هێزێکی سیاسی، لە باشووری کوردستان، لە دژی دەوڵەتی عێراق پەنای بۆ چەک و کاری چەکداری بردبێت، بە ناچاری ڕووی لە ئێران کردووە و ملکەچی مەرجەکانی ئەو بووە. چونکە بزاڤی چەکداری پێویستیی زۆری بە چەک، خۆراک، دەرمان، تیمارکردنی نەخۆش و بریندار و هاتوچۆکردن هەبووە و هەیە. ئێران، بە پێچەوانەی تورکیا و سووریا، هەمیشە ئامادە بووە، کۆمەکی بزاڤەکە بکات بۆ ئەوەی دەستی بەسەردا بگرێت، بۆ ئامانجی خۆی و لە دژی دەوڵەتی عێراق و گەلی کورد بەکاری بهێنێت. چونکە ئێران هەمیشە چاوی لە بندەستکردنی عێراق بووە، کە زۆرینەی خەڵکەکەی شیعەیە. لە کۆنەوە کێشەی سنووریی لەگەڵ دەوڵەتی عێراق هەیە. لە دوای تەمووزی ١٩٥٨م کە ڕێژیمی مەلەکی گۆڕدرا بە کۆماری، کێشە و ناکۆکیی قووڵی سیاسی کەوتە نێوانیان. ئێران هەمیشە بزاڤی چەکداریی کوردی، وەکوو ئامرازێکی خۆی، بۆ لاوازکردنی دەوڵەتی عێراق و وێرانکردنی باشووری کوردستان و ڕێگرتن لە هەر بزاڤێکی چەکداریی کورد لە ئێران، بەکار هێناوە.

سەرەتای ساڵی ١٩٧٩ کاتێک حزبی شیوعی پەنای بۆ خەباتی چەکداری برد، پشتی بە کۆمەکی حکومەتی سووریا بەست، کە ئەو کاتە کێشەی گەورەی لەگەڵ حکومەتی عێراق هەبوو. سووریا پشتگیریی حزبی شیوعیی کرد و سنووری بۆ کردەوە، تا لە ڕێگای قامیشلو- بادینانەوە، هاتوچۆ بکەن، چەک و کەلوپەلی پێویست بگوازنەوە بۆ کوردستان. بەڵام سنووری سووریا و عێراق، لە ناوچەی بادینان، بەدەست پارتییەوە بوو. بۆیە بە بێ ڕەزامەندیی

پارتی، هاتووچۆ و سوودوەرگرتن لەو ڕێگایە، زەحمەت بوو.

پێشتر ساڵی ١٩٧٦ دەوڵەتی سووریا، کە دوژمنایەتیی لەگەڵ حکومەتی عێراق هەبوو، هەمان کۆمەکی بە یەکێتیی نیشتمانی کردبوو، بۆ ئەوەی ئەم جارە سووریا جڵەوی بزاڤی چەکداریی کورد بگرێت. ئەویش وەکوو ئێران، لەو ڕێگایەوە داخوازییەکانی خۆی بەسەر عێراقدا بسەپێنێت.

یەکێتیی نیشتمانی ویستی سنووری سووریا و بادینان کۆنترۆڵ بکات، بۆ ئەوەی چەک و پێداویستیی خۆی لە سووریاوە بهێنێتە کوردستانی عێراق. ئەو کاتە سووریا لە بەرەی دژی عێراق و ئێران و تورکیا بوو. بۆیە بەهێزبوونی ئەو بزاڤە چەکدارییە، کە لە سنووری ئەو وڵاتانە بوو، زیانی پێ دەگەیاندن.

مام جەلال باسی ئەوە دەکات، کە تێکۆشەرانی شۆڕشگێڕی کورد بە هاریکاری لەگەڵ سوریا سەرلەنوێ شۆڕشی کوردیان هەڵگیرساندەوە. لەوەش زیاتر دەنووسێت:

(هەڵگیرسانەوەی شۆڕش هەر بەو ئامانجە نەبوو کە کوردستان لە بەعەرەبکردن و گەلی کورد لە لەناوبردن بپارێزن، بەڵکو بۆ ئەوەش بوو بەرەنگاری حوکمی بۆرژوازیی بیرۆکراتیی عەفلەقی سەر بە ئیستعمار و تێوەگلاوی جێبەجێکردنی پیلانەکانی ئیستعمار و زایۆنییەکان ببنەوە، تا نەهێڵن (حوکمی عێراق) دەسبەتاڵ بێ بۆ سووریای عەرەبیی خۆڕاگر.)[1]

ئێران لە کۆنەوە چاوی لە عێراق بڕیوە، بە قووڵایی ستراتیجیی خۆی و بە بواری بەرژەوەندیی نەتەوەیی خۆی زانیوە و دەزانێت. لە ڕێگەی بزاڤی چەکداریی کوردستانی عێراقەوە، توانیویەتی

1- جلال الطالباني، اغد وديمقراطي وحرمان شعب حتى من حق الحلم، منشورات الاتحاد الوطني الكردستاني، مركز -ئەركی نوێ- الثقافي، ١٩٨٩، ل١٤، ٤٢

عێراق ئازار بدات و ملکەچی بکات. بۆیە تا بتوانێت ڕێگە نادات هیچ بزاڤێکی چەکداری، لە کوردستانی عیراق، ئەگەر خۆی کۆنترۆڵی نەکات، بەردەوام بێت. پەلاماردانی یەکێتیی نیشتمانی لە هەکاری، لە لایەن چەکدارانی پارتییەوە، بەو ئامانجە بوو دەستی سووریا لە کوردستانی عێراق ببڕدرێت، واتا بزاڤی چەکداریی یەکێتیی بەرەو پووکانەوە بچێت. چونکە بزاڤی چەکداریی کورد لە عێراق، کۆمپانیایەکی ئێرانی بوو، دەبوو جڵەوەکەی بەدەست ئێرانەوە بێت، نەک وڵاتێکی تر! ئەمەش (ئەو کاتە) بە قازانجی هەرسێک دەوڵەتی عێراق، ئێران و تورکیا بوو، چونکە هەموویان کێشەیان لەگەل سووریا و گەلی کوردستان هەبوو.

دوای کارەساتی هەکاری، یەکێتیی نەیتوانی بچێتەوە بادینان و پێوەندیی مەیدانیی لەگەڵ سووریا نەما. سەرکردایەتییەکەی تێکشکاو و گەمارۆدراو لە قەندیل گیرسایەوە. هەروا سنووری سووریا و عێراق ناڕاستەوخۆ، لە ڕێگەی قیادە موەقەتەی پارتییەوە، کەوتە بندەستی ئێرانی شاهەنشایی، بەمەش دەستی سوریا لەناو بزاڤی چەکداریی کورد، شکێندرا.

بە ڕای من ئەگەر یەکیتیی بە کۆمەکی سووریا پەنای بۆ کاری چەکداری نەبردایە. دەوڵەتی ئێران ڕێگەی نەدەدا سەرانی قیادە موەقەتەی پارتی، کە ئاشبەتاڵیان کردبوو و لە بن دەست و چاودێری دەزگای جاسووسیی ساواکدا بوون، چەک لە دژی عێراق هەڵبگرنەوە. چونکە ئێران باشترین پێوەندیی لەگەڵ عێراق هەبوو. ئەوەی لە دەوڵەتی عێراقی دەویست، لە بەهاری ١٩٧٥ لە ڕێککەوتنی ئەلجەزایر، دەستی کەوتبوو. بۆیە ئێران لەو کاتەدا، پێویستیی بەوە نەبوو کە مردوو زیندوو بکاتەوە و پرچەکی بکات!.

لەو دەمانەدا سێ سەرکردەی کۆمەڵە، شەهاب شێخ نووری،

جەعفەر عەبدولواحید و ئەنوەر زۆراب، پەنایان بۆ ئێران برد. کەچی دەوڵەتی ئێران ڕادەستی عێراقی کردنەوە، بێ ئەوەی داوا لە حکومەتی عێراق بکات، کە لەسێدارەیان نەدات. چونکە ئەو جۆرە داواکاری و مەرجە، بەشێکە لە عورفی دیپلۆماسی و ئەخلاق و شەرافەتمەندیی سیاسیی هەر سەرۆکدەوڵەت و ڕابەرێک، کە ڕێزی خۆی بگرێت. کەچی شای ئێران، ئەو عورف و نەریتەی ڕەچاو نەکرد. ڕۆژی ٢١-١١-١٩٧٦ هەرسێکیان لەسێدارە دران. چەند مانگ دوای ئەوە قیادە موەقەتەی پارتیش، دوو سەرکردەی یەکێتی، د.خالید و عەلی عەسکەریی بە دیلیی کوشت! ئەمەش دەیسەلمێنێت کە ئێران چەند بە توندی ویستوویەتی پێش بە نفوزی سوریا لە کوردستان و عێراق، بگرێت.

من ڕێزم بۆ سەدان هەزاران پێشمەرگە و تێکۆشەر هەیە، کە بە درێژایی چەندان ساڵ بە هەستی پاکەوە، بۆ ئازادیی نەتەوەیی و داکۆکی لە خاک و گەلی کوردستان، قوربانیی زۆریان دا. هەزارانیان لە سەنگەری بەرەنگاربوونەوە، یان لە زینداندا شەهید کران. هەزارانی تریان لە شەڕی نێوخۆدا بەکوشت دران، یان زامدار کران، یاخود ئاوارە بوون. بەڵام بزاڤی چەکداریی کورد، لە باشووری کوردستان، سەرەتا هەرچۆنێک و بە هەر ئامانجێک بووبێت، سەرەنجام، جڵەوەکەی کەوتۆتە دەستی ئێران.

هێزێکی پێشمەرگەی حزبی شیوعی، کە سەد کەس زیاتر بوون، بە ڕێککەوتن لەگەڵ پارتی، لە بادینان بوون. ئەوان دەورەبەری سێ ڕۆژەڕێ لە نێوزەنگەوە دووربوون. پێشمەرگەکان، بە کۆمەکی پارتی ڕزگاریی کوردستان (لە تورکیا) ڕێگایەکیان دۆزییەوە و لە سووریاوە بە قاچاخی، بە ناو تورکیادا، چەکیان دەگەیاندە بادینان. بەڵام پارتی لەو سنوورە هێزی هەبوو، ئەو

ڕێگایەی وەکوو فاکتەری فشار بەکار دەهێنا، دەیەویست چەکەکان لە ڕێگەی ئەوانەوە بێن و کۆنترۆلیان بکات. هەر کاتێک پارتی بیویستایە فشار بۆ حزبی شیوعی بهێنێت، لە بادینان گرفتی بۆ هاتوچۆی هاوڕێیان و هێنانی چەک و کەلوپەلی تر لە سووریاوە، دروست دەکرد. هەروا هەڕەشەیان لە خەڵکی ناوچەکە دەکرد، کە نابێت بە هیچ شێوەیەک هاوکاریی شیوعییەکان بکەن.

ڕۆژی ٢١ و ٢٩ی ئابی ١٩٨٠ دوو جار پێشمەرگەی حزبی شیوعی لە سووریاوە، بە کۆمەکی پارتی ڕزگاریی کورد (لە تورکیا)، چەکیان هێنا بۆ کوردستان، کەچی پارتی تەقەی لێ کردن و گەمارۆی دان، چونکە ویستبووی خۆی کۆنترۆڵی ئەو شتانە بکات، کە حزبی شیوعی لە دەرەوە هێنابوونی. حزبی شیوعی بە نامە و بروسکە، سەرکردایەتیی پارتیان لەو دەستدرێژییانە ئاگادار کردەوە، کەچی پارتی لە وەڵامدا، بە دوو نامە، کە ڕۆژی ١٩ی ئەیلول و ٣٠ ئەیلولی ١٩٨٠ نووسراون، دەڵێت: (ئامادەین لە ڕێگەی ئێمەوە هەموو پێویستییەکانتان پێ بگات).[1]

بارەگای سەرکردایەتیی حزبی شیوعی لە کوردستان، لەسەر سنووری ئێران (نێوزەنگ-تووژەڵە) بوو. لەو دەڤەرەوە تا شارەزوور و گەرمیان هەر شتێکمان پێویست بووایە، لە ئازوقە، دەرمان، کەلوپەلی ڕاگەیاندن تا چارەسەرکردنی برینداری و نەخۆش، دەبوو بە نهێنی، یان بە ئاشکرا، ڕوو لە ئێران بکەین. کۆماری ئیسلامیی ئێران ئامادە نەبوو هیچ جۆرە ئاسانکاری و هاوکارییەکی حزبی شیوعی بکات. بۆیە حزبی شیوعی دەبوو بە نهێنی، یان بە هاوکاریی پارتی هاتوچۆی ئێران بکات و پێداویستییەکانی خۆی لە ئێرانەوە بهێنێت. چونکە پارتی لە شەڕی

1- فاتیح ڕەسوول، بەرگی دووەم ل١٨٢

نێوان ئێران لەگەڵ حزبی دیموکرات و کۆمەڵە، هەروا لە شەڕی عێراق و ئێراندا، هاوسەنگەری لەشکری ئێران بوون و کۆمەکیان دەکرد.[1]

پارتی پسولەیەکی هاتووچۆی بە ناوی (برگ عبور) دەدا بە هاوڕێیانمان، کە بە هۆیەوە دەیانتوانی بە ناوی (ئەفرادی بارزانی) لەناو ئێراندا هاتوچۆ بکەن. هەندێک جاریش ئاسانکارییان بۆ چەند هاوڕێ دەکرد، کە لە تارانەوە بۆ دەرەوەی وڵات دەچوون. بە کورتی دابینکردنی پێداویستییە گرینگەکانی حزبی شیوعی و کلیلی هەردوو دەرگای هاتووچۆی سەرکردە و پێشمەرگەکانی، بۆ سووریا، ئێران و دەرەوەی وڵات، بە دەستی پارتی بوو. بۆیە سەرکردایەتیی حزبی شیوعی، لەم لایەنەوە بە تەواوی وابەستەی پارتی بوو، نەیدەتوانی دەستبەرداری پارتی ببێت. پارتی سودی زۆری لەمە وەرگرت، وەکوو فاکتەری فشاربردن بۆ حزبی شیوعی بەکاری هێنا. دەیەویست حزبی شیوعی لە یەکێتی دوور بکەوێتەوە، لە ڕووی سیاسی و عەسکەرییەوە، لەو نزیک ببێتەوە.

پارتی لە ئاستی کوردستان و ناوچەکەدا، گۆشەگیر کرابوو. حزبی دیموکرات و کۆمەڵە و چەپی ئێران دژی بوون، چونکە پارتی هاوکاریی کۆماری ئیسلامیی ئێرانی دەکرد. هێز و لایەنە عەرەبییەکانی عێراق و ناوچەکە، بە پێوانەی ئەو ڕۆژە، پارتییان بە حزبێکی کۆنەپەرست دەزانی، چونکە ساڵی ١٩٧٤-١٩٧٥ پشتی بە دەوڵەتی ئێران، ئەمریکا و ئیسرائیل بەستبوو. یەکێتیی نیشتمانی کاری زۆری کردبوو بۆ ئەوەی پارتی، لە ڕووی سیاسییەوە، گۆشەگیر بکات. بۆیە پارتی لەم بارەوە پێویستیی بە حزبی

---

1- بۆ زیاتر لەو بارەیەوە بڕوانە: حزبی دیموکراتی کوردستان، خیانەتەکانی قیادە موەقەتە بەرانبەر بە کورد، لە بڵاوکراوەکانی ئینتیشارات و تەبلیغاتی کۆمیتەی ناوەندی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، ڕەزبەری ١٣٦٠

شیوعی هەبوو.

ڕۆژی ١٢-١١-١٩٨٠ بە سەرپەرشتیی حکومەتی سووریا، کە دالّدەی ئۆپۆزیسیۆنی عێراقیی دابوو، بەرەی نیشتمانی و نەتەوەیی دیموکراتی (جوقد) لە دیمەشق لە هەشت حزبی عێراقی پێک هات.[1]

حزبی شیوعی هەوڵی زۆری دا، پارتی لەو بەرەیەدا بەشدار بێت، بەڵام بێ سوود بوو. ئەمە ناهەقییەک بوو بەرامبەر بە پارتی کرا و کۆمەکی بە توندبوونی شەڕی نێوخۆ کرد.

سەرکردایەتیی حزبی شیوعی، پێشتر لەگەڵ سەرکردایەتیی پارتی و سۆشیالیست ڕێک کەوتبوون، کە ئەگەر پارتی لە بەرەی (جوقد) قبووڵ نەکرا، پرۆژەیەکی هاوکاریی تایبەت لەگەڵ پارتی ئامادە بکەن. ڕۆژی ٢٧-٩-١٩٨٠ حزبی شیوعی پرۆژەکەی ئامادە کرد و بۆ هەردوو حزبی نارد. تەنیا دوو مانگ دوای پێکهێنانی بەرەی جوقد، لە ١٩٨٠/١١/٢٨ بەرەی نیشتمانیی دیموکراتی (جود) لەنێوان حزبی شیوعی، پارتی و سۆشیالیست پێک هات. هاوڕێیانمان بۆ ئەوە چووبوون کە پرۆژەی هاوکاریی لەگەڵ پارتی ئیمزا بکەن، نەک بەرەیەکی نوێی سیاسی دروست بکەن. بەڵام بە داوای پارتی، ڕێککەوتنەکە کرا بە بەرە و ناوی (بەرەی نیشتمانیی دیموکراتی-الجبهه الوطنیه الدیموقراطیه-جود)ی لێ نرا. ئەم بەرە نوێیە بە تایبەت لە بەر پارتی پێک هات، چونکە حزبی شیوعی و سۆشیالیست پێکەوە ئەندامی بەرەی (جوقد) بوون.

یەکێتیی نیشتمانی پێی وابوو ئەو بەرەیە بۆ دوژمنایەتیی ئەو

---

1- بەرەی جوقد لەم حزب و گروپانە پێک هاتبوو، کە زۆربەیان دوکانی سیاسی بوون: منظمه جیش التحریر الشعبی، الحزب الشیوعی العراقی، الاتحاد الوطنی الکردستانی، الحزب الاشترکی الکردستانی الموحد، حزب البعث العربی الاشترکی-قیاده قطر العراق، الحرکه الاشترکیه، الحزب الاشترکی العراقی، المستقلون الدیموقراطیون.

پێک هێندراوه، بۆیه له دژی وه‌ستا. به سه‌رکردایه‌تیی حزبیان وت: (پێکهێنانی ئه‌م به‌ره‌یه، نرخی ئه‌و به‌ره‌یه‌ی نه‌هێشت که له دیمه‌شق دروست کرابوو.)[1] سه‌رکردایه‌تیی حزبی شیوعی هه‌وڵی دا دڵنیایی به یه‌کێتی بدات، به‌ڵام سوودی نه‌بوو. ئه‌ندامییه‌تیی حزبی شیوعی و سۆشیالیست، له به‌ره‌ی (جوقد) هه‌ڵپه‌سێردرا. هه‌روا پێوه‌ندیی نێوان حزبی شیوعی له‌گه‌ڵ حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، ساردیی تێکه‌وت، چونکه له‌گه‌ڵ پارتی له شه‌ڕدا بوون.

پاش پێکهێنانی به‌ره‌ی جود حزبی شیوعی، ڕاسته‌وخۆ یان ناڕاسته‌وخۆ، که‌وته پاڵ لایه‌نێکی شه‌ڕێ نێوخۆ. که‌چی بڕیار بوو، له‌گه‌ڵ هیچ لایه‌نێکیان نه‌بێت و بێلایه‌ن وه‌کوو ناوبژیوان بمێنێته‌وه.

دوای پێکهێنانی به‌ره‌ی جود، شه‌ڕی نێوخۆ فراوانتر و توندتر بوو. پارتی و سۆشیالیست شه‌ڕی خۆیان له‌گه‌ڵ یه‌کێتی، به شه‌ڕی به‌ره‌ی (جود) ناو ده‌برد. فشاریان بۆ حزبی شیوعی هێنا بێلایه‌ن نه‌مێنێته‌وه، وه‌کوو لایه‌نێکی به‌ره‌ی جود کۆمه‌کیان بکات و له‌سه‌ریان بکاته‌وه. سه‌رکردایه‌تیی حزبی شیوعی، گوێزانێکی له گه‌رووی خۆیدا عاسێ کردبوو، نه بۆی ده‌هاته‌وه ده‌رێ، نه ده‌یتوانی به ئاسانی قووتی بدات. به ڕای من، ئه‌مه یه‌که‌م هه‌نگاوی سه‌رکردایه‌تیی حزبی شیوعی بوو به‌ره‌و شه‌ڕی نێوخۆ.

---

1- فاتیح ڕه‌سوول، سه‌رچاوه‌ی پێشوو، به‌رگی دووه‌م، ل٢٣٧

## ٢
## حزبی شیوعی و زەماوەندی خوێن

لە هاوینی ١٩٨١ کۆنە جاشێک بە ناوی عەبدوڵڵا ماولی، لەگەڵ سێ چوار خزمی خۆی، هاتنە بارەگای سەرکردایەتیی حزبی شیوعی لە دۆڵی نۆکان، بۆ ئەوەی ببنە پێشمەرگە. ئەوە یەکەم جار بوو چەند جاشێک ڕوو لە حزبی شیوعی بکەن. ماولی چەند ساڵ پێشتر، کە بزووتنەوەی سۆشیالیست لەناو یەکێتیدا بوو، دوو پێشمەرگەی یەکێتیی، کە یەکێکیان سۆشیالیست بوو، ڕادەستی حکومەت کردبۆوە و لە سێدارە درابوون. دوای ماوەیەک جاشایەتی، جارێکی تر هاتەوە شاخ، بۆ ئەوەی ببێتە پێشمەرگەی حزبی شیوعی!

هاتنی ماولی گرژیی دروست کرد. یەکێتی و سۆشیالیست هەردووکیان، بە نامە و ڕاستەوخۆ، داوایان لەسەرکردایەتیی حزبی شیوعی کرد کە ئەو تاوانبارە بە خۆی نەگرێت و ڕادەستی ئەوانی بکەن، یان پێکەوە دادگای هاوبەشی بۆ دابنێن. تەنانەت یەکێتیی نیشتمانی بە ڕوونی وتی ئەوان لێی خۆش نابن و تۆڵەی شەهیدەکانیان دەکەنەوە. کەچی سەرکردایەتیی حزبی شیوعی، وەکوو ئەوەی هەنگیان لە داردا دۆزیبێتەوە، داواکەیان ڕەت کردەوە. پێیان وابوو یەکێتی و سۆشیالیست، دەترسن لەمەودوا

جاشی هەڵاتوو، پەنا بۆ حزبی شیوعی بەرن، بۆیە دەیانەوێت پێش بەو کارە بگرن!.

کۆمەڵێک پێشمەرگە و کادیری حزبی شیوعی، لەوانە لە ڕاگەیاندنی هەرێم، داوامان لەسەرکردایەتیی حزب کرد، کە عەبدوڵلا ماولی دالْدە نەدات، یان ڕازی بێت هەموو لایەنەکان پێکەوە دادگایی بکەن، یاخود ئیزنی بدەن بەرەو ئێران بچێت، لەوێ چی دەکات با بیکات. چونکە بەخۆگرتنی کەسێکی لەو جۆرە پێشینەیەکی خراپە و زیانمان پێ دەگەیەنێت. سبەینێ دەشێت کەسێک پێشمەرگەی ئێمە بکوژێت و پەنا بۆ حزبێک بەرێت، ئێمە چۆن دەتوانین داوای دادگاییکردنی ئەو کەسە بکەین؟!

کەچی سەرکردایەتیی حزبی شیوعی، وەکوو ئەوەی بیەوێت هێزی خۆی بەرانبەر بە یەکێتیی پێشان بدات، هیچکام لەو داواکاری و پێشنیارانەی قبووڵ نەکرد. بێمنەتانە وەڵامی یەکێتی دایەوە کە (عەبدوڵلا و چەکدارەکانی پێشمەرگەی حزبی شیوعین و بە هەموو شێوەیەک دەیانپارێزین.)[1]

دوای ئەوە یەکسەر عەبدوڵلا ماولییان ناردە ناوچەی وەرتێ و دەرگەڵە! کە یەکێتیی نیشتمانی لەوێ باڵادەست بوو، بێ ئەوەی هەوڵ بدەن بیپارێزن، کەچی زۆر بەروونی یەکێتیی نیشتمانی پێی وتبوون، کە تۆڵەی شەهیدەکانیان دەکەنەوە.

ڕۆژی ٥-٩-١٩٨١ عەبدوڵلا ماولی، لەگەڵ سێ چوار چەکداری خۆی چووبوو بۆ گوندی دەرگەڵە، لەوێ هێزێکی یەکێتی گرتی، ڕۆژی دواتر هەواڵی کوشتنەکەی گەیشت.

ئەو ڕووداوە کوژرانی قارەمانی ڕۆمانی (مەرگێکی

---

1- ئەحمەد بانیخێلانی، سەرچاوەی پێشوو ل٤٠٢

ڕاگەیەنـدراو)ی گابرێـل گارسـیا مـارکێز، بە بیـر دەهێنێـتەوە. لە کاتێکدا هەموو خەڵکی ئاوایی دەیانزانی برایانی ڤیکاریۆ بەنیازن قارەمانی ڕۆمانەکە، سانتیاگۆ نەسار، بکوژن، کەچی کەس بایەخی بەو مەسـەلەیە نەدا و نەیەویسـت پـێش بەو کارەسـاتە بگیرێـت. لەجیاتیـان هەمـوو خەڵکـی ئـاواییەکە چـاوەڕێ بـوون ڕووداوی کوشتنەکە ببینن.

دوای کوژرانی عەبدوڵلا ماولی، بە بڕیاری سەرکردایەتیی حزبی شیوعی، عەلی کلاشینکۆف، کە بەرپرسی بەتالیۆنی سەفین بوو، بە مەفرەزەیەکەوە چـوو بـۆ تـۆڵەکردنەوەی عەبـدوڵلا مـاولی، لەنـاو مزگەوتی گوندی فەقێیان، لە ناوچەی ڕەواندز، لە ناغافڵی پەلاماری مەفرەزەیەکـی یەکێتییـان دا، لەوێ وەسـمان بەگ و سـێ پێشـمەرگەیان کوشـت، کە ئاگایـان لە ڕووداوی عەبـدوڵلا مـاولی نەبـوو، هەروا پێوەنـدیی باشـیان لەگەڵ پێشـمەرگەکانی حزبـی شیوعی لە ناوچەکە هەبوو.[1]

هەر لەو کـاتەدا، شـەڕێکیش بەهـۆی ئەو کێشـەیە، لەنێـوان پێشمەرگەی یەکێتی و حزبی شیوعی لە گوندی وەرتێ و بناری چیـای کـارووخ ڕووی دا. سێ ڕۆژ دوای ڕووداوەکە نەوشـیروان مسـتەفا و ئەحـمەد بـانیخێلانی بـۆ وەرتـێ چـوون، بـۆ ئەوەی کێشەکان چارەسەر بکەن.

چ گاڵتەجـاڕییەکە! دوو حزبـی سیاسـی، کە بە چەک دژی حکومەتی عێراق وەستاون، کەچی لەسـەر کۆنەجاشێک، کە دوو پێشـمەرگەی کوشـتووە و ڕەنـگە بـۆ تـاوانی تـر هـاتبێتەوە شـاخ، بەشەڕ دێن و چەند پێشمەرگە بەکوشت دەدەن.!

1- سەرنج: چەند سەرکردەی حزبی شیوعی، لە یادەوەرییەکانیاندا بە جۆرێک باسی ئەو ڕووداوە دەکەن وەک ئەوەی عەلی کلاشینکۆف خۆی، نەک بە بڕیاری سەرکردایەتی و مەکتەبی عەسکەری، ئەو کارەی کردبێت.

ئەوە یەکەم جار بوو یەکێتی و حزبی شیوعی بەشەڕ بێن. لە ئەنجامدا ئەو درزەی بەرەی جود خستبوویە پێوەندیی نێوان ئەو دوو لایەنە، گەورەتر بوو. پێوەندییەکە خوێناوی و متمانەی نێوان هەردوو لایەن لاوازتر بوو. هەروا لەناو سەرکردایەتیی هەردوو لایەندا، کەسانی داخلەدڵ و شەڕخواز دەرفەتیان بۆ ڕەخسا زیاتر دەنگ هەڵببڕن، کینە لەناو پێشمەرگە و ڕێکخستنەکاندا بڵاو بکەنەوە و بەهانەی شەڕکردن لەگەڵ لایەنی تر بدۆزنەوە. حکومەتی عێراقیش، لە ڕێگەی کەسانی خۆی، ڕۆڵی بینی. حزبی شیوعی، دوای ڕاپەڕین، زۆر بەڵگەنامەی دەزگای موخابەراتی عێراقی دەست کەوت. بەڵگەنامەیەکیان دەیسەلمێنێت، کە پێکدادانی چەکداریی نێوان مەفرەزەی یەکێتی و مەفرەزەی حزبی شیوعی، لە ناوچەی (بەستی شەرگە)، بە پیلانی موخابەراتی عێراق بووە.[1]

شەڕی یەکەمی جیهان لە ٢٨ی حوزەیران (جونی) ١٩١٤، لەبەر چەند هۆکاری ئابووری، سیاسی، جیوسیاسی و کولتووریی هەڵگیرسا. بەڵام کوشتنی جێنشینی عەرشی پاشایەتیی ئاوستریا (نەمسا) فرانز فێردیناند و ژنەکەی، لە شاری سارایێڤۆی پایتەختی بۆسنیا، بە هۆکاری هەڵگیرسانی شەڕی یەکەمی جیهانی دادەندرێت. ئەو کاتە بۆسنیا بەشێک بوو لە ئیمپراتۆریای نەمسا-هەنگاری. گەنجێکی ناسیۆنالیستی سێربی، کە ١٩ ساڵ بوو، بە ئامانجی ئازادکردنی سێربەکانی بۆسنیا، لە ئیمپراتۆریای نەمسا، ئەو کارەی کرد و شەڕەکە هەڵگیرسا. بۆ گاڵتەجاریی زەمانە، دەبێت کوژرانی کۆنە جاشێک، عەبدوڵڵا ماولی، بە هۆکاری هەڵگیرسانی شەڕی نێوان حزبی شیوعی و یەکێتیی نیشتمانی، دابندرێت، هەرچەندە هۆکاری تر لەپشت ئەو شەڕەوە هەبوو.

---

1- كريم احمد، المسيرە، صفحات من نضال كريم احمد، مطبعە شهاب، اربيل، ص٢٣٤

مانگێــک دوای ئەو ڕووداوە، لە نیــوەی یەکەمــی ئۆکتــۆبەر، ســەرکردایەتیی حزبــی شــیوعی لە کوردســتان، جگە لە ئەحــمەد بــانیخێلانی، بــۆ کۆبــوونەوەی کــۆمیتەی ناوەنــدیی حــزب چــوونە دەرەوەی وڵات، تا کۆتایی شوبات (فەبریوەری) ١٩٨٢ نەگەڕانەوە. لەو مــاوەیەدا، ئەحــمەد بــانی خێلانــی، بە جــۆرێکی کــاتی کــرا بە بەرپرسی مەکتەبی هەرێمی کوردستان. دوای دوو هەفتە خۆی بە تەنیــا، بێ ئەوەی هــیچ ئەنــدامێکی کــۆمیتەی هەرێمــی کوردســتانی حزب لەگەڵ خۆی بەرێت، چوو بۆ کۆبوونەوەی بەرەی (جود)، کە لە ئێران کرا. لەو کۆبوونەوەیەدا چەند بڕیاری سەربازیی ترسناک دران، کە ڕاســتەوخۆ حزبــی شــیوعی، لە ڕووی سەربازیشــەوە، بە تەواوەتی لە دژی یەکێتیی نیشتمانی، چووە ناو سەنگەری پارتی و سۆشیالیست. لە ڕێککەوتنەکەدا هاتووە:

١-(نــاوچەی باڵەکــایەتی و دەرگەڵە و گەڵاڵە بکەیــنە نــاوچەیەکی کــۆنترۆڵکراوی -جــود- و هەوڵ بــدەین نەخــتە نەخــتە ناوچەکــانی جود فراوان بکەین. هەوڵ بدەین یەکێتی بگەیەنینە ئەو قەنــاعەتەی کە واز لە پاوانکردنی گۆڕەپانی خەبات بهێنێ... ئەگەر یەکێتیش مل بە عەقڵ و مەنتیق نەدا، ئەوا ئێمەش ڕێگە نەدەین لە ناوچەکــانی ژێر دەسەڵاتی -جود-دا بێت و بڕیارمان دا لە ئاداری داهــاتوو ئەو نەخشەیە جێبەجێ بکەین. لە کاتی کۆبوونەوەکەدا سەرکردەیەکی ســـەربازیی حیســـک، عەبـــدوڵلا ســـوور، لە شـــەڕێکدا لەگەڵ پێشمەرگەی یەکێتی، لە دۆڵە ڕەقە دیل کرا و کوژرا. ئەم ڕووداوە زیاتر هانی داین بۆ ئەوەی بڕیارەکانمان جێبەجێ بکەین.

٢- پــارتی ٦٠٠ چەکــدار بنێــرنە بــنکەی پشتئاشــان بــۆ لای هاوڕێیــانی ئێمە، برادەرانــی سۆشیالیســت ٣٠٠ پێشــمەرگە بنێرن، بەڵام برادەرانی پاسۆک "کە ئەندامی بەرەی جود نەبوو" گووتیان

ئێمە نامانەوێ درۆ بکەین، هەر ٢٥ کەسمان هەیە.)[1]

(من لە تاقیکردنەوەی خۆمەوە لەگەڵ ئەو حزب و هێزانەدا شکم هەبوو لەوەی برادەرانی پارتی ٦٠٠ کەس و سۆشیالیست ٣٠٠ کەس بنێرن. دەترسام ئاکام شەڕەکە تەنیا بەسەر ئێمەدا بشکێتەوە ئەنجامیش هەر وا دەرچوو).[2]

ئەگەر ئەحمەد بانیخێلانی، بە ڕاستی ئەوەی دەزانی، بۆچی ڕێککەوتنەکەی قبووڵ کرد؟!

دوای ئەو ڕێککەوتنە، پارتی تەنیا سەد پێشمەرگەی ناردە پشتئاشان. بە قسەی بانیخێلانی، خەرجیی ئەو چەکدارانەشیان، تا ڕادەیەکی زۆر، خستە ئەستۆی حزبی شیوعی!

لەو کاتەوە، فابریوەری ١٩٨٢، حزبی شیوعی بێلایەنیی خۆی لەدەست دا و چووە بەرەی پارتی و سۆشیالیست. ئەو بڕیارە گرینگە، لە دەسەڵاتی تاکە کەسێکدا نەبوو، پێش سەفەری سەرکردایەتیی حزبی شیوعی لە کوردستان، بۆ دەرەوەی وڵات، بڕیارەکە درابوو.

ئەگەر سەرکردایەتیی حزبی شیوعی، بەرەی (جود)ی لە گەڵ پارتی و سۆشیالیست پێک نەهێنابووایە، شەڕی نێوخۆ هێندە فراوان نەدەبوو. چونکە تا ئەو کاتە پارتی و سۆشیالیست لە سەنگەری داکۆکیکردندا بوون، بنکەی جێگیریان لە باڵەکایەتی، دەرگەڵە، گەلاڵە و ناوچەی تری پارێزگای هەولێر نەبوو. بۆیە نەیاندەتوانی هێرش بۆ سەر یەکێتی بەرن. پشتئاشان کە بارەگای سەرکردایەتی حزبی شیوعی لێبوو، کرایە بنکەی سەرەکیی

1- ئەحمەد بانیخێلانی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٢٣-٤٢٤

٢- هەمان سەرچاوە، ل ٤٢٤

کۆکردنەوەی هێزی پێشمەرگەی جود، بۆ شەڕی یەکێتی. بەو کارە سەرکردایەتیی حیزبی شیوعی، بەئاگایانە یان بێئاگایانە، خۆی و حزبەکەی کردە کەواسووری بەر لەشکری جود.

یەکێتی هەستی بە مەترسی کرد. مولازم عومەر عەبدوڵڵا، بەرپرسی مەکتەبی عەسکەریی یەکێتی، دوو نامەی بۆ حزبی شیوعی نووسی و پێداگریی کرد کە: (ئێمە بە هیچ جۆرێک نامانەوێ شەڕی ئێوە بکەین، بەڵام هاتنی پارتی زەمینەی تێکچوونی پێوەندیی نێوانمان ساز دەکات). حزبی شیوعی لە وەڵامدا وتیان: (برادەرانی پارتی بۆ لێدانی ئێوە نەهاتوون، ئەگەر ئێوە شەر بە جود نەفرۆشن). کەچی هەر دوای ئەو وەڵامە، ئەحمەد بانی خێڵانی دەنووسیت: (ئەو هێزانەی کە هەمانبوو پێشمەرگەکانی حزبی شیوعی بە ڕابەری مولازم خدر، پێشمەرگەکانی پارتی بە ڕابەری مەلا محەمەد و پێشمەرگەکانی سۆشیالیست بە ڕابەری سەید کاکە و قادر جەباری، بەر لەوەی یەکێتی بە تەواوی خۆی کۆ کاتەوە و پەلاماری ئەوان بدات، ئەوان هێرشیان بردە سەر بنکەکانی یەکێتی لە زارگەلی و وەرتێ و ناوچەکەیان پێ چۆڵ کردن).[1]

ئەوە یەکەم جار بوو پێشمەرگەی حزبی شیوعی، لەگەڵ پێشمەرگەی پارتی و سۆشیالیست، شەڕی یەکێتی بکات. بەڵام ئایا پێویست بوو حزبی شیوعی، لەگەڵ ئەو دوو حزبە پەلاماری یەکێتی بدات؟! چونکە هێشتا کێشەی سەربازی و شەڕ لەنێوان حزبی شیوعی و یەکێتی دروست نەبووبوو؟ پێشمەرگەکانی حزبی شیوعی، ئازادانە و بێ گرفت، بە هەموو ئەو ناوچانەدا دەگەڕان،

1-هەمان سەرچاوە، ل ٤٢٦

که پێشمەرگەی یەکێتیی لێ بوو؟ لە هەر شوێنێک گرفتێک دروست ببووایە، بە زوویی چارەسەر دەکرا.

لەسەرەتای ئاداری ١٩٨٢ سەرکردایەتیی حزبی شیوعی گەڕایەوە بۆ کوردستان. لەو مانگەدا دوو کۆبوونەوەی لەگەڵ یەکێتی کرد. لە حزبی شیوعی کەریم ئەحمەد، کە جێگری سکرتێری یەکەمی حزب و بەرپرسی کوردستان بوو، لە یەکێتیی مام جەلال و نەوشیروان مستەفا ئامادە بوون. کۆبوونەوەکان گرژی و ساردی نێوان هەردوو لایەنیان کەم کردەوە، بەڵام ڕێککەوتنێکی نوێ لەنێوانیاندا نەکرا. هەردوو لایەن متمانەیان بە یەکتر لاواز بووبوو. حزبی شیوعی بڕیاری دابوو، کە کار و چالاکیی خۆی لەگەڵ دوو هێزەکەی تری بەرەی جود، پتەو بکات. بارەگای سەرکردایەتیی خۆی لە نێوزەنگەوە گواستەوە بۆ پشتئاشان، تا لە سەرکردایەتیی یەکێتی دوور بێت و پارێزراو بێت.

بەهادین نووری کە بەرپرسی هێزی پێشمەرگەی حزبی شیوعی بوو لە ناوچەی سلێمانی و گەرمیان، لە بیرەوەرییەکانیدا دەنووسێت: (چەند بروسکەیەکمان پێگەیشت کە هانی دەداین بۆ دوورکەوتنەوە لە ی.ن.ک- یەکێتی- و هاوکاریکردنی -جود- بە واتایەکی ڕوونتر: بەشداریکردن لە جەنگ لە ڕیزی هێزەکانی جود. فەرمانەکە پێچەوانەی سیاسەتە فەرمییەکانمان بوو، کە لەسەر بنەمای دروستکردنی پەیوەندییەکی هاوڕێیانە لەگەڵ هەمووان بەند بوو. بۆیە من پەیوەست بووم بەو هێڵە سیاسییەوە... باردودۆخەکە زیاتر و زیاتر ئاڵۆز دەبوو. ئێمە لەسەر هەڵوێستی خۆمان سوور بووین، بەڵام سەرکردایەتییەکەمان لە پشتئاشان بە شێوازێکی تر لە بارودۆخەکەیان دەڕوانی، کە هانی دەداین زیاتر لایەنگیری پارتی و ح.س.ک (سۆشیالیست) بکەین، واتا لایەنگری جود بکەین

لە دژی ی.ن.ک کە ئێمە لە مەڵبەندی خۆمان ڕازی نەبووین.[1]

مەڵبەندی چواری یەکێتیی لە ناوچەی بالیسان بوو، د.کەمال خۆشناو بەرپرسی بوو. بەرەی جود (حزبی شیوعی، پارتی و سۆشیالیست) لەو ناوچەیە بارەگای کردەوە. پارتی و سۆشیالیست دەیانویست بە هەر شێوەیەک بێت، یەکێتی لەو ناوچەیە دەرپەڕێنن. وەفدێکی حزبی شیوعی، کە لە کەریم ئەحمەد و عەبدولڕەزاق سافی پێک هاتبوو، لە پشتئاشانەوە چوون بۆ نێوزەنگ، لەگەڵ مام جەلال و سەرکردایەتیی یەکێتی ڕێک کەوتن، کە پێوەندیی نێوان یەکێتی و حزبی شیوعی بەتین بکرێت و چالاکیی سەربازی لە دژی ڕێژێمی عێراق بکەن. حزبی شیوعی ڕۆڵێکی چالاک ببینێت بۆ ئەوەی پارتی و یەکێتی پێکەوە کۆببنەوە و کێشەکانی نێوانیان چارەسەر بکەن. دوای ئەوە سێ لایەنەکەی بەرەی (جود) لە گوندی ڕۆستێ کۆبوونەوە، کەریم ئەحمەد، عەلی عەبدوڵڵا، سکرتێری ئەو کاتەی پارتی و، ڕەسووڵ مامەند، سکرتێری سۆشیالیست، بەشدار بوون. لە کۆبوونەوەکەدا باسی چارەسەرکردنی کێشەی نێوان هێزە کوردستانییەکان کرا. کەریم ئەحمەد لەو بارەیەوە دەنووسێت:

(چەند ڕۆژێک پاش گەرانەوەمان بۆ بارەگای پشتئاشان نامەیەکمان لە ئەبو حیکمەت، کە بەرپرسی بارەگای بالیسان بوو، پێ گەیشت، تیایدا دەڵێ کە پارتی و سۆشیالیست دەیانەوێت بە ئۆپەراسیۆنێکی عەسکەری یەکێتی لە ناوچەکە دەرکەن، پێداگری دەکەن کە ئێمەش لەو پەلامارە عەسکەرییە بەشدار بین، چونکە لایەنێکی بەرەی جودین، ماقوول نییە هاوپەیمانانمان بە تەنیا جێ

---

1- بیرەوەرییەکانی بەهادین نوری، بەرگی دووەم، بڵاوکراوەی کتێبخانەی هەژار موکریانی، هەڵەبجە ٢٠١٩، ٢١٢-٢١٤

بهێڵین و تەماشایان بکەین. پێشنیاز دەکەن پێکەوە لە دژی یەکێتی ئەو کارە بکەین لە بالیسان. ئێمە وەڵاممان دایەوە کە ئەو جۆرە کارە بە ڕاست نازانین و دەبێت ڕۆڵی خۆی ببینێت و ڕێ لەوە بگرێت شەڕ لەنێوان هێزە کوردستانییەکاندا ڕوو بدات، بە تایبەت کە ئێمە لەگەڵ یەکێتیی ڕێک کەوتبووین کە کۆبوونەوەیەکی سێ قۆڵی بۆ چارەسەری گرفتەکان بکەین. ئەبو حیکمەت بە نامەیەکی تر وەڵامی دایەوە، تیایدا دەڵێت پارتی و سۆشیالیست پێداگری دەکەن، کە لەگەڵ ئەوان بەشداری ئەو ئۆپەراسیۆنە بکەین، ئەگەر نا ئێمە جێگامان لەناو بەرەی جود نابێتەوە و پەیوەندیمان بەجۆرێکی ئاسایی نامێنێتەوە. لە وەڵامی ئەو نامەیەدا هەڵوێستێکی هەڵە و ڕاڕامان هەبوو، بڕیاری بەشداربوونی ئەو ئۆپەراسیۆنەمان بۆ خۆیان بەجێ هێشت، ئەوانیش بەشدارییان کرد و یەکێتی ناچار کرا لە بالیسان بکشێتەوە. بەڵام سەرکردایەتیی یەکێتی، لە بەرانبەر ئەوەدا بڕیاری دا هێرش بکاتە سەر بارەگای هەرسێک لایەن، پارتی، سۆشیالیست و حزبی شیوعی، یەکەم هەنگاویان هێرشیان کردە سەر بارەگای حزبی شیوعی و سۆشیالیست لە ئاشقوولکە و پشتئاشان.)[1]

ئەو هەڕەشەیەی پارتی و سۆشیالیست لە سەرکردایەتیی حزبی شیوعییان کردووە، کە لە بەرەی جود دەری دەکەن، سوکایەتییەکی ئاشکرایە، تەنیا لەوپەڕی لاوازیدا، ڕەنگە بە ناچاری قبووڵ بکرێت. لەبری ئەوەی سەرکردایەتیی ئەو حزبە، دوای ئەو هەڕەشەیە، جوامێرانە پێداگریی لەسەر هەڵوێستی خۆی بکات، کەچی ترسنۆکانە لە بەرپرسیاریی هەڵاتووە. بڕیاری بەشداربوون یان بەشدارنەبوونی ئەو شەڕەیان داوەتە ئەو هێزە چەکدارەی لە

1- كريم احمد، المسيره، مصدر سابق ص٢٣٦-٢٣٧

بالیسـانە، کەچـی ئەو کـارە، پێوەنـدیی بە چارەنووسـی سیاسـی و سـەربازیی تەواوی حیزبی شیوعیی عێراقەوە هەبوو، سـەرەنجام کارەساتی پشتئاشانی خوڵقاند.

ڕۆژی ٢٦ی نیسـانی ١٩٨٣ هێـزی جـود لە بالیسـان پەلامـاری مەڵبەندی چواری یەکێتی دا. فاتیح ڕەسووڵ، لە یاداشتی ڕۆژانەیدا، ئامـاژە بەوە دەدات کە دەرکردنـی یەکێتیـی لە بالیسـان، شـەڕی نێوخۆی گۆڕی بە شەڕی نێوان بەرەی جود لەگەڵ یەکێتی. بە ڕای ئەو (پەلامـاردانی مەڵبەنـدی چـواری ینـک -یەکێتـی نیشـتمانی- و دەسـت بەسـەرداگرتنی، کـارێکی نـاڕەوا و سەرلێشـێواوی و کورتبینی تەواوی تێدا بەدی دەکرا. لە هەمـان کاتدا کرا بە فتیلەی خۆشـکردنی ئاگری شـەڕی ناخۆ و یەکتر کوشتن. چونکە تـا ئەو کاتە لە هەموو ڕوویەکەوە ماوەی ئەوە مـابوو، بە تـایبەت لەنێوان سەرکردایەتیی حزبی شیوعی عێراق و ینک (یەکێتیی نیشتمانی) کە بە ڕێگـای گفتوگـۆکردن، چـارەی ئاشـتییانە بـۆ نـاکۆکی و مەشاکیلەکان بدۆزرێتەوە.)[1]

پێـنج ڕۆژ دواتـر، بەرەبەیـانی یەکـی ئایـار هێزێکـی گەورەی یەکێتـی، بەڕابەری نەوشـیروان مسـتەفا، هێرشـیان کـردە سـەر بارەگای سەرکردایەتیی حزبی شیوعی لە پشتئاشـان. نزیکەی ٢٠ ئەندامی مەکتەبی سیاسی، کۆمیتەی ناوەندی و کۆمیتەی هەرێمـی کوردستان لەوێ بوون. بەشێکیان زۆر نەبوو لە دەرەوە هـاتبوون بـۆ کوردسـتان. ئەو کـاتە ٣٠٠ ئەنـدام و کـادیر و پێشـمەرگەی حـزبەکە لە پشتئاشـان کـۆ کرابـوونەوە، بەڵام تەنیـا ٨٠ کەسـیان پێشـمەرگەی شـەڕکەر بـوون. لە دەسـتپێکی شـەڕدا، هێزێکـی

1- فاتیح ڕەسول، سەرچاوەی پێشوو، بەرگی سێیەم ل ٢٦٨

سۆشیالیست، کە بارەگایان لە پشتئاشان بوو، بەدزی و بێ ئەوەی حزبی شیوعی ئاگادار بکەن، هەڵاتبوون. هەروا هێزێکی گەورەی پارتی و سۆشیالیست، کە مەڵبەندی چواری یەکێتییان گرتبوو، لە ناوچەکە بوون. سەرکردایەتیی حزبی شیوعی بە بروسکە داوایان لە پارتی کرد بە زوویی هێزیان بۆ بنێرن، کەچی پارتی هێزی نەنارد. پێشمەرگەکانی حزبی شیوعی دوو ڕۆژ قارەمانانە بەرگرییان کرد. دواتر بە چیای قەندیلدا، بە ناو بەفر و زریاندا هەڵگەڕان و بەرەو دیوی ئێران شۆڕ بوونەوە. لەو شەڕەدا ٦٠ کادیر و پێشمەرگەی حزبی شیوعی، شەهید کران.

سەرکردایەتیی حزبی شیوعی و پێشمەرگەکانی لە کوردستان، جگە لە پێشمەرگەکانی ناوچەی بادینان، هەموویان لەو ناوچانە بوون کە یەکێتی چالاکیی سەربازیی تێدا دەکرد، یان بارەگای پێشمەرگەی تێدا دامەزراندبوو. کەچی پارتی لەسەدا دەی هێزە چەکدارییەکەی لەو ناوچانە نەبوون. سەرکردایەتییەکەشی لە ڕاژان بوو. بۆیە سەرکردایەتیی حزبی شیوعیی، نامەسئولانە خۆی و کادیر و پێشمەرگەکانی هاویشتە ناو شەڕێکەوە، کە شەڕی ئەو نەبوو. کاتێک لە پشتئاشان تێک شکێندرا، تەنیا لە ناوچەی سلێمانی هێزی پێشمەرگەی مایەوە، چونکە بەهادین نووری و مەلا عەلی (عەبدوڵڵا قەرەداخی) کە بەرپرسی سیاسی و عەسکەری بوون، بە قسەی سەرکردایەتیی حزبیان نەکرد. پێکەوە لەگەڵ بەرپرسی ئەو کاتەی مەڵبەندی یەکێتیی نیشتمانی لە ناوچەکە، مەلا بەختیار، بڕیاریان دا شەڕی یەکتر نەکەن. بەم کارە تواندرا گیانی دەیان پێشمەرگەی هەردوو لایەن بپارێزرێت. لە تۆڵەی ئەوە سەرکردایەتیی حزبی شیوعی سزای ئەو دوو هاوڕێیەی دا. کەچی کاتێک کەریم ئەحمەد و ئەحمەدی بانیخێڵانی، بە دیل گیران،

زەلیلانە و بە داوای یەکێتی، بانگەوازی ڕاگرتنی شەڕیان ڕاگەیاند. ئەوان لەو کاتەدا دیل بوون، بە هیچ شێوەیەک مافی ئەوەیان نەبوو بە ناوی حزبەکەیانەوە قسە بکەن و بڕیار بدەن.

سەرکردایەتیی حزبی شیوعی، بە هاندان و پشتئەستووربوون بە هێزی پارتی و سۆشیالیست، چووە ناو شەڕ. کەچی ئەوان لە پشتئاشان بە تەنیا بە جێیان هێشت، دوای پشتئاشانیش لە ناوچەکە هەڵاتن. ئەوان مەبەستیان بوو حزبی شیوعی، بەجۆرێک لەناو خویناو و قوڕاوی شەڕی یەکێتیدا نقووم ببێت، کە نەتوانێت بە ئاسانی لێی بێتە دەرێ. هەروا تێکشکانی یەکێتی یان حزبی شیوعی، بە قازانجی ئەوان بوو. تا کارەساتی پشتئاشان حزبی شیوعی لە کوردستان، دووەم هێزی سیاسی و چەکداریی بوو. دوای ئەوە لاواز و زەبوون کرا، پارتی و سۆشیالیست، لە کوردستان، بوونە هێزی دووەم و سێیەم.

ساڵانێک دوای شکستی پشتئاشان، کەریم ئەحمەد، کە لەگەڵ عەزیز محەمەد حزبی شیوعییان بەرەو شەڕی نێوخۆ برد، بەخەبەر هاتووە و دەنووسێت:

(ئێمە لە شەڕێکی دۆڕاو هاتینەدەر، کە لە بنەڕەتدا شەڕی پارتی و سۆشیالیست بوو بەسەر ئێمەدا سەپێندرا. ئەنجامەکەی ئەوەیە کە لە کاتێکدا ئێمە لە کێشەی لایەنە کوردستانییەکان بێلایەن بووین و ڕۆڵی ئاشتکردنەوە و چارەسەری کێشەکان و یەکخستنی هێزەکانمان لە دژی دیکتاتۆریای شۆڤێنی دەبینی، ئێستا بووینە لایەنگری لایەنێک لە دژی لایەنێکی تر).[1]

ڕاستییەکەی شەڕ بەسەر حزبی شیوعیدا نەسەپێندرا. ئەگەر

---

1- کریم احمد، مصدر سابق ص٢٤١

سەرکردایەتیی حزبەکە، لاواز نەبووایە و پشتی پارتی و سۆشیالیستی نەگرتایە و ڕێگای نەدایە پێشمەرگەکانی لە گرتنی بالیسان بەشدار بن، کارەساتی پشتئاشان ڕووی نەدەدا. کارەساتەکە ئەنجامی ڕاستەوخۆی شەڕی بالیسان بوو. یان وەکوو بەهادین نووری دەڵێت: پشتئاشان لە تۆڵەی بالیسان بوو.

دوای کارەساتی پشتئاشان، مەکتەبی هەرێمی حزب شیوعی و مەڵبەندی پێشمەرگەکانی هەولێر، چوونە ناوچەی بارزان، کە وێران کرابوو. چەکدارانی پارتی، لەگەڵ سوپای پاسداران، چوونە سەریان و بە زەبری هەڕەشەی چەک، ناچاریان کردن، لە ماوەی شەش ڕۆژدا، ناوچەکە بەجێ بهێڵن. فاتیح ڕەسووڵ دەنووسێت:

(ژیانمان بە نیمچە ئاسوودەیی و پڕ تەفائول و ورەی بەرز بەسەر دەبرد.ساڵێک و چەند مانگێک بەم شێوەیە لە ناوچەی بارزان ژیاین. نیوەڕۆی ١٩٨٥/٨/٣ بارزانییێکی چەکدار، کە ناوی سەعید بارزانی بوو، کتوپڕ گەیشتە لامان. نامەیەکی پێ داین و ئێمەی بەجێ هێشت... ئەمە دەقی نامەکەیەتی:

(جاء الحق وزهق الباطل، ان الباطل کان زهوقا

الی: الشیوعی الکافر

ان ارض بارزان الطاهره لا یمکن ان تکون ملاذا للکفر والملحدین. ننزرکم باخلاء مناطق بارزان خلال سته ایام والا ان جحافل الاسلام جاهزه لاخراجکم منها بالقوه. وقد اعذر من انذر.

شیخ خالد بارزانی، رحمان رضائی.)[1]

دوای ئەوە فاتیح ڕەسووڵ دەنووسێ:

(ئەوەی ڕاست بێت ناوەڕۆکی ئەم نامەیە، وەکوو بۆمبێکی داندراوەی نهێنی لە ناکاو بتەقێت و لە هاژەن بدات، مێشک و

1- فاتیح ڕەسووڵ، سەرچاوەی پێشوو، بەرگی سێیەم، ل٣٧١-٣٧٢

هەست و جەستەی تاساندین، دڵتەنگی و ئازارمان گەیشتە ئەوپەڕی نارەزایی و بێزاری. لە بار و دۆخی ئەو کات قەت چاوەنۆڕی ئەم ڕەفتارەمان لە کەسانێکی دۆست نەدەکرد... بە ئاشکرا چاوسوورکردنەوە لە دەوروبەری خۆمان دەمان بینی ژمارەیەک لە هێستربار و چەکداری ڕیشپان، وێنەی خومەینیان بە سنگیانەوە هەڵواسیە و، بە فارسی و بە عارەبی قسەیان دەکرد، لەگەڵ ژمارەیەک چەکدارانی شێخ خالید بارزانی گەڕ و سووڕیان دەدا، وا خۆیان دەردەخست کە چاوەنۆڕی ئەوە دەکەن لەم ماوەی دانداراوە بارزان بە جێ نەهێڵین بە لولەی تفەنگ دەرمان پەڕێنن.)[1]

بەم جۆرە پارتی، بە کۆمەکی پاسداران، پاداشتی حزبی شیوعی دایەوە، کە سەرکردەکانی بۆ پشتگیریی ئەو، تێکەڵی شەڕی نێوخۆ بوون، دەیان پێشمەرگە و کادیریان بەکوشت دا.

سەرکردایەتیی یەکێتیی نیشتمانی و حزبی شیوعی بەرپرسن لەو شەڕ و تاوان و کوشتارەی لەنێوان هێزی پێشمەرگەی هەردوو لایەن، ڕوویان دا. تێکەڵبوونی حزبی شیوعی بەو شەڕە، تەنیا هەڵەیەکی سیاسی نەبوو، بەڵکو تاوانێک بوو، لە ئاستی ناپاکیدا بوو. چونکە سەرکردایەتیی حزبی شیوعی دەیتوانی بێلایەنیی خۆی بپارێزێت، هیچ لایەنێک نەیدەتوانی ئەو شەڕەی بەسەردا بسەپێنێت.

حزبی شیوعی دەبوو تێکەڵی ئەو شەڕە نێوخۆییە نەبێت، کە لە ناوەڕاستی شەستەکانەوە لە کوردستان هەبووە و هەزاران پێشمەرگەی تێدا بە کوشت دراوە. ئەوە گەمەیەکی دەوڵەتە ئیقلیمییەکانە، کە دەیانەوێت هێز و وزەی گەلی کوردستان، لە دژی

---

1- فاتیح ڕەسووڵ، هەمان سەرچاوە، بەرگی سێیەم، ل٣٧١-٣٧٢

خۆی و بۆ وێرانکردنی کوردستان و عێراق، بۆ کوشتنی هیوا و داهاتووی گەلەکەی بەکار بهێندرێت.

سەرکردە کوردەکانی حزبی شیوعی، کە چارەنووسی حزبیان دیاری دەکرد، مافی ئەوەیان نەبوو، حزبێکی سەرانسەریی عێراقی، کە پێشەنگی حزبە شیوعییەکانی ناوچەکە بوو، ڕابکێشنە ناو شەڕێکی لەو جۆرە. لەپێناوی گردێک، یان گوندێکی وەکوو بالیسان و شوێنی هاوشێوەی ئەو، کە لەسەر نەخشەی عراق هەر دیار نین، دەیان هاوڕێی عەرەب، کورد و ئاسووری، بەکوشت بدەن و سەدانیش بێهوا بکەن. ئەو هاوڕێیانە، بۆ ڕوخاندنی ڕێژیمی بەعس چەکیان هەڵگرتبوو، نەک بۆ بەشداربوون لە شەڕی نێوخۆی کوردستان.

سەرکردایەتیی حزبی شیوعی لە کوردستان، دەیتوانی خۆی لەو شەڕە بەدوور بگرێت. بەڵام بەداخەوە لەبەر لاوازی، عەقڵتەسکی و هەندێک بەرژەوەندیی شەخسی و بە هاندانی پارتی و سۆشیالیست و پشتبەستن بە هێزی پێشمەرگەی ئەوان، حزبیان تێکەڵی شەڕەکە کرد، بێ ئەوەی جوامێرانە خۆیان و هێزی پێشمەرگە بۆ شەڕکردن و عاقیبەتەکانی ئامادە بکەن. ئەوان لەو باوەڕەدا بوون، کە یەکێتی پەلاماری بارەگای سەرکردایەتیی حزبی شیوعی نادات، واتا ئەوان خۆیان پارێزراون. بەلایانەوە گرینگ نەبوو لەو شەڕەدا پێشمەرگەی حزب، لە ناوچەکانی تر بە کوشت دەدرێن. تەنانەت کاتێک یەکێتیی نیشتمانی دوو سەرکردەی حزبەکەی بە دیل گرت، کە لە بەرپرسانی سەرەکیی شەڕەکە بوون، وەکوو میوانی شەرەف ڕەفتاری لەگەڵ کردن، کەچی زیاتر لە دە پێشمەرگەی دیل، ناجوامێرانە شەهید کران. لە ماوەی ١١ ساڵ خەباتی چەکداری، سەدان کادیر و پێشمەرگەی حزبی شیوعیی عێراق

شـەهید و بریندار کـران، کەچـی یەک سـەرکردەی ئەو حـزبە، لە پێشمەرگایەتیدا، خوێن لە لووتی نەهات.

سـەرکردایەتیی حزبی شیوعی، بەرپرسیاری ئەو شکستەن، کە بەسـەر حزبیانـدا هێنـا. بە ڕای مـن ئەگەر بڕیـاری حزبـی شـیوعی عێراق بە دەست ئەو چەند سـەرکردە کوردەوە نەبووایە، حزبەکە تێکەڵی شەڕی نێوخۆ نەدەبوو، بەمەش گیانی دەیان پێشـمەرگە و کادیر، هەیبەت و پێگەی سیاسیی حزبەکەش دەپارێزران.

پێش کارەساتی پشتئاشان، حزبی شیوعی لە کوردستان، هێزی دووەم بوو، کەچی دوای شەڕەکە بوو بە هێزی هیچەم. قورسـایی سیاسی و عەسکەریی خۆی لە کوردسـتان لە دەست دا، لە ئاستی عێراقییشدا لاوازتر بوو. تەنانەت لای پارتی ئەوەنده زەلیل کرا کە حیزبوڵڵای ئیسلامیی خالید بـارزانی و پاسداری نـاردە سـەریان و لە بارزان دەریان کردن.

دوای ئەو شکستە، لەناو حزبی شیوعیدا کۆمەڵێک کێشـەی کۆن و نـوێی سیاسـی، ڕێکخراوەیـی و فیکـری دەرکەوتـن، کە حزبیـان لاوازتـر کـرد. سـاڵی ١٩٨٤ کۆنگرەی چـوارەمی حزبی شیوعی لە شاخ بەسترا. پێش کۆنگرە بەهادین نووری و مەلا عەلی (عەبدوڵڵا قەرەداخی) بە پاڵ لە حزب وەدەر نران.

لەو کـۆنگرەیەدا، بە نـاوی کـاری نهێنیـیەوە، دەسـەڵات درا بە عەزیـز محـەمەد، کە دە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی حزبەکە دیـاری بکات، بێ ئەوەی هـیچ کەسێک ناوەکانیـان بزانێت. عەزیز محـەمەد بە دەنگـی ئەو دە ئەنـدامەی کـۆمیتەی ناوەنـدی، تـوانی لەنـاو کـۆمیتەی ناوەنـدی، هەڵبـژاردنەوەی خـۆی بە سـکرتێری یەکەمـی حـزبەکە، مسـۆگەر بکـات. هەروا تـوانی ئەو کەسـانەی خـۆی مەبەسـتی بـوو، لە مەکتەبـی سیاسـی، دایانبنێت، هەر کەسێکیشـی

بەدڵ نەبــوو کەنارنشــینی بخــات. بەو جــۆرە عەزیــز محــمەد و بەرپرسـانی تر، کە حزبیـان تووشـی شـەڕی نێوخۆ کرد، لەجیاتی ئەوەی سزا بدرێن، لە سێبەری شاخ و لە سـایەی تفەنگدا، کرانەوە بە سـەرکردەی حـزب و ئەنـدامی مەکتەبـی سیاسـی و کـۆمیتەی ناوەنـدی. ئەوان لەو شکستەشـدا، وەکـوو بەرزەکـی بانــان بــۆی دەرچوون. دوای کۆنگرە زۆر پێشمەرگە و کادیری حزبی شیوعی، لەگەڵ چەند ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی، لە حزب دوور کەوتنەوە.

بەڵام هەڵە و بەرپرسـیاریی سـەرکردایەتیی حزبـی شـیوعی، لە شەڕی نێوخۆدا، هەرچەندێک بوو بێت، ناتوانرێت پاکانە بۆ تـاوانی پشتئاشان بکرێت، کە چەندان پێشمەرگەی حزبی شیوعی، بە دیلی کوژران. ئەمە پەڵەیەکی ڕەشە بە نێوچاوانی یەکێتیی نیشـتمانییەوە. دیلکوژی لە کوردسـتان، وەکـوو تـاوانی وەحشـییانە و پەڵەی ڕەش بە مێـژووی بزاڤـی چەکـداریی کـورد و ڕوخسـاری دیلکـوژانەوە، دەمێنێتەوە.

سەرانی بزاڤی چەکداری، بە درێژایی دەیـان سـاڵ قەت نەیـانوێرا سـەرباز و ئەفسـەری عێراقـی، بە دیلیـی بکـوژن، کەچـی سـەدان پێشـمەرگەی دیلیـان کوشـتووە. لای ئەوان قەت ژیـانی پێشـمەرگە، هێندەی ژیانی مەڕێک، بایەخی نەبووە و نییە و نابێت.

سـەرکردایەتیی حزبـی شـیوعیی عـراق نە لە سیاسـەتدا ژیـر، دووربین، پراگماتی و عەقڵانی بوون، نە لە مەیدانی شـەڕدا ئـازا و جـوامێر دەرچـوون. ئەوان لە سیاسـەتدا قارەمـانی شکسـت و لە شەڕدا پێشـەنگی بەزین بوون.

## ٣
## چەند ڕووداوی جۆراوجۆری شاخ

### ئا- ئەوینکوژیی کۆمۆنیستانە بە بەهانەی ئاینی

لە بارەگــای ســەرکردایەتیی حزبــی شــیوعی و ڕاگەیانــدن لە تــوژەڵە، چەنـد هـاوڕێی کـچ هەبـوون، کە کۆتـایی سـاڵی ١٩٧٩ بە ناچاری، لە ترسی گرتن، ڕوویان لە شاخ کردبوو، دوو هاوڕێیان عەرەب بوون. یەکێکیان بە ناوی لینا، ئەوی تریان بە ناوی ژیان خۆیان ناساندبوو. هەردووکیان تازە قۆناخی خوێندنی ئامادەییان تەواو کردبوو. لینا خەڵکی نەجەف یان کەربەلا بوو. کچێکی هێمن، بەڕێز، ڕۆحسووک و کتێبدۆست بوو. جار جار دەهاتە ژووری ڕاگەیاندن، سۆراخی کتێبی نوێی دەکرد، بۆ ئەوەی بیخوێنێتەوە. دوای ماوەیەک لینا لەگەڵ هاوڕێ سەلام، کە لە بارەگای ئێمە بوو، ئاشقی یەکتر بوون، بڕیاریان دا پێکەوە هاوسەرگیریی بکەن.

هەواڵەکە زوو لەناو پێشمەرگەکاندا بڵاو بۆوە. دڵخۆش بووین کە تەنانەت لەو دۆخە سەختەشدا، ئەوین دەتوانێت چرۆ بکات، بە هیــوا بــووین ئەو ئەویــنە بەر بگرێــت. بەڵام چەنــد ئەنــدامی سەرکردایەتیی حزبی شیوعی، بە بەهانەی ئەوەی سەلام ئێزدییە و لینا شیعەیە، دژی ئەو کارە ڕاوەستان. چەند هاوڕێی ئێزدی، کە لە

شاخ بوون، ئه‌وانیش پێیان باش نه‌بوو سه‌لام کچێکی شیعه بهێنێت. سه‌لام هه‌وڵی زۆری دا، به‌ڵام سوودی نه‌بوو. دڵشکاو و بێهیوا، له‌گه‌ڵ چه‌ند کادیر و پێشمه‌رگه‌ی ئێزدی و ناوچه‌ی بادینان، ڕه‌وانه‌ی بادینان کرا. سه‌لام له‌وێوه به‌رده‌وام نامه‌ی بۆ هاوڕێکانی ده‌نارد، بێزاریی ده‌رده‌بڕی و ئه‌ندامێکی کۆمیته‌ی ناوه‌ندیی تومه‌تبار ده‌کرد، که ناهێڵێت سه‌لام و لینا به مورادی خۆیان بگه‌ن. به هۆی ئه‌و نامانه هاوڕێ سه‌لامیان له بادینانه‌وه، بۆ لێپرسینه‌وه و سزادان، هێنایه‌وه باره‌گای سه‌رکردایه‌تی، له تووژه‌ڵه. له‌وێ به به‌ر چاوی لیناوه، زیندانی کرا. دوای ده‌وروبه‌ری دوو مانگ ناردیانه‌وه بادینان و له‌وێ شه‌هید کرا.

دواتر، که من له شاخ نه‌مابووم، هه‌مان کار له‌گه‌ڵ دوو پێشمه‌رگه‌ی تر، کوڕێکی مه‌سیحی و کچێکی مسوڵمان، دووباره کرایه‌وه. به هۆی جیاوازیی ئاینی، ڕێگه‌ی ئه‌وانیشیان نه‌دا ببنه هاوسه‌ری یه‌کتری. له هه‌ردوو حاڵه‌ته‌که‌دا، ئه‌گه‌ر کوڕه‌کان مسوڵمان و کچه‌کان ئێزدی و مه‌سیحیی بوونایه، به دڵنیاییه‌وه، ڕێگرییان لێ نه‌ده‌کردن. حزبی شیوعی، بانگێشه‌ی یه‌کسانیی ژن و پیاوی ده‌کرد، که‌چی له بواری کۆمه‌ڵایه‌تیدا، به تایبه‌ت سه‌رکرده کورده‌کان، کێوی بوون، وه‌کوو فه‌قێ و کۆلکه مه‌لا ڕه‌فتاریان ده‌کرد.

ئه‌و کاره ته‌نیا تاوانێک نه‌بوو به‌رانبه‌ر به‌و هاوڕێیانه کرا، به‌ڵکو سووکایه‌تیش بوو به ئازادی و یه‌کسانیی ژن و پیاو، به مارکسیزم و هه‌ر به‌هایه‌کی ئینسانی. باوه‌ڕ ناکه‌م سه‌رکردایه‌تیی هیچ حزبێکی کۆمۆنیستیی دنیا، کاری له‌م جۆره‌ی کردبێت.

## بێ- شەهیدبوونی هاوڕێ ئەحمەدی مارف

لە پێشـــمەرگایەتێدا، مـــرۆڤ لە هەرکـــوێ بێـت، تەنیـــا چەنـــد هەنگاوێـک لە مەترسـی برینـداربوون، یـان مـردنەوە دوورە. بـۆیە پێشمەرگە تەنیا لە شـەڕدا، یان لە بۆردومـانی فرۆکەدا نـاکوژرێن، یان زامدار و کەمئەندام نـاکرێن، بەڵکو زۆر هۆکاری تریش هەن، لەوانە گـوللەی وێـڵ، مـارپێوەدان، هەڵـدێران لە شـاخ، وەرگەڕانـی ئۆتۆمبێـل، تلبـوونەوەی بەرد و تـاوێر، ڕەقبـوونەوە لەنـاو بەفـردا، لافاو و ئاوبردن لە دەمی پەڕینەوەی ڕوبار و هۆکاری تر.

بڕیـار بـوو ڕۆژی ٨ ی تەمـووزی ١٩٨٢ لەگەڵ ئەحـمەد مـارفی نـانەوا، کە کـادیرێکی قسـەخۆش و جـوامێری حزبـی شـیوعی بـوو، پێکەوە بچین بۆ ئێران. مام ئەحمەد دەیەویست سەردانی کوڕەکەی بکات، کە لە شەڕی عێراق و ئێران بە دیل گیرابوو، لەگەڵ هەزاران دیلـی تـری شـەڕ، لە ئۆردوگـایەکی تـایبەت، دەستبەسـەر بـوون. ڕۆژێـک پێشـتر مـام ئەحـمەد بەسـەر بنکەکـانی پێشـمەرگەدا گەڕا، خواحـــافیزی لە چەنـــد هـــاوڕێیەک کـــرد، لای ئێـــواری گەڕایەوە بارەگاکەمان، کە لە دۆڵەکەی پشتی نۆکان بوو.

ئەو ئێـوارەیە بڕیـار بـوو عـومەر عەلـی شـێخ، لەبـارەی دۆخـی سیاسـیی عێـراق و کوردسـتان، قسـە بکـات. مـام ئەحـمەد و مـن

پێکەوە لە شوێنی سیمینارەکە، کە سەکۆیەک و تەختاییەک بوو، ڕاوەستابووین، لەبارەی سەفەرەکەمان دەدواین. لەو دەمەدا عومەر عەلی شێخ هات لە ناوەڕاستی سەکۆکە دانیشت. بە ڕێکەوت مام ئەحمەد لە سەکۆکە نزیکتر بوو، یەکسەر لە تەنیشت هاوڕێ عومەر و منیش لە تەنیشت مام ئەحمەد دانیشتم. لە سیمینارەکەدا نزیکەی بیست پێشمەرگە، لەوانە هاوڕێی بەڕێز پەخشان زەنگەنە، هاوسەری هاوڕێ عومەر، هاوڕێیانی ڕاگەیاندنی هەرێم و پێشمەرگەکانی تری بارەگاکە، بەشدار بوون. لە گەرمەی سیمینارەکەدا، بەردێکی سێ چوار کیلۆیی لە گردەکەی پشتمانەوە، کە بارەگای ئێستگەی دەنگی گەلی عێراق بوو، خلۆر بۆوە و بە پشتەسەری هاوڕێ ئەحمەد کەوت. یەکسەر لە سەکۆیەکەوە فڕێی دایە تەختاییەکە و بەدەمدا خستییە سەر زەوی. لە چاوتروکانێکدا خوێنێکی سووری خەست، وەکوو نیوەبازنەیەک لەسەر ئەرزەکە، بە دەوری سەریی هاوێ ئەحمەددا، بڵاو بۆوە. هاوڕێیەک بە پەلە چوو بە دوای دوکتۆر سادق (د.موهەنەد بەراک) کە بەرپرسی نەخۆشخانەکەمان بوو، بەڵام هاوڕێ ئەحمەد یەکسەر تەوا بوو.

ئەگەر من لە تەنیشت عومەر عەلی شێخ بوومایە، یان بەردەکە بیست سانتیمەتر بەلای چەپدا هاتبووایە، بە سەری من دەکەوت، ئەگەر بەلای ڕاستدا چووبایە، بە سەری هاوڕێ عومەر دەکەوت. ئەو ڕووداوە هەمووومانی خەفەتبار کرد، لە مەترسییەکیش ئاگاداری کردینەوە، کە لەو دۆڵەدا بیرمان لێ نەکردبۆوە. ڕۆژی دواتر بە دڵێکی پڕ لە خەمەوە، شکۆمەندانە هاوڕێ ئەحمەدمان لە گۆڕستانی زەڵێ بە خاک سپارد.

ئەوە دووەم جار بوو تووشی ڕووداوی لەو جۆرە ببم.

## پێ- جارێکی تریش دەمانچەکەت تاقی ناکەیتەوە؟

ئەو دەمەی بەرپرسی پێشمەرگەکانی ناوچەی پشدەر بووم، بارەگاکەمان لە زەڵێ بوو. پێشمەرگەکان لە دوو ژووی گەورەدا دەنووستن. من و مەحموود حاجی فەقێ خدر، کە کەسایەتییەکی دیار و بەرێزی ناوچەی پشدەر بوو، لە ژوورێکی بچووکی چوارگۆشەیی، سێ مەتر بە سێ مەتر دووجا، دەنووستین.

هاوڕێ مەحموود لە ساڵانی پەنجاکانەوە ئەندامی حزبی شیوعی و ساڵانێک بەرپرسی ڕێکخستنی ئەو حزبە بوو لە قەڵادزێ. بەڵام وەکوو کەسێکی محافەزەکار، بۆ هەندێک مەسەلەی کۆمەڵایەتیی دەڕوانی. ساڵی ١٩٧٣ گیرا و ڕەوانەی زیندانی خەلان و ڕایاتی پارتی کرا. زۆر ئازار و ئەشکەنجەی بینی، بەڵام جوامێرانە خۆی ڕاگرت. ساڵی ١٩٧٤، وەکوو نوێنەری حزبی شیوعی بوو بە ئەندامی ئەنجومەنی تەشریعی، هاوینی ١٩٧٩ هاتە شاخ و لای ئێمە بوو.

ئەو کاتە کاک مەحموود بەتەمەندا چووبوو، بۆ کاری پێشمەرگایەتی و گەڕان لەگەڵ پێشمەرگە، نەدەگونجا. هێشتا کارێکی حزبیی پێ نەدرا بوو. هەمووومان زۆر ڕێزمان دەگرت.

کاک مەحموود دەمانچەیەکی بچووکی لەگەڵ خۆی هێنابوو،

زوو زوو خـــاوێنی دەکـــردەوە. ڕۆژێکـــی پـــایز هەردووکمـــان لە ژوورەکە بووین. جێی نووستنمان، کە جێی دانیشتنیشمان بوو، بە جـۆرێکی تەریبـــی ڕاخرابـــوو، ڕوومـــان لە پەنـــجەرە و دەرگـــای ژوورەکە بوو. تەنیا نیو مەترێک بۆشایی لە نێوانماندا بوو. من لەسـەر جێگاکەم لاقم درێژ کردبوو، پاڵم بە دیواری پشتسـەرم دابوو کتێبم دەخوێندەوە، ئەویش لە جێگـاکەی خۆی دانیشـتبوو دەمانچەکەی خاوێن دەکردەوە. چەند جار دەمانچەکەی، بە یەدەگی پڕ لە فیشـەک و بێ یەدەگ ڕاکێشـا، فیشـەکی بـردە بەر و فڕێـی دایەوە و دەسـتی بە پەلاپیـتکەی دەمـانچەکەدا هێنـا. لـوولەی دەمـانچەکەی ڕووی لە لای ئەژنـۆم بـوو. مـن هۆشـم لای کتێبەکە نەمابوو، پێم وت هاوڕێ لوولەی دەمانچەکەت لە لای قاچم مەکە!. وتـی مەترسـە فیشـەکی تێـدا نیـیە. لـوولەی دەمـانچەکەی لە لای سۆپاکە کرد، کە لە خوار پێی من بوو. بەڵام دوای تاوێک لوولەی دەمناچەکەی بەرەو لای قاچم وەرسوڕاندەوە. تا توانیم خۆم بۆ لای دیـوارەکە کشـاندەوە، کتێـبەکەم داخسـتەوە بەو نیـازەی ژوورەکە بە جێ بهێڵم. لەپڕ کاک مەحموود گوللەیەکی لە دەست دەرچوو، تەنیا دە سانتیمەترێک لە تەنشت ئەژنۆی چەپم تۆز و خۆڵی زۆری لە ئەرزەکە هەستاند و کیسەخەوەکەمی کون کرد، کە لەسەری پاڵم دابۆوە. کاک مەحموود کەمێک شڵەژا، دەمانچەکەی دانا و تەماشای کردم، بەڵام من هیچ خۆم تێک نەدا و نەجوڵام، چـونکە چـاوەڕێی ئەو ڕووداوەم دەکـرد و پێشـتریش ئاگـادارم کردبۆوە. بە هێمنی و کەمێک بێزارییەوە لێم پرسی:

هاوڕێ جارێکی تریش دەمانچەکەت تاقی ناکەیتەوە؟!

بە هۆی ئەو قسەیە، هاوڕێ مەحموود لە من دڵگران بوو.

## تێ- شەهیدبوونی هاوڕێم شەفیق کەریم

لە ناوەڕاستی ئاداری ١٩٨٠ هاوڕێم شەفیق کەریم (شاهۆ) ١٩٤٩-١٩٨٠ هاتە توژەڵە، بە بینینی دڵخۆش بووم. ئەو کەسێکی بەڕێز، ڕووناکبیر، کەمدوو، هاوشاری و هاوڕێم بوو. ساڵی ١٩٧١ لە زانکۆی بەغدا، بەشی زمانی ئینگلیزی، خوێندنی تەوا کرد، بوو بە مامۆستا لە سلێمانی. کچی نووسەر ساجید ئاوارە هاوژینی بوو. تا نەهاتە شاخ، نەمزانیبوو ئەندامی حزبی شیوعییە. پێی وتم لەگەڵ مەفرەزەیەک دەچێت بۆ ناوچەی سلێمانی، بۆ ئەوەی لەوێ چاوی بە هاوسەر و کچە ساواکەی بکەوێت، کە وەکوو لە بیرم بێت وتی ناوی بینابیە.

شەفیق پێشتر چەند تێکستێکی هزری و چەند نووسینی کارل مارکسی لە ئینگلیزییەوە کردبوون بە کوردی، بڵاوی کردبوونەوە. لە توژەڵە شەوێک لای من مایەوە، ڕێک کەوتین کە گەڕایەوە لە ڕاگەیاندن لەگەڵمان کار بکات، چونکە پێویستمان پێی بوو. توانای نووسین و تەرجومەکردنی هەبوو. لە بارەگای سەرکردایەتی و ڕاگەیاندن کەسمان نەبوو زمانی ئینگلیزی بە باشی بزانێت.

مەفرەزەکە، لە توژەڵەوە ڕۆیشتن، هاوڕێ شەفیق تفەنگێکی پەڕەشوتی پێ بوو، حەمە کەریم قەرەچەتانی بەرپرسی

مەفرەزەکەیـان بـوو. ڕۆژی ٢٤-٣-١٩٨٠ لە نزیـک سـلێمانی، لای نیوەڕۆ، بە پێچەوانەی ڕێنماییەکانی حزبی شیوعی کە دەبوو بە ڕۆژ نەچـنە نـاو گونـدەکان، چووبـوونە گونـدی قـزلەر. لەوێ جاسووسێک بە ئامێری بێتەل، خەبەری لێ دابوون، یەکسـەر لە سـلێمانییەوە بە نـۆ فـڕۆکەی کـۆپتەر، جـاش و سـەربازیان بـۆ ناردبوون و گەمارۆی گوندەکەیان دابوو. پێشمەرگەکان، ئازایانە تا شـەو شـەریان کردبـوو، لە ئەنجامـدا شـەفیق کەریـم لەگەڵ چـوار هاوڕێی تر، شەهید کران. یەکێکیان نیگارکێشی عێراقی، هونەرمەند موعتەسەم عەبدولکەریم ١٩٥٣-١٩٨٠ بوو.

مەعتەسـەم کوڕێکی ئەسـمەری باڵابەرزی ڕوونـاکبیر، بەڕێـز و هێمن بوو، هەندێک جار پێکەوە باسی ئەدەب و هونەرمـان دەکرد. موعتەسەم عەبدولکەریم یەکەم هـاوڕێی عەرەب بوو، کە لەو بزاڤە چەکدارییە نوێیەدا شەهید کرا. سێ شەهیدەکەی تر ئەمانە بوون:

حوسـێن ڕەشـید مەعـروف (فەلاح) ١٩٥٥-١٩٨٠، عـومەر قـادر (مەلا حوسـێن) ١٩٣٥-١٩٨٠، کەمـال مـام هەمـزە کەریـم (هەژار) ١٩٥٠-١٩٨٠.

ئەو کارەسـاتە هەموومـانی تەزانـد. ئەوان دووەم پۆلە شـەهیدی ئەو بـزووتنەوە چەکـدارییە نـوێیەی حزبـی شـیوعی بـوون. دوای ماوەیەک هۆنراوەیەکم بە نـاوی (لە کوێ بتنێژم) بە یـادی هـاوڕێ شـەفیق نووسـی، کە لە ١٩٨١ لە گۆڤـاری یەکێتیـی نووسـەرانی کوردستان، پێروو، بڵاو کرایەوە:

بایەکی سپی لەو بنارەوە هەڵدەکات  
گیانی شپرزەم دەتەنێت  
گژوگیای گۆڕستان و

ئارەقەی سەر ڕوخسارە جوانەکەت دادەپۆشێت،
خۆڵی سەر زامەکانت بەنێو ئێوارەدا
پەخش دەکات.
بایەکی سپی پرچە ئاڵۆسکاوەکەت
وێنەی پۆلەتیشکێکی نێو ئاو ڕادەژەنێت.
زامەکانم بە خۆڵەمێش دەشواتەوە
بەرەو ئاسۆی لێڵی ونبوون هەڵمدەگرێت
پەنجەکانم وەکو چیلکە ڕەق و ویشک دەکاتەوە.

بە پەنجەی سڕ و بێ نینۆک چەپکە گزنگێک
بۆ زامەکانت، چۆن بچنمەوە؟
داستانی سوورت لەسەر تاوێر و باڵای ئێوارە
چۆن بنوسمەوە؟
دڵیشم شەختە و گڕ تەنیویەتی
چۆن تەرمەکەتی تیا بشارمەوە؟

٤

## هەڵاتن لە زەماوەندی خوێن

ئەو ماوەیەی لە شاخ بووم نەمبینی پێشمەرگەکانمان مەشق و ڕاهێنانی سەربازییان پێ بکرێت. بەڵام کۆمەڵێک هاوڕێی تر، کە زۆربەیان عەرەب بوون و ڕوویان لە لوبنان و سووریا کردبوو، پێش ئەوەی بگەڕێنەوە کوردستان، لە لوبنان، لە کامپی بزاڤی ڕزگاریخوازیی فەلەستینی، ماوەیەکی کورت ڕاهێنانی سەربازییان پێ کرابوو. هەروا گروپێک پێشمەرگە، کە ١٢ کەس بوون، لە کوردستانەوە بۆ کۆماری دیموکراتیی باشووری یەمەن نێردران[1]. لەوێ لە کۆلێجی سەربازی خوێندیان، وەکوو ئەفسەر گەڕانەوە شاخ. چەند ساڵ دواتر، سێ گروپی تر، لەوێ خوێندنیان تەواو کرد. تێکڕایان پەنجا تا پەنجا و پێنج ئەفسەر بوون.[2]

مەکتەبی عەسکەریی حزبی شیوعی، بەرپرسی هێزی پێشمەرگە بوو. ئەو پێشمەرگانەی لە نێوزەنگەوە چەکدار دەکران و بۆ

---

1- ئەو کاتە یەمەن دوو بەش بوو، لە باشوور، کۆماری دیموکراتیی یەمەنی باشوور هەبوو، شاری عەدەن پایتەختی بوو. حیزبی سۆشیالیستی یەمەنی، کە حزبێکی چەپی مارکسی بوو، حوکمڕان بوو. دۆستی حزبی شیوعی عێراق بوو، کۆمەکی زۆری پێ کرد. لە ناوەڕاستی نەوەتەکانی سەدەی پێشوو، لەگەڵ یەمەنی باکوور یەکیان گرتەوە.

2- ئەو زانیارییەم لە هاوڕێ ملازم شوان شێخانی، کە یەکێکە لەو ئەفسەرانە، وەرگرت.

چالاکیی چەکداری و کاری سیاسی، دەنێردرانە ناوچەکانی سلێمانی، هەولێر و گەرمیان، پێشتر ڕاهێنانی سەربازییان پێ نەکرابوو. بەشێکیان گەنج، خەڵکی شار و خوێندەوار بوون، یەکەمجار بوو دەست بدەنە چەک، هیچ زانیارییەکیان لەبارەی شەڕی پارتیزانی و تەکنیکی خۆپاراستن، پەلاماردان و گرتنی سەنگەر و ڕەبیەیی سەربازی و تەکنیکی داکۆکیکردن نەبوو. تەنانەت کاتێک بڕیار درا لەگەڵ پۆلێک پێشمەرگە، جەولەیەک بە ناوچەی پشدەر و بیتوێندا بکەین، کەس لێی نەپرسیم ئایا من هیچ شارەزاییەکم لە کاری سەربازیدا هەیە، یان تەنانەت دەتوانم کلاشینکۆفەکەم بەکار بهێنم! وەکوو ئەوەی هەموومان، لەگەڵ ناوکبڕینماندا، ڕاهێنانی سەربازیمان پێ کرابێت!

دووساڵێک دواتر مەکتەبی عەسکەریی حزبی شیوعی، دەورەیەکی ڕاهێنانی سەربازی، بۆ فێرکردنی تۆپهاویشتن کردەوە. من و چەند پێشمەرگە بەشداریمان تێدا کرد، یەکێکیان هاوڕێ شێرزاد شێر بوو، کە خوێندنی ماجستەری لە یەکێتیی سۆڤییەت تەواو کردبوو و گەڕابۆوە بۆ کوردستان، ئێستا لە سوێد دەژی. هاوڕێ موحسین یاسین، کە کەسێکی بەڕێز و پێشمەرگەیەکی لێهاتووی دێرین بوو و ئێستا لە هەولێر دەژی، مامۆستامان بوو.

لە شەڕی پارتیزانیدا تۆپ، مەگەر بە دەگمەن، دەنا بەکار ناهێندرێت. سەرەتا وامزانی هەندێک تۆپمان دەست دەکەوێت و دەبێت بۆ کارێکی تایبەت خۆمانی بۆ ئامادە بکەین. کەواتا چ زیانێکی هەیە ئەگەر منیش تەکنیکی بەکارهێنانی تۆپ فێر ببم، لە کاتی پێویستدا، دەکرێت سوودی هەبێت. لە کۆتاییدا من لە دەورەکەدا بە یەکەم دەرچووم و پاداشتێکم وەرگرت، کە هیچ پێوەندیی بە تۆپچێتی و تۆپهاویشتنەوە نەبوو. لەوە دەچوو

هاوڕێیـانی مەکتەبـی عەسـکەری، دوای تەواوکردنـی ڕاهێنـانەکە، بیریـان کەوتبێتەوە کە مـن نووسـەرم و لە ڕاگەیانـدن کـار دەکەم، بۆیە قەڵەمێکیان وەکوو پاداشت بۆ هەڵبژاردبووم، کە لاموایە، بۆ من، ماقووڵترین بەشی ڕاهێنانەکە بوو. چونکە دواتر قەت دەستم بە تـۆپ نەکەوتەوە، کەچـی تـا مەرەکەبـی قەڵەمەکە تەواو بـوو، بەکارم هێنا.

لەو ماوەیەی لە شاخ بووم یەک دەورەی هزری و ڕۆشنبیری، بۆ پێشمەرگەکانی بارەگای مەکتەبی هەرێمی کوردستانی حزب کرایەوە، کە سێ هەفتەیەکی خایاند، لاموایە ١٦ هاوڕێیەک تیایدا بەشـدار بـوون. بەهـادین نـووری باسـی مێـژووی بـزووتنەوەی کرێکـاری و کۆمۆنیسـتیی عێـراق و نـاوچەکە و دنیـای بـۆ پێشمەرگەکان کرد، منیش فەلسەفەی ماتریالیزمی دیالێکتیکی و ماتریالیزمی مێژووییم پێ وتن.

هەندێک جار، لە بۆنەی سیاسی، یان سەری ساڵ، سیمینار و چالاکیی ڕۆشنبیری و هونەری، لە هەندێک بنکەدا ڕێک دەخرا. لەو بوارەدا هاوڕێیانی عەرەب دەستپێشخەر و چالاک بوون.

مـن لە دۆخـی سیاسـیی کوردسـتان و شـەڕی نێوخـۆ بێتـاقەت بـووم. هیـوایەکم بەو ئـاژاوە چەکدارییە نەمـابوو، کە لە ناوەڕۆکدا کوردکـوژی و کاتبەسـەربردن بـوو. چـاوەڕێی ئەوە دەکـرا، لە مـاوەیەکی کورتـدا ئێـران لە شـەڕەکەدا سـەربکەوێت و ڕێژیمـی عێراق بڕوخێت، ئێمەش بگەڕێینەوە شار. کار گەیشتبووە ئەوەی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی حزبی شیوعی گرەویان لەسەر ئەوە دەکرد، کە دوای چەند مانگ لەشکری ئێران، دەتوانێت بەغدا داگیر بکات و ڕێژیمی عێراق بڕوخێنێت! هەندێک جار خۆم بە نـامۆ دەبینـی، لە خـۆم دەپرسـی ئایـا مـانەوەی مـن لێـرە چ سـوود و

مانایەکی هەیە؟

لەو دۆخەشدا، من لەوێ مابوومەوە، چونکە هەندێک ئەرک و ئیلتیزاماتی سیاسی، ڕۆژنامەنووسی و ئەخلاقیم کەوتبوونە ئەستۆ. هاوڕێیانم زۆر ڕێزیان دەگرتم و خۆشیان دەویستم. سەرکردایەتیی حزبی شیوعی بە ئاسانی دەستبەردارم نەدەبوون، نەشمدەویست خۆبەسەر، بێ ئەوەی حیساب بۆ هیچ شتێک بکەم، ئەوێ بە جێ بهێڵم. من ئارەزوومەندانە گەڕابوومەوە کوردستان، بەڵام ئەو ئازادییەی کەسێک لە بڕیارداندا هەیەتی، مەرج نییە لە گۆڕینی بڕیارەکەیدا هەیبێت. پشیلە ناچێتە شوێنێک، ئەگەر دڵنیا نەبێت لەوەی کە دەتوانێ بە ئاسانی لێی بێتەوە دەرێ. بۆیە زۆر بە دەگمەن، مەگەر پشیلەی بێئەزموون، لە شوێنێک عاسێ دەبێت. کەچی مرۆڤ، ئەگەر وریا و ژیریش بێت، لە ساتێکدا بە پەلە، یان تەنانەت دوای بیرکردنەوە و بە باوەڕەوە، بڕیارێک، لەبارەی ژیانی تایبەتی خۆی، یان مەسەلەیەکی تر دەدات، بەڵام لەوانەیە ساڵانێکی زۆر، بەدەست ئەنجامی بڕیارەکەیەوە گرفتار ببێت و نەتوانێت بە ئاسانی پەشیمان ببێتەوە. بۆیە بڕیار و کرداری هەر کەسێک عاقیبەتی خۆی، یان باجی خۆی هەیە، دەبێت ئەو کەسە بەرپرسانە لەگەڵی ڕەفتار بکات و بیر لە باج و عاقیبەتەکەی بکاتەوە.

پاش پەرەگرتنی شەڕی نێوخۆ، دۆخەکە گۆڕدرا. من لە سەرەتاوە دژی ئەوە بووم حزبی شیوعی پشتی لایەنێکی شەڕەکە بگرێت، چونکە سەربەخۆبوون و بێلایەنبوونی لەو شەڕەدا، چاوگەی هێز و هەیبەتی حزبەکە و نیشانەیەکی ڕەواییبوونی خەباتە چەکدارییەکەی بوو. ئەو ڕۆژانەی شاخ و ئێستاش، لەو باوەڕەدام کە تێکەڵبوونی حزبی شیوعی بە شەڕی نێوخۆ کارێکی حەتمی نەبوو، دەکرا سەرکردایەتیی حزبەکە خۆی لێ بە دوور

بگرێت، گیانی ده‌یان پێشمه‌رگه بپارێزرێن. ئه‌و بۆچوونه‌م له شاخ، به سه‌رکردایه‌تیی حزب گه‌یاندبوو. حزبی شیوعی له لایه‌نی سیاسی و ئایدیۆلۆجی له لایه‌نه‌کانی تر جیاواز بوو، به‌لام کێشه‌ی سیاسی و سه‌ربازیی له‌گه‌ڵ هیچ لایه‌نێکیاندا نه‌بوو. هه‌موویان حسابیان بۆ ده‌کرد و وه‌کوو نێوانگرێکی متمانه‌پێکراو بۆیان ده‌ڕوانی.

به مێرمنداڵی شه‌ڕی نێوخۆ و تاوان و کاره‌ساته‌کانیم دیتبوون، دڵنیا بووم ئه‌و جۆره شه‌ڕه به‌ره‌و شکست و ئاشبه‌تاڵمان ده‌بات. هه‌روا له ته‌مه‌نی لاویدا دوو جار به ئاگری ئه‌و شه‌ڕه داخ کرابووم، ئه‌شکه‌نجه درابووم، زیندانی کرابووم و له خوێندن دواکه‌وتبووم. له‌به‌ر تێکڕای ئه‌و هۆکارانه‌ی باس کران، نه‌مده‌ویست ببم به به‌شێک له تاوانی شه‌ڕی نێوخۆ. بۆیه نه‌ده‌کرا له‌وێ بمێنمه‌وه، چونکه به بێ ویستی خۆم، وه‌کوو شه‌یکسپیر ده‌ڵێت، ده‌بوو ببم به‌و مرۆڤه‌ی که‌سانی تر ده‌یانه‌وێت. من وه‌کوو به‌رپرسی ڕاگه‌یاندنی هه‌رێمی کوردستانی حزبی شیوعی، ده‌بوو شه‌یپووری شه‌ڕ هه‌ڵگرم و پاکانه بۆ شه‌ڕێک بکه‌م، که نه باوه‌ڕم پێیه‌تی، نه له بڕیاردانیدا به‌شداربووم و نه ده‌توانم له ڕاگرتنیدا ڕۆڵێکم هه‌بێت. ئه‌مه بۆ من ته‌نیا مه‌سه‌له‌یه‌کی سیاسی و پابه‌ندبوونی حزبی نه‌بوو، به‌ڵکو پێش هه‌ر شتێک، وه‌کوو مرۆڤ و شاعیر، مه‌سه‌له‌یه‌کی ئینسانی، نیشتمانی، ڕووناکبیری و ئه‌خلاقیی بوو. بۆیه بڕیارم دا شاخ به جێ بهێڵم. داوام له عومه‌ر عه‌لی شێخ کرد، که ئه‌وکاته به‌رپرسی یه‌که‌می کوردستان بوو، ڕێگه‌م بدات بچمه ده‌ره‌وه، ده‌مه‌وێت ئه‌گه‌ر ده‌رفه‌ت بڕه‌خسێت درێژه به خوێندن بده‌م. هاوڕێ عومه‌ر که‌سێکی به حورمه‌ت، به ته‌حه‌مول، له‌خۆبوردوو، بێده‌نگ و سنگفراوان بوو. هه‌ستی به‌رپرسیاریی

بەرانبەر بە هەمووان هەبوو. بە درێژایی ئەو ماوەیەی لەگەڵ ئەو کارم کرد، نەمبینی یەکجار لە هاوڕێیەک تورە ببێت، یان قسەیەکی ڕەق بە کەسێک بڵێت. دوای هەندێک قسەوباس، زانی بەڕاستمە و نامەوێت لە شاخ بمێنمەوە، ڕازی بوو سەفەر بکەم، بەڵام پێی وتم بە هاوڕێیان مەڵێ و بە بێدەنگی بڕۆ.

نامەم بۆ خوشکم نووسی کە بەنیازی سەفەرکردنم، حەز دەکەم لەگەڵ دایکم بێنە گوندی دەرگەڵە، تا خواحافیزییان لێ بکەم. پێش ئەوەی بۆ بوڵگارستان بچم، دووسەد دینارم بۆ ژنهێنان لای خۆشکم، کە لە قەڵادزێ مامۆستا بوو، دانابوو. داوام لێ کرد ئەگەر پارەکە مابێت، لەگەڵ خۆیان بیهێنن.

لەگەڵ چەند هاوڕێیەک چووینە دەرگەڵە. بەڵام هەر سەبری خوشکم و براژنە گورجیم، کە ڕەشپۆش بوون، هاتن. دڵم داخورپا و لە خۆشکم پرسی:

بۆ دایکم نەهاتووە؟

وتی: کەمێک ناساغە، کاکم بۆ چارەسەر بردوویەتی بۆ لای دوکتۆر لە بەغدا.

لێم پرسی: بۆچی تۆ و براژنم ڕەشپۆشن؟

وتی: لەبەر خاڵە مەجیدم، کە زۆر نەبوو کۆچی دوایی کردبوو.

من کەمێک دڵنیا بوومەوە، بەڵام بیرم بۆ ئەوە چوو کە ڕەنگە دایکم لە ژیاندا نەمابێت، خوشکم پێی خۆش نەبێت پێم بڵێت، بەڵام لەسەری نەڕۆیشتم. لە ناخمەوە دەمەویست باوەڕ بهێنم، کە دایکم هێشتا لەژیاندایە و چووە بۆ بەغدا.

شەوەکەی لەوێ ماینەوە. خوشکم پارەکەی بۆ هێنامەوە، خۆی و کاکە ڕەئووفم و کاکە محەمەدم هێندەی تریان خستبووە سەر. ڕۆژی دواتر ئەوان بە ڕێی هەولێردا گەڕانەوە و ئێمەش لە

گەڕانەوەدا، بەرەو پشتئاشان ڕۆیشتین. چەند ڕۆژ لەوێ ماینەوە و بەرەو نۆکان بەڕێ کەوتین. لە نزیکی لە نۆکان، تووشی هاوڕێ مەلا حەسەن (مامۆستا فەتاح) بووم، کە لەگەڵ چەند پێشمەرگە بەرەو پشتئاشان دەچوون، دوای ماندوونەبوون وتی:

هاوڕێ کاوە خۆتان خۆشبن و هاوبەشی خەمتانم.

زانیم مەبەستی دایکمە، تاساو و حەپەساو تەماشای مەلا حەسەنم کرد، نەمتوانی هیچ بڵێم. مەلا حەسەن هەستی کرد ئەو هەواڵەم نەبیستووە، کەمێک تێک چوو، وتی:

بمبوورە هاوڕێ کاوە، لە نۆکان هاوڕێیان باسیان کرد، وام زانی تۆش زانیوتە.

دایکم سێ مانگ پێشتر لە ٢٤ی جەنیوەری ١٩٨٢ کۆچی دوایی کردبوو. لە سەرەمەرگدا داوای بینینی منی کردبوو، کە پێی وابوو هێشتا لە بولگارستانم. تا لە ژیاندا بوو، نەمتوانی وەکوو پێویست خزمەتی بکەم، بە بێ مەبەست و خواستی خۆم، بەرانبەری کەمتەرخەم دەرچووم. لە تەمەنی بیست ساڵییەوە چوومە بەغدا و لە دایکم دوور کەوتمەوە. تەنانەت نەمتوانی لە ناشتنی تەرمە پیرۆزەکەی و تازییەکەیدا، بەشداربم. کاتێک بیرم لەو شتانە دەکردەوە، ئازاری مردنەکەی زۆرتر دەبوو.

**چەند کۆپلەی هۆنراوەیەک بۆ دایکم:**

لە گۆڕستانی ئەم مەنفایەدا
تەنیا وێنەی تۆم لە تیشک چنیوە
بە گەرووی نوقمی سەراب و خۆڵم
گۆرانیی عومرم بۆ تۆ چڕیوە.

خۆزگە چاوانی بە کل ڕێژراوت
خۆزگە چاوانی لە خەم گیراوت
بە چەپکێک نیگا
ڕۆحی شکاوم، وەک چرای نێو با هەڵدەکاتەوە
یان چنگێک خۆڵی سەر گۆڕی تینووت
وەک نووری یەزدان لە گوناهانم پاک دەکاتەوە

هەروا لە یادمە
لایلایەکانت بارانی خوا بوون
وەک درەختی خۆڵ دەیانتەکاندم
هێشتا ساوابووم
بە دەست و پەنجەی فریشتەییانەت
بۆ ڕێی ئازادی و
شەوی ڕەنجەدەران داتدەگیرساندم.

لە تۆوە فێربووم
دوندەکان بکەم بە نسێی گیانم
وەک ئەسپی هەتاو لە ئاسۆوە بێم
کام شەپۆل قووچە نەگاتە شانم

لە تۆوە فێربووم بەرزەفڕ بمرم
بەرزەفڕ بژیم
بەرز بڕوانم.
دایە بمبوورە!
خوایە بمبوورە!

ئەو ماوەیەی لە کوردستان بووم چەند کتێب و نامیلکەم بڵاو کردنەوە. لە هاوینی ١٩٧٩ کە شاری مهاباد ئازاد کرابوو، فریا کەوتم، لە ڕێگەی (کتێبفرۆشیی سەیدیان) کۆمەڵە هۆنراوەیەکی نوێ (ڕێژنە) و هەروا بۆ دووەم جار کۆمەڵەهۆنراوەی (پشکۆکان دەگەشێنەوە)، بڵاو بکەمەوە. لە بری چاپی ئەو دوو کتێبە نزیکەی ٧٠٠ دۆلارم وەکوو پاداشت وەرگرت. دواتر کە فارسییەکەم باش بوو، کورتەچیرۆکی زوڵمئاوای عەلی ئەشرەف دەروێشیان و چیرۆکی ٢٤ سەعات لە خەو و بێداریی سەمەد بێهرەنگیم کرد بە کوردی، هاوڕێ یوسف، کە کادیری فیداییانی خەڵکی ئێران-ئەکسەرییەت بوو، تەرجومەکەی لەگەڵ دەقە فارسییەکەدا بەراورد کردەوە. چیرۆکەکەی بێهرەنگی بە نامیلکەیەکی سەربەخۆ، لە لایەن یەکێتیی نووسەرانی کوردستانەوە، لە شاخ بڵاو کرایەوە. هەروا کتێبی (الحزب الشیوعی والمساله الکردیه)م کرد بە کوردی، حزبی تودەی ئێران چاپی کرد و بۆی ناردینەوە نێوزەنگ. لە شاخ بەدەم خوێندنەوەی دیوانەکانی ئەحمەد شاملوو، کۆمەڵەهۆنراوەیەکم کردن بەکوردی، کە زیاتر بۆ خۆم بوو، نەک بۆ بڵاوکردنەوە. تا ئێستا ڕەشنووسی هۆنراوەکان، بێ پاکنووس و دەستکاریکردن، لە لام پارێزراون و قەت بیرم لە بڵاوکردنەوەیان نەکردۆتەوە،

تەرجومەکردنی شیعر داهێنان و بەرهەمهێنانەوەی شیعرەکەیە

بە زمانێکی تر. بەلای منەوە پێوانەیەکی باشی تەرجومەی سەرکەوتووی شیعر ئەوەیە، ئایا تەرجومانەکە (وەرگێڕەکە) لە کارەکەیدا، وێرای زانینی هەردوو زمانەکە، ئەوەندە داهێنەرە کە بتوانێت لایەنی ئێستێکیی شیعرەکان بپارێزێت و بگاتە ئاستی زمان و ستایلی شیعریی شاعیرەکە، یان بە پێچەوانەوە، لایەنی ئیستێتیکی و زمانی شیعری و ستایلی شاعیرەکە، بۆ ئاستی خۆی دێنێتە خوارێ. لە هەر تەرجومەیەکی شیعریدا، یەکێک لەو دوو لایەنە زاڵە. تا ئێستا دوو تەرجومەی شیعرەکانی شاملووم دیون، کە دوو نووسەر کردوویانن بە کوردی. بە ڕای من تەرجومەکەی ناسری حیسامی نموونەی یەکەمیانە.

لە شاخ کۆمەڵە هۆنراوەیەکی نوێم نووسی، بە ناوی (چرای گۆڕستان) بەڵام لەوێ چاپم نەکرد، چونکە شیعری بەرگری یان شۆڕشگێڕی نەبوون. بابەت و شێوازی هۆنراوەکان لەگەڵ کەشوهەوای پێشمەرگایەتیدا نە دەگونجان. کەچی لە ساڵانی حەفتاکان، کە لە بەغدا بووم، بەشێکی ئەو شیعرانەی نووسیمن، وەکوو تەحەدایەکی ڕێژیمی بەعس بوون. قارەمانێتیی مرۆڤ و خۆبەختکردن لەپێناو گەل و ئازادیدا، لایەنێکی دیاری بەشێکی هۆنراوەکانم بوون. بۆیە لە چاپی یەکەمی (پشکۆکان دەگەشێنەوە) دەزگای سانسۆر، حەوت هۆنراوەی لابردن.

لەو هۆنراوانەی لە شاخ نووسران، دنیای ناوەوە و لایەنی ڕۆحی و دەروونی مرۆڤ، لە دۆخی شەڕ، تیرۆر و ئەشکەنجەدا، بایەخیان پێ دراوە. لەوێ لە ئینسان نزیکتر بوومەوە، لە ساتی سەخت و پڕ مەترسیدا، باشتر خۆم و ئینسانم بەگشتی ناسی. لەوێ خەڵکی جۆراوجۆرم دیت، هەبوون ئەشکەنجە درابوون، لەڕووی ڕەوانییەوە شەکەت و ماندووبوون. هەبوون بێهیوا

کرابوون، یان خەمی ژن و منداڵەکانیان بێتاقەتی کردبوون. بەڵام زۆربەیان بە ورەی بەرز و ئیرادەوە دەژیان. بۆ پاراستنی کەرامەتی مرۆیی خۆیان و داکۆکی لە داد و ئازادی، ژیانی خۆیان خستبووە مەترسییەوە. ئەوان مرۆڤ بوون، نەک ڕۆبۆت. هەر یەکێکیان ژیان و خەون و چیرۆک و گرفتی تایبەتی خۆیان هەبوو، کەسوکار، یان یار، یاخود ژن و منداڵیان بۆ ڕەحمەتی دەسەڵاتی بەعس بە جێ هێشتبوو، بە ئاواتەوە بوون بیان بیننەوە. ژیان و کارکردن لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانە، ئەزموونی تەنیایی لە شاخ و دابڕان لە کۆمەڵ و شار، لەگەڵ ئەو کێشە و ناکۆکییانەی کە پێوەندییان بە شەڕی نێوخۆوە هەبوو، بۆ من ئەزموونی نوێ بوون، هانیان دام بەرەو ناوەوەی خۆم بکشێمەوە، بایەخ بە مرۆڤ و دیوی ناوەوەی مرۆڤ بدەم، کە خۆی لەبەردەم سەختی و ڕووداوی زەبەلاحدا دەبینێت. ئەو بابەتانە لە بەشێکی دیاری ئەو شیعرانە و شیعری دواترمدا ڕەنگیان دایەوە. بەشێکی هۆنراوەکان شێوەی پەخشانەشیعریان هەیە، بەڵام ڕیتمی شیعر زاڵە، نەک ڕیتمی پەخشان. زمان، شێوەی دەربڕین، چڕی و ناڕاستەوخۆیی هۆنراوەکان، تایبەتمەندییەکی تری ئەو کۆمەڵەهۆنراوەن. ئەوە سەرەتای گۆڕانکارییەکی نوێ بوو لە شیعرەکانمدا، کە لە گەڵ قۆناخی ئەزموونی حەفتاکانمدا جیاواز بوو. ساڵانی دواتریش لە دووروڵاتیدا، گۆڕانکارییەکە، بە شێوازی تر بەردەوام بوو، ڕوونتر لە قەسیدەی (وەرزی سەهۆڵبەندان) لەندەن ١٩٨٧، (لاوکی هەڵەبجە) لوبنان ١٩٨٩، (کاروانسەرا) سوێد ١٩٩٠ دەرکەوت.

بەلای زۆرەوە ژیانی پێشمەرگایەتی، مەنفا، خوێندنی فەلسەفە، ئەوین، خوێندنەوەی شیعر و ئەدەبیاتی گەلانی تر، کاریان لە دنیابینیی من و زمان و شێوازی شیعرەکانم کردوون. خولیای

گەڕان بە دوای شێوازی نوێی شیعری و خۆپاراستن لە خۆدووبارەکردنەوە، کە هەمیشە جێگای بایەخی من بوون، هاندەرێکی تری ئەو گۆڕانکارییە شیعرییە بوون، دوای جێگربوون لە سویدیش، بە شێوازی تر بەردەوام بوو.

لەبارەی ئەو هۆنراوانەی شاخ، ساڵی ١٩٩٣ لە پێشەکیی بەرگی یەکەمی دیوانەکەمدا، نووسیومە:

(ئەو هۆنراوانەی لە کاتی پێشمەرگایەتی، لە شاخ و چەند ساڵێکیش دواتر نووسیمن، تێڕامانێکی شپرزەی خود و گیان و دەوروبەر بوون. هەوڵدانێک بوون بۆ دەربڕینی هەندێک ئاوات و ئازاری گیانیی مرۆڤ، کە لە سایەی تیرۆر و توندوتیژیی دەوڵەتدا، تەنانەت نرخی مریشکێکی نییە. کاتێکیش بە مەبەستی پاراستنی ناوەرۆکی ئینسانییانەی خۆی ڕوو دەکاتە شاخ، هەست دەکات تەنیا پەناگەیەکی فیزیکیی دۆزیوەتەوە، یان تەنیا شوێنە جیۆگرافییەکەی گۆڕدراوە. کەچی ئازادی و بەها ئینسانییەکەی، لەوێش لە بەردەم هەڕەشەدان. ئێمە کە لە ڕووی تیرۆر و فاشیزمدا چەکمان هەڵگرتبوو، دەتوت لە ساتێکی غەفڵەت و بێئاگاییدا، ڕەنگی دوژمنەکەی خۆمان گرتووە. جۆرەها بۆچوون و ڕەفتار و مێتۆد و لایەنی کولتووریی ئەومان دەهێنایەوە بەرهەم... ئایا ئەو دیاردە چەوتانە ڕەنگدانەوەی بێئاگایانەی عەقڵ و کولتووری باوی کۆمەڵ بوون، یان لە هەندێک ڕیشەی وێکچوونی ئایدیۆلۆجیای ئێمە و دوژمنەوە، سەرچاوەیان گرتبوو؟ یاخود لەوەوە هاتبوون کە هەردوو لامان، لەگەڵ جیاوازیی نێوان هێز و ئامانجمان، کەم تا زۆر، بەرهەمی یەک کۆمەڵی نەخۆش بووین؟! هۆکارەکە هەرچییەک بووبێت، ئەنجامەکە هەر ئەوە بوو کە ئێمەیش نەمانتوانی نموونەیەکی نوێی فیکری، سیاسی و کولتووری

بخەینەڕوو. نەمانتوانی بە چاوێکی دی بۆ مرۆڤ بڕوانین.)

پێش بەجێهێشتنی شاخ، لە کۆبوونەوەی لیژنەی بەڕێوەبەری یەکێتیی نووسەراندا، ماڵئاواییم لە برادەران کرد، سوپاسم کردن کە ئەو ماوەیە بێ گرفت پێکەوە کارمان کرد.

لە تاران  دوو مانگ مامەوە. شاعیر و نووسەر حەمەی حەمە باقی، بە کاک دڵشاد خانەقینیی ناساندم، کە نوێنەری حزبی گەل بوو لە ئێران. کاک دڵشاد پێشمەرگەی دێرین و کەسێکی بەڕێز، دڵسۆز، ئیشکەر و بەپەرۆش بوو. لە تاران زۆر پێمەوە ماندوو بوو، بە کۆمەکی ئەو توانیم مۆڵەتی چوونەدەرەوە لە ئێران وەربگرم. کاتێک گەیشتمە سووریا هاوڕێیان، ڕۆژنامەنووس و ڕووناکبیرانی ڕۆژانی بیری نوێ و تەریق ئەلشەعب، بەگەرمی پێشوازییان کردم و جێوڕێی کاتییان بۆ دابین کردم.

دوای ماوەیەک، لە ناوەڕاستی نۆڤەمبەری ١٩٨٢ چوومەوە بولگارستان. لە پێشمەرگەیەکی شەکەت و دڵشکاوی نیشتەجێی نێوزەنگەوە، بوومەوە خوێندکاری ئەکادیمیای زانستە کۆمەڵایەتییەکان لە سۆفیا.

## ١
## دەستکردنەوە بە خوێندن

لە ناوەڕاستی نۆڤەمبەری ١٩٨٢ گەیشتمە سۆفیا. لە ئەکادیمیای زانستە کۆمەڵایەتییەکان دەستم بە خوێندن کرد. وەکوو ئەو خوێندکارانەی حزبە چەپ و کۆمۆنیستییە نهێنییەکان دەیانناردن بۆ ئەکادیمیا، دەبوو ناوێکی خوازراو هەڵبژێرم، بۆ ئەوەی نە ناسرێمەوە. من ناوی (سەلیم)م هەڵبژارد، هاوڕێ عەرەبەکان بە (ئەبو کاوە) بانگیان دەکردم.

لە بەشی ناوخۆیی قوتابیان، لە باڵەخانەیەکی گەورەی شەش قاتی، کە بۆ خوێندکاری دوکتۆرا تەرخان کرابوو، ژوورێکی گەورەی سەربەخۆیان پێ دام. ژوورەکە حەمام، تەوالێت، دۆڵابی جلوبەرگ و کتێب و مێز و کورسیی تێدابوو. بەڵام ئەو قوتابیانەی لە قۆناخی خوێندنی زانکۆ بوون، بە دوو کەس ژوورێکی لەوجۆرەیان پێ دەدرا. لە هەر قاتێکی باڵەخانەکە هۆڵێکی گەورەی تەلەڤزیۆن و موبەقێک هەبوو. موبەقەکە چەند تەباخ، سەلاجە، دۆڵاب و هەموو پێداویستییەکی چێشتلێنانی لێ بوو. مانگانە ١٨٠ لیڤەی بولگارییان دەداینێ، کە هێندەی موچەی مانگانەی کارمەندێکی ئاسایی بوو.

ئەکادیمیا بایەخی زۆری پێ درابوو. ساڵانە سەدان قوتابیی

زانکۆ و دوکتۆرا و کادیری ئیداری و حزبیی بولگار و بیانی ڕوویان تێ دەکرد. کادیر و ئەندامی سەرکردایەتیی حزبە کۆمۆنیستەکان و بزووتنەوە ڕزگاریخوازەکان، لە وڵاتانی جۆراوجۆرەوە، دەهاتن و لەوێ ساڵێک، یان چەند ساڵ دەیانخوێند.

لە ئەکادیمیا بەشی ناوخۆیی قوتابیان، کتێبخانەیەکی گەورە، ئۆفیسی پۆست، قاوەخانە، بۆفێ، ڕێستوران، مارکێتی خۆراک و خواردنەوە، شوێنی وەرزش و ڕاکردنی لێ بوو. هەروا نەخۆشخانەیەکی لە تەنیشتەوە بوو. ئەکادیمیا بە گوندێکی ئاوەدان دەچوو، کە بەردەوام دانیشتوانی خۆی دەگۆڕی. ساڵانە سەدان خوێندکارانی نوێی بولگار و بیانی خوێندنیان تەواو دەکرد و خوێندکاری نوێ دەهاتن. هاوینان خوێندکاران دوو مانگێک دەچوونەوە شار، یان وڵاتی خۆیان. ئەوانەی ئێمەئاسا نەیاندەتوانی سەردانی وڵاتەکانیان بکەن، هەر ساڵەی بەشێکیان دەرفەتیان پێ دەدرا دوو سێ هەفتە لە شاری ڤارنا، لە میوانخانەیەکی نزیک دەریا، بە نرخێکی هەرزان، بمێننەوە. لە هەمان کاتدا هاوینان چەندان گرووپی بیانی و بولگاری دەهاتن، لەوێ چەند هەفتە، یان مانگ و دوو مانگ کۆرسی خوێندنی تایبەتیان بۆ ڕێک دەخرا و ئەکادیمیایان ئاوەدان دەکردەوە.

لە سۆفیا لەگەڵ هەشت قوتابیی دوکتۆرا، کە هەموویان بیانی بوون، دەستم بە خوێندنی زمانی بولگاری کرد. خوێندکارەکان لە چەند وڵاتی عەرەبی، ئەفریقا، ڤێتنام و ئەمریکای لاتینەوە هاتبوون. هەفتەی شەش ڕۆژ، هەر ڕۆژەی شەش سەعات زمانی بولگاریمان خوێند. دوای ئەوە شەوانە، جگە لە شەوانی شەممە، سێ تا چوار سەعات، سەرقاڵی فێربوونی زمانی بولگاریی بووم. ماوەی

خوێندنی زمانی بوڵگاری نزیکەی نۆ مانگ بوو. لەو ماوەیەدا دەبوو ئەوەندە فێری زمانەکە ببین لە وانەکانمان، کە بە زمانی بوڵگاری بوون، بگەین و لێدوانیان لەبارەوە بکەین، بیر و بۆچوونی خۆمان بە ڕوونی دەرببڕین. لە سەرەتاوە پێیان وتین ئەوەی لە تاقیکردنەوەی کۆتایی ساڵدا یەکەم بێت ١٥٠ لیڤە، وەکوو پاداشت، وەردەگرێت. هەر کەسیش دەرنەچێت، ناتوانێت درێژە بە خوێندن بدات.

کۆرسی فێربوونی زمانم سەرکەوتووانە تەواو کرد. من و خوێندکارێکی ئەسیوپی، بە ناوی سۆلۆمۆن، یەکەم بووین، هەردووکمان پاداشتەکەمان وەرگرت. دوای ئەوە دەستم بە خوێندنی فەلسەفە کرد. لەگەڵ سەرپەرشتیاری باسەکەم، پرۆفێسۆر کۆستەنتین پۆپۆڤ، کە لە ئەکادیمیا و زانکۆی سۆفیا مامۆستا بوو، ڕێک کەوتین دوکتۆرنامەکەم لەبارەی (ڕۆڵی کولتوور لە پێکهێنانی هۆشیاریی نەتەوەیی کورد) بنووسم. بەڵام باسەکە تەنیا کولتووری ڕۆحی-هزری بگرێتەوە، نەک کولتووری مادی، کە پێوەندیی بە شێوەژیان و جلوبەرگ و خۆراک و لایەنی تری مادیی کۆمەڵەوە هەیە. باسەکە وێڕای پێشەکی و ئەنجام، لە دوو بەند پێک هاتبوو، هەر بەندەی سێ بەش بوو.

بەندی یەکەم بە ناوی کولتوور و پێکهێنانی هۆشیاریی نەتەوەییە. لەو بەشەدا پێناسەی هۆشیاریی نەتەوەیی کراوە، وەکوو ئەو هەست و بیر و ئاگایی و شێوازانەی خۆناسین، کە لە قۆناخێکی مێژوویی، لای گروپێکی خەڵک دەردەکەون، کە هاوخاک، هاوکولتوور، هاوزمان و هاومێژوون، خاسییەتی سایکۆلۆجیی نەتەوەیی هاوبەش کۆیان دەکاتەوە. ئەوان هۆشیاری لەبارەی خۆیان و لەبارەی ئەویتر، یان ئەوانیتری لەخۆیان جیاواز، پێک

دەهێنن و بەرەو خۆناسین دەچن. لە باسەکەدا پێوەندیی نێوان ئەو هۆشیارییە لەگەڵ مێژووی هاوبەش، کولتوور و زمان، وەکوو فاکتەری هاوبەشی نێوان ئەو گروپە خەڵکە، ڕوون کراوەتەوە.

لە بەشی دووەمدا باسی سەرەتاکانی دەرکەوتنی هەست و هۆشیاریی نەتەوەیی، لە سەدەی نۆزدەیەمدا، لە کوردستان کراوە. گۆڕینی شێوەزاری کوردیی ناوەڕاست، لە زمانی پەیڤینەوە بۆ زمانی نووسین، لە ڕێگەی قوتابخانەی ئەدەبیی نالی، کوردی و سالمەوە، بە دیاردەیەکی نوێی کولتووری، ئەدەبی و زمانیی دانـدراوە، کە توانیویەتی بەردەوام بێت. بڵاوبوونەوەی ئەو شێوەزمانە ئەدەبییە، لە ڕێگەی شیعر و دواتر نووسین و ڕۆژنامەوانی، بنچینەی هەستی خۆناسینی نەتەوەییان پێک هێناوە. لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا، دەستەی نوێی ڕووناکبیران، کە ئاگاداری هزری ڕۆشنگەری بوون، دەرکەتن، بە شێوازی نوێی کولتووریی، کۆمەڵایەتی، ڕێکخراوەیی و سیاسی، سەرەتاکانی هەست و هۆشیاریی نەتەوەیی و هزری نەتەوەییان بڵاو کردەوە. لەو لایەنەوە، شوێنی ڕۆژنامەی کوردستان لە (نیسانی ١٨٩٨) و ناوەرۆکی چالاکییە کولتووری، هزری، کۆمەڵایەتی، ڕێکخراو و ڕووناکبیرانی کورد لە ئەستانبول، باس کراون.

لە دوا بەشدا ڕۆڵی کولتووری کوردی لە بڵاوبوونەوەی هزر و هۆشیاریی نەتەوەیی، خراوەتە ڕوو. لەو ڕێگەیەوە بۆچوونێکی هاوبەش، لەبارەی تایبەتمەندیی کولتووری و نەتەوەیی کورد پێک هێندراوە، کە ناوەرۆکی سیاسیی بە شوناسی ئێتنیکی/ کولتووریی گەلی کورد داوە، لە ئەنجامدا بزاڤی ئازادیخوازیی کورد، دەرکەوتووە.

بەندی دووەم: پرۆسێسی کولتووری سەردەم و بزووتنەوەی شۆڕشگێڕیی دیموکراتی لە کوردستانی عێراقدا.

لە بەشی یەکەمدا ئاماژە بەو گۆڕانکارییە چۆنایەتییانە دراون، کە لە دوای شەڕی یەکەمی جیهان، لە ژیانی سیاسی، هزری و کولتووریی گەلی کورد و بزاڤی نەتەوەیی کورددا ڕوویان داوە، لەوانە دابەشکردنی کوردستان و دامەزراندنی مەملەکەتی کوردستان، بە ڕابەریی مەلیک مەحموود و بەرەنگاربوونەوەی کۆلۆنیالیزمی بریتانی، کە ویلایەتی موسل (کوردستانی خواروو)ی بە عێراقەوە لکاند. ناوەرۆکی هزر و ئایدیۆلۆجیای دیموکراتانە و عەدالەتخوازانەی بزاڤی ئازادیخوازیی گەلی کوردستان و گەلانی ناوچەکە لە دژی کۆلۆنیالیزم ڕوون کراوەتەوە. لەو قۆناخەدا ڕووناکبیرانی ئازادیخواز، لە کوردستانی عێراق، بوونە پێشەنگی بزاڤی دیموکراتی، کۆمەڵایەتی و ڕزگاریخوازی.

لە بەشی دووەمدا پەرەگرتنی پرۆسێسی کولتووری و گەشەکردنی خوێندەواری و خوێندنی مۆدێرن، چاپەمەنی، فراوانبوونی چالاکیی کولتووری و سیاسی باس کراون. هزر و کولتووری کورد بە ناوەرۆکی نوێی سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئازادیخوازی بەپێز کرا. لێرەدا کولتووری کورد بە کولتووری ڕزگاریخوازیی نیشتمانی داندراوە، چونکە کولتووری گەلێکە کە لە قۆناخی ڕزگاریخوازیی نیشتمانیدایە، خەبات بۆ ئازادی و مافی بڕیاردانی چارەنووس دەکات. کولتوورەکەی بەرهەمی مێژووی گەلە و خاسییەتە تایبەتەکانی گەلەکە دەردەخات.

لە بەشی سێیەمدا ئاسۆی هۆشیاریی نەتەوەیی و گەشەکردنی کولتووریی کورد و پێوەندیی ئۆرگانیکی نێوان ئەو دوو دیاردەیە، لە کۆمەڵی کوردستان، باس کراون. ڕۆڵی زمان، ئەدەب، هونەر،

ڕۆژنامەگەری و کاری تری کولتووری، لە پێشخستنی هۆشیاریی نەتەوەیی و پاراستنی شوناسی نەتەوەیی کورد ڕوون کراونەتەوە.

مامۆستاکەم چەند کتێبێکی تیئۆری بۆ دیاری کردم کە بیانخوێنمەوە، هەندێکیان بە زمانی ڕووسی بوون، پێنج مانگ لەگەڵ گروپێکی شەش کەسیدا هەفتەی پێنج سەعات، زمانی ڕووسیم خوێند. زمانی بولگاری و ڕووسی لە زمانانی سلاڤین و لە زۆر لایەنەوە لەیەکتر دەچن. دیارە لە زۆر لایەنی تریشەوە جیاوازییان هەیە. زۆربەی تێرم و زاراوە فەلسەفی، ئەدەبی، ئابووری و زانیستییەکان، بە هەردوو زمان یەکن، هەندێکیان لە شێوەی وتنیاندا کەمێک جیاوازییان هەیە، بەڵام ڕێزمانی ڕووسی، لە هەندێک لایەنەوە، ئاڵۆزتر و گرانترە. لە قسەکردنی ئاساییدا جیاوازیی ئەو دوو زمانە زۆرترە، بەڵام لە ئاخاوتندا ڕووسێک و بولگارێک دەتوانن لەیەکتر بگەن. دیارە بەو ماوە کەمە مرۆڤ فێری زمانێکی نوێ نابێت، بەڵام خوێندنەکە هاندەرێک بوو بۆ ئەوەی دواتر، بایەخ بە زمانی ڕووسی بدەم.

لە ئەکادیمیا کۆمەڵێک خوێندکاری عێراقی هەبوون، کە لە قۆناخی خوێندنی زانکۆ و دوکتۆرا دەیانخوێند. ساڵانەش دەوروبەری بیست کادیری حزبی، بۆ خوێندنی یەکساڵە دەهاتن و دوای ئەوە دەگەڕانەوە سووریا. زۆربەیان لەوێوە دەچوونە کوردستان، یان بۆ کار و حەوانەوە ڕوویان لە کۆماری دیموکراتیی باشووری یەمەن دەکرد. بەڵام لە زانکۆی سۆفیا و شارەکانی تر قوتابیی عێراقی، کە حزبی شیوعی بۆ خوێندن ناردبوونی، زۆر بوون. حوسێن سوڵتان، کە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حزبی شیوعی و خەڵکی نەجەف بوو، لەوێ بەرپرسی ڕێکخستنی ئەکادیمیا نوێنەری حزبی شیوعی بوو لە بولگارستان.

حوســێن ســوڵتان کەسـێکی بەڕێــز و بێــدەنگ بــوو، تەمەنــی دەوروبەری ٧٥ بوو ساڵ بوو. بە تەنیا لە میوانخانەی ئەکادیمیا دەژیـا. لە ســەرەتای ١٩٨٤ ســەرکردایەتیی حزبـی شـیوعی، بـۆ ئەوەی پرسـم پـێ بکەن، بڕیاریـان دا مـن لە جـێگەی ئەو بـبم بە بەرپرسی ڕێکخستن و نوێنەری حزبی شیوعی لە بولگارستان.

یەکێـک لەو کەسـە هێـژا و بەڕێـزانەی لە سـۆفیا ناسـیم کـاک (نەویـدی مـوعینی)یە، کە بـرای شـەهیدان سـلێمانی مـوعینی، عەبدوڵڵای موعینی و خانەی موعینییە. کاک نەوید دوای شۆڕشی گەلانـی ئێران، بە ئەنـدامی کۆمیتەی ناوەنـدیی حزبـی دیمـوکراتی ئێـران هەڵبژێـردرا. بەڵام دواتـر لەگەڵ غەنــی بلوریـان، مامۆسـتا هـێمن، حەمەدەمینـی سـیراجی و ڕەحمـانی کەریمـی، کە حیزبـی دیمـوکرات تیرۆری کـرد، لە حزبـی دیمـوکراتی کوردسـتانی ئێران جیـا بـوونەوە و بە نـاوی خەتـی کـۆنگرەی چـوار ناسـران، دواتـر چوونە پاڵ حزبـی تودەی ئێران. کـاک نەویـد سـاڵێک دوای مـن بـۆ خوێنـدن هـاتە سـۆفیا. لەوێ وەکـوو هـاوڕێیەکی حزبـی شـیوعی عێراق ناسێندرا. لە ئەکادیمیای زانستە کۆمەڵایەتییەکان، دەسـتی بە خوێنـدن کـرد. کـاک نەویـد کەسـێکی بەڕێـز، مەنـد، ڕوونـاکبیر و قسـەخۆش بـوو، چەنـد سـاڵێک لە مـن گەنجتـر بـوو. زوو بـووینە هـاوڕێی نزیـک و زۆربەی کـات پێکەوە بـووین. دوای تەواوکردنـی خوێندن، کاک نەوید ڕووی لە ئەڵمانیا کرد و لەوێ نیشتەجێ بوو. من لە گفتار، ڕەفتـار و دڵسـۆزیی کـاک نەویدەوە باشـتر تێگەیشـتم کە بـۆچی و چـۆن برایـانی مـوعینی، وەکـوو پەپـوولەی شـەیدا، بەرەوڕووی مەشخەڵی ئازادی چوون؟

ئەو کاتە کەریمی حیسامی بە یەکجاری گەڕابۆوە بولگارستان و لەگەڵ خێزانەکەی لەوێ دەژیا. زۆر جار بە تەنیا، یان لەگەڵ کاک

نەوید سەردانمان دەکردن، یان ئەوان بانگێشتنیان دەکردین. ئەو دەمە د.عەبدولڕەحمان قاسملوو، کە سکرتێری حزبی دیموکرات بوو، کێشەی لەگەڵ حیسامی هەبوو، بەو تومەتەی گوایا جاسووسی یەکێتیی سۆڤیەتە، لە حزبی دیموکرات دەری پەڕاندبوو. سەیر ئەوەیە لە سەرەتای حەفتاکان، سکرتێری پێشووتری حزبی دیموکرات، ئەحمەد تۆفیق، گرفتی لەگەڵ د.قاسملو هەبوو، ئەوی بە جاسووسی سۆڤیەت تومەتبار کردبوو. برادەرێکی ئەو سەردەمەی د.قاسملوو، کە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی حزبی دیموکرات بوو، ئێستا لە سوێد دەژی، بۆی گێڕامەوە کە دوکتۆر قاسملوو وتوویەتی:

ئەحمەد تۆفیق نەفامە، بە مەلا مستەفای وتووە من جاسووسی یەکێتیی سۆڤیەتم، پێی وایە بەو قسەیە مەلا مستەفا پێوەندیم لەگەڵ دەبڕێت، نازانێت لەبەر ئەو قسەیە زیاتر ڕێزم دەگرێت، بۆ ئەوەی لە لای سۆڤیەتییەکان قسەی باشی لەبارەوە بکەم.

د. قاسملوو بە شێوازێکی وەحشییانە و بەهۆی خۆشباوەری و هەڵەی خۆیەوە شەهید کرا، بەڵام شەهیدبوونی ناتوانێت پاکانە بۆ هەڵەکانی بکات. ئەو کەسێکی تاکڕەو و نادیموکرات بوو، توانی توومەتی جاشایەتیی بداتە پاڵ هێمنی شاعیر، کە ژیانی خۆی بۆ نەتەوەکەی تەرخان کرد. ئەمە گوناهێکە لە ئاستی تاواندایە. لەو باوەڕەدام ڕۆژێک لە ڕۆژان، سەرکردایەتیی حزبی دیموکرات، داوای لێبووردن لە هێمن و بنەماڵە بەڕێزەکەی و هێمندۆستان دەکات.

کاری ڕێکخراوەکەمان زۆر نەبوو، کاتی باشم بۆ خوێندن، خوێندنەوە، نووسین و چوونەدەرەوە هەبوو. بەشێکی کارەکان ئەندامانی لیژنەی ڕێکخستن ڕایان دەپەڕاند و من سەرپەرشتیم

دەکردن. بۆ کاروباری خوێندن و سەفەری هاورێیانمان، خۆم پێوەندیم بە بەرپرسانی بولگارەوە دەکرد و کارەکانیان بۆ رادەپەڕاندین. ئەگەر هاورێیەکمان گرفتی هاتوچۆ و پاسپۆرتی هەبووایە، بە نووسراوی تایبەت، داوای پاسپۆرتم لە سەفارەتخانەی باشووری یەمەن، لە سۆفیا، دەکرد. لە ماوەی چەند رۆژدا، پاسپۆرتیان بۆ هاورێکەمان ئامادە دەکرد. پێوەندیی نێوان حزبی شیوعی و کۆماری باشووری یەمەن زۆر باش بوو. سەدان خێزان و ئەندامی حزبی شیوعیی عیراق لەوێ کاریان دەکرد و حەوابوونەوە.

سالی ١٩٨٠ حکومەتی عێراق لە عەدەن، دوکتۆر تۆفیق روشدییان شەهید کرد، کە لەوێ مامۆستای زانکۆ و بەرپرسی رێکخستنی حزبی شیوعی بوو. یەمەنییەکان زۆر بە توندی وەلامی عێراقیان دایەوە. پەلاماری سەفارەتخانەی عێراقیان دا، کە بکوژەکانیان پەنا دابوو. بە زەبری هێز و دەستڕێژی گوللە، لەناو سەفارەتخانە بکوژەکانیان دەرهێنان. بە ئاشکرا دادگاییان کردن و راستەخۆ لە رادیۆی عەدەنەوە، چەند رۆژ پەخشیان کرد. ئەو کاتە ئێمە لە شاخ، گوێمان لە دادگاییکردنەکە گرت. دوای ئەوە پێوەندیی نێوان هەردوو ولات تێک چوو.

بەیانییەکی بەهاری سالی ١٩٨٤ هاورێ کانێف، کە لە کۆمیتەی ناوەندی حزبی کۆمۆنیستی بولگارستان بۆ پێوەندیی لەگەل ئێمە دیاری کرابوو، تەلەفۆنی بۆ کردم وتی دەولەتی بولگارستان خەلاتی دیمیترۆڤی پێشکەشی سکرتێری حزبی شیوعیی عێراق، عەزیز محەمەد، کردووە. چەند رۆژێک پێشتریش لە مۆسکۆ، خەلاتی لێنین، بە عەزیز محەمەد درابوو.

عەزیز محەمەد، هاتە سۆفیا و خەلاتەکەی، بە دوور لە چاوی

مێدیای بولگاری وەرگرت. هەفتەیەک لەوێ مایەوە، چەند جار بینیم. بولگارەکان دەرفەتیان نەدا زۆر دەربکەوێت، چونکە چوار ساڵێک پێشتر، لە شاری سۆفیا، قوتابییە بەعسییەکان بەگژ قوتابییە شیوعییەکاندا چووبوون. لەو شەڕەدا قوتابییەکی بەعسی کوژرا بوو. سەفارەتی عێراق هەڕەشەیان کردبوو، کە تۆڵەی قوتابییە کوژراوەکە بکەنەوە. ئەوان پێداگرییان کردبوو کە گوایا حەمید مەجید موسا، قوتابییە شیوعییەکانی هان داوە، ئەو کارە بکەن. ئەو کاتە حەمید مەجید، لە ئەکادیمیای زانستە کۆمەڵایەتییەکان، خوێندکاری دوکتۆرا و نوێنەری حزبی شیوعی بوو لە بولگارستان. دوای ئەو ڕووداوە گرژیی لەنێوان بولگارستان و دەوڵەتی عێراق دروست بوو. سەرۆککۆماری ئەو کاتەی بولگارستان، تۆدۆر ژیڤکۆڤ، چوو بۆ بەغدا و لەوێ داوای لێبووردنی کرد. هەروا حەمید مەجید موسا، بۆ کاری حزبی نێردرا بۆ پراگ. دواتر لە ناوەڕاستی نەوەتەکانی سەدەی پێشوو، بوو بە سکرتێری یەکەمی حزبی شیوعیی عێراق.

ڕۆژێکی سەرەتای ١٩٨٤ هاوڕێیەکی کچ هات بۆ لام، زۆر بێتاقەت دیار بوو. بە شەرمەوە نامەیەکی دەرهێنا وتی:

هاوڕێ ئەم نامەیەم بۆ سەرکردایەتیی حزب بنێرە؟

من وامزانی لەگەڵ هاوڕێیانی تر گرفتی بۆ دروست بووە، کە ڕەنگە خۆمان بتوانین چارەسەری بکەین. بەڵام وتی نا، نامەکە پێوەندی بە ئەندامێکی کۆمیتەی ناوەندییەوە هەیە، خەمناکانە ئەم ڕووداوەی بۆ گێڕامەوە:

لە دیمەشق چاوم بە (أ.ب.خ) کەوت کە دۆستی باوکمە، چەندان جار هاتۆتە ماڵمان و وەکوو مامی خۆمان سەیرمان کردووە. دوای چاکوچۆنی پێی وتم وەرە سەرمان لێ بدە. کاتێک چوومە

سەردانیان، هەر خۆی لە ماڵ بوو. دوای تاوێک پەلاماری دام و ویستی دەستدرێژیم بکاتە سەر، بە زەحمەتێکی زۆر توانیم خۆم لە دەستی ڕزگار بکەم.[1]

بەهاری ١٩٨٤ کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا-سەنتەری پراگ، لە لەندەن، کەریمی حیسامی و منیان بانگهێشتن کرد، بۆ ئەوەی لەوێ سێمینار بکەین و لەگەڵ ئەوان لە ئاهەنگی نەورۆز بەشدار بین. من دڵنیا نەبووم ڤیزای بریتانیام پێ دەدەن، بۆیە نووسراوێکم لە سەفارەتخانەی یەمەن وەرگرت. کە تیایدا نووسرابوو، من هاووڵاتیی باشووری یەمەنم، لە سۆفیا دەخوێنم، بۆ نووسینی دوکتۆرنامەکەم، پێویستم بە هەندێک سەرچاوەیە، کە لە بریتانیا دەست دەکەون.

لەگەڵ کاک کەریم پێکەوە چووینە سەفارەتخانەی بریتانی لە سۆفیا و داوای ڤیزامان کرد. کاتێک هاتینە دەرێ و کەمێک لە سەفارەتخانەکە دوور کەوتینەوە، پۆلیسێک بە بەرگی مەدەنییەوە ڕای گرتین، داوای ناسنامە، یان پاسپۆرتی لێ کردین، لێی پرسین: بۆچی چوونە سەفارەتخانەی بریتانیا؟

دوای ئەوەی وەڵاممان دایەوە، ناوی نووسین و لە کۆڵمان بۆوە.

بێ گرفت ڤیزای بریتانیام وەرگرت. لە لەندەن لە چەند کۆڕ و چالاکی بەشدار بووین. دواتر ساڵی ١٩٨٥ بە کۆششی کاوە بێسارانی، کە بەرپرسی کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد بوو لە

---

1- عەلی حامید، کادیرێکی ناسراوی حزبی شیوعی بوو، لە ئایاری ١٩٨٩ دەستگیر کرا و حوکمی زیندانیی تا هەتایی بەسەردا درا، لە زینداندا چاوی لەدەست دا. لە یاداشتەکانیدا (بولێڵە) دەگێڕێتەوە کە سەرەتای ساڵی ١٩٧٩ هەمان کەس بە داوای حزب لە ماڵی (ع.ق) لە سلێمانی، شاردرایەوە. لەوێ پەلاماری ژنی خاوەنماڵی دابوو! ژنەکە ڕووداوەکەی بۆ مێردەکەی گێڕابۆوە، پیاوەکە تا توانیبووی لە (أ.ب.خ)ی هەڵدابوو. بۆ زیاتر بڕوانە عەلی حامید، بولێڵە، یاداشت، سلێمانی، ٢٠٢٠، ل. ١٤٣-١٤٤

بریتانیا، کۆمەڵەهۆنراوەی سوتان لەبەر باراندا، چاپ کرا. هەروا لە لەندەن میوانی ئەو بووم، زۆر پێمەوە ماندوو بوو.

لەو سەفەرەدا هاوڕێی هێژام کەمال میراودەلیم بینییەوە، کە لە بریتانیا خوێندکاری دوکتۆرا بوو. لە لەندەن هەندێک شوێنی گرنگ و جوانی پیشاندام. دوایی داوام لێ کرد بمباتە پیکادیلی و چەند شوێنی تری لەندەن، کە لە ڕۆمانەکانی کۆلۆن ویلسن و نووسەری تردا، ناویانم بیستبوون، بە خەیاڵ وێنەیەکم لەبارەیانەوە کێشابوون.

ڕۆژێک چووینە پیکادلی، تاوێک لەوێ سووڕاینەوە، لە شوێنێک چەند کابینەی بچووکی لێ بوو، کە هێندەی سندووقی تەلەفۆنی جارانی سەرجادە بوون. بە نیوپاوەن دەتواندرا تەماشای ناوەوە بکەیت، کە ژنی ڕووتی پیشان دەدا. ئەو جۆرە بەزمانە لە بولگارستان نەبوون. بە کەمالم وت دەمەوێت ئەوە ببینم بزانم چۆنە. چووینە ناو کابینەکە، کە مەترێکی چوارگۆشەیی نەدەبوو، بە زەحمەت جێگای دوو کەسی تێدا دەبۆوە. نیوپاوەنەکەم خستە ناو درزێکەوە، پەنجەرۆکەیەکی بازنەیی بچووک دەرکەوت، کە هێندەی دەمی پیاڵەیەک بوو. لەوێوە بینیم ژنێکی لاوازی کەڵەگەتی ڕووت، گوایا سەمای دەکرد، بەڵام بە جوڵەی ئەکرۆباتیکی لەناو ژوورێکدا، خەریکی بازبازێن بوو. بە شێوەیەکی بێزەوقانە، هەندێک شوێنی جەستەی پیشان دەدا، زوو زوو تەماشای لای منی دەکرد. کەمێک سەرم لادا، داوام لە کەمال کرد ئەویش ئەو دیمەنە سەیرە ببینێت. دوای چەند چاوتروکانێک ژنەکە هەستی کرد دوو کەس بۆی دەڕوانن. تەقڵەیەکی بەرەو لای پەنجەرەکە لێ دا و دایخست، هەردووکمان تێر پێکەنین و چووینە دەرێ. ئەو دیمەنەم بەلاوە سەیر بوو، چونکە لە بولگارستان، لە قەراخی دەریا، شوێنی

تایبەتی مەلەکردن هەبوو، کە ژن و پیاو پێکەوە بە ڕووتی مەلەیان دەکرد، یان خۆیان لە بەرهەتاو هەڵدەخست و کەس تەماشای کەسی نەدەکرد.

دوای ئەوە بە شەقامێکی باریکدا ڕۆیشتین. لە بەردەم دەرگایەکی گەورەدا، کە هەردوو لای دوکان بوو، دوو کچی ڕووخۆش ڕاوەستابوون، پێشیان پێگرتین و فەرموویان لێ کردین. ئێمە وامانزانی دوکانێک، یان پێشانگایەکمان پێشان دەدەن. ژنەکان بەرەو قاتی ژێرەوەی هۆڵەکەیان بردین. شوێنەکە لە بار یان ڕێستوران دەچوو، لەوێ لەسەر قەنەفەیەک دانیشتین. کچێکیان کەوتە تەنیشت من، ئەوی تریان کەوتە لای کەمال. ئەو کچەی لە تەنیشت من دانیشتبوو، یەکسەر دەستی خستە سەرشانم، ڕووی لە من کرد و بە پێکەنینەوە زمانی دەرهێنا. کۆندۆمێکی وەکوو گۆرەوی لە زمانی هەڵکێشابوو، بێ ئەوەی دەست بجوڵێنێت فوی پێدا کرد. کۆندۆمەکە وێنەی بنێشتی فووتێکراو، یان میزەڵدان هەڵامسا، لووت و چەناگەی کچەکەی داپۆشی. بە کەمالم وت:

هەستە! ئەگەر زوو فریای خۆمان نەکەوین، ئەو دوو کچە لێرە سوارمان دەبن!.

خێرا هەستاین و بە سەلامەتی دەرباز بووین!

## ٢
## لە هەر کوێ بژین ئەوین لەوێیە

لە بولگارستان کچێکی جوان و ڕووناکبیرم ناسی ناوی مایا بوو. حەوت ساڵ لە من گەنجتر بوو، فەلسەفەی خوێندبوو. باوکی نەمابوو، خوشک و برای نەبوو، لەگەڵ دایکی دەژیا. دایکوباوکی مایا لەو منداڵانە بوون، کە ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهانی، لە کۆمەڵکوژیی ئەرمەنەکان لە تورکیا دەرباز بووبوون و ڕوویان لە بولگارستان کردبوو. ساڵێک لەگەڵ مایا هاوڕێ بووین، پێکەوە گونجاو و ئاسوودە بووین. باسی ژنهێنان و پێکەوەژیان هاتە پێش و پێوەندییەکەمان درزی برد.

من مایام خۆشدەویست، حەزم دەکرد پێوەندیمان بەردەوام بێت، بەڵام کاتێک بیرم لە داهاتووی خۆم دەکردەوە، سەخت بوو بڕیاری ژنهێنان بدەم، چونکە نەمدەزانی دوای بولگارستان بەرەو کوێ دەچم و لە کوێ دەگیرسێمەوە. لە خۆم دەپرسی چۆن منداڵ بهێنمە دنیایەک، کە بە زەحمەت جێگای خۆمی تێدا بۆتەوە.

پێوەندییەکەمان بە شوێنێک گەیشتبوو، کە مایا دەیەویست یەکلایی بکاتەوە. لە دوابینیندا، لە قاوەخانەیەک دانیشتبووین، باسی ئەو مەسەلەیە کرا. ئەو خەمبار و شڵەژاو دیار بوو، من دووبارەم کردەوە کە هێشتا لە دۆخێکدا نیم بتوانم بڕیاری ژنهێنان بدەم، با

مـاوەیەکی دی چـاوەڕێ بکەیـن. لەوێ ڕۆیشـتین، سـواری پـاس بووین، تـا بیگەیەنمە لای دەستەخوشـکێکی. بە درێژایی ڕێگا مایا قسـەی نەکرد. پێش ئەوەی دابەزیـن، بە دەنگێکی خەمبـارانە وتـی: ئەگەر وابێ پێویست ناکات لەمەودوا یەکتر ببینین.

زانـیم دوابڕیـاری داوە، خـۆم بـۆ نەگیـرا، چـاوم پڕ لە فرمێسـک بوو. پێکەوە لە پاسەکە دابەزین، تاوێک باوەشمان بە یەکتردا کرد، هیچمـان نەوت. لە هەنـدێک سـات و شـوێندا، بێـدەنگی دەتوانێـت بدوێت و هەموو شتێک بڵێت. مایا بەرەو مـاڵی دەستەخوشـکەکەی چوو، تا لە چاو ون بوو تەماشام کرد. ئەو ساتانەم بە بیر هـاتەوە کە یەکەم یـار، یەکەم برینی ئەوینـی خسـتە دڵـم. دوای چەنـد سـاڵ برینەکە سارێژ بوو، بەڵام لەبیر نەچۆوە.

ئەویـن خۆشـی، هیـوا و بڕوابەخۆبـوون بە مـرۆڤ دەدات، بەڵام بێ ئازار نییە، چونکە ئەوین هەسـت و سـۆزە، کەمتـر پێوەنـدیی بە عەقڵ و لۆجیکەوە هەیە.

شەش مانگێک بەو جۆرە تێ پەڕی، بەڕێکەوت لە سۆفیا (ئێکـا)م ناسی، کە لە جۆرجیاوە هـاتبوو. کچێکی هـێمن، جـوان، بە دیسپلین و بە تەحەمـول بـوو. شـەش سـاڵ لە مـن گەنجتـر بـوو. لە زانکـۆی باتومی زمـان و ئەدەبی ئینگلیزیـی تەواو کردبـوو، چەنـد سـاڵێکیش مۆسـیقای خوێنـدبوو. وێـنەی هەر هـاووڵاتییەکی ئەو سـەردەمەی یەکێتیی سۆڤیەتییەت، کە لە زانکۆ خوێندبێتی، ئاگاداری ئەدەبیـاتی ڕووسـی و سـۆڤیەتی بـوو. دوای ئەوەی گەڕایەوە بـۆ جۆرجیـا پێوەنـدیمان بەردەوام بـوو. لە تەمـووز (جـولای) ١٩٨٥ ئێکـا بـۆ سەردانی من هاتەوە بۆ سۆفیا و مانگێک لەوێ مایەوە. بەڕێکەوت ئەو کاتە دوازدەیەم فێستیڤاڵی لاوان و قوتابیانی جیهان لە مۆسـکۆ دەکرا، دەبوو منیش بەشدار بم. چەند ڕۆژ لەگەڵ ئێکا بـووم، دوای

ئەوە لە ماڵی خێزانێکی ناسیاوی، کە داوەتنامەی بۆ کردبوو، بەجێم هێشت و چووم بۆ مۆسکۆ.[1]

ئەوە دووەم جار بوو سەردانی مۆسکۆ بکەم. هەردوو جارەکە هاوین بوو و مۆسکۆ ئاهەنگی دەگێڕا، لە ترۆپکی خۆڕازاندنەوە و جوانیدا بوو. جاری یەکەم هاوینی ١٩٧٧ بە هۆی یادی شەست ساڵەی شۆڕشی ئۆکتۆبەر، ئەم جارەش بە هۆی ئەم فێستیڤاڵەوە ئاهەنگ دەگێڕێت. بەو بۆنەیەوە بە دەیان هەزار لاوی کوڕ و کچی جیهان و کۆمارەکانی سۆڤییەت و خەڵکی ئاسایی، بۆ بەشداری و بینینی فێستیڤاڵەکە، هاتبوونە مۆسکۆ. فیستیڤاڵەکە ئەو شارە گەورە دە ملیۆنییەی ئەو کاتەی گۆڕیبوو بۆ شاری لاوان. لە هەرجێ ئاهەنگ، کەرنەڤاڵ و چالاکیی هونەری، کولتووری و دیداری وەفدی لاوانی وڵاتانی جۆراو جۆر بوو. بەرنامەی فێستیڤاڵەکە ئەوەندە زۆر و فرەڕەنگ بوو، کە فریا نەکەوتین نیوەشیان بەتەواوی ببینین. لەوێ چاوم بە نوێنەری چەند ڕێکخراوی لاوان و قوتابیانی چەند وڵات کەوت و باسی بارودۆخی کوردستان و عێراق و ئەو وڵاتانەمان کرد.

دوای پێنج ڕۆژ گەڕامەوە سۆفیا. ژوورێکم لە ئاپارتمان (شوقە)ی خانمێک بەکرێ گرتبوو، کە لە چێشتخانەی ئەکادیمیا کاری دەکرد. لەو ماوەیەدا لەگەڵ ئێکا باشتر یەکترمان ناسی، بەڵێنم پێ دا دوای سەری ساڵ، لە مۆسکۆ یەکتر ببینین.

هاوڕێم کاک کەمال شاکر لە مۆسکۆ نوێنەری حزبی شیوعی و بەرپرسی ڕێکخستن بوو، ڤیزای یەکێتیی سۆڤیەتی بۆ وەرگرتم. بلیتی فڕۆکە بۆ مۆسکۆ گران بوو، بۆیە بە ڤیتار چووم، کە بە ڕۆمانیا، ئۆکراینا- کییفدا ڕەت بوو، تا گەیشتە مۆسکۆ ٢٤ سەعات

---

1- بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە دوو، لە کۆتایی ئەم کتێبەدا.

زیاتری پێ چوو.

له مۆسکۆ میوانی هاوڕێ که‌مال بووم، که له ڕۆژانی به‌غداوه ده‌مناسی. ئه‌و کاته به‌رپرسی یه‌کێتیی لاوانی دیموکراتی عێراق و کادیری پێشکه‌وتووی حزبی شیوعی بوو. له نووسینگه‌ی بیری نوێ و گۆڤاری ئه‌لسه‌قافه ئه‌لجه‌دیده، له گه‌ڕه‌کی به‌تاوین، ژوورێکیان بۆ کاره‌کانی پێ دابوو. له نیوه‌ی دووه‌می حه‌فتاکاندا، گیرا و حوکمی له سێداره‌دانی درا، ئازایانه خۆی ڕاگرت. سالی ١٩٧٩ سه‌دام بوو به سه‌رۆککۆمار، لێبووردنی گشتی ده‌رکرد. ئه‌ویش، وه‌کوو هه‌زاران حوکمدراوی تر، ئازاد کرا و یه‌کسه‌ر هاته شاخ، له‌وێ یه‌کترمان بینییه‌وه. هه‌موومان به ئازادبوون و ده‌ربازبوونی دڵخۆش بووین. کاک که‌مال، له ساڵانی نه‌وه‌ته‌کاندا، به سکرتێری حزبی شیوعی کوردستانی عێراق هه‌ڵبژێردرا.

تا ده‌هات له‌گه‌ڵ ئێکا زیاتر هۆگری یه‌کتر ده‌بووین، دووریی نێوانمان سۆز و گه‌رمیی به پێوه‌ندییه‌که دابوو، حه‌زی یه‌کتربینینی به‌هێزتر کردبوو. چه‌ند جاری تر له بوڵگاریا یه‌کترمان بینیی. له خۆم ده‌پرسی ئه‌م پێوه‌ندییه به‌کوێ ده‌گات؟ ده‌مه‌ویست پێش ئه‌وه‌ی ئێکا باسی ئه‌و مه‌سه‌له‌یه بکات، لای خۆم یه‌کلایی بکه‌مه‌وه. هه‌ندێک ڕۆژ بڕیاری ژنهێنانم ده‌دا، ڕۆژی دواتر په‌شیمان ده‌بوومه‌وه. ده‌مزانی ئه‌گه‌ر ئێمه نه‌بینه ژنومێرد، دره‌نگ یان زوو، ئه‌مه‌ش کۆتایی دێت. کێ ده‌ڵێت دوای ئه‌و به کچێکی تر ده‌گه‌م، که پێکه‌وه هێنده گونجاو بین.

له نیسانی ١٩٨٦ له نووسینی دوکتۆرنامه‌که‌م بوومه‌وه. ئه‌و قوتابییه بیانییانه‌ی ده‌گه‌یشتنه ئه‌و قۆناخه، دڵخۆش ده‌بوون، چونکه واده‌ی گه‌ڕانه‌وه‌یان بۆ وڵات نزیک ده‌بۆوه. له‌وی که‌سوکار و زانکۆ چاوه‌ڕێیان بوون. که‌چی بۆ ئێمه‌مانان، که نه‌مانده‌توانی

بگەڕێینەوە وڵاتەکەمان، سەرەتای گرفتی نوێ و مایەی خەم و نیگەرانی بوو، چونکە نەماندەزانی ڕوو لە کوێ بکەین.

لە گەرمەی بیرکردنەوە لە چارەنووسی خۆم و ئەوینەکەم، ژیانی مەنفا و بیرهاتنەوەی ڕۆژانی پێشمەرگایەتی و شەڕی نێوخۆ، دەستم بە نووسینی قەسیدەی وەرزی سەهۆڵبەندان کرد و ڕۆژانە پێیەوە خەریک بووم. لە کۆتایی حوزەیران، ماوەی سێ هەفتە بۆ پشوودان چووم بۆ ڤارنا، لەوێ لە میوانخانەی ئەکادێمیا بووم، کە لە ڕۆخی دەریای ڕەش بوو. پێشنیوەڕۆیان بۆ مەلەکردن دەچووم، زۆربەی شەوانیش سەرقاڵی نووسینی هۆنراوەکە بووم.

لە ناوەڕاستی تەمموز (جولی) ئێکا بە فڕۆکە، لە شاری باتومییەوە ڕاستەوخۆ هاتە ڤارنا و لەوێ پێشوازیم کرد. چەند ڕۆژێک لەوێ پێکەوە بووین، دواتر بە شەمەندەفەر (قیتار) چووینە سۆفیا، کە ئێوارێ بەڕێ دەکەوت بۆ بەیانییەکەی دەگەیشتە ئەوێ. شەمەندەفەرەکە "ژوور"ی خەوتنی تێدا بوو. پێشتر دوو بلیتم کڕیبوو، کاتێک سواری قیتارەکە بووین، بلیتەکانم بە جابییەکە پیشان دا، چاوی لێکردین و وتی ئێوە ژنومێردن؟ وتم نەخێر ئێمە دەزگیرانین. وتی تەنیا ژنومێرد بۆیان هەیە پێکەوە لە ژووریک بن، تۆ دەبێت بڕۆیتە جێگای تایبەتی پیاوان. من لەو قسەیە سەرم سوڕما! نزیکەی چوار ساڵ بوو لە بولگارستان بووم، نەمزانیبوو شتی لەم جۆرە هەیە. وا دیار بوو سەد ساڵ دوای ئازادبوونی بولگارستان، لە داگیرکەری عوسمانی، هێشتا شوێنەواری کولتوورەکەی هەر مابوو! بە جابییەکەم وت:

ئەم کارە سەردەمی عوسمانییەکانی بە بیر هێنامەوە!

جابییەکە بە زەردەخەنەوە وتی:

چی بکەم بڕیارەکە بەو جۆرەیە.

بە ڕاڕەوی شەمەندەفەرەکەدا ڕۆیشتین، لە جێیەک وتی:
ئەمشەو بەبێ دەزگیرانەکەت لێرە بنوو.

لەمێژبوو بڕیارم دابوو، دوای تەواوکردنی خوێندن، نەگەڕێمەوە بۆ شاخ، چونکە شەڕی نێوخۆ فراوانتر و خوێناویتر کرابوو. حزبی شیوعی تا قووڵایی ئەو شەڕە چووبوو، تێکشکاو لەناویدا چەقیبوو. هەروا ئامادە نەبووم جارێکی تر، ئازادیی خۆم بخەمە دەستی کەسانی تر. بەڵام هێشتا نەمدەزانی دوای بولگارستان، بەرەو کوێ دەچم و لە کام وڵات دەگیرسێمەوە. لە خۆم پرسی کەواتا بۆ ژن نەهێنم؟ لە هەر وڵاتێک بژیم، ئێکا دەتوانێت لەگەڵم بێت، یان دەرفەت دەبێت بەردەوام سەردانی یەکتر بکەین.

بە ئێکام وت: ساڵێکم لە بولگارستان ماوە، دوای ئەوە دەبێت ئێرە بەجێ بهێڵم. هێشتا بڕیارم نەداوە ڕوو لە کوێ بکەم، بەڵام دەزانم تۆم خۆش دەوێت و دەمەوێت پێوەندیمان بەردەوام بێت.
ئێکا وتی: منیش تۆم خۆش دەوێت، ئەمەم بە دایکم و باوکم وتووە. ئەوان پێیان ناخۆشە من ئەو ڕێگا دوورە دەبڕم تا بچم بۆ لای کەسێک، کە ئەوان نازانن کێیە! دەزانم ئەوان لە داهاتووی من دەترسن، بەڵام پێم وتوون تۆم خۆشدەوێت. لێرە یان لە هەر کوێ بژیت، ئامادەم لەگەڵت بم.

ئەو کاتە هەر قوتابییەکی عێراقی کە لە بولگارستان خوێندنی تەواو دەکرد، ئەگەر نەیتوانیبووایە بگەڕێتەوە وڵات، لەجیاتیان هەر وڵاتێکی تری بویستایە، لەوانە وڵاتانی ڕۆژئاوا، بلیتی فڕۆکەیان بۆ دەبڕی، بێ ڤیزای ئەو وڵاتە یارمەتییان دەدا و بەڕێیان دەکرد، چونکە بۆی نەبوو لەوێ بمێنێتەوە، مەگەر ژنەکەی بولگار بێت، یان لەوی کار بکات. هەروا لە باشووری یەمەن، لیبیا و ئەلجەزایر دەرفەتی کار، بۆ ئەوانەی بڕوانامەی باکالۆریۆس و دوکتۆرایان

هەبوو، زۆر بوو. من دامنابوو دوای ئەوەی بولگارستانم بە جێ هێشت و لە شوێنێک گیرسامەوە، بچم بۆ جۆرجیا و خوازبێنی ئێکا بکەم. کەچی ئێکا بە باشی زانی تا لە بولگارستانم ئەو کارە بکەین، چونکە ئەو کاتە لە سۆفیا وەرگرتنی ڤیزای سۆڤیەت، کە وڵاتێکی داخراو بوو، ئاسانتر بوو. بەڵام گرفتەکە ئەوە بوو من قوتابی بووم، منحەی مانگانەی خوێندن هەر بەشی ژیانی ئاسایی دەکردم. ئەو ڕۆژەی خوێندنەکەم تەواو دەبوو، ئەو پارەیەش دەبڕدرا. هیچ دەرماڵەیەکم لەبری کاری حزبی، وەکوو بەرپرس و نوێنەری حزب، وەرنەدەگرت. دەستم بە کەسوکاریشم نەدەگەیشت یارمەتیم بدەن. تەنانەت توانای ئەوەم نەبوو ئەلقە و جلی بووکێنیش بۆ ئێکا بکڕم، بۆیە لە خۆشەویستی بەولاوە هیچ شتێکی ترم نەبوو پێی ببەخشم. دوای ئەو قسانە پێم وت:

با ماوەیەکی تر چاوەڕێ بکەین تا لە شوێنێک دەگیرسێمەوە.

ئێکا وتی: من پێویستم بە هیچ شتێک نییە خۆشەویستیی تۆ نەبێت. باوەشمان بەیەکتردا کرد، بڕیارمان دا پێکەوە بژین.

بەڵام ئەمە تەنیا نیوەی مەسەلەکە بوو. لە زۆر حیکایەت، بەیتی فۆلکلۆری، چیرۆک و ڕۆماندا، عاشقان بە هۆی جیاوازیی کۆمەڵایەتی و چینایەتی، یان کێشەی نێوان دوو بنەماڵە و خێڵ، یاخود لەبەر زۆرداریی باوک، بێموراد بوون و عیشقەکەیان بە جۆرێکی تراجێدیانە کۆتایی هاتووە. کەچی ئەوینی ئێمە، لەبەر هۆکاری سیاسی و بیرۆکراتی بەر هەڕەشە کەوتبوو.

ئەو سەردەمە هەر قوتابییەکی عێراقی و وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئەگەر بیویستایە لە یەکێتیی سۆڤیەت ژن بخوازێت، دەبوو پشتگیرییەک لە سەفارەتخانەی وڵاتەکەی بهێنێت، کە تیایدا نووسرابێت ئەو هاووڵاتییە ژنی تری نییە، ئەوان ڕازین فلان کچ

بهێنێت و ئەو ژنهێنانە لە وڵاتەکەیان بە قانوونی دادەندرێت. چونکە پێشتر بە دەیان کەس و قوتابی، لەوانە کەسایەتیی سیاسی و قوتابیی کورد، لە وڵاتی خۆیان ژنیان هەبوو، کەچی لە یەکێتیی سۆڤیەت ژنیان هێنابۆوە، بێ ئەوەی بە ژنە نوێکانیان بڵێن، کە لە وڵاتی خۆیان ژنیان هەیە! کاتێک گەڕابوونەوە وڵات، ژنە سۆڤیەتییەکانیان بەجێ هێشتبوون. ئەوەش گرفتی تایبەت و کۆمەڵایەتیی بۆ زۆر کەس و خێزان و منداڵ، دروست کردبوو.

ئەندام و کادیرانی حزبی شیوعی، نەیاندەتوانی ڕوو لە سەفارەتخانەی عێراق بکەن، دەبوو ڕێکخراوی حزب، یان ئەگەر پاسپۆرتی کۆماری باشووری میللی یەمەنییان هەبووایە، سەفارەتخانەی یەمەنی باشوور، بە ڕەزامەندیی ڕێکخراوی حزبی شیوعی، ئەو پشتگیرییەیان بۆ بکەن. بەڵام مەکتەبی سیاسیی حزبی شیوعی، نەیدەویست ئەو ئەندامانەی کە لە یەکێتیی سۆڤیەت و وڵاتانی سۆشیالیستی دەیانخوێند، ژنی بیانی بهێنن. چونکە لەوانە بوو دواتر لەو وڵاتانە بمێننەوە، یان خۆیان سەرقاڵی ژن و منداڵ بکەن و لە کاری حزبی دوور بکەونەوە! بۆیە ئەو جۆرە پشتگیرییە بۆ ئەندام و کادیرانی حزبی شیوعی نەدەکرا. چەندان ئەندامی حزبی شیوعی هەبوون ساڵانێک بوو، لە یەکێتیی سۆڤیەت ژنیان هێنابوو، منداڵیان هەبوو، کەچی نەیاندەتوانی لە دادگا وەکوو ژنومێرد خۆیان ناونووس بکەن. بۆیە لە ڕووی قانوونی و کۆمەڵایەتییەوە، بە ژنومێرد دانەدەندران. ئەوەش گرفتی بۆ ئەو خێزانانە و منداڵەکانیان دروست کردبوو.

من نوێنەری حزبی شیوعی بووم لە بولگارستان. پاسپۆرتی یەمەنیم هەبوو، هەر پشتگیرییەکم بۆ خۆم، یان بۆ هەر کەسێک، لە سەفارەتخانەی یەمەنی باشوور، داوا بکردایە یەکسەر بۆیان ئامادە

دەکردم. بەڵام نەمویست، لە پشت سەرکردایەتیی حزب، ئەو کارە بکەم. هەروا بە باشم نەزانی بە نامە، لەو مەسەلەیە ئاگاداریان بکەم، چونکە دڵنیا بووم مرداریان دەکردەوە. لە دەرفەتێکی گونجاو دەگەڕام پرسی ژنهێنانەکەم لەگەڵ ئەندامێکی سەرکردایەتی باس بکەم، کە زۆر جار بە سۆفیادا ڕەت دەبوون، یان هاوینان، کە بۆ کاری قوتابیان دەچوومە پراگ، لەوێ دەمبینین.

چەند ڕۆژ دوای گەڕانەوەی ئێکا بۆ باتومی، درێژەم بە نووسینی هۆنراوەکە دا، کۆتایی ئابی ١٩٨٦ تەواوم کرد، ناوی (وەرزی سەهۆڵبەندان)م بۆ هەڵبژاد. چەند جارێک بە وردی پێیدا چوومەوە، هەندێک دەستکاریم کرد. ئەوینی ئێکا بە قووڵی ئاوێتەی وەرزی سەهۆڵبەندان بووە، بۆیە پێشکەشی ئەوم کرد.

هۆنراوەکەم بۆ هاوڕێم کەمال میراودەلی نارد، کە ئەو کاتە سەرۆکی مەڵبەندی ڕۆشنبیریی کوردی بوو لە لەندەن. هۆنراوەکەی زۆر بەدڵ بوو. لە ئاداری ١٩٨٧ بە نامیلکەیەکی ٤٦ لاپەڕەیی، وەکوو بڵاوکراوەی مەڵبەندی ڕۆشنبیری، چاپ کرا.

ئەو هۆنراوەیە ئەزموونێکی شیعریی نوێیە و شێواز، زمان و تەکنیکی شیعریی منی گۆڕی. هۆنراوەکە شێوەیەکی داستانئامێزی هەیە، فرەڕەنگ، فرەبابەت و فرەدەنگە. شێوازی ئاخاوتنی کەسی یەکەم، کەسی دووەم و سێیەم، گێڕانەوە، مۆنۆلۆگ و دایەلۆگ بەکار هاتوون. کەشوهەوای دراماتیکی هۆنراوەکە، بەپێی جۆر و شێوازی ڕووداوەکان، گۆڕانیان بەسەردا دێن. مەنفای ڕۆحی و جەستەیی و ئەوین، تێمایەکی سەرەکیی هۆنراوەکەن، کە تیایدا دیمەن و وێنە و ڕووداو و کات، بەخێرایی ئاڵوگۆڕیان بەسەردا دێن و هەندێک جار تێکەڵاوی یەکتر دەبن. هەروا سێبەری شەڕ و شەڕی نێوخۆ، شوێنەواری خۆیان لە هۆنراوەکەدا بە جێ

هێشتووە. سەرەنجام ڕێگای ئەوین، ئەگەر ڕێگای نەهاتیش بێت، وەکوو شارێگا هەڵبژێردراوە:

سێوەخانێ!
ئەم شەو لە گەردوونی چاوتا لەنگەر دەگرم
هاتووم لە ماچانت بگرم
سێوەخانێ!
ئەم شەو بروسکە زین دەکەم
هەڵت دەگرم.

بە سەر شانی دارستاندا سەردەکەوم
چرایەک بە لقی شەودا هەڵدەواسم
لەنێوانی دوو لوتکەدا
هەورێک دەکەم بە جۆلانە
تاوڵێکی بێ خاک و ئەستووند
ئەشکەوتێک، پەنا دەوەنێک بە هێلانە.
بۆ کوێت بەرم سێوەخانێ؟
بە شەوی باوبۆرانێ
ناگەمەوە کوردستانێ.

٣

## ئێمە لەگەڵ ئەوە نین ژنی بیانی بهێنیت!

لە سەرەتای ئاداری ١٩٨٧ لە نووسینی دوکتۆرنامەکەم بوومەوە. مامۆستایەکی زمانی بولگاری بە نووسینەکەدا چۆوە. پرۆفیسۆر پۆپۆف، زۆر لێی ڕازی بوو. ئەکادیمیا بە نامەی تایبەت، بۆ دوو پسپۆڕی فەلسەفەی نارد، پرۆفیسۆر دوکتۆر گێنۆ تسۆکۆڤ، پرۆفیسۆر دوکتۆر دینیۆ گردیڤ، بۆ ئەوەی سەرنج و ڕای خۆیان لەبارەیەوە بنووسن. چاوەڕێ بووم، پێش پشووی هاوین، لە بەردەم لیژنەی تایبەتدا، گفتوگۆی لەبارەوە بکرێت و یەکلایی بکرێتەوە.

لەو دەمەدا فەخری کەریم، کە ئەو کاتە ئەندامی سەرکردایەتیی حزبی شیوعی بوو، بە بولگارستاندا تێ پەڕی. من لە سەرەتای حەفتاکانەوە، کە لە ڕۆژنامەی بیری نوێ- فیکر ئەلجەدید کارم دەکرد، دەمناسی، بەڵام باسی ژنهێنانەکەم لەگەڵ نەکرد. چونکە خۆی ژنی نەبوو، دەمزانی بایەخ بەمەسەلەکە نادات. هاوڕێ فەخری ئاگاداری کردم کە لە ناوەڕاستی ئاداردا، کۆبوونەوەیەکی تایبەت، لە بەرلینی ڕۆژهەڵات لەبارەی دۆخی فیکری، ئابووری و ئایدیۆلۆجیی عێراق و سیاسەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنی حزبی شیوعی ڕێک دەخرێت. ناوی کۆمەڵێک ڕووناکبیر، ئابووریناس،

نووسەر و ڕۆژنامەنووسی هێنا، کە بەشدار دەبن، لەوانە خۆی و دوکتۆر کازم حەبیب، کە ئەندامی مەکتەبی سیاسی و بەرپرسی ڕێکخستنی حزبی شیوعی بوو لە ئەوروپا. دوایی وتی تۆش بۆ ئەو کۆبوونەوەیە بانگ کراویت و هاوڕێیان بلیتی فڕۆکەت بۆ دەنێرن.

بە هەواڵی کۆبوونەوەکەی بەرلین دڵخۆش بووم، چونکە لەوێ کۆمەڵێک مەسەلەی هزری، ئابووری، سیاسی و کولتووری باس دەکرێن، هەروا لەوێ د.کازم حەبیب دەبینم، کە لە ساڵانی شەستەکان، لە ئەڵمانیا خوێندنی دوکتۆرای، لە بواری ئابووری، تەواو کردبوو. کەسێکی ڕووناکبیر، کراوە، مۆدێرن و دۆستی کورد بوو. من پێشتر دەمناسی، گونجاوترین کەس بوو ئەو مەسەلە تایبەتەی خۆمی لەگەڵ باس بکەم، چونکە ژنەکەی ئەڵمان بوو، تێگەیشتنی بۆ ئەو مەسەلەیە زیاتر بوو. باوەڕم نەدەکرد بڵێ ژنی بیانی مەهێنە. پێش سەفەرەکە، هاوڕێ کەمال شاکر، ڤیزای یەکێتیی سۆڤیەتی بۆ ئامادە کردم. هەروا نامەیەکم لە ئەکادیمیا وەرگرت، کە تیایدا نووسرابوو، من لەوێ خوێندکاری دوکتۆرام.

کۆبوونەوەکە لە دەرەوەی شاری بەرلین بوو، چەندان ڕووناکبیری دیاری حزبی و ئازادیخواز تیایدا بەشدار بوون، لەوانە د. نەمیر ئەلعانی، فایەق ئەلبەتی، د.جەوهەر شاوەیس، د.زوهدی داودی، فالح عەبدولجەبار، فازیل ئەلعەزاوی، زوهێر ئەلجەزائیری، عەدنان حوسێن، من و چەندان نووسەر ڕۆشنبیری تر، کە ناوەکانیانم لەبیر نین. لە کۆبوونەوەکەدا سێ پرس باس کران:

١-گەشەکردنی ئابووری و کۆمەڵایەتیی عێراق، لە ساڵی ١٩٦٨ تا ناوەڕاستی هەشتاکان. دوکتۆر کازم حەبیب باسێکی فراوانی لەو بارەیەوە پێشکەش کرد. ئاماژەی بەوەدا کە دوای خۆماڵیکردنی

نەوت و زۆربوونی داهات، دۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتیی عێراق بە خێرایی گۆڕانیان بەسەردا هات. سەرەتای بە مۆدێرنکردنی کشتوکاڵ و گەشەکردنی هێزی بەرهەمهێنەر و بایەخدان بە سەنعەتی خۆماڵی دەستی پێ کرد. ئابووریی عێراق گەشەی کرد، بە ملیۆن کەس، لە لادێکانەوە چوونە شار و لە دەزگای سوپا و پۆلیس و دەزگای بیرۆکراسیی دەوڵەت و کەرتی تایبەت کەوتنە کارکردن. بەڵام شەڕی عێراق و ئێران، کۆتایی بەو گەشەکردنە ئابوورییە هێنا. دۆخی کۆمەڵایەتیی عێراق بە تەواوی شێوێندرا. تا ئەو کاتە عێراق ٢٥٠ ملیار دۆلار زیانی لێ کەوتبوو. سەد ملیار دۆلار زیاتر قەرزدار بوو.

٢- رەوشی فیکری و ئایدیۆلۆجی لە عێراقدا بابەتێکی تری کۆنفرانسەکە بوو. د. نەمیر ئەلعانی، کە پسپۆڕی بواری فەلسەفە بوو، باسێکی لەبارەی هزر و ئایدیۆلۆجیای حزبی بەعس، پێشکەش کرد. ڕوونی کردەوە کە دەسەڵاتی بەعس تا چ ئەندازەیەک و بە چ شێوازێک هزر و ئایدیۆلۆجیا و کولتووری سیاسیی خۆی، لە عێراقدا سەپاندووە.

٣- سیاسەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن لە عێراقدا باسێکی تر بوو. لەسەرەتای حەفتاکاندا ڕۆشنبیرانی عێراقی پشتیان بە کار و نووسینی خۆیان بەستبوو، لە ڕووی ئابوورییەوە، وابەستەی دەسەڵات نەبوون. بەڵام پاش ئەوەی پارەی زۆر، بە هۆی داهاتی نەوتەوە ڕژایە عێراق، بەعس توانی بە پارە و دەمچەورکردن بەشێکی نووسەران، هونەرمەندان و ڕۆژنامەنووسان، بە لای خۆیدا ڕابکێشێت و بە دەزگای ڕۆشنبیری، سیاسی و ئایدیۆلۆجیی خۆیەوە گرێیان بدات. تەنانەت لە کوردستانیش، دوای ساڵی١٩٧٥، کۆمەڵێک نووسەر و ڕۆژنامەنووس ڕوویان لە بەعس کرد. لە

کۆبوونەوەکەدا سیاسەتی ڕۆشنبیری و ڕۆڵی میدیای حزبی شیوعی، باس و لێدوانیان لەبارەوە کران و چەند بڕیارێک، لەو بوارەدا، وەرگیران.

دوای کۆبوونەوەکە، لەگەڵ د.کازم باسی مەسەلەی ژنهێنانەکەم کرد، پێموت دەمەوێت ئەو کچە بیهێنم. د.کازم دۆستانە وتی:

هاوڕێ با شتێکت بۆ بگێڕمەوە، دوای شۆڕشی تەمووزی ۱۹۵۸ بۆ خوێندن هاتم بۆ ئەڵمانیا، وەکوو تۆ عاشقی کچێک بووم، کە ئەڵمان بوو. حزب لەگەڵ ئەوە نەبوو ئێمە ژنی بیانی بهێنین. ڕۆژێک هاوڕێ شەهید جەمال حەیدەری[1] بۆ کارێک هاتە بەرلین، لەگەڵ ئەو باسی مەسەلەکەم کرد، لە وەڵامدا پێی وتم:

هاوڕێ کازم، ئێمە تۆ باش دەناسین، دەزانین ژنەکەت عێراقی بێت، یان بێگانە، تۆ وەکوو ئێستا لە کار و تێکۆشانی خۆت، بەردەوام دەبیت.

دوای ئەوە د.کازم کەمێک بێدەنگ بوو، وتی:

هاوڕێ منیش هەمان قسەی شەهید جەمال بە تۆ دەڵێم، لە ئێستاوە پیرۆزباییت لێ دەکەم.

لە بەرلینەوە بە قیتار بەرەو مۆسکۆ بەڕێ کەوتم، لەوێوە چوومە شاری باتومی، کە دووەم شاری گەورەی جۆرجیایە و لەسەر دەریای ڕەشە. ئێکا لەوێ دەژیا و کاری دەکرد. ژوورێکی لە هۆتێلێکی ناوەندی شارەکە بۆ گرتبووم، کە لای ماڵەکەیان بوو.

---

1- جەمال حەیدەری ئەندامی مەکتەبی سیاسی حزبی شیوعی بوو، ساڵی ۱۹٦۳ بە ئەشکەنجەدان شەهید کرا. دواتر لە ۲۲-۷-۱۹٦۳ ڕاگەیاندنێک بە ناوی دادوەری گشتیی سەربازی، ڕەشید ئەلموسلیح، لە ڕۆژنامەی ئەلجەماهیر، بڵاو کرایەوە، تیایدا هاتبوو کە ئەو دادگایە فرمانی لە سێدارەدانی بۆ جەمال حەیدەری و دوو سەرکردەی تری حزبی شیوعی، عەبدولجەبار وەهبی و محەمەد ساڵح ئەلعەبلی، دەرکردووە و هەرسێکیان لە ۲۱ی تەمووز لەسێدارە دراون.

پێکەوە چووینە ماڵی دایکوباوکی ئێکا، کە مامۆستا بوون، لە شارۆچکەی کابولێتی، دەژیان، کە نزیکی دەریا و بیست دەقە لە باتومییەوە دوورە. ئەوان دۆستانە پێشوازییان کردم، بەڵام پەشۆکاو دیار بوون، پرسیاری زۆریان کرد، منیش بێ هیچ خوارو خێچی و زیادەڕۆییەک، وەڵامم دانەوە. ئەوان هەقیان بوو، کەسێکی غەریب و نەناسی بیانی پەیدا بووە، دەیەوێت کچەکەیان بەرێت. ئەوان دڵنیا نین خەڵکی کام وڵاتە و کچەکەیان لە کوێ دەگیرسێتەوە. خۆی دەڵێ کوردی عێراقە و لە بولگارستان دەخوێنێت، کەچی پاسپۆرتەکەی یەمەنییە و ناشتوانێت دوای تەواوکردنی خوێندنەکەی بۆ عێراق بگەڕێتەوە. ئەوان بە (سەلیم) دەیناسن، بەڵام ناوی ڕەفیق سابیرە. دەیەوێت کچەکەیان ببات، بەڵام نازانن بۆ کوێ و لە کام شار و وڵاتی دنیا نیشتەجێی دەکات. چۆن پێداویستیی ژیانی خۆی و ژنەکەی دابین دەکات!. تاکە شتێک کە لێی دڵنیان ئەوەیە تا ماون کچەکەیان لێیان دوور دەبێت، بە درێژایی ساڵ چاوەڕێ دەبن، کەی بە سەردان دەچێتەوە لایان. لەبەر ئەو هۆکارانە و سڵەمینەوە لە کەسی بیانی، سەرەتا زۆر دژی ئەوە بوون ئێکا شوو بە من بکات، بەڵام بە هۆی پێداگریی ئێکا و خۆشەویستی و متمانەبوونی ئەوان بە کچەکەیان، ڕازی بوون.

نانی ئێوارەمان خوارد، لەوێ هەستاین، لە کاتی خواحافیزیدا بە گەرمی سوپاسم کردن، کە لە ماڵەکەیاندا پێشوازییان کردووم و وەکوو کەسێکی بنەماڵەکەیان قبووڵیان کردووم، پێم وتن:

مـن و ئێکا یەکترمان خۆش دەوێت، بەڵێنتان پێ دەدەم کە هاوسەر و هاوڕێی باشی کچەکەتان بم.

لەگەڵ ئێکا ئەوانمان بەجێ هێشت و چووینەوە باتومی. بۆ

بەیـانی پـێکەوە ڕۆیشـتینە نووسـینگەی کاروبـاری مەدەنـی (نووسینگەی مـارەبڕین) لەوێ داواکاریمـان پێشکەش کـرد. ژنەکە پێی وتین وەڵامەکە زۆر ناخایەنێت، دەبێت لە مـاوەی سێ مانگدا بێنەوە ئێرە، پەیماننامەی ژنومێردایەتی ئیمزا بکەن. ڕووی لە من کرد وتی:

تۆ دەبێت لە سەفارەتخانەی یەمەن لە سۆفیا، نووسراوێکمان بۆ بێنی، کە تیایدا هاتبێت ڕەفیق سابیر قادر هـاووڵاتییەکی یەمەنییە و ئەوان ڕازین تۆ ئەم کچە، دارۆ لۆمـادزێ ئەلێکساندرا، بهێنیت. ئەم ژنهێنـان و شـوکردنە (زەواج) لە یەمەن بە قـانوونی دادەنـدرێت، هەروا دەبێت بنووسن تۆ ژنی ترت نییە.

دوو سێ هەفتە بوو لە جۆرجیا گەڕابوومەوە، چاوەڕێ بووم کاتێکم بۆ دیاری بکەن، لەبەردەم لیژنەی زانستیدا، گفتوگۆ لەبارەی دوکتۆرنـامەکەم بـکەم. نـامەیەکم لە سـەرکردایەتیی حـزبەوە پـێ گەیشـت کە پێوەنـدیی بە کاروبـاری حـزبییەوە هەبـوو. لە کۆتـایی نامەکەدا نووسرابوو:

ئـێمە لەگەڵ ئەوە نـین ژنـی بیـانی بهێنیـت، پێمـان باشـە واز لەو کارە بهێنیت.

ئەو داوایەی سەرکردایەتیی حزب تـوڕە و بێتـاقەتی کـردم. چۆن ئـاوا بە ئاسـانی دەسـتبەرداری ئەو ئەویـنە بـبم؟ ئایـا یـاریکردن بە هەسـت و سـۆزی کەسـێکی هەرە خۆشەویسـت و ئـازیز، ئەوەنـدە ئاسانە؟ بە تووڕەییەوە بە خۆمم وت:

بڕیاری خۆم داوە، چی دەبێت با ببێت.

لە وەڵامـــی نـــامەکەدا ئاگـــادارم کـــردنەوە کە (ئەو کـــچەم خۆشدەوێت، خوازبێنیم کردووە و تـازە ناکرێت پەشیمان ببمەوە.) لەگەڵ وەڵامەکەدا نامەیەکی تایبەتیم، لەبارەی ژنهێنانەکە بۆ عەزیز

محەمەد نووسی، کە ئەو کاتە لە دیمەشق بوو، نامیلکەی (وەرزی سەهۆڵبەندان)م هاوپێچی نامەکە کرد، کە لە سەرەتادا نووسرابوو پێشکەش بە ئێکا کراوە، بۆ ئەوەی بزانێ تا چەند ئەم مەسەلەیە لای من گرینگە. دەنا من هاورێ عەزیزم لە نزیکەوە دەناسی، دەمزانی کەم یان زۆر ئاگاداری شیعری کوردی، بە تایبەت شیعری شاعیرانی حەفتاکان نییە و ئەو جۆرە شیعرانە ناخوێنێتەوە، چونکە لەگەڵ چێژی ئەدەبیی ئەو و ئاستی ئاشنابوونی ئەو بە ئەدەبیات، نەدەگونجان.

دواتر زانیم مەکتەبی سیاسی ڕەخنەیان لە د.کازم گرتبوو، چونکە ڕێگری لێ نەکردووم کچێکی بێگانە بهێنم. پێیان وتبوو ئەو کارەی من دەرگایەکیان بۆ دەکاتەوە، کە ناتوانن بە ئاسانی دایبخەنەوە. ڕاستییەکەی هەر بەو جۆرەش بوو، کە ئەوان چاوەڕێیان دەکرد، وەکوو دواتر باسی دەکەم.

دوای چەند هەفتەیەک سەرکردایەتیی حزبی شیوعی ئاگاداریان کردم، کە بڕیاریان داوە، دوای تەواوکردنی خوێندنەکەم، وەکوو نوێنەری حزب بچم بۆ کابول. ئامانجی سەرەکیی کارەکەش ئەوە بوو کە، لە ئەفغانستانەوە هاوڕێیانمان بە قاچاخی و لە ڕێگای ئێرانەوە بۆ کوردستان بنێرین. لەوێشەوە بە هەمان ڕێگادا بێن بۆ ئەفغانستان و بەرەو مۆسکۆ بەڕێیان بکەین.

لە ئەفغانستان حزبێکی مارکسیی حوکمڕان بوو، ئەوان و هاوڕێیانی فیداییانی خەڵکی ئێران (ئەکسەریەت) بەڵێنیان دابوو، لەم بارەیەوە ئاسانکاری و کۆمەکمان بکەن.

من نەمدەویست دوای تەواوکردنی خوێندن ببم بە کادرێکی پیشەیی حزبی شیوعی، چونکە تموحی سیاسیم نەبوو، چاوم لە پلەی بەرزی حزبی نەبڕیبوو، نەمدەویست سنووری ئازادیم

بەرتەسک ببێتەوە. کاتێک نووسەر دەبێتە کادیری پیشەیی حزبێک، هـزر و هۆشـی زۆرتـر لە لای کـاری حزبـی و ڕێکخسـتن دەبێـت، زۆرتـرین کـات و وزەی خـۆی بـۆ تەرخـان دەکـات. بەرە بەرە لە خوێنـدنەوە و نووسـینیش دوور دەکەوێـتەوە. کـردار، ڕەفتـار و شـێوازی بیرکـردنەوەی دەگـۆڕدرێن. خاسـیەت و سـیما ڕۆشنبیرییەکەی خۆی لەدەست دەدات و دەبێتە کەسێکی سیاسی، چـاو لە پـلەی بەرزتـری حزبـی، دەسـەڵاتی زۆرتـر و ئیمتیـازاتی تایبەت دەبرێت، بە تایبەت کە نانی ژیانی لەناو دەستی حزبەکەیدا دەبێت. بۆیە ئامادەیە بە هەر شێوازێک بێت، شوێن و پێگەی خۆی بپارێزێت و باشتری بکات. سەرکردایەتیی حزب متمانەی بە من هەبـوو، دەیویسـت بەو ڕێگایەمـدا بەرێـت، بەڵام مـن نەمدەویسـت، وەکوو شەیکسپیر دەڵێت، ببم بەو کەسەی ئەوانی تر دەیانەوێت.

ئەو کـارەی دەبـوو لە کـابول بـیکەم، بە کـوردیی سـادە "قاچـاخچێتی" بـوو. بەڵام ئەمە بەشـێکە لە کـاری ناقـانوونی، کە لە کاتی زەوتکردنی ئازادیدا، پێویست و ڕەوایە. لە خۆم پرسی:

بـۆچی دوای پێـنج سـاڵ خوێنـدنی دوکتـۆرا، ئەو کـار و بەرپرسیارییە بە من دەسپێردرێت؟!

ئەو کـاتە قسـەیەکی نەوشـیروان مسـتەفام بیـر کەوتەوە، کە لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٨١ لە شاخ پێی وتم. دوای تاوێک قسـەکردن، لێی پرسیم ئایا جەلال دەباغ هەر لە قامیشلییە؟

دیـار بـوو دەیزانـی ئەو کـاتە کـاک جەلال لەوێ نـوێنەری حزبـی شیوعییە و لەوێوە، بە ئاگاداریی حکومەتی سووریا، هاوڕێیـان و چەک و تەقەمەنـی، بە قاچـاخی بـۆ کوردسـتان بەڕێ دەکـات. مـن وتم: بەڵێ هەر لەوێیە. ئەو وتی:

سـەیرە! کـاک جەلال نووسـەر و ڕۆژنامەنووسـێکی باشـی حزبـی

شیوعییە، ئایا قیادەی حزبتان بە چ عەقڵییەتێک کاری قاچاخچێتیی پێ دەکات؟ حزبی شیوعی چەند نووسەر و ڕۆژنامەنووسی تری وەکوو جەلال دەباغی هەیە؟

ئەو ڕاشکاوییەی نەوشیروان مستەفا سەرنجی ڕاکێشام، بەڵام قسەکەی هەڵە نەبوو. ئەوە گرفتێکی گەورەی ناو حزبی شیوعی بوو. سەرکردایەتیی حزبەکە، ئەو هونەرەی نەدەزانی کە کام ئەندام و کادیر، بۆ کام کار و شوێن دەگونجێت! یان دەیزانی و بایەخی پێ نەدەدا. هەندێک جاریش بۆ سزادان، یاخود کەنارخستنی هاوڕێیەک و ڕێگرتن لە پێشکەوتنی حزبی و جێلەقکردن بە کەسانی تر، کارێکی نەگونجاویان پێ دەسپارد. بۆیە زۆر جار، لەناو حزبی شیوعیدا، نانەوا قەسابی و قەساب نانەوایی دەکرد.

من ئەو بڕیارەم بەدڵ نەبوو، بەڵام بە باشم نەزانی لە ماوەیەکی کورتدا، دوو بڕیاری مەکتەبی سیاسی ڕەت بکەمەوە، بە تایبەت کە خوێندنەکەم تەواو دەبوو. ئاگادارم کردنەوە، کە هەر کاتێک پێویست بێت دەچم بۆ کابول، بەڵام بلیتی فڕۆکەم بۆ مەنێرن، لێرە لە ئەکادێمیا بلیتەکە وەردەگرم، ماوەیەکی کورت لە یەکێتیی سۆڤیەت، لە جۆرجیا دەمێنمەوە و لەوێوە دەچم بۆ کابول. ئەو کاتە بڕیارم دا، دوای تەواوکردنی خوێندنەکەم، بە یەکجاری بولگارستان بە جێ بهێڵم. سەرەتا بۆ جۆرجیا بچم، لەگەڵ ئێکا زەماوەند بکەین. یەک دوو مانگ لەوێ بمێنمەوە، پاش ئەوە بچم بۆ کابول.

٤

## له سۆفیاوه بەرەو باتومی و کابول

ڕۆژی ١٨-٦-١٩٨٧ بۆ گفتوگۆکردن لەبارەی دوکتۆرنامەکەم دیاری کرا. دەبوو لە بەردەم لیژنەی تایبەتدا، کە چەند پرۆفێسۆر و دوکتۆری فەلسەفە و کۆمەڵناس بوون، پوختەی بابەتەکە باس بکەم. ڕای خۆم لەبارەی سەرنجی ئەو دوو پرۆفێسۆره بدەم، کە هەڵیان سەنگاندبوو. لە بەر ئەوەی بەشێکی باسەکە پێوەندیی بە سیستەمی سیاسی، ئایدیۆلۆجی و کولتووریی دەوڵەتانی تورکیا، ئێران و عێراق و خەباتی کولتووری و بزاڤی ڕزگاریخوازیی کوردەوە هەبوو، دانیشتنەکە بە داخراوی بەڕێوە چوو. ڕێگە نەدرا، جگە لە لیژنەی تایبەت و بەرپرسی ئەکادیمیا، کەسی تر بەشدار بن. ویستم هاوڕێم نەوید موعینی لەگەڵم بیتە ناو هۆڵەکە، کەچی ڕێگەیان پێ نەدا، بە ناچاری لە دەرێ چاوەڕێی کردین.

هەردوو پرۆفێسۆرەکە ڕاپۆرتی خۆیان خوێندەوە و بە باشی لەبارەی باسەکە دووان. وەڵامی سەرنج و پرسیارەکانیانم دایەوە. دواتر چەند ئەندامی لیژنەکە پرسیاری زۆریان لەبارەی دوکتۆرنامەکە، کولتووری کورد و بزاڤی ڕزگاریخوازیی کوردستان لێ کردم. دانیشتنەکە، دوو سەعات زیاتری خایاند. دوکتۆرنامەکە بە کۆی دەنگ زۆر باش پەسەند کرا.

پێشتر ڕۆژی ٧-٥-١٩٧٨ لە سەفارەتخانەی باشووری یەمەن لە سۆفیا، ئەو نامەیەم بە زمانی ڕوسی وەرگرت، کە لە نووسینگەی کاروباری مەدەنی (نووسینگەی مارەبڕین) داوایان کردبوو. لە باڵوێزخانەی یەکێتیی سۆڤیەت، لە سۆفیا، نامەکەیان پشتڕاست کردەوە و مۆری کونسولخانەی یەکێتیی سۆڤیەتیان لێ دا.[1]

بە ئیدارەی ئەکادیمیام وت بلیتی فڕۆکەم بۆ کابول بۆ ئامادە بکەن، بەڵام ماوەیەک لە مۆسکۆ دەمێنمەوە، بۆیە کاتی سەفەری مۆسکۆ- کابول بە کراوەیی بمێنێتەوە. لە جێی من جاسم حەلوایی (ئەبو شروق) کە ساڵانی زۆر ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی حزبی شیوعی بوو، کرا بە نوێنەری حزب لە بولگارستان. لەگەڵ هاوسەری هاتن بۆ سۆفیا و لەوێ نیشتەجێ بوون.

کۆتایی حوزەیران بە یەکجاری بولگارستانم بە جێ هێشت. ئەم جارەش هاوڕێم کەمال شاکر، ڤیزای یەکێتیی سۆڤیەتی بۆ وەرگرتم و لە مۆسکۆ زۆر پێمەوە ماندوو بوو. بە داخەوە قەت نەمتوانی چاکەی کاک کەمال بدەمەوە.

ڕۆژی ٤ی تەمووز، بۆ مارەبڕین و زەماوەندەکەمان دیاری کرابوو. لەگەڵ ئێکا چووینە نووسینگەی کاروباری مەدەنی، لە شاری باتومی. تەمارای خوشکی و چەند خزم و هاوڕێی زۆر نزیکی ئێکا، لەگەڵمان هاتن. ئێکا بۆ زەماوەندەکەی تەنوورە و چاکەتێکی ڕەشی گوڵدار و کراسێکی بێجیی کاڵی بۆ خۆی کڕیبوو، چونکە من لە توانامدا نەبوو ئەڵقە و بەرگی بووکێنی بۆ بکڕم. منیش پانتۆڵێکی خۆڵەمێشی و کراسێکی سپی قۆڵکورتم لەبەر کرد. لە نووسینگەکە پەیماننامەمان ئیمزا کرد.[2]

---

1- بۆ دەقی نامەکە بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە سێ.

2- بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە چوار.

ژنە کارمەندەکە بەڵگەنامەی مارەبڕینەکەی بەدەستەوە بوو، ویستی بیدات بە ئێکا، بە زمانی جۆرجی قسەیەکی لەگەڵ کرد، کە تێی نەگەیشتم. ئێکا کەمێک شڵەژا، جانتا دەستییەکەی کردەوە، بەوردی تەماشای کرد و دەستی بە ناودا گێڕا، بەڵام هیچی لێ دەرنەهێنا. ڕووی لە ژنەکە کرد و شتێکی پێ وت. ژنەکە بە گەرمی تەوقەی لەگەڵ کردین، پیرۆزبایی لێ کردین و بەڵگەنامەکەی دا بە ئێکا. کاتێک لە نووسینگەکە چووینە دەرێ، لە ئێکام پرسی ئەو ژنە چی پێ وتی و بۆ ئاوا شڵەژای؟ ئێکا بە پێکەنینەوە وتی:

ژنەکە داوای لێ کردم ئەڵقەکان دەربهێنم، تا لە پەنجەی یەکتری بکەین، منیش پێم وت لە ماڵێ لە بیرم چووە.

هەموومان دەستمان کرد بە پێکەنین. چووینەوە ماڵی ئێکا، کەمێک شامپانیامان خواردەوە. بە هەمان بەرگ و شادییەوە، بەرەو ماڵی دایکوباوکی ئێکا، بەڕێ کەوتین. لەوێ ئاهەنگی زەماوەندەکەیان ساز کردبوو، ٢٥ تا ٣٠ کەسیان بانگ کردبوو، هیچ کەس و برادەری من لەوێ نەبوو.

ئاهەنگەکە بە باشی بەڕێوە چوو. پێش ئەوەی تەواو ببێت ئەو کەسەی بەڕێوەی دەبرد، کە بە جۆرجی پێی دەڵێن (تەمادا) هەستا، شووشەیەک شەڕابی سوور و شاخەگایێکی کێویی بە دەستەوە بوو، ڕووی لە من کرد و وتی:

دەبێ زاوا، پێش تەواوبوونی ئاهەنگەکە، شووشەیەک شەڕاب بە یەک کەڕەت، بێ وچان و وەستان، بخواتەوە، بۆ ئەوەی توانای خۆی پیشان بدات.

شەڕابەکەی ڕۆکردە ناو شاخەگایەکە و بەرەو لای من و ئێکا هات. من حەپەسام، چونکە نەمدەزانی ژنهێنانەکەم ئەم سەربارە گرانەشی دەوێت! بەڵام هەستام و لێموەرگرت. پێشتر نیو قاپ

ڤۆدکا و پەرداخێک شەمپانیام خواردبۆوە. تەماشای ئامادەبووانم کرد، هەندێکیان وەکوو ئەوەی بۆ زۆرانبازی، یان بۆکسێن بچم، هانیان دەدام، ئەوانی تر چاوەڕێ بوون تا بزانن زاوا بیانییەکە شێرە یان ڕێوی! بە ناچاری شەڕابەکەم بێ ناوبڕ و وچان خواردەوە، تا ئێستا شاخەگایەکەشم پاراستووە.

زۆرم پێ سەیر بوو، دوای ئەوە نە هێڵنجم هاتێ، نە سەرخۆش بووم و نە تووشی سەرەگێژە و ژانەسەر هاتم! پاش ئەو هەموو ڤۆدکایە، چۆن لەشم توانی وەک ئیسفنج، سێ چارەگە لیتر شەڕاب هەڵبمژێت! ئەگەر ئەوە سیحری ئەوین نەبێت، دەبێت چی بێت!

ئێکا، لە کۆمپانیای کەشتیوانیی جۆرجیا وەکوو تەرجومانی ئینگلیزی، رووسی و جۆرجی کاری دەکرد. چەند ڕۆژ دوای ئاهەنگەکە، بە داشکانێکی زۆرەوە، دوو بلیتی یەک هەفتە گەشتی دەریایی، بە سێ ژەم نانخواردنەوە کڕی. کەشتییەکە لە بەندەری باتومییەوە بەڕێ کەوت، لە چوون و گەڕانەوەیدا، بە شارەکانی سوخۆمی، سۆچی، یالْتا و ئۆدێسادا تێ پەڕی و گەڕایەوە باتومی. ئەوە یەکەمجار بوو سواری کەشتی ببم، کە هێندەی هۆتێلێکی گەورەی پێنج شەش قاتی بەرز بوو، ڕێستوران، بار، دیسکۆ، شوێنی مەلەکردن، ساونا و سۆپەرمارکێتی تێدا بوو. شەوان کەشتییەکە بەڕێ دەکەوت، بەرەبەیان لە بەندەری یەکێک لەو شارانە دەوەستا. تا ئێواری لەوێ دەبووین، بەناو شارەکەدا دەگەڕاین، سەردانی شوێنی مێژوویی و مۆزەخانەمان دەکرد. ئێکا دەستەخوشکێکی لە ئۆدێسا هەبوو، وتی کە گەیشتینە ئەوێ سەردانی دەکەین. لە شاری سۆچییەوە بە تەلەگرام کچەی ئاگادار کرد، کە دوای دوو ڕۆژ دێینە ئۆدێسا و سەردانی دەکەین. ئەو کاتە تەلەگرام، دوای تەلەفۆن، خێراترین شێوازی پێوەندیکردن

بـوو، كه له پۆسـتـه‌وه به‌ڕێ ده‌كـرا و هه‌مـان سـه‌عات ده‌گه‌یشـته پۆسـتی ئه‌و شـاره‌ی بـۆی نێـردراوه. له‌وێـش به په‌له بـۆ شـوێنی مه‌به‌ستیان ده‌برد. كاتێک گه‌یشـتینه ئۆدێسـا چووینه مـاڵی كچه‌كه، چه‌نـد جـار له ده‌رگامـان دا، كه‌س وه‌ڵامـی نه‌دایه‌وه. ویسـتمان بڕۆین. پۆسته‌چییه‌ک په‌یدا بوو، وایزانی ئێمه خاوه‌ن ماڵین، پارچه كاغه‌زێكی دایه ئێكا و وتی: ئه‌مه بۆ ئێوه‌یه. ئێكا زۆر پێكه‌نی، وتی: ئه‌مه ته‌له‌گرامه‌كه‌مانه، ده‌ڵێی به كه‌شتییه‌كه‌دا نێردراوه. ئێكا له‌سه‌ر ته‌له‌گرامه‌كه، چه‌ند وشه‌ی بۆ بۆ كچه‌كه نووسی و ڕۆیشتین.

ئه‌و هه‌فته‌یه كاتێكی خۆشمان به‌سه‌ر برد و زۆر شوێنی جوان، مۆزه‌خـانه و شـوێنه‌واری مێژووییمـان بینـی. شـه‌وانه‌ش له كه‌شتییه‌كه‌دا ئاهه‌نگی گۆرانی، مۆسیقا و سه‌مایان ڕێک ده‌خست و تا دره‌نگانێكی شه‌و به‌رده‌وام ده‌بوو.

## مه‌لاكه‌ی باتومی

هه‌رێمی ئۆتۆنۆمی ئه‌جاریا كه پایته‌خته‌كه‌ی شاری باتومییه، له سـه‌ده‌كانی حه‌ڤـده‌یه‌م و هه‌ژده‌یه‌م، له بنده‌سـتی عوسـمانییه‌كاندا بوو، له‌وێ ئاینی ئیسلامیان، به‌سه‌ر به‌شێكی خه‌ڵكه‌كدا سه‌پاندووه. به‌شـێک له كـاری والـی عوسـمانی ئه‌وه بـووه، كه وڵاته‌كه تـاڵان بكـات، كـچ و ژنـی جـوان، وه‌كـوو جه‌واری و كـوڕی منـداڵ بـۆ ده‌ربـاری سـوڵتان بنێرێـت. كوڕه‌كـان، كه له بنه‌مـاڵه‌ی دیـار هه‌ڵده‌بژێردران، له منداڵییه‌وه بۆ سوپا په‌روه‌رده ده‌كران. مه‌دحه‌ت پاشـای والـی عوسـمانییه‌كان له به‌غـدا، منداڵێكی دزراوی جۆرجی بـوو، له‌گه‌ڵ منداڵانی تـری وه‌كـوو خـۆی، له شـوێنی تـایبه‌ت پێـی خوێنـدرابوو و په‌روه‌رده كرابـوو. دانیشـتوانی جۆرجیـا، به بـێ

ئەبخازیا[1] کە لە جۆرجیا دابڕاوە، نزیکەی چوار ملیۆن کەسن. لە هەرێمی ئەجاریا ۳۵۰ هەزار کەس دەژین، سەد هەزاریان مسوڵمانن، بەڵام هەموویان بە ڕەگەز جۆرجین و بە زمانی جۆرجی قسە دەکەن. هەروا ئەو ساڵانە لە جۆرجیا زیاتر لە چل هەزار کورد دەژیان، کە زۆرینەیان ئێزدی بوون، کاتی خۆی لە ترسی کوشتاری تورک و جاشەکوردی مسوڵمان، ڕوویان لە ناوچەی قەفقاس کردبوو. بەشێکیان لە جۆرجیا، بە تایبەت لە پایتەخت، تبلیسی و گوندەکانی دەوروبەری، گیرساونەوە. لە بەر ئەوەی ئەو ماوەیە لە باتومی ژیام، بە داخەوە، نەمتوانی پێوەندییان پێوە بکەم.

کوڕێکی ناسیاوی ماڵی ئێکا، ناوی زڤیاد بوو، قوتابی زانکۆ بوو، زمانی عەرەبی دەخوێند و کەمێک فێری زمانەکە بووبوو. پێی وتم لە باتومی مزگەوتێک هەیە، ئەگەر حەز دەکەیت پێکەوە دەچین ببینە و قسە لەگەڵ مەلای مزگەوتەکەش دەکەین.

مزگەوتەکە، خانوویەکی ئاسایی بێ منارە بوو، بانگی تێدا نەدەدرا. زڤیاد بە مەلاکەی وتبوو کە من خەڵکی عێراقم، بۆ ژنهێنان هاتووم بۆ باتومی. مەلا گەنجێکی گەنمڕەنگ، چاوقاوەیی و باڵا مامناوەنجی بوو. وێنەی زۆربەی مەلایانی جارانی کوردستان، بە مووکێش ڕیش و سمێڵی قەڵەم کردبوو. بە ڕووی خۆشەوە پێشوازی کردین. بە عەرەبییەکی فوسحای مەلایانە بەخێری هێنام و کەوتە قسەکردن. دوای تاوێک لێی پرسیم: ژنەکەت مسوڵمانە؟

---

1- هەرێمی ئەبخازیا، لە سەرەتای نەوەدەکاندا، بە کۆمەکی ڕووسیا، یەکلایەنە سەربەخۆیی ڕاگەیاند. هاووڵاتیانی گورجییزمان کە بە دەیان هەزار خێزان بوون، لەوێ بە شەڕ دەرکران. ئێستا دانیشتوانی ئەبخازیا نزیکەی چارەکە ملیۆنێک کەسە. بەشێکی تری جۆرجیا، ئۆسێتیای باشوور، کە ناوچەیەکی ستراتیجیی قەفقاسە، خەڵکەکەی نزیکەی ٥٥ هەزار کەسن، زۆربەیان ڕووسزمانن. ڕووسیا دەستی بەسەردا گرتووە.

وتم: نەخێر مسوڵمان نییە؟

زۆر بە جیدی و سەرسامییەوە پرسی:

بۆچی ژنی نەسرانیت هێناوە؟!

من لە پرسیارەکەی کەمێک بێتاقەت بووم، چونکە دەخالەتێکی زەوقسزانە و ڕووقایمانەش بوو لە ژیانی تایبەتی کەسێک، کە نایناسێت و تەنیا چەند دەقیقەیەکە بینیویەتی. بەڵام بەسەرخۆم نەهێنا، چونکە بەو عەقلییەتە ئاشنام و دەزانم بەرهەمی چ جۆرە بیرکردنەوە و کولتوورێکە. بۆ جەفەنگ و گاڵتەکردن بە قسەکەی، وتم:

ئەمە هەڵەیەک بوو، جارێکی تر دووبارەی ناکەمەوە.

کەچی مەلاکە قسەکەی بە جیدی وەرگرت و وتی:

ئینشا ئەڵڵا.. ئینشا ئەڵڵا... ئێوە لە عێراق دەتوانن چوار ژن بهێنن، ئێمە ئەو مافەمان نییە.

دوای تاوێک قسەکردن لێی پرسیم: کەی دەچییەوە بۆ عێراق؟

وتم: من لە بولگارستانەوە هاتووم، ناچمەوە عێراق.

کاغەزێکی لە گیرفانی دەرهێنا، کە پێشتر ئامادەی کردبوو، وتی: لێرە کتێبی ئاینی نییە، ئەگەر جارێکی تر هاتییەوە ئەم کتێبانەم لەگەڵ خۆت بۆ بێنە.

کاغەزەکەم لێ وەرگرت، ناوی کتێبی چەند زانا و مێژوونووسی ئیسلامی نووسیبوو، لەوانە کتێبێکی ئەلتەبەری بە ناوی (تاریخ الرسل والملوک) و چەند کتێبی تر، کە ناویانم لەبیر نین. بە مەلاکەم وت:

ئەگەر چوومەوە عێراق، بەدوایاندا دەگەڕێم.

لەو ماوەیەی لە باتومی بووم، چەند برادەر، کە لە یەکێتیی سۆڤیەت دەیانخوێند، یان دەژیان، لەوانە د.جەمشید حەیدەری،

تەلەفۆنیـان بـۆ کـردم و پیرۆزباییـان لـێ کـردم. د.جەمشـید بە سەرسوڕمانەوە لێی پرسیم چۆن حزبی شیوعی ڕێگەی پێ داویت ژنـی سـۆڤیەتی بهێنیت؟ ئەوە نـاعەدالەتییە، چەنـدان ئەنـدامی حزبـی شیوعی لێرە هەن، دەیانەوێت ژن بهێنن، ڕێگەیان پێ نادەن. هەیـانە چەنـد سـاڵە لەگەڵ ژنـی سـۆڤییەتی دەژیـن و منـداڵیان هەیە، کەچـی یارمەتییان نادەن بە جۆرێکی قانوونی ژنەکانیان مارە بکەن. نـاوی چەند کەسێکی برد، لەوانە برایەکی پەخشان زەنگەنە، وا بزانـم وتـی د.سیروان عەبدوڵلا، قوتابییەکی ئێزدی، کە نـاوی خودێدا بوو، مـن لە پێشـمەرگایەتی ناسـیم، لەگەڵ نـاوی چەنـد کەسـی تـر، کە ئەو گرفتەیان هەبوو.

وتم: دوکتۆر جەمشید کەواتـا دەرفەتـی چـاک بـۆ ئەو هاوڕێیـانە هەڵکەوتووە، با پێداگری بکەن، بۆ ئەوەی مۆڵەت بەوانیش بـدرێت کە ژنی سۆڤیەتی بهێنن، یان ژنەکانیان مارە بکەن.

ئەوەی مەکتەبـی سیاسـیی حزبـی شـیوعی لێـی دەسـەڵەمییەوە ڕووی دا، دەرگـاکە کـرایەوە و دواتـر نەتوانـدرا دابخـرێتەوە. چـوار ساڵ دواتریش یەکێتیی سۆڤییەت هەڵوەشایەوە.

١

# ژیان لە کابول

لە هەفتەی دووەمی ئەیلولی ١٩٨٧ چووم بۆ مۆسکۆ، تا لەوێوە بەرەو کابول بەڕێ بکەوم. جگە لە ئێکا، هیچ کەسێکی خێزانەکەیان نەیزانی من بۆ کابول دەچم. چونکە ئەو کاتە هەشت ساڵ بوو لەشکری سۆڤیەت لە ئەفغانستان، لەگەڵ چەکدارە ئیسلامییە توندڕەوەکان، لە شەڕێکی زۆر سەختدا بوو. ئەمریکا، ڕۆژئاوا، عەرەبستانی سعوودی و پاکستان، بە هەموو تواناییەکیانەوە، پشتگیریی سەربازی، ئابووری و لۆجستیی ئەو هێزە ئیسلامییە توندڕەوانەیان دەکرد. ئەو ساڵانە بەردەوام تەرمی سەرباز و ئەفسەری سۆڤیەتی، لەوێوە دەهێندرانەوە مۆسکۆ و ڕەوانەی کۆمارە جیاوازەکانی سۆڤییەت دەکران. لەو شەڕەدا زیاتر لە پازدە هەزار سەربازی سۆڤییەتی کوژران. بۆیە ئەو کاتە ئەفغانستان، لای خەڵکی سۆڤیەت، بە شوێنێکی زۆر ترسناکی دنیا دادەندرا.

لەگەڵ ئێکا ڕێک کەوتین، بۆ ئەوەی دایک و باوکی نەترسن و نیگەران نەبن، پێیان دەڵێین من دەچم بۆ سووریا.

لە مۆسکۆ هاوڕێ عەزیز محەمەد، کە ماڵی لەوێ بوو، ویستی پێش سەفەرەکەم بمبینێت. شەوێک لەگەڵ کەمال شاکر، لە ماڵی خۆی میوانداریی کردین. شەوەکەمان بە خۆشی بەسەر برد و

ڤۆدکـای ڕووسـیمان خـواردەوە. عەزیـز مـحەمەد نە پیرۆزبـایی ژنهێنانەکەی لێ کردم، نە باسی ئەو نامە و نـامیلکەیەی کرد، کە لە سۆفیاوە بۆم ناردبوو. منیش بێدەنگەم لێ کرد. هەندێک زانیـاری و ڕێنمـایی لەبـارەی کـارەکە و پێوەنـدیمان لەگەڵ حزبـی خەڵکـی ئەفغانستان پێ دام. پێی وتم، کە پێش من دوو هـاوڕێ، ئەبو عەلا (کامیل کەرەم) لەگەڵ هاوڕێیەکی عەرەب، بە ناوی ئەبو حـاتەم، کە نەمدەناســی، لە کــابولن، لەوێ چـاوەڕێم دەکەن. هەروا وتــی لە کابول ئەبو عەلا لە کاروبارەکان زیاتر ئاگادارم دەکات.

ئەو شـەوە زانـیم ئەبـو عەلا، لەجیـاتی مـن، کـراوە بە بەرپرسـی کـارەکە. مـن ئەبـو عەلام دەناسـی، کـادیرێکی پیشـەیی حـزب و کەسێکی هەڵسووڕاو بوو، پێنج شەش ساڵ لە من بەتەمەنتر بوو. لەو کــوردە فەیلییــانەی بەغــدا بــوو، کە لە کۆتــایی حەفتاکــان خێزانەکەیـان لە عێـراق، بە بەهـانەی ئێرانیبـوون، دەرکرابـوون و ڕەوانەی ئێران کرابوون، ئەویش دواتـر خـۆی گەیانـدبووە ئێران. زمـانی فارسیی دەزانـی، چەنـد سـاڵ لە تـاران بە نهێنـی بەرپرسـی کاروباری حزبی بوو. بەڵام چەند هاوڕێیەک، کە ئەویان دەناسـی و کاریان لەگەڵ کردبوو، بە کەسێکی گەندەڵ ناویـان دەبرد. لە تـاران مـاڵەکەی کرابـوو بە مـاڵی حزبـی و هەنـدێک هـاوڕێی تـایبەت، کە هـاتووچۆی ئێـران و دەرەوەیـان دەکـرد، چەنـد شـەوێک لەوێ دەمانەوە. ئەو کاتەی بۆ چارەسەری پزیشکی چوومە تاران، چەند شـەو لە مـاڵی ئەوان بـووم. دواتـر ژوورێکیـان بـۆ دۆزیمەوە. ئەبـو عەلا بۆ لای دوکتۆری پسپۆڕی بردم، لە نەخۆشـخانەش سـەردانی کـردم و پـێمەوە مانـدوو بـوو. هاوسـەرەکەی، دایکی عەلا، ژنێکـی بەڕێـز، میواندۆسـت، ڕووخـۆش و بەتەحەمـول بـوو. هاوڕێیـانی خـۆش دەویسـت، وێـنەی خوشـکێکی میهرەبـان، ڕەفتـاری لەگەڵ

هەمووان دەکرد و ڕێزی دەگرتن.

من ئەو بڕیارەم پێ ناخۆش نەبوو، بە پێچەوانەوە پێم باش بوو. چونکە ئەبو عەلا، لەم بوارەدا شارەزاتر بوو. لە شەستەکانەوە کادیری پیشەیی حزبی شیوعی بوو. ئەزموونی لە کاری ڕێکخستندا هەبوو، بۆیە بۆ کاری لەو جۆرە، لە من گونجاوتر بوو.

کاتێک لە ماڵی عەزیز محەمەد دەرچووین، هێشتا بیرم لەو مەسەلانە دەکردەوە. هەستم کرد باری سەرشانم کەمێک سووک بووە. ئەو کارە بەرپرسیارییەکی گەورەیە و پێوەندیی بە ژیان و چارەنووسی دەیان، یان سەدان کەسەوە هەیە. من هیچ ئەزموونێکم لەو بوارەدا نییە. کارەکە لە وڵاتێکە نوقمی شەڕ بووە، من نەمبینیوە و لەوێ کەس ناناسم. قورسایی ئەو بەرپرسیارییە، بە تەنیا ناکەوێتە ئەستۆی من. هەروا بە بیرمدا هات کە لەوێ کاتی خوێندنەوە و نووسینم زیاتر دەبێت و جارێکی تر دەستم بە کتێبی فارسی دەگاتەوە، کە پێنج ساڵ بوو، بە هۆی خوێندن و سەرقاڵبوون بە زمانی بولگاری، لە زمان و ئەدەبی فارسی دابڕابووم.

ڕۆژێکی ناوەڕاستی ئەیلول منیان گەیاندە فرۆکەخانەی مۆسکۆ. لەوێ بێ ئەوەی کۆنترۆڵ بکرێم، بە بەشی (ڤیپ)دا، برامە ناو هۆڵی چاوەڕوانی. وەکوو هاووڵاتییەکی ئەفغانی، بە پاسپۆرتی ئەوان، سەفەرم کرد. ئەمە پاسپۆرتی چوارەم وڵات بوو کە وێنەی منی بەسەرەوە بێت، پاسپۆرتی عێراقی، ئوردونی، یەمەنی و ئەفغانی، ئێستاش لە سوێد، پاسپۆرتی سوێدیم هەیە.

کاتێک فرۆکەکە گەیشتە ئاسمانی کابول، کەمێک نزم بۆوە و بە دەوری شاری کابولدا سووڕایەوە. لە پەنجەرەی فرۆکەکەوە، چەند ڕاکێتم بینین، کە بە لای فرۆکەکەدا تێ پەڕین. وامزانی ئەو ڕاکێتانە

بۆ فرۆکەکە هاوێژران، بۆیە ترسام، تەماشای سەرنشینەکانم کرد، هەنـدێکیان لە پەنـجەرەی فـرۆکەکەوە، سـەیری ئەو ڕاکێتانەیـان دەکرد. لە سەرنشینەکەی تەنیشتم، کە ئەفغانی بوو، پرسی:

ئەو ڕاکێتانە چین و کێ دەیان هاوێت؟

وتـی: ئەوانە لە فـرۆکەکەوە هەڵـدەدرێن، بـۆ ئەوەی ڕاکێتـی تیرۆریستان ڕوو لە گەرمایی ئەوان بکەن و بەر فرۆکەکە نەکەون.

بەم قسەیە کەمێک ئارام بوومەوە.

بێ گرفت گەیشتینە کابول. لە فرۆکەخانە هاوڕێیان چاوەڕێم بوون، لەوێوە منیان بردە ڤێلایەکی دوونهۆمی، کە ئەفغانییەکان وەکوو ماڵ و شوێنی کار، بۆیان دیاری کردبووین و هەرسێکمان لەوێ دەژیاین. خانووەکە لە گەڕەکی وەزیر ئەکبەرخان بوو، ماڵی بازرگانێکی ئەفغانی بوو، کە دوای ڕوخاندنی ڕێژیمی داود خان، وڵاتی بە جێ هێشتبوو. ساڵانێک دواتر کە ڕۆمانی (کۆلارە)ی نووسەری ناوداری ئەڤغانستان، خالید حوسێنیم خوێندەوە، ئەو خانووەم بە بیر هاتەوە، چونکە ماڵی قارەمانی ڕۆمانەکە، لە زۆر لایەنەوە، لەو خانووە دەچێت.

ژووری میوان، نانخواردن و موبەق لە قاتی یەکەم بوون، لە قاتی سەرەوە پێنج ژوور هەبوون، هەر کەسمان ژووری خۆی هەبوو. دوو ژوورەکەی تر بۆ میوان بوون. پاسەوانی ماڵەکە، لە قاتی یەکەم، ژوورێکی لاچەپی تایبەتی هەبوو. ڕۆژانە ئەفغانەکان خۆیان خواردنیان بۆ ئێمە و میوانەکانمان دەهێنا. هەروا کارمەندێکیان بۆ ماڵەکە دیاری کردبوو، ناوی حوسێن بوو، بۆ چالێنان و قاپشۆری و ماڵخاوێنکردنەوە، هاوکاریی دەکردین. ئێمە ئۆتۆمبێلمان نەبوو. بێ چەک و پاسەوان، بە تاکسی، یان بە پێ، هاتوچۆی ناو شار و دەزگای حکومەت و هاوڕێیانی فیدائیانی

خەڵکی ئێران (ئەکسەریەت) و حزبی تودەمان دەکرد. لەوێ مانگانە تەنیا بیست دۆلارم وەکوو دەرماڵە وەردەگرت، کە بەشی جگەرە، دوو-سێ قاپ ڤۆدکای ڕووسی و چەند کتێبێکی دەکرد.

ئەو ساڵانە ئەندام و کادیری حزبی شیوعی زۆر بە زەحمەت دەیانتوانی لەنێوان کوردستان و دەرەوەدا، هاتوچۆ بکەن. ڕێگای قامیشلی- بادینان گیرابوو. کۆماری ئیسلامی ئێران هاوکاریی زۆربەی هێزە سیاسییە عێراقییەکانیان دەکرد، کەچی ئێمەیان بە دوژمن دەزانی و هیچ جۆرە ئاسانکارییەکیان بۆ هاتوچۆی هاوڕێیانمان نەدەکرد، تەنانەت دەیان گرتن. بۆیە ڕێگای نهێنیی نێوان ئەفغانستان- تاران- کوردستان، گونجاو و پێویست بوو. لە ئەفغانستان، پارتێکی چەپی مارکسی، حوکمڕان بوو، ئاسانکاریی بۆ دەکردین. چەند ئەندامی سەرکردایەتیی فیداییانی خەڵکی ئێران (ئەکسەریەت) لە کابول بوون، ڕێگای نێوان ئێران و ئەفغانستانیان بەکار دەهێنا. ئەوانیش لەو بارەیەوە کۆمەکیان کردین.

سنووری نێوان ئەفغانستان و ئێران، ئەوەندە فراوان و سەختە، زۆر زەحمەتە کۆنترۆڵ بکرێت. لەوەش گرینگتر خەڵکی ناوچە سنوورییەکانی ئێران لەگەڵ ئەفغانستان، هەم بلوچن، هەم سوننەمەزهەبن، بۆیە زۆرینەیان لە کۆماری ئیسلامیی ئێران تووڕە و بێزارن، ئەگەر بتوانن دژایەتیی دەکەن. ڕاستییەکەی ئەوەی ئەفغانستانی بەدەستەوە بێت، دەتوانێت بە قاچاخی چەک، چەکدار، حەشیشە و هەر شتێکی تری بوێت، ڕەنگە یۆرانیۆمیش، بیگەیەنێتە ئێران، عێراق، تورکیا و تەنانەت ئەورووپاش. یان بەرەو پاکستان، چین، تاجیکستان، ڕووسیا و دوورتری بەرێت. هۆکارێکی شەڕی زیاتر لە چل ساڵەی ئەفغانستان لەبەر بایەخی جیۆسیاسی و (جیۆقاچاخچێتی)ی! ئەو وڵاتەیە. ئەو ڕۆژگارە ئێمە لەوێوە

کۆمۆنیستانمان، بۆ بەرەنگاربوونەوەی ڕێژیمی سەدام حوسێن، بۆ کوردستانی عێراق ڕەوانە دەکرد. دوای ئێمە حکومەتی ئیسلامیی ئەفغانستان و ڕێکخراوی تیرۆریستیی ئەلقاعیدە، لەوێوە چەک و چەکداری ئیسلامی و حەشیشەیان، بۆ عێراق و ناوچەکە و دنیا دەنارد.

دوای هەڵوەشاندنەوەی یەکێتیی سۆڤیەت، ئەمریکا بایەخی زیاتری بە ئەفغانستان دا و داگیری کرد، بەو هیوایەی بتوانن دەسەڵاتێکی گوێڕایەڵی خۆیان لەوێ بسەپێنن، لە ڕێی ئەفغانستانەوە، نەوت و گازی ئوزبەکستان، کازاخستان و وڵاتی تری ئەو ناوچەیە، بگەیەننە دەریای عومان. بەڵام ئەو کارە سەری نەگرت، ئەمریکا ساڵی ٢٠٢١ بە پەلە ئەفغانستانی بەجێ هێشت. مۆدێرنترین چەک و جبەخانەی سەربازیی خۆی لە ئەفغانستان خستە دەستی تالیبان؟

ئایا ئەمریکا بەو ئامانجە ئەو کارەی کرد تا هێزە سەربازییەکەی ڕەوانەی شوێنی تر بکات، یان دەیەوێت حکومەتی تالیبان، تیرۆریستان بۆ وڵاتانی تر بنێریت؟ بە تایبەت بۆ چین، ڕووسیا و ئێران، کە بە نەیاری ئەمریکا و ڕۆژئاوا دادەندرێن. ڕەنگە تالیبانەکان سەری خۆیان لە تاوێری زلهێزانی وێنەی چین و ڕووسیا نەدەن، بەڵام بەڵای زۆرەوە کێشە بۆ ئێران دروست دەکەن.

لە ئەفغانستان چوار نەتەوەی سەرەکی هەن، پشتو، تاجیک، هەزارە و ئۆزبەک. پشتووەکان، کە ڕابەریی گروپی تیرۆریستیی تالیبان دەکەن، لە سەدا چل تا چل و پێنجی دانیشتوانن، لە باشوور و ڕۆژهەڵاتی وڵاتەکە دەژین. بەشێکی پشتووەکان لە پاکستانیش هەن. لە ئەفغانستان دوو زمانی فەرمی (ڕەسمی) هەیە، زمانی

پشتوو و زمانی دەری. هەردووکیان لە میدیا، خوێندن و دەزگای دەوڵەتدا بەکار دەهێندرێن. زمانی دەری شێوەیەکی ئەفغانیی زمانی فارسییە، لە شێوەی ڤێرشنی ئینگلیزیی بریتانی و ئەمریکایی.

ئەو کاتە بزاڤی ناسیۆنالیستی لە ئەفغانستان دەرنەکەوتبوو. کەچی بزاڤی کۆمۆنیستی و بزاڤی ئیسلامی بەهێز بوون. کێشەی سەرەکی لەنێوان ئەو دوو لایەنەدا بوو.

کۆمۆنیستەکان بە کۆمەکی یەکێتیی سۆڤیەت، حوکمڕانییان دەکرد. کۆمەڵێک گۆرانکاری و ڕیفۆرمیان لە بواری ئابووری، کۆمەڵایەتی، ئازادی و مافی یەکسانیی ژن و پیاودا کرد، سنووریان بۆ دەسەڵاتی دەزگا ئاینییەکان دانا. بەڵام بە هۆی کێشەی نێوخۆی حزبەکە لەسەر دەسەڵات، ناکۆکی و شەڕ کەوتە نێوان سەرکردەکانیان. حەفیزوڵڵا ئەمین، کە سەرۆکوەزیر بوو، سەرۆککۆماری کوشت و دەستی بەسەر دەسەڵاتدا گرت.

لە ئاداری ١٩٧٩ کە مانگێک بوو شۆڕشی ئیسلامیی ئێران هەڵگیرسابوو، ئیسلامییەکانی ئەفغانستان، بە ڕابەریی گوڵبەدین حیکمەتیار، پەنایان بۆ چالاکیی چەکداری برد. ئەمریکا، پاکستان و عەرەبستانی سعوودی و دۆستانی ئەمریکا، دەبوو بە چەکی ئاین، دژایەتیی کۆمۆنیزم و لەشکری سۆڤیەت بکەن، چونکە هێزێکی ناسیۆنالیستی، لە شێوەی حزبی بەعس، لە ئەڤغانستان نەبوو ئەو کارەیان بۆ بکات.

لەو ساڵەدا ئیسلامی توندڕەوی سیاسی، وەکوو هێزێکی سیاسیی چەکدار، بۆ شەڕی دەوڵەتی ئەڤغانستان و لەشکری سۆڤیەت، ئامادە کرا. لە هەمان کاتدا ئێران ڕادەستی خومێنی و ئاخوندەکان کرا. بەو کارە ڕۆڵی ئیسلامی سیاسی و کێشەی

هەزار و چەند سەد ساڵەی نێوان سوننە و شیعە چالاک کرانەوە و هێندرانەوە سەر شانۆی سیاسیی ناوچەکە و جیهان.

ئایا ڕێکەوت بوو لە ماوەی چەند مانگدا دوو بزاڤی بەهێزی ئیسلامیی شیعەمەزهەب و سوننەمەزهەب، لەسەر شانۆی سیاسیی ئەو دوو وڵاتە دراوسێیە (ئێران و ئەفغانستان) دەرکەوتن؟!

بە ڕای من مۆدێلی دەوڵەتی ئیسلامیی شیعەمەزهەب، لە ئێران، هاندانێکی سوننەی سیاسیی بوو، بۆ ئەوەی ئەوانیش چالاکانەتر کار بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی سوننەمەزهەب بکەن. ئەمریکا و عەرەبستانی سعودی و پاکستان، بە هەموو توانایەکیانەوە پشتگیری بزاڤی ئیسلامی ئەفغانستانیان کرد. سوننەی سیاسی، بە بێ دژەکەی خۆی، کە شیعەی سیاسییە، لاواز دەبێت و دەپووکێتەوە. بۆ ئەوەی یارییەکە گەرم و بەردەوام بێت، دەبێت هەردوو تیپەکە هاوتا بن و پێکەوە، لە مەیدانەکەدا چالاک بن. لەبەر ئەوە دەبێت دەوڵەتی ئیسلامیی شیعەمەزهەبی ئێران جارێ بەردەوام بێت. بە ڕای من ئەو ڕۆژەی سوننەی سیاسی کارەکەی خۆی تەواو دەکات و شانۆکە چۆڵ دەکات، کۆماری ئیسلامی ئێرانیش نامێنێت، یان بە پێچەوانەوە. چونکە ئەو دیاردەیە دوو تیپی یارییەک و دوو ڕووی دراوێکن.

یەکێتیی سۆڤییەت، بۆ بەرژەوەندیی خۆی و لە ترسی ئەوەی هێزە ئیسلامییەکانی ئەفغانستان دەسەڵات بگرنە دەست، ئەو وڵاتەی داگیر کرد و شەڕێکی فراوان هەڵگیرسا. چەند مانگ دواتر شەڕی عێراق و ئێرانیش دەستی پێ کرد. عەرەبستانی سعودی و وڵاتانی کەنداو، بۆ پێشگرتن لە شیعەی سیاسی، پشتی سەدامیان گرت. کورد دەڵێت: گۆم تا قووڵ بێت مەلەی خۆشترە!

ئەو دەمەی لە کابول بووم هەشت ساڵ بوو، شەڕی نێوان هێزە

ئیسلامییە توندڕەوەکان و دەوڵەتیی ئەڤغانستان، هەڵگیرسابوو. تۆپباران، تەقینەوە و تیرۆر، لە گەڕەک و شەقام و بازاڕەکانی کابولدا، بووبوون بە دیاردەی ئاسایی و خەڵک لەگەڵیان ڕاهاتبوون. دەوڵەتی سۆڤیەت، دەیەویست لەگەڵ حزبی گەلی ئەفغانستان، سیستمێکی سیاسی، ئایدیۆلۆجیا و کولتوورێک لەو وڵاتەدا بچەسپێنن، کە بە کولتوور، مێژوو و شێوەژیانی زۆرینەی خەڵکی ئەو وڵاتە نامۆ بوون. بە کورتی شەڕەکە زەمینەی سیاسی، کۆمەڵایەتی و کولتووریی هەبوو. لەوەش زیاتر ئەنجامی کاردانەوەی گەلی ئەفغانستان بوو بەرانبەر دەسەڵاتی مارکسیی ئەفغانی و لەشکری سۆڤیەت، کە وڵاتەکەی داگیر کردبوو. بەڵام شەڕەکە لە ناوەرۆکدا گۆڕدرابوو بە شەڕی نێوان ئەمریکا و یەکێتیی سۆڤیەت. سەرەنجام، لە کۆتایی هەشتاکانی سەدەی پێشوو، لەشکری سۆڤیەت، بە ناچاری لە ئەفغانستان کشایەوە و ئیسلامییە سوننە توندڕەوەکان دەسەڵاتیان گرتە دەست.

تا ئێستا ئیسلامی سیاسیی سوننی، تالیبانەکان، لە ئەفغانستان زاڵن، کە زۆرینەیان پشتوزمانن. ڕەنگە لەمەودوا، کە گەلی ئەڤغانستان لە داگیرکەری بیانی ڕزگار بوون، سەرەتای کێشەی نەتەوەیی، ئەگەر لە بەرگی ئاینیشدا بێت، ڕوونتر دەربکەوێت. کێشەی نێوخۆی ئەڤغانستان، تەنیا کێشەی مەزهەبیی سوننە و شیعە نییە، بەڵکو تایبەتمەندییەکی نەتەوەییشی هەیە، کێشەی نێوان پشتوو و دەریزمانانە، کە بەشێکیان شیعەمەزهەبن. ئێستا خەڵکی هەزارە، کە دەریزمانن، بە بەهانەی شیعەبوون لەناو دەبردرێن، بەڵام لە ناوەرۆکدا هەستێکی شۆڤێنییانەی دێرین، بەرامبەر بە ئەوان هەیە و بە سوکی تەماشایان دەکەن. پشتووەکان، وێنەی فارسەکانی ئێران، لە نیوەی دانیشتوانی وڵاتەکە کەمترن، بۆیە بە

بێ توندوتیژی و تیرۆر، ناتوانن وڵاتەکە بەڕێوە بەرن.

تالیبانەکان، کە هێزێکی ئیسلامیی سوننەمەزهەبن، لە کارخانەی ئیسلامیی پاکستانەوە بەرهەم هێندران. پێش کۆتایی سەدەی پێشوو، بە چەک و تانکی پاکستان، نێردرانەوە کابول. بەلای زۆرەوە ئەو جیاوازییە کولتووری و زمانییەی نێوان هەردوو نەتەوە، هۆکارێکی تری هەڵگیرسانی شەڕی نێوخۆی ئەفغانستانە.

خەڵکی کابول بەگشتی زۆر هەژار و نەدار بوون. بە پۆل منداڵان لە شەقام و بازاڕ، دەستگێرییان دەکرد. هەر بیانییەکیان بدیتبایە ماوەیەک دوای دەکەوتن، بە زمانی ڕووسی داوایان لێ دەکرد شتێکیان لێ بکڕێت. منداڵانی زۆریش لەناو زبڵ و خاشاکدا، بە دوای شتێکدا دەگەڕان، کە بۆ خواردن، یان بەکارهێنانەوە دەست بدات. پاسی هاتوچۆ زۆر کەم بوو، لە ویستگاکانی پاس خەڵک لە چاوەڕوانیی پاسدا، کەڵەکە دەبوون. کاتێک پاسەکە دەهات ئەوەندەی لە دەرگاوە بە پاڵەپەستۆ سەردەکەوتن، هێندەش لە پەنجەرەکانەوە خۆیان دەخزاندە ناو پاسەکە. ڕووبارێکی گەورە بە کابولدا دەڕوات، زۆر لیڵ، پڕخاشاک و پیس دیاربوو. خەڵک لە ڕۆخی ڕووبارەکە دەست و ڕوخساری خۆیان دەشوشت.

لەناو ئەو شەڕ و هەژاری و وێرانکارییەدا، هێشتا ڕووناکییەک دەبیندرا، چینی مامناوەند لە گەشەکردندا بوو. بزاڤی ژنان بەهێز بوو، دەوڵەتی نوێی ئەفغانستان بە قانوون کۆمەڵێک ماف و ئازادیی بۆ ژنان بڕیار دابوو، لەوانە مافی یەکسانبوونی ژن و پیاو، مافی هەڵبژاردنی هاوسەر و جیابوونەوە. سەدان کچ و ژن وەکوو چالاکوانی سیاسی و کۆمەڵایەتی، یان لە دەزگاکانی دەوڵەت و بازاڕدا، کاریان دەکرد و ئازادانە دەگەڕان. لە بەرانبەر ئەوەدا ژنانی بورقەپۆش زۆر بوون. هەروا سەدان لەو کتێبە ئەدەبی،

هزری، فەلسەفی و مێژووییانەی لە سەرەتای هەشتاکاندا، لە ئێران دەرچووبــوون، جــارێکی تــر لە کــابول، چــاپ کرابــوونەوە و بە نرخێکی هەرزان، دەفرۆشران و کڕیاریان زۆر بوو.

کاری سەرەکیی ئێمە لە کابول ئەوە بوو، پێشوازیی هاوڕێیانمان بکەین، کە لە ڕێگای مۆسکۆوە دەهاتن، دەبوو لەوێوە بە ئێراندا بۆ کوردســتانیان بنێرین. یــان بە پێچەوانەوە، ئەوانەی بە قاچــاخی لە ئێــرانەوە دەهــاتن بەرەو مۆســکۆ بەڕێیــان بکەیــن و لەوێــوە بچــنە سووریا، یان وڵاتێکی تر. ئەو کارە بە ئاگاداریی سۆڤیەتەکان و بە هاوکاریی حکومەت و حزبی گەلی ئەفغانستان دەکرا. ئەفغانەکان خۆیان پێداویستیی سەفەریان تا سەر سنووری ئێران، یان لەوێوە تا کابول، ئامادە دەکرد. جێگایەک لە سنووری ئێران، لە ناوچەی زەرەنــج، وەکوو بنەکە بۆ هــاتووچۆ دیــاری کرابوو. دوو هــاوڕێی خۆمان، ئەبو نەشوان و یەشار، بە نۆرە لەنێوان تاران و کابولدا، هاوڕێیانیــان دەهێنــا و دەبــرد. لە تــارانەوە دەچــوونە ســنووری ئەفغانســتان و دەهــاتنە شــاری زەرەنــج، لەوێشــەوە بە فــڕۆکە بــۆ کــابول بەڕێ دەکــران. بەڵام ئەوانەی بەڕێــی ئێرانــدا دەچــوونەوە کوردســـتان، بە فـــڕۆکە بـــۆ زەرەنـــج دەنێـــردران، لە ســـنوور دەپەڕێندرانەوە و دەگەیەندرانە تاران، لەوێوە دەچوونە کوردستان.

چەنــد ڕۆژ پــێش کۆتــایی ســاڵی ١٩٨٧ عەزیــز مــحەمەد گەیشــتە کــابول، بــۆ ئەوەی بەو ڕێگایەدا، کە مــن نــاوم نــا ڕێگــای ئاوریشــم، بچێتە کوردستان. ئەو مــاوەیەی لەوێ بوو ڕیشــی هێشــتبۆوە، زۆر پیر دیار بوو و گومانی هیچی لێ نەدەکرا. لە سەرەتای ساڵی نوێدا کاروباری سەفەرەکەی، لەگەڵ هاوڕێیانی ئەفغاندا، ڕێک خرا. (ئەبو نەشوان) چەند هاوڕێیەکی هێنابوو بۆ کابول، لە گەڕانەوەیدا عەزیز محەمەد لەگەڵی چوو بۆ ئێران.

ئێمە چاوەڕێ بووین، لە کاتی دیاریکراودا، هەواڵی گەیشتنیان ببیستین. بەڵام هەواڵ نەهات. نیگەرانی ئەوە بووین گیرابێت. دوو ڕۆژ دواتر زانیمان عەزیز محەمەد لە ڕێگا گرفتی بۆ دروست بووە، بەڵام بە سەلامەتی گەیشتووە. لە زابول، ئەبو نەشوان عەزیز محەمەدی لەو ماڵەی کە بنەگەمان بوو، بە جێ هێشتبوو تا بچێت بلیتی شەمەندەفەر بکرێت، بۆ ئەوەی بۆ تاران بچن. بەڵام، دوای کڕینی بلیتەکان، زۆر لەناو شار مابۆوە. خاوەن ماڵ ترسابوو کە گیرابێت، بۆیە هاوڕێ عەزیزی تەنگاو کردبوو لە ماڵەکە بڕوات، ئەویش بە ناچاری ماڵەکەی بە جێ هێشتبوو. چووبوو بۆ ناو شار. لەوێ بە سۆراخ ئیستگەی شەمەندەفەری دۆزیبۆوە و بەرەو تاران بەڕێ کەوتبوو. بە درێژایی ڕێگا، کپ و بێدەنگ، وەکوو پیرەمێردێکی ناساخ، خۆی پیشان دابوو. لە تارانیش بە تاکسی چووبوو بۆ ماڵی هاوڕێیەک.

ئەبو نەشوان، پاش کڕینی بلیتەکان، وەکوو دواتر گێڕایەوە، چووبۆوە بۆ ماڵەکە. خاوەنماڵ پێی وتبوو برادەرەکەت ڕۆیشتووە. لەناو شار زۆر بە دوایدا سووڕابۆوە، بەڵام نەیدۆزیبۆوە. شەو بە ناچاری بە قیتار بەرەو تاران بەڕێ کەوتبوو. سەرەتا کەسی ئاگادار نەکردبوو. گوێی هەڵخستبوو، بەڵکو هەواڵێک لەبارەی عەزیز محەمەد ببیستێت. ئەو دەیوت زۆر ترسابووم شتێکی بەسەر هاتبێت، چونکە ئەو کاتە هەرچیم بوتایە کەس باوەڕی پێ نەدەکردم، تومەتبار دەکرام، کە من عەزیز محەمەدم ڕادەستی ئێرانییەکان کردووە.

## ٢
## ئایا بە ڕێگایەکی دروستدا دەڕۆم؟

لە کـابول مانگـانە دوو یـان سـێ جـار بە تەلەفـۆن لەگەڵ ئێکـا قسـەمان دەکـرد، چـونکە نرخـی تەلەفـۆنکردن گـران بـوو. خەتـی ڕاسـتەوخۆی تەلەفـۆن بـۆ دەرەوەی وڵات نەبـوو. سـەرەتا دەبـوو پێوەندیی بە بەدالەی تەلەفۆنی ناوەندیی کابولەوە بکەم و ژمـارەی تەلەفـۆنی مـاڵی ئێکـای بـدەمێ. لەوێـوە پێوەنـدییان بە بەدالەی تەلەفۆنی ناوەندیی مۆسکۆوە دەکرد و تەلەفۆنەکەی ئێمەیان بەو ژمارەوە پێیوەند دەکرد، کە داوام کردووە. دوای ئەوە دەمـانتوانی قسە بکەین. ڕۆژێک تەلەفۆنم بۆ ئێکا کرد، کە بە سـەردان چووبـوو بـۆ لای پـووری و خوشـکی لە تبیلیسـی. دوای چـاکوچۆنی وتـی: درۆیەکەمان ئاشکرا بوو. ئێستا دەزانن تۆ لە کابولی. کە لێم پرسی چـۆن؟ وتـی کاتێـک لە بەدالەی تەلەفـۆنی مۆسـکۆوە بە پوورمیـان وت تۆ لە کابولەوە داوام دەکەیت، پوورم بە دڵخۆشییەوە وتـی، تۆ گەیشـتوویتە کـابولێتی و لە مـاڵی بـاوکمەوە تەلەفۆنم بۆ دەکەی! ئێستا ئاشکرا دەبێت، کە تۆ لە کابولی نەک لە کابولێتی!

چ ڕێکەوتێکی سـەیرە! دوو شـار، یەکیـان لە قەفقـاس، لە کەنـاری دەریـای ڕەش (کـابولێتی)، ئەوی تریـان لە ئەفغانسـتانی شـاخاوی (کابول)، بە هۆی لێکچوونی ناوەکانیان، گرفتی نوێ بۆ ئێمە و ماڵی

خەزوورم زیاد دەکەن! دوای ئاشکرابوونی درۆیەکەمان، ئێکا وتی دێم بۆ لات. داوەتنامەیەکم لە کابولەوە بۆ نارد، تا مۆڵەتی سەفەرکردنی پێ بدرێت و بتوانێت ڤیزای ئەفغانستان وەربگرێت.

سێ هەفتە دوای سەفەری عەزیز محەمەد، ئەبو عەلا پێی وتم کە هاورێیان داوایان کردووە بگەڕێمەوە بۆ کوردستان، لەوێ پێویستیان پێمە. ئەو دەیزانی داوەتنامەم بۆ ئێکا ناردووە، خۆم بۆ پێشوازیکردنی ئامادە کردووە. نەمویست وەڵامێکی ڕاستەوخۆی بدەمەوە، پێم وت با جارێ ئێکا بگات، دوایی قسەی لێ دەکەین. بەڵام ئەو دەیەویست زوو وەڵامیان بداتەوە. یەکسەر وتم:

بۆیان بنووسە من بۆ کاری حزبی و پێشمەرگایەتی، ناچمەوە کوردستان.

ئەبو عەلا چاوەڕێی وەڵامی لەو جۆرە نەبوو، بە سەرسوورمانەوە تەماشای کردم، بەڵام هیچی نەوت.

نەمزانی ئایا ئەو کاتەی عەزیز محەمەد لە کابول بوو، ئەو قسەیەی بە ئەبو عەلا وتبوو، یان ئەمە بڕیارێکی نوێی مەکتەبی سیاسی بوو!.

دوای ئەوەی کوردستانم بەجێ هێشتبوو، دۆخی سیاسیی کوردستان زۆر ئاڵۆزتر و شەڕی نێوخۆ خوێناویتر و فراوانتر بووبوو. لە ئایاری ۱۹۸۳ کارەساتی پشتئاشان ڕووی دا. ئەگەر لە کوردستان بوومایە، سەد لە سەد منیش، لەگەڵ هاورێیانی ڕاگەیاندن و سەرکردایەتیی حزبی شیوعی، لە پشتئاشان دەبووم. لەوانەبوو بە سەلامەتی دەرباز ببم، یان نەبم. چ کارەساتێکی گەورەیە مرۆڤ لە شەڕێکدا، کە باوەڕی پێی نەبێت، بکوژرێت، یان یان دیل بکرێت!.

لە قەسیدەی وەرزی سەهۆڵبەنداندا، کە ژانی شەڕی نێوخۆی بە

زەقی پێوە دیارە، نووسیومە:

تەنیا ڕێکەوتێکی ڕووت بوو کە بە دەستی
پێشمەرگەیەکی ڕووتەڵەی شیعرپەروەر شەهید نەکرام
تەنیا ڕێکەوتێکی ڕووت بوو
کە تۆ وەکوو گوللەیەکی وێڵ
لەنێو دڵما گیرسایتەوە.

مایەی بەختیارییە کە، لەجیاتی گوللەی پێشمەرگەیەکی ئاسایی یان شیعرپەروەر، ئەوینی کچێک دڵی منی ئاوەدان کردەوە. لە شەڕدا دەشێت هەر شتێکی چاوەڕواننەکراو ڕوو بدات. لەوانەبوو بە پێچەوانەوە، گوللەیەکی منی شاعیر، لەناو دڵ و جەستەی پێشمەرگەیەکی شیعردۆست، یان ئاساییدا بگیرسێتەوە!

کاتێک بەهاری ١٩٨٦ لە سۆفیا ئەو بەشەی قەسیدەکەم نووسی، قسەی دوو پێشمەرگەی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانم بیر کەوتەوە، کە لە دوو ڕێکەوتی جیاوازدا، بە جیا لە خڕی نێوزەنگ توشم هاتن و منیان ناسییەوە. دوای قسەکردن لەبارەی شیعر و ئەدەبیات، هەردووکیان، بێ ئەوەی ئاگایان لە یەکتری بێت، وتیان: شیعرەکانی تۆمان زۆر بەدڵە، خۆزگە تۆ ئەندامی کۆمەڵەی ڕەنجدەران دەبوویت، نەک ئەندامی حزبی شیوعی.

منیش هەردوو جارەکە بە ڕوویەکی خۆشەوە وەڵامم دانەوە: ئەوە نییە هەمووومان پێکەوە، لە دژی فاشیزم دەجەنگین.

ئەو کاتەی لە کوردستان بووم، لێم ڕوون بوو شەڕەکە فراوانتر و خوێناویتر دەبێت، چونکە سەرکردایەتیی حیزبی شیوعی ژێر بە ژێر خۆی یەکلایی کردبۆوە. من بەو مەبەستە کوردستانم بە جێ نەهێشت تا دواتر، کە شەڕەکە خوێناویتر بوو، بگەڕێمەوە

شاخ. ئەگەر بە نیازی گەڕانەوە بوومایە بۆ پێشمەرگایەتی، ژنم نەدەهێنا. چونکە ئاگادار بووم ئەو هاوڕێیانەی ژن و منداڵیان لە ئەورووپا بەجێ هێشتبوو، خۆیان و خێزانیان لە چی حاڵێکدا بوون. چەندان ساڵ لە شاخ دەمانەوە، کەچی ڕێگایان نەدەدان، تەنانەت بۆ مانگێک، سەردانی ژن و منداڵەکانیان بکەنەوە. یەکێک لەوانە حەمید بەخش (ئەبو زەکی) بوو، کە خەڵکی بەسرە و کادیرێکی دێرین و زۆر بەتەمەن بوو، ژنەکەی بولگار بوو، بە دوو منداڵەوە، کە قوتابی بوون، بە جێی هێشتبوو و گەڕابۆوە بۆ کوردستان. دوای چوار ساڵ، هێشتا ڕێگەیان نەدەدا سەردانی خێزانەکەی بکاتەوە، کە هەژارانە لە شوقەیەکی ئەو باڵەخانەدا دەژیان، کە ماڵی کەریمی حیسامی لێ بوو. ڕۆژێک لە ڕۆژان سەرکردایەتیی حزبی شیوعی بەمنیان نەوت سەد لیڤەی بولگاری بدەم بەو خێزانە، کە دەیکردە بیست و پێنج دۆلار، لە کاتێکدا من هەمیشە نزیکەی هەزار لیڤەی بولگاری و سەدان دۆلاری حزبم لەبەردەست بوون، کە ئەو کاتە لە بولگارستان بە پارەی زۆر دادەندرا.

لە ناوەڕاستی فابریوەری (شوبات) دوای پێنج مانگ دابڕان، ئێکا گەیشتە کابول. دە ڕۆژێک پێشتر ئەفغانییەکان ئەپارتمان (شوقە)ێکی ڕاخراوی دوو ژوورییان، لە گەڕەکی مەکرویان، بۆ ئامادە کردبووین، کە لە ماڵەکەی ترەوە، بە پێ چارەکە سەعاتێک دوور بوو. بە هاتنی ئێکا دڵخۆش بووم، هەندێک ڕۆژ، کە کات و تاقەتم دەبوو، چەند سەعاتێک زمانی ڕووسی پێ دەوتم.

لە ١٦ی ئادار کارەساتی هەڵەبجە ڕووی دا، زۆر خەمبار و بێ تاقەتی کردم. شێوازی تاوانەکە، گەورەیی کارەساتەکە و ژمارەی قوربانیانی بە جۆرێک بوون، کە ئاسان نەبوو باوەڕ بە ڕوودانی ئەو کارەساتە بهێندرێت. چۆن ڕێگە دەدرێت، بە بەرچاوی دنیاوە،

نەتەوەیەک بە گازی ژەهراوی لەناو ببردرێت.! ترسی گەورەم ئەوەبوو، کە ئەمە تەنیا سەرەتا بێت، لە سایەی بێدەنگیی دنیادا، تاوانی تری لەم جۆرە و گەورەتریشی بەدوادا بێت، لە قەسیدەی لاوکی هەڵەبجەدا ئەو ترسە زۆر ڕوون دەبیندرێت.

پێوەندیمان بە هاوڕێیانی ئەفغانەوە کرد، وتیان ئەو هەواڵەمان بیستووە، بەڵام ئێران هەڵەبجەی کیمیاباران کردووە. ئەوان هەواڵەکەیان لە میدیای سۆڤییەتی وەرگرتبوو، چونکە دەوڵەتی سۆڤیەت، کە بەرژەوەندیی زۆری ئابووری و سیاسیی لە عێراق هەبوو، ئیدیعای حکومەتی عێراقی دووبارە کردبۆوە، کە گوایا ئێران ئەو کارەی کردووە. ئەو هەڵوێستەی یەکێتیی سۆڤییەت و بێدەنگبوونی بەرانبەر ئەو تاوانە مەزنە، برینی کارەساتەکەی لە دڵی من و ڕەنگە دەیان هەزار کەسی تر، قووڵتر و پڕئازارتر کرد. چونکە چاوەڕێی هەڵوێستی لەو جۆرە لە یەکێتیی سۆڤییەت نەدەکرا. کاتێک دەوڵەتی سۆڤیەت، کە خۆی بە پشتوپەنای گەلانی ستەملێکراو دادەنا، هەڵوێستێکی مرۆڤدۆستانەی بەرانبەر کارەساتەکە پیشان نەدا و مەحکوومی نەکرد، نەدەبوو هێندە هەلپەرستانە پاکانە بۆ دەوڵەتی عێراق بکات. گەورەیی کارەساتەکە و هەڵوێستی هەلپەرستانەی یەکێتیی سۆڤییەت و وڵاتانی سۆشیالیستی بەرامبەرکارەساتەکە، درزێکیان خستە باوەڕی سیاسیم، بۆ یەکەم جار لەخۆم پرسی:

ئایا من بە ڕێگایەکی دروستدا دەڕۆم؟

لەو کاتانەدا هەستم بە بێهیوایی و بێمانایی ژیان کرد. دوو سێ چوارینەی سەرەتای قەسیدەی لاوکی هەڵەبجەم نووسی، کە حەوت چوارینەیە، بەڵام نەمتوانی بەردەوام بم. جار جار دەمەویست درێژە بە نووسینی بدەم، کەچی هیچی لێ بەرهەم

نەدەهات. لە دۆخێکی شپرزەی ڕۆحی و هزریدا، ئایا نووسین لە بەرانبەر کارەساتێکی هێندە گەورەدا، دەتوانێت چ مانایەکی هەبێت؟ بەڵام لە وەڵامی خۆمدا دەمپرسی، ئایا نەنووسینیش خۆدزینەوە و بێمانایی نییە؟

لە کابول کارمان کەم بوو، کاتی باشم بۆ خوێندنەوە و نووسین هەبوو، بەڵام بێتاقەت بووم. زۆر ڕۆژ خۆم لەخوێندنەوە و نووسین دەدزییەوە. تا ئەو کاتە لاموابوو هەر ڕۆژێک کات و دەرفەت هەبێت، دەتوانم بخوێنمەوە، یان هەوڵ بدەم بنووسم. بەڵام لە کابول، بە تایبەت دوای کارەساتی هەڵەبجە، بۆم دەرکەوت کە مەسەلەکە بەو جۆرە نییە. کات (زەمەن) لە هەناوی خۆماندایە، نەک لە دەرەوەی خۆمان. بۆیە مەرج نییە هەموو کاتێک بە کات دابندرێت، واتا کاتێکی بایەخدار، یان بەرهەمدار بێت. کارکردن، بە تایبەت خوێندنەوە و نووسین، تەنیا پێوەندییان بە هەبوونی کاتەوە نییە، بەڵکو پێش هەر شتێک پێوەندییان بە لایەنی دەروونی و ڕۆحیی مرۆڤەوە هەیە. کەسێک کە پەشێوی و خەمناکی ڕووی تێ دەکات، دەشێت لە هەناوی خۆیدا زەمەن لەدەست بدات و بۆی کۆنترۆڵ نەکرێت، یان کات لای ئەو بمرێت. بۆیە ناتوانێت کاتەکەی خۆی بۆ زەمەنێکی سوودبەخش و بەرهەمدار بگۆڕێت. هەندێک ڕۆژ چەند سەعات لەسەر پشت پاڵ دەکەوتم، بێ ئەوەی کارێک بکەم، بیر لە شتێکی گرینگ بکەمەوە، یاخود تەنانەت لەخۆم ڕاببینم گوێ لە مۆسیقا بگرم. ئەو ساتانە ئەگەر بە تەنیا بوومایە، بە لای زۆرەوە خەمناکتر و پەرێشانتر دەبووم.

لە سەرەتای ئایاری ١٩٨٨ ئاگادار کرام بچم بۆ دیمەشق. خواحافیزیم لە هاوڕێیانی خۆمان و ئەفغان کرد و لەگەڵ ئێکا چووینە مۆسکۆ. لە فرۆکەخانەی مۆسکۆ، پاسپۆرتە ئەفغانییەکەیان

لێ وەرگرتمەوە، لە چاوترووکانێکدا، لە هاووڵاتییەکی ئەفغانییەوە، کە ناوی کاوە قادر بوو، کرامەوە بە هاووڵاتییەکی یەمەنی، کە ناوی ڕەفیق سابیر قادرە.

لە مۆسکۆ هەفتەیەک لەگەڵ ئێکا، لە ئۆتێل ماینەوە. ئێکا نەیتوانی ڕاستەوخۆ لەگەڵم بێت بۆ سووریا، چونکە ئەو سەردەمە، هاووڵاتیی سۆڤیەت، بۆ ئەوەی سەفەری وڵاتێک بکات، دەبوو لەوێوە داوەتنامەی تایبەتی لە کەسێکەوە بۆ بێت، دوای ئەوە ڕێگای دەدرا سەفەری وڵاتەکە بکات. ئێکا بە ناچاری ڕۆیشتەوە بۆ جۆرجیا، منیش چووم بۆ دیمەشق، بەو ئومێدەی لەوێ یەکتر ببینینەوە.

تا لە ئەفغانستان بووم (ڕێگای ئاوریشم)! بەردەوام هاتووچۆی پێدا دەکرا. لەو ماوەیەدا دەیان هاوڕێ و پێشمەرگە، چەندان خێزان، کادیری پێشکەوتووی حزب و سێ ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی، کە لە شاخ پێکەوە کارمان کردبوو، بەوێدا تێپەڕین. یەکێک لەو ئەندامانەی کۆمیتەی ناوەندی (ح س) کە زانی ژنم هێناوە، لێی پرسیم ئایا ژنەکەم کوردە؟ وتم نەخێر خەڵکی جۆرجیایە. کەچی یەکسەر وتی:

هاوڕێ بۆ کچێکی کورد یان عێراقیت نەهێنا؟

من لەو جۆرە پرسیارە بێزار بووم، لێرەش عەقڵیەت و کولتووری مەلاکەی باتومی، بە جۆرێکی تر بەرۆکم دەگرێتەوە!! پێش ئەوەی وەڵامی بدەمەوە، بە مەبەست قسەی مەلاکەی باتومیم بۆ گێڕایەوە، دوای ئەوە وتم:

هاوڕێ هەڵەیەک بوو کردم، بەڵێن بە تۆش دەدەم دووبارەی ناکەمەوە!

مەلاکەی باتومی بە بەهانەی ئاینی، کەچی ئەندامەکەی کۆمیتەی

ناوەنـدیی حزبـی شـیوعی، بە بەهـانەی سیاسـی و ئایـدیۆلۆجی، هەمـان پرسـیاریان لە مـن کـرد. پرسـیارەکە وێـرای ئەوەی دەخـاڵەتێکی نامـاقوولە لە ژیـانی تـایبەتی کەسێک، هەروا نـاڕەزایی ئەوان بەرانـبەر بە ژنهێنـانەکەم دەردەخـات، بـێ ئەوەی مـافی ئەوەیـان هەبێت. مەلاکە و ئەنـدامەکەی کۆمیتەی ناوەنـدیی حزبـی شیوعی، بە ڕواڵەت و لەڕووی بۆچوون و هزرییەوە سـەد لە سـەد جیـاواز بـوون، کەچـی لە دنیـابینیی کـۆمەڵایەتی و ناوەرۆکدا لێـک دوور نەبوون. تێڕوانین و شێوازی بیرکردنەوەی هەردووکیان، لەم بـوارەدا، بەرهەمـی یەک کولتـوور بـوون، کولتـووری سـڵەمینەوە لە ئەویـتـری جیـاواز، ئەویـتـری نامسـوڵمان، یـان ئەویـتـری نـاکورد-نـاعێراقی. هەر ئەو عەقڵیـیەتەش بـوو نەیهێشـت لە شـاخ کچێکـی شـیعە و کـوڕێکی ئێـزدی، هەروا کچێکـی کـوردی مسـوڵمان و کوڕێکی مەسیحی، بە مورادی خۆیان بگەن!

کاتێک ئەم جۆرە دنیـابینی و کولتـوورە، لە بـواری کۆمەڵایەتیدا، لای مەلایەک و سـەرکردەیەکی کۆمۆنیسـت، کە ئـاین بە ئەفیـونی گەلان دەزانێت، وەکـوو یەکـن، بە دڵنیـاییەوە هەڵەیەک هەیە. بـۆیە دەشێت ئەو جۆرە دنیابینییە- هەڵەیە، لە زۆر بواری تـری سیاسـی، کـۆمەڵایەتی، کۆلتـووری و ڕوانـین بـۆ ئـازادی و مـافی مـرۆڤ، دووبارە ببێتەوە. ڕەنگە بەشێکی شکست و کارەسـاتی کۆمۆنیسـت و چەپی کوردستانی و ناوچەکە، لێرەوە سەریان هەڵدابێت!

ئایا ئەگەر حزبی شـیوعی دەسـەڵاتی سیاسـیی لە عێراق، یـان لە کوردسـتان بە دەسـت بگرتبـایە، بە زەبـری قـانوون و قـامچی، ئەو جۆرە دنیابینی و کولتوورەی دەسەپاند؟!

لە کتێبـی ئیمپراتۆریـای (١٩٩٨) باسـی ئەوەم کـردووە کە هەر ئاین و ئایدیۆلۆجیا مرۆڤ و کۆمەڵ نـاگۆڕن، بەڵکو ئەوانیش ئـاین

و ئایدیۆلۆجیا دەگۆڕن، ملکەچی بەرژەوەندیی تایبەت و کولتووری خۆیانی دەکەن، چۆنیان بوێت بەکاری دەهێنن. بۆیە لە هەر ئاین و ئایدیۆلۆجیایەکدا، چەندان مەزهەب و ڕێبازی جیاواز و پێکناکۆک هەن. ئەو کوشتارەی لایەنگرانی ئاینێک و ئایدیۆلۆجیایەک لەگەڵ یەکتریان کردووە، لەو کوشتارە کەمتر نییە، کە لەگەڵ لایەنگرانی ئاین و ئایدیۆلۆجیای لەخۆیان جیاواز کردوویانە. بۆ نموونە کوشتاری نێوان سوننە و شیعە، کاتۆلیک و پرۆتستان، کێشە و شەڕی نێوان چەپ و کۆمۆنیستان.

## ٣
## ژیان لە دیمەشق

دووەم جار بوو سەردانی دیمەشق بکەم. ساڵی ١٩٨٢ پێش ئەوەی بۆ خوێندن بچمەوە بولگارستان، دوو مانگ زیاتر لەوێ ژیام. دیمەشق شارێکی خۆش، جوان و دڵگیرە، کەوتۆتە دامێنی چیای (ئەلقاسیون). خەڵکی دیمەشق هێمن، بێوەی، بێگرفت و کارپەروەرن. دیمەشق ئاووهەوای دەریای ناوەڕاستی هەیە، بە پێچەوانەی بەغدا، هاوینەکەی هێندە گەرم نەبوو کە پانکە، یان موبەریدە بەکار بهێندرێت، زستانەکەشی زۆر سارد نەبوو.

لە دیمەشق گەڕەکێکی تایبەت بە ناوی گەڕەکی کوردان (حی الاکراد) هەیە، کە ناوەکەی کراوە بەڕوکن ئەلدین. مەزاری مەولانا خالیدی نەقشبەندی لەوێیە. سەلاحەدینی ئەیوبی لە مزگەوتی ئومەوییە نێژراوە. لە دیمەشق هەستم بە نامۆیی نەدەکرد و وامدەزانی لە بەغدا دەژیم و دڵم پێی دەکرایەوە.

یەکەم دیاردە کە لە دیمەشق سەرنجی ڕاکێشام ئەوەبوو کچ و ژنی موحەجەبە، لەچاو ساڵی ١٩٨٢ زۆر زیادیان کردبوو. لە هەر شەقام، بازار و کۆڵانێکدا موحەجەبە دەبیندران. لەوە دەچوو ئەو دیاردەیە ئەنجامێکی ستەمی بەعس، بێئومێدی و بەرهەمی ئەو کوشتارە فراوانەی ئیسلامییەکان بێت، کە ساڵی ١٩٨٢ حکومەتی سووریا، لە شاری حەما کردبووی.

لە دیمەشق، لە گەڕەکی مەساکین بەرزە، لە خانوویەکدا، کە دوو ژوور و موبەقێک بوو، لەگەڵ ئەبو شاخەوان، کە لە ڕۆژانی پێشمەرگایەتیدا ناسیم، نیشتەجێیان کردم. ئەبو شاخەوان وەکوو هەموو هاوڕێ و برا مەسیحییەکانی کوردستان، کەسێکی زۆر هێمن، بەڕێز و بێگرفت بوو، دڵسۆزانە و بە بێدەنگی کاری خۆی دەکرد، هەقی بەسەر کەسەوە نەبوو، کێشەی لەگەڵ کەسدا نەبوو. لە کوردستان بەرپرسی بواری لاسلکی بوو، چەندان پێشمەرگەی گەنجی لەو بوارەدا پێ گەیاند.

سەرەتای مانگی ئاب، ئێکا بە فڕۆکە، هاتە حەلەب. لەوێ پێشوازیم کرد و شەوەکەی لە ئوتێل ماینەوە. نیوەشەو ئێکا بە پەشۆکاوی بە خەبەری هێنام، وتی:

هەستە، پیاوێک لە دەرەوە هاوار دەکات و پێویستی بە یارمەتییە. بچۆ بۆ پرستگەی ئوتێلەکە با بە هانایەوە بچن، یان تەلەفۆن بۆ پۆلیس بکەن. کاتێک گوێم هەڵخست هێشتا مجەوری مزگەوتێکی نزیک ئوتێلەکە، لە بانگدان نەبووبۆوە، وتم:

بێ خەم بنوو، ئەمە بانگی نوێژی بەیانییە. لەمەودوا، تا لە سوریا بین، لەوانەیە بەیانیان بەو بانگ و هاوارە بێدار ببیتەوە.

پێش هاتنی ئێکا شوقەیەکی ڕاخراوی دوو ژووریم بەکرێ گرت. من مانگانە تەنیا هەشت سەد لیرەم وەک دەرماڵە وەردەگرت، کە دەیکردە بیست دۆلار. دوای ئەوەی ئێکا هات، شەش سەد لیرەیان زیاد کرد، هەروا کرێی خانووەکەشیان بۆ دەدایین، کە دوو سەد دۆلار بوو.

دوای کیمیابارانی هەڵەبجە، بەرەی کوردستانی، بە بڕیار و سەرپەرشتیی کۆماری ئیسلامیی ئێران، لەنێوان یەکێتیی نیشتمانی، بەرەی جود (پارتی، حزبی شیوعی و سۆشیالیست) دامەزرێندرا.

سەرکردایەتیی بەرەی کوردستانی لە ئێران بوو. سەرکردایەتیی دەرەوەی بەرەی کوردستانی، لە دیمەشق، لە نوێنەرانی چوار حزبەکە، پێک هێندرا. من نوێنەری حزبی شیوعی بووم لە لیژنەکەدا. نوێنەرانی سێ حزبەکەی تر بریتی بوون لە عیزەدین بەرواری نوێنەری پارتی، دوکتۆر خەسرەو خاڵ، کە ساڵی ١٩٨٩ لەوێ جوانەمەرگ بوو، نوێنەری یەکێتی، دوکتۆر مەحموود عوسمان و عەدنان موفتی نوێنەری حزبی سۆشیالیست. هەروا ئەندامی لیژنەی پێوەندییەکانی حزبی شیوعی و لیژنەی ناوەندی ڕاگەیاندن و بەرپرسی گۆڤاری ڕێگای ئاشتی و سۆشیالیزم بووم، کە دوو مانگ جارێک، بە کوردی لە سووریا بڵاو دەکرایەوە.

ڕۆژی ٢٠ی تەمووز (جولای)ی ١٩٨٨ ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی، بە بڕیاری ژمارە ٥٩٨ داوای کرد شەڕی هەشت ساڵەی نێوان عێراق و ئێران کۆتایی بێت. هەردوو وڵات بڕیارەکەیان قبووڵ کرد و ڕۆژی ٨ ئاب شەڕەکە ڕاگیرا. بەپێی بڕیارەکە، دەبوو هەردوو وڵات دیلی شەر بگۆڕنەوە و هێزەکانیان لەناو خاکی یەکتر، بۆ سنووری نێودەوڵەتی وڵاتەکانیان، بکشێننەوە. هەرچەندە هەموو دنیا دەیزانی عێراق شەڕەکەی هەڵگیرساندووە، بەڵام لە بڕیارەکەدا باس نەکرابوو.

لە ئەنجامی هەشت ساڵ شەڕی عێراق و ئێراندا، هیچ لایەنێکیان نەیتوانی مەرجی خۆی بەسەر لایەنەکەی تردا بسەپێنێت. سنووری هەردوو وڵات وەکوو خۆیان مانەوە. بەڵام لە شەڕەکەدا، وەکوو دەوترێت دوو میلیۆن کەس کوژران، هەردوو وڵات ٤٠٠ ملیارد دۆلاریان خەرج کرد. عێراق سەد ملیار دۆلار زیاتر بە دەوڵەتانی کەنداو و فرەنسا و یەکێتیی سۆڤیەت قەرزار بوو. ئابوورییەکەی لە لێواری داڕماندا بوو. بەڵام دەوڵەتی عێراق لافی سەرکەوتنی لێ

دەدا، منەتی بەسەر وڵاتانی کەنداودا دەکرد، کە عێراق ئەوانی لە پەلاماری ئێران پاراستووە. بۆیە چاوەڕێ بوو، ئەو وڵاتانە، دوای تەوابوونی شەڕ، کۆمەک بە ئاوەدانکردنەوەی عێراق بکەن و لە بەشێکی قەرزەکانیشیان خۆش بن.

هێزە چەکدارەکانی کوردستانی عێراق دۆڕاوی گەورەی شەڕی عێراق و ئێران بوون، چونکە بێ مەرج و داواکاریی سیاسی، چوونە بەرەی ئێران و تێکەڵی شەڕەکە بوون، کەچی دەیانتوانی سەربەخۆ و بەجیا شەڕی دەوڵەتی عێراق بکەن، یان لەو شەڕەدا بێلایەن بن. لە سەرەتاوە پارتی و حزبی سۆشیالیست پشتی ئێرانیان گرت. دواتر یەکێتیی نیشتمانی، کە مفاوەزاتەکەی لەگەڵ عێراق سەری نەگرت، لەگەڵ ئێران رێک کەوت و چووە پاڵ ئێران.

کۆماری ئیسلامیی ئێران دژایەتیی کۆمۆنیزمی دەکرد، بۆیە لە حزبی شیوعی دەسڵەمییەوە. تەنانەت حزبی تودەی ئێران، کە لە سەرەتای شەڕی عێراق و ئێراندا هێشتا ئازاد بوو، ویستی خۆبەخشانە ئەندامانی خۆی بۆ بەرەی شەڕ بنێرێت، کەچی حکومەتی ئێران قبووڵی نەکرد. ڕەنگە کودێتای ئەفسەرانی حزبی گەلی ئەفغانییان لە بەرچاو بووبێت. ئەو کاتە سکرتێری حزبی تودە، کیا نووری، لە بەرانبەر هەڵوێستی حکومەتی ئێران وتی:

ئەمانە هێندە پاوانخوازن مردنیشیان هەر بۆ خۆیان دەوێت.!

ساڵی ١٩٨٣ بە کۆمەکی پارتی، پاسداران و سوپای ئێران ناوچەی حاجی هۆمەرانیان داگیر کرد. بەم کارەش بەهانەیەکیان دا بە دەوڵەتی عێراق، تۆڵە لەو بارزانییانە بکاتەوە، کە لە سەرەتای حەفتاکانەوە، دوای مردنی شێخ ئەحمەد بارزانی، بە هۆی کێشە و شەڕی نێوخۆی بارزانییەکان، پەنایان بۆ حکومەتی عێراق بردبوو.

لە هاوینی ١٩٨٦ مەفرەزەیەکی یەکێتیی نیشتمانی، لەگەڵ

پاسـداران چـوونه نـاوچەی کەرکـووک و لە پـالاوگەی نەوتـی کەرکووکیان دا. لە تۆڵەی ئەوە، زیاتر لە شەست گوندی ساڵەیی و شـوانیان وێـران کـرد و خەڵکەکەیـان ڕاگواسـت. لە ئـاداری ١٩٨٨ هەموو هێزە چەکدارەکان، جگە لە حزبی شیوعی، لەگەڵ لەشکری پاسـداران، شـاری هەڵەبجەیـان گـرت. لە تـۆڵەی ئەوە حکـومەتی عێراق، کە پێشـتر چەکـی کیمیـایی لە دژی ئێران بەکـار هێنـابوو، شـاری هەڵەبـجەی بە چەکی کیمیایی بۆردومـان کـرد. لە ئەنجامـدا پێـنج هەزار کەس شـەهید کـران، هەزارانـیش بە چەکـی کیمیـایی بریندار و ژەهراوی کران.

پێش کۆتایی شەڕی عێراق و ئێران، سەدام بڕیـاری دابوو تۆڵە لە گەلی کورد و هێزە چەکدارەکانی بکاتەوە، کە وەکوو بەشێکی لەشـکری ئێرانیـان لـێ هـاتبوو. ئێـران بە کـۆمەکی ئەوان تـوانی شـەڕەکە بهێنێـتە کوردسـتان. لە ٢٩ی ئـاداری ١٩٨٧ بە بڕیـاری ژمـارە ١٦٠ی ئەنجـومەنی سـەرکردایەتیی شـۆڕش، کە سـەدام سـەرۆکی بـوو، عەلـی حەسـەن ئەلمەجیـد کـرا بە بەرپرسـی کوردستانی عێراق. دەسـەڵاتی ڕەهـای پـێ درا، بۆ ئەوەی وەکوو نوێنەری سـەدام حوسین و ئەنجوومەنی سـەرکردایەتیی شـۆڕش، سیاسەتی حکومەتی عێراق، لە ناوچەی کوردستان بچەسپێنێت. لەم کارەشدا تەنیا مۆڵەت لە سەرۆک سەدام حوسێن وەربگرێت.[1]

بەپێی ئەو بڕیارە هەموو کاروباری ناوچەی کوردستان و دەزگا حکومەتییەکـان، بە عەلـی حەسـەن ئەلمەجیـد (ناسـراو بە عەلـی کیمیـایی) سـپێردران. کاتێـک سـەدام حوسـین لە سـەرەتای ١٩٨٨

---

1- حامد شريف الحمداني، لمحات من تاريخ الحركه التحرريه الكرديه في العراق، الاكاديميه العربيه في دانمارك، ٢٠٠٩، ص١٤٢، - محمد إحسان، كردستان ودوامة الحرب، ص ١٤٢ .

بڕیاری شاڵاوی ئەنفالی دا، ئەوی کردە بەرپرسی شاڵاوەکە. وەزیری بەرگریی ئەو کاتەی عێراق، هاشم سوڵتان، بە فەرماندەی سەربازیی شاڵاوەکە و سوپاسالار نزار خەزرەجی، بە یاریدەدەری دیاری کران.

ئەنفال بە واتای غەنیمەتی شەڕ (دەستکەوتی دزی و تالانی) دێت و ناوی سورەتی ژمارە هەشتی قورئانە، کە سەدام بۆ جینۆسایدی کورد سوودی لێ وەرگرت، چونکە ئایەتەکە خۆی دەرفەتی ئەم جۆرە کارە دەدات. کوشتنی خەڵکی لەخۆجیاواز و تالانکردنی ماڵ و سامانیان، کۆیلەکردن، زەوتکردن و دەستدرێژی سێکسی، فرۆشتنی ژن و کچ و منداڵیان، بەڕەوا دادەنێت. ڕەواییدان بەم جۆرە کارانە، لە هیچ ئاین و مەزهەب و ئایدیۆلۆجیایەکدا وێنەی نییە.

سورەتەکە باسی شەڕی بەدر دەکات، کە ساڵی دووی کۆچی، ٦٢٤ی زاینی، لەنێوان لایەنگرانی ئیسلام و بتپەرستاندا ڕووی داوە. لەو سورەتەدا چۆنییەتیی دابەشکردنی غەنیمەت، دزی و تالانیی شەڕ، بەسەر شەڕکەرە مسوڵمانەکاندا، دیاری کراوە.[1]

لە شاڵاوی ئەنفالدا دوو فیرقەی سوپای عێراق و هێزی پاسەوانی کۆماری و جەیشی شەعبی و جاش بەشدار بوون. فڕۆکەی جەنگی، هێلیکۆپتەر، تانک و زرێپۆش و هەموو جۆرە چەکێک، بە چەکی کیمیاییشەوە، بەکار هێندران. شاڵاوەکە لە ماوەی شەش مانگ و نیودا بە حەوت قۆناخ بەڕێوە چوو:

قۆناخی یەکەم: لە ٢٣ی شوبات (فەبریوەری)ی ١٩٨٨ هێرش کرایە سەر ناوچەی سەرگەڵو و بەرگەڵو، لە پارێزگای سلێمانی، کە

---

1- القرآن، سورە الانفال

بارەگـای سـەرکردایەتیی یەکێتیـی لـێ بـوو. لەو هێرشـەدا چەکـی کیمیایی لە هەڵەبجە، گوندی سەرگەڵو، بەرگەڵو و گوندی تر، بەکار هێندرا. بەلاغی کۆتایی ئەم قۆناخە لە ١٩ی ئادار ڕاگەیەندرا.

قۆنـاخی دووەم: لە ٢٢ی ئـادار هێزێکـی گەورەی سـەربازی، پەلامـاری نـاوچەی قەرەداخـی دا. چەکـی کیمیـایی لە گونـدەکانی سێوسێنان و جافەران و مەسۆیی و شاخی زەردە، بەکار هێندرا. ئەم قۆناخە لە ١٤ی نیسانی ١٩٨٨ تەواو کرا.

قۆنـاخی سـێیەم: لە ٧ی نیسـان پەلامـاری گەرمیـان درا، لە ناوچەکانی دوز خورمـاتووەوە تـا قـادر کەرەم، سـەنگاو، هەردوو حەوزی کفـری و کەلار و هەمـوو گوندنشـینە کوردەکـانی ئەو ناوچـانەی گـرتەوە. لەو شـاڵاوەدا چەکـی کیمیـایی لە (تازەشـار)ی ناوچەی قادر کەرەم بەکار هێندرا. لە ٢٠ی نیسان بەلاغی کۆتـایی ئەو قۆنـاخەش ڕاگەیەنـدرا. لەم شـاڵاوەدا، کە فراوانتـرین نـاوچەی گـرتەوە، زۆرتـرین ژن و منـداڵ و پیـر بە دیـل گیـران. هەمـوو ناوچەکە وێران و تاڵان کرا. بەشێکی خەڵکەکەی ڕوویـان لە شـاری تـری کوردسـتان کـرد و ئەوانـی تـر، هەنـدێکیان لە ئۆردوگـای زۆرەملێ نیشتەجێ کران، زۆرینەشیان، نزیکەی ١٥٠ هەزار کەس، بەکۆمەڵ کوژران و لە گۆڕی بەکۆمەڵدا نێژران.[1]

حکومەت دەیویست سروشتی دیمۆگرافیی ئەو ناوچەیە بگۆڕێت، کورد لەوێ نەهێڵێت و عەشیرەتی عەرەب لەوێ نیشتەجێ بکات.

قۆناخی چوارەم: ڕۆژی ٣ی ئایار دۆڵی زێی بچووک، ناوچەکانی قەڵاسێوکە، شێخ بزێنی، شـوان و نـاوچە شـاخاوییەکانی پارێزگـای هەولێر پەلامار دران. هەروا گوندی گۆپتەپە و عەسـکەر، بە چەکـی کیمیـایی بۆردومـان کـران و سـێ سـەد هـاووڵاتی شـەهید کـران. لە

---

1- حامد شریف الحمدانی، سەرچاوەی پێشوو.

٨ی ئایار بەلاغی کۆتایی قۆناخی چوارەمی ئەنفال ڕاگەیەندرا.

هەرسێک قۆناخی پێنجەم و شەشەم و حەوتەم لە ١٥ی ئایار دەستیان پێ کرد، ناوچەی ڕەواندز و ناوچە سنوورییەکانی ئێرانی گرتەوە. ئەم قۆناخانە زیاتر لە سێ مانگی خایاند، چەندان جار چەکی کیمیایی لە ناوچەکانی بالیسان، هیران، سماقوولی، وەرتێ، ئاکۆیان، دۆڵەکانی مەلەکان و ناوچە سنوورییەکان بەکار هێندرا. ڕۆژی ٢٦ی ئاب بەلاغی کۆتایی ئەو قۆناخەی ئەنفال ڕاگەیەندرا.

لە دواقۆناخی ئەنفالدا، لە ٢٥ی ئاب، هێرشی فراوان کرایە سەر بادینان ٢٧ گوندی ئەو ناوچەیە بە چەکی کیمیایی بۆردومان کران. هێرشەکە بە (خاتم الانفال) ناوبرا و لە ٦ی ئەیلول کۆتایی هات. هەزاران کەس کوژران، دەیان هەزاریش پەنایان بۆ تورکیا برد.[1]

ئەو ناوچانەی بەر پەلاماری ئەنفال کەوتن، وێران کران و بە ناوچەی قەدەخەکراو داندران. بەپێی بڕیاری حکومەتی عێراق، هەر کەسێک لە تەمەنی ١٥ ساڵییەوە تا ٧٠ ساڵی لەو ناوچانە بگیرێت، دوای لێکۆڵینەوە، دەبێت بکوژرێت.

لە شاڵاوی ئەنفالدا نزیکەی دوو سەد هەزار سەباز و چەکداری عێراقی و جاشی کورد بەشدار بوون، ١٨٠ هەزار کەس لەناوبران، زۆربەیان لە بیابانی باشووری عێراق، لە گۆڕی بەکۆمەڵدا نێژران. هەروا دوو هەزار گوند وێران کران. مەڕ و ماڵات و سامانی خەڵک بەتاڵا بران. چەکی کیمیایی لە هەموو ناوچە ئەنفالکراوەکان، بە فراوانی بەکار هێندرا. عەلی کیمیایی لە تۆمارێکی دەنگیدا، کە دوای ڕوخاندنی ڕێژیمی بەعس لە نیسانی ٢٠٠٣، ڕێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی (Amnesty International) بڵاوی کردەوە، هەڕەشە لە

---

1- بۆ زیاتر بڕوانە: عارف قوربانی، شایەتحاڵەکانی ئەنفال، بەرگی یەکەم، ٢٠٠٢، هەروا حامد شریف الحمدانی، سەرچاوەی پێشوو.

خەڵکی ئەو ناوچانە دەکات و دەڵێت:

(هەموویان بە چەکی کیمیایی دەکوژم، کێ بەرهەڵستی دەکات؟ کۆمەڵی نێودەوڵەتی؟ با خۆیان و هەر کەس و لایەنیش کە گوێیان لێ دەگرن بۆ دۆزەخ بچن. نەک هەر تاکە ڕۆژێک، بەڵکو لە ماوەی پازدە ڕۆژدا بە چەکی کیمیایی لێیان دەدەم.[1]

دوای ڕوخاندنی ڕێژیمی سەدام، سەدان گۆڕی بەکۆمەڵی ئەو ئەنفالکراوانە، کە ژن و منداڵ و گەنج و پیر بوون، لە بیابانی باشووری عێراق دۆزرانەوە. لە ٢٣ی حوزەیرانی ٢٠٠٧ لە دادگای تاوانەکانی عێراق، عەلی حەسەن مەجید و هاشم سوڵتان و ئەحمەد حوسێن ڕەشید، بە تاوانی کوشتاری بەکۆمەڵ، بڕیاری لەسێدارەدانیان درا، دادگا شاڵاوی ئەنفالی بە جینۆساید ناساند. پێشتریش لە ٣٠ دیسەمبەری ٢٠٠٦ سەدام حوسێن، بە تاوانی کوشتن و لەناوبردن، لەسێدارە درا. هەروا لە دیسەمبەری ٢٠٠٥ دادگای هۆڵاندی بڕیاری دا ڤان فرانس ئەنرات، کە هاوولاتییەکی هۆڵاندییە، بە تۆمەتی بەشداربوون لە تاوانی شەڕ و فرۆشتنی چەکی کیمیایی بە حکومەتی عێراق ١٥ ساڵ زیندانی بکرێت. دادگاکە کوشتنی هەزاران کوردی، لە ساڵانی هەشتاکانی سەدەی پێشو، بە تاوانی جینۆساید دانا.[2]

لە شاڵاوی ئەنفال باشووری کوردستان وێرانتر کرا. بزاڤی

---

1- منظمة هيومن رايت نشرت التسجيل الصوتي لعلي حسن المجيد عام ١٩٨٩، حامد شريف الحمداني، نفس المصدر ص١٤٦

2- حملة الأنفال - ويكيبيديا(wikipedia.org) هەروا بڕوانە:

.October 2007 27 ntinues Iraq: 'Disappearances' – the agony co

،Amnesty International

چەکداری شکستی هێنا، ڕاستییەکەی ئاشبەتاڵێکی بێدەنگانەی پێ کرا. سەرکردایەتیی حزبەکان لە شاخ کشانەوە و چوونە ئێران. دواتر بەشێکیان ڕوویان لە سووریا و وڵاتانی تر کرد. تاک تاک چەند مەفرەزەی کەمی پێشمەرگەی ئەم یان ئەو حزب، لە دۆخێکی زۆر سەختدا، لە چەند ناوچەی کوردستان مانەوە. ئەوانی تر بەشێکیان خۆیان ڕادەستی عێراق کردەوە، بەشێکی تریان لەگەڵ دەیان هەزار ئاوارەدا پەنایان بۆ ئێران و تورکیا برد. تەنیا لە ئۆردوگای ماردین پەنجا هەزار کەس هەبوون، کە خەڵکی بادینان بوون. لەناو ئەواندا دەیان پێشمەرگەی حزبی شیوعی هەبوون، کە خۆیان تێکەڵی خەڵکەکە کردبوو، چووبوونە تورکیا. دواتر زۆربەیان چوونە قامیشلی، لەوێشەوە هاتنە دیمەشق.

بەپێی (ویکیپیدیا) شاڵاوی ئەنفال (وەڵامدانەوەیەکی ئەو هێرشانە بوو، کە شەڕکەرانی کورد، پێشمەرگە، لە کاتی شەڕی ئێران و عێراقدا، بە هاوکاریی هێزی پاسدارانی ئێرانی، توانییان چەند شاری عێراق بگرن).[1]

هەر دیاردەیەک لە سروشت و کۆمەڵ و سیاسەتدا جارێک ڕوو بدات، دەشێت دووبارە ببێتەوە. بزاڤی چەکداریی کورد لە باشووری کوردستان، بۆ دووەم جار، بە بێ هیچ مەرج و ڕێکەوتنێکی سیاسی، چارەنووسی خۆی خستەوە دەستی ئێران، کە بە شێوەی ئامرازێک دژی عێراق بەکاری هێنا. ئێران بە کۆمەکی ئەوان توانی شەڕی خۆی، لەگەڵ دەوڵەتی عێراق، بهێنێتە کوردستان و چەکی کیمیایی لە دژی کورد بەکار بهێندرێت.

ئەو دوو ئەزموونە شکستخواردووە دەیسەلمێنن کە تا ئێستا پرسی کورد لە عێراق و وڵاتانی تردا، هەر دەبێت بە ڕێککەوتن

---

1- حملة الأنفال – ويكيبيديا (wikipedia.org)

لەگەڵ حکومەتی ناوەندی چارەسەر بکرێت، چونکە ئامانجی بزووتنەوەی کورد بۆ ئۆتۆنۆمی یان فیدرالییە، نەک بۆ ڕزگاربوون و دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی. هەر مافێکی نەتەوەیی گەلی کورد بە دەستی بهێنێت، دەبێت بە سازان و ڕێککەوتن لەگەڵ حکومەتی ناوەندیی بێت و مافەکە لە دەستووری وڵاتەکەدا بچەسپێندرێت، بە دەزگای تایبەت بپارێزرێت. ئەو دەوڵەتانە ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکانن، لە کورد بەهێزترن. پارسەنگی سیاسی، دیپلۆماسی و هێزی سەربازی، لەنێوانی بزاڤی چەکداریی کورد و دەوڵەتی ناوەندیدا، نابەرانبەرە. بۆیە ئەوەی ئەمڕۆ گەلی کوردستان بە زەبری شەڕ و هێز، یان لەبەر لاوازیی دەوڵەتی ناوەندی، بە دەستی بهێنێت، سبەینێ بە زەبری هێز لێی دەستێندرێتەوە. ڕادەستکردنەوەی خۆبەخشانەی تەواوی ناوچە کێشەلەسەرەکان، دوای شانۆگەریی ریفراندۆم، بە حکومەتی عێراق، نموونەی بەرچاوە. پەنابردن بۆ چەک و چەکبازی، خۆبەستنەوە بە دەوڵەتانی دراوسێ، ناتوانێت دەستکەوتی چەسپاو بۆ گەلی کوردستان مسۆگەر بکات. چونکە ئەو دەوڵەتانە چەند پێک ناکۆک بن، هێشتا لە بەرانبەر پرسی کورددا کۆک و هاوئامانجن. هیچیان لە دەستوورەکەیاندا، جگە لە عێراق، دانیان بە هەبوونی کورد لە وڵاتەکانیاندا نەناوە، چونکە دژی هەر مافێکی نەتەوەیی و خواستی گەلی کوردستانن. ئەگەر ئەوان دوو پارچە چەک بدەنە هەر لایەنێکی کوردی، دەبێت ئەو لایەنە چەکێکیان لە دژی گەلی کورد بەکار بهێنێت. بۆیە ئەوان بزاڤی چەکداریی کورد دەکەنە ئامرازێکی دەستیان، لە دژی گەلی عێراق و بۆ کاولکردنی کوردستان و پێشگرتن لە هەر مافێکی نەتەوەیی بە کاری دەهێنن. سەرەنجام بزاڤە چەکدارییەکە، دەشێت وەکوو هێزێکی

مورتەزەقەی لێ بێت، هەر ڕۆژێک کاریان پێی نەما، ئاشبەتاڵی پێ دەکەن. کەمترین دەستکەوتی نەتەوەیی بۆ گەلی کوردستان لەعێراقدا، سەد جار لە شەرهەڵگیرساندن، بەکوشتدانی خەڵک و خۆکردنە ئامرازی دەستی دەوڵەتێکی ناوچەکە، باشتر و بەسوودترە.

ئەمریکا و هاوپەیمانان لە شەڕی کەنداودا، لەشکری عێراقیان بەزاند و زۆنی دژەفرینیان، بۆ پاراستنی گەلی کوردستان، لە پەلاماری دەوڵەتی عێراق، دروست کرد. ئەگەر کۆمەکی ئەمریکا و هاوپەیمانانی نەبوونایە، ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی و کوردستانی، تا ئەمڕۆ، بە شێوەی ئۆپۆزیسیۆنی ئێرانی، لە مەنفا دەبوون. لەم سەردەمەدا هیچ گەلێکی ناوچەکە، چەند جەنگاوەر بێت و قوربانی بدات، زەحمەتە بتوانێت بە بێ کۆمەکی زلهێزێک، خۆی لە ستەمی دەوڵەتەکەی رزگار بکات.

تاوانی ئەنفال و کیمیابارانی کوردستان، تاوانە دژی مرۆڤایەتی و بە هیچ بەهانە و بیانوویەک ناتواندرێت پاکانەی بۆ بکرێت. بەڵام ئایا ئەگەر هێزە چەکدارەکانی کورد، لە شەڕی عێراق و ئێراندا، شانبەشانی پاسدار و لەشکری ئێران، شەڕی عێراقیان نەکردایە، تاوانی ئەنفال و کیمیابارانکردنی هەڵەبجە و ناوچەکانی تری کوردستان، بە هەمان چەشن، یان لە بنەڕەتدا، ڕوویان دەدا؟!

٤

## گەڕان بەدوایماڵێک- وڵاتێکدا

دوای ئەنفال شاری دیمەشق، کە سەنتەری ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی بوو، کرا بە ناوەندی چالاکیی هێزەکانی بەرەی کوردستانی، کە هەموویان نوێنەر و نووسینگەیان لەوێ هەبوو. هەروا نووسینگەی لیژنەی سەرکردایەتیی دەرەوەی بەرەی کوردستانی لە شام بوو. کار و کۆبوونەوەی لیژنەکە زۆر نەبوون و بە ئاسایی بەڕێوە دەچوون. لیژنەکە هەواڵ و بەڵگەنامەی لەبارەی تاوانەکانی ڕژێمی عێراق و ئەنفال و وێرانکردنی کوردستان، بڵاو دەکردەوە. بە ناوی بەرەی کوردستانییەوە، پێوەندیی بە چەند سەفارەتخانەی وڵاتان و هێز و لایەنی سیاسیی عەرەبییەوە کرد، کە لە دیمەشق نوێنەریان هەبوو، بەو مەبەستەی زانیارییان لەبارەی کیمیابارانکردنی کوردستان و ئەنفال پێ بدەن. بە بەڵگەوە لەو کارەساتە و تاوانی جینۆسایدی گەلی کوردستان ئاگاداریان بکات. بەشێک لەو سەفارەتخانانە پێشوازیی نوێنەرانی لیژنەکەیان نەکرد، ئەوانەی پێشوازیشییان کردین، بۆ نموونە سەفارەتخانەی سوید، فەرمانبەرێکی ئاسایی لەگەڵ ئێمە دانیشت. ئەو قسە و بەڵگانەی لەبارەی ئەنفال و کیمیابارانکردنی هەڵەبجە خرانە ڕوو، جێگای بایەخی ئەوان نەبوون!

ڕۆژێک هەواڵێک بڵاو بۆوە کە لاوێکی عێراقی ویستوویەتی لە ڕێگەی ڕۆمانیاوە، وەکوو پەنابەر ڕوو لە وڵاتێکی ڕۆژئاوا بکات، بەڵام پۆلیسی ڕۆمانیا گرتوویەتی و بەنیازن ڕادەستی عێراقی بکەنەوە. پێشتریش دەوڵەتی سۆشیالیستیی مەجەرستان (هەنگاریا) تاوانێکی لەو جۆرەی کردبوو. لەگەڵ (ئەبو شەزا) کە لەگەڵ من لە لیژنەی پێوەندییەکانی حزبی شیوعی بوو، چووینە سەفارەتی ڕۆمانیای سۆشیالیستی لە دیمەشق، بۆ ئەوەی بە ناوی حزبی شیوعییەوە داوایان لێ بکەین ئەو هاوولاتییە، ڕەوانەی عێراق نەکەنەوە، چونکە لەوێ لە سێدارەی دەدەن. لە بەردەم سەفارەتخانەک عەبدولخالق زەنگەنە، کە نوێنەری حزبی زەحمەتکێشان بوو لە سووریا، بۆ هەمان مەبەست دەیەویست سەردانی سەفارەتخانەکە بکات. هەمووومان پێکەوە چووینە ژوورێ. نوێنەری سەفارەتی ڕۆمانیا لالووت و بێمنەتانە پێی وتین ئەو کەسە هاوولاتی عێراقییە، دەبێت بنێردرێتەوە وڵاتی خۆی. هەوڵمان دا بۆی ڕوون بکەینەوە کە ئەمە بۆ ناوبانگی ڕۆمانیا باش نییە، چونکە حکومەتی عێراق، لە سێدارەی دەدات. باسی هاوولاتییەکی عێراقیم کرد، کە پێش چەند مانگێک حکومەتی مەجەرستان ڕادەستی حکومەتی عێراقی کردبۆوە و لەسێدارە درابوو. وتم خەڵکی عێراق دۆستانە بۆ گەلی ڕۆمانیا دەڕوانن، چاوەڕێی کاری لەو جۆرە لە حکومەتی ڕۆمانیا ناکەن. کاتێک زانیم ئەو قسانە سوودیان نییە، وتم:

باش نییە ئەو کوڕە بنێرنەوە بۆ عێراق، چونکە ئەگەر لە سێدارە بدرێت، کەسوکارەکەی حکومەتی ڕۆمانیا بە بەرپرس دەزانن، زۆر هاوولاتیی ئێوە لە عێراق کار دەکەن، ڕەنگە بۆ ئەوان باش نەبێت.

کاتێک گەڕاینەوە نووسینگە، هاوڕێیان لێیان پرسیم، ئەوە چیتان

بە ڕۆمانییەکان وتووە؟ من پرسیارەکەم بەلاوە سەیر بوو! وتیان لە سەفارەتی ڕۆمانییەوە تەلەفۆنیان بۆ لایەنی پێوەندیداری حکومەتی سووریا کردووە، گوایا ئێوە هەڕەشەتان لێ کردوون. باش بوو هاوڕێیان زوو فریا کەوتن و گرفتەکەیان چارەسەر کرد.

ئەو کاتە تازە شەڕی هەشت ساڵەی عێراق و ئێران کۆتایی هاتبوو. زۆربەی وڵاتانی ڕۆژئاوا و سۆشیالیستی چاوەڕێ بوون عێراق و ئێران، کە دوو وڵاتی دەوڵەمەندی خاوەن نەوتن، دەست بە ئاوەدانکردنەوە بکەن و کۆمپانیاکانی ئەو وڵاتانەش پشکی خۆیان بەر بکەوێت. بۆیە بە هەموو شێوەیەک نەرمییان بەرانبەر بە عێراق و ئێران دەنواند، لە تاوانەکانیان بێدەنگ بوون. لە بەرانبەر کیمیابارانی کوردستان و پرۆسێسی ئەنفالدا چاویان نووقاندبوو. ئەو هەڵوێست و ڕەفتارانەی وڵاتانی سەرمایەداری، چاوەڕوانکراو بوون، ئەوان بە دوای بەرژەوەندیی خۆیاندا دەگەڕێن. بەڵام هەڵوێستی وڵاتانی سۆشیالیستی، لە بەرانبەر ئەو تاوانانەی ڕێژیمی عێراق، مایەی بێئومێدی بوو. چونکە دەیسەلماند کە ئەوانیش، لە لایان گرینگ نەبوو دەسەڵاتێکی فاشیستی، چۆن لەگەڵ گەلەکەی ڕەفتار دەکات، یان نەتەوەیەک جینۆساید دەکات، بەڵکو گرینگ ئەوەبوو ئایا ئەو دەسەڵاتە دۆست، یان نەیاریانە.!

من پێوەندیم لەگەڵ ئەندامانی لیژنەی سەرکردایەتیی دەرەوەی بەرەی کوردستانی ئاسایی بوو، کار و چالاکیی لیژنەکە بێ گرفت بەڕێوە دەچوون، چونکە شتێک نەمابوو شەڕی لەسەر بکرێت. دوای چەند مانگێک، بڕیارمان دا بڵاوکراوەیەک بەناوی بەرەی کوردستانی، بە زمانی عەرەبی لە سووریا دەربکەین. ژمارەی یەکەمی بڵاوکراوەکە ئامادە کرا.

من لە کاری لیژنەی دەرەوەی بەرەی کوردستانی بێتاقەت بووم،

خۆم بە نامۆ دەبینی. داوام لە سەرکردایەتیی حزب کرد کارەکە بە هـاوڕێیەکی تـر بسـپێرن، سـەرەتا ڕازی نەبـوون، دواتـر حـاجی سـلێمان (ئەبـو سـیروان) کە ئەنـدامی کـۆمیتەی ناوەنـدی بـوو، بە نوێنەری حزب لە لیژنەکە داندرا. منیش سەرقاڵی گۆڤاری ڕێگای ئاشتی و سۆشیالیزم و کاری ڕاگەیاندن و نووسینی خۆم بووم.

سەرەتا من و هـاوڕێ ئەسـتێرە (پرشـنگ) لە گۆڤارەکە کارمـان دەکـرد. ئەو بابەتەکـانی بـۆ چـاپکردن بە تایـپ دەنووسـینەوە و هەنـدێک وتاریشـی دەکـردن بە کـوردی. ئەسـتێرە خـان کچێکـی ڕووناکبیر و چالاک بوو. لە یەکێتیی سۆڤیەت خوێندنی زانکۆی تەواو کردبـوو، دوای ئەوە گەڕابـۆوە کوردسـتان و چەنـد سـاڵ پێشمەرگە بوو، دوای پەلاماری ئەنفال ڕووی لە سووریا کردبوو، ئێستا لە دانمارک دەژی.

هەروا دوکتۆر شیروان مەحموود، کە ڕووناکبیرێکی بە توانا و بەهـرەدارە، لە گۆڤـارەکە بەشـداریی کـردین و چەنـدان بـابەتی تەرجومە کرد. د.شیروان لە یەکێتیی سۆڤیەت خوێندنی دوکتۆرای تەواو کردبوو، بۆ پێشمەرگایەتیی گەڕابۆوە بۆ کوردستان و چەند ساڵ پێشمەرگە بوو، ئێستا لە سوێد دەژی.

من لەو گۆڤارەدا چوار باس و نووسینم، لەبارەی سەرهەڵدانی هۆشـیاریی نەتەوەیـی کـورد، دەرکەوتنـی بیـری ڕۆشـنگەریی لە کوردسـتان، سـەرەتاکانی بیـری سۆشیالیسـتی لە کوردسـتان و وتارێک لەبارەی فیکری پەیڕەوکاریی کورد، بڵاو کردەوە. هەروا فایلێکمان، بە زمانی عەرەبی، لەبارەی گۆرانی شاعیر، بۆ گۆڤاری (ئەلسەقافە ئەلجەدیدە) ئامادە کرد. فایلەکە شەش باس و نووسینی چەنـد نووسـەری، لەبـارەی شـیعری گـۆران و چەنـد نمـوونەی

شیعرەکانی بە زمانی عەرەبی، بەخۆ گرتبوو.[1]

لە دیمەشق، بەپێی کات و دەرفەت، هەوڵم دەدا درێژە بە نووسینی قەسیدەی لاوکی هەڵەبجە بدەم. لەوێ بە ڤیدیۆ فیلمێکی دۆکۆمێنتارم، لەبارەی کیمیابارانی هەڵەبجە، بینی کە ڕاستەوخۆ دوای کارەساتەکە گیرابوو. تەرمی ژن و منداڵ و پیاو، بە جلی ڕەنگاوڕەنگەوە، وێنەی گەڵاپایزە لەسەر شۆستە و شەقام و کۆڵان و پەنای دیواران، بێناز کەوتبوون. فیلمەکە زۆر کاری تێکردم و بردمیە شوێنی ڕووداوەکە و ڕۆژانی سەردەمی شاخ. دوای ئەوە بە تەواوی سەرقاڵی نووسینی هۆنراوەکە بووم، لە کانونی دووەمی ١٩٨٩ تەواوم کرد. بەشێکی هۆنراوەکەم، بە ناوی سروودی خاک بۆ هەڵەبجە، بۆ کوردستان نارد، لە ژمارە ١٥ی ساڵی ١٩٨٩ی گۆڤاری نووسەری کوردستان، کە لە ئێران دەردەچوو، بڵاو کرایەوە. لە سەرەتای بەهاری هەمان ساڵدا قەسیدەکە، لەگەڵ سێ نیگاری هونەرمەندی عێراقی، ئوسامە، کە بۆ قەسیدەکەی کێشابوون، بە نامیلکەیەکی ٤٨ لاپەڕەیی لە لوبنان چاپ کرا. تەواوی قەسیدەکە، لە لایەن کاک کاوە کرا بە عەرەبی و لە گۆڤاری ئەلسەقافە ئەلجەدیدە، بڵاو کرایەوە.

ساڵێک دوای ڕاپەڕین هونەرمەند ڕزگار ئەمین قەسیدەکەی کردە شانۆگەری، لەگەڵ کۆمەڵێک هونەرمەند، لە کۆڵانە وێرانەکانی شاری هەڵەبجە نمایش کرا.

لە یادی دە ساڵەی کارەساتی هەڵەبجەدا، لەگەڵ هونەرمەند

---

1- لەوانە باسێکی د.کەمال میراودەلی لەبارەی گۆران، کە د.شیروان مەحموود کردبووی بە عەرەبی، باسێکی هانا برامیس، کە خاتو هیام جاوید لە ئینگلیزییەوە کردبووی بە عەرەبی، لەگەڵ چوار بابەتی تر کە ئەحمەد دلزار، نووسەری کوردی سووریا تەها خەلیل، سیروان، ڕەفیق سابیر نووسیبوویان. بڕوانە: الثقافة الجديدة، العدد ٢٠٧ و ٢٠٨ آذار-نيسان ١٩٨٩

عەدنان کەریم، لە تەلەڤزیۆنی مێد، پێکەوە تەواوی قەسیدەکەمان بەجۆرێک پێشکەش کرد، کە من کۆپلەیەکم لێ دەخوێندەوە و کاک عەدنان بە مۆسیقاوە تێکستەکەی دەچڕی.

دەستپێکی ئەو قەسیدەیە، حەوت کۆپلە، یان چوارینەیە و بە هاواری (بە تەنیا جێی مەهێڵن- ئەمشەو زریان دەیچێنێت) دەست پێ دەکات. ئەمە کراوەتە سروودێکی تایبەت بە هەڵەبجە و ساڵانە لە یادی هەڵەبجە بە دەنگی هونەرمەند عەدنان کەریم و هونەرمەندی تر دەوترێت[1]. هەروا ئەو حەوت چوارینەیە، بە گەورەیی لەسەر برۆنز هەڵکەندراوە و لەناو مۆنۆمێنتی هەڵەبجەدا، بە پایەیەکی درێژدا هەڵواسراوە.[2]

ڕۆژی ٢٣ی فابریوەری (شوبات)ی ٢٠١٧ خەڵکی بەڕێزی شاری هەڵەبجە، لە کۆڕێکی ڕێزلێناندا، کە کتێبخانەی هەژاری موکریانی، بە سەرپەرشتی پارێزگای هەڵەبجە، ڕێکی خستبوو، باوەشییان بۆ گرتمەوە. ئەوان و ئەم دەزگا و لایەنانەی خوارەوە، ڕێزیان لێ نام و هەر یەکەیان دیاریی تایبەتی خۆیان پێشکەش کردم:

شارەوانیی هەڵەبجە، بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی شەهیدان و ئەنفالکراوانی هەڵەبجە، کۆمەڵەی قوربانیانی کیمیابارانی هەڵەبجە، ڕێکخراوی ڕزگاربووانی چەکی کیمیایی هەڵەبجە، یەکێتیی پەرلەمانتارانی کوردستان، لقی سلێمانی، بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی

---

1- سالح سوزەنی بێ پرس و ئاگاداریی من، چەند چوارینەی سەرەتای هۆنراوەکەی وەرگرتووە، شێواندوویەتی و کەسی سێیەمی تاک (ئەو)ی گۆڕیوە بە کەسی یەکەمی تاک (من). دوو چوارینەی ناقۆڵای لێ زیاد کردووە، کە لەگەڵ ستایل و ئاستی هونەریی شیعرەکە ناگونجێن. لەمەش خراپتر خۆی کردۆتە شەریکی من، نووسییەتی: (هۆنراوەی ڕەفیق سابیر و سالح سۆزەنی) وەک ئەوەی پێکەوە شیعرەکەمان نووسیبێت! بڕوانە: ڕەفیق سابیر، ڕوانین بە ڕووناکیدا، ل٣٠٧-٣٢٧

2- بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە ٥

ڕۆشنبیری و هونەریی هەڵەبجە، بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی پەروەردەی هەڵەبجە، بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیسی هەڵەبجە، گروپی مۆزیکی هەڵەبجە و چەند ڕێکخراوی حیزبی و ڕۆشنبیری لە هەڵەبجە. هەروا شاعیر ئاری عەبدول لەتیف هۆنراوەیەکی پێشکەش کردم.

من شانازم بەو ڕێزلێنانە و بە خەڵاتێکی گەورەی دەزانم و سوپاسیان دەکەم. ئەمە ڕێزلێنانە لە شیعر، ڕێزلێنانە لە قوربانیانی هەڵەبجە، کە ژان و تراجیدیای ئەوان چاوگەی هۆنراوەکەن.

هێشتا بە ڕەشنووسی ئەم کتێبەدا نەچووبوومەوە، تاوانی کوشتنی ژینا ئەمینی ئێران و دنیای هەژاند. لە ٢٦-١٠-٢٠٢٢ مامۆستا جەعفەر شێخولئیسلامی، شاعیر و پرۆفیسۆری زمانناسی لە زانکۆی کارلتن، کەنەدا، لە نامەیەکی دۆستانەیدا نووسیبووی:

*(مامۆستا ڕەفیق گیان، هەموو کاتت باش... دەزانی لاوکی هەڵەبجەکەی تۆ دیسان بووە بە وێردی زمان لە سەر گڵکۆی ژینا. ئەو ڕۆژی کە ناشتیان، ١٦ی سپتامبر، سەدان کەس لە خزم و دۆستانی ژینا گۆرانیەکەیان دەگوتەوە، پڕ بە گۆڕستانی ئایچی لە سەقز:*

*بە تەنیا جێی مەهێڵن، ئەمشەو زریان دەیچێنێت*
*تەم و مژ دایدەپۆشێت، مانگەشەو دەیڕفێنێت...*

*ئەمڕۆ ڕۆژی چلەی کوشتنی ژینا بوو. هێزەکانی ئێران ڕێگایان نەدا کە خەڵک بە سەر جادەدا و بە سەیارە بچنە سەر گۆڕی ژینا. ئەوانیش، بە گەورە و بچووکەوە، دەست و پایان لێهەڵماڵی و ٨ کیلۆمەتر بە پێ ڕۆشتن، هەتا چوونە سەر گۆڕی ژینا. هەزاران کەس دەبوون. دیسان تێیان هەڵکرد: بە تەنیا جێی مەهێڵن ... نەمدەزانی ئاگاداری یان نا. گوتم، با بزانی شوێن پەنجەت چەند*

*دیارە. هیوام سلامەتیتە. -جەعفەر)*

ئەو کاتانەی هۆنراوەی لاوکی هەڵەبجەم نووسی، لە ڕووی شوێنی ژیانەوە ناجێگیر بووم. لە ڕووی هزری و سیاسییەوە لە گوماندا دەژیام، دڵنیا نەبووم بە ڕێگایەکی دروستدا دەڕۆم. لە ڕەوشی نووسینی قەسیدەکەدا، گومانە سیاسی و هزرییەکانم زیاتر بوون، لە ڕووی ڕەوانییەوە نائارام بووم. هەروا کارەساتی هەڵەبجە و ئەنفال خەمبار و بێتاقەتیان کردبووم، لەوە دەترسام کارەساتی تری لەو جۆرە و خراپتری بەدوادا بێت. لە دواکۆپلەی لاوکی هەڵەبجەدا بە پێداگرییەوە ئەو ترسە دووپات کراوەتەوە:

بنوو کۆرپە شیرینەکەم!<br>
چیتر دەنگی دەستڕێژ و فڕۆکە نایەت<br>
بنوو ڕۆحە شەکەتەکەم!<br>
بۆنی گاز و خوێن و جانەوەران نایەت.<br>
بنوو بە خاک، بەڕووتێتیم<br>
بە مەرگی خۆم و تینووێتیم داتدەپۆشم<br>
ئەم سووتانە سەرەتایە.<br>
بنوو بە پەلکە زێڕینە<br>
بە نێرگز و جەمەدانێ و لاوکەسوورە و<br>
بە ئامێزی داگیرساوم داتدەپۆشم<br>
ئەم تاوانە دوایی نایە<br>
بنوو کۆرپە لاسارەکەم<br>
ئەم تاوانە سەرەتایە!.

*

پاش تەواوکردنی خوێندن لە بولگارستان، لە ماوەی دوو ساڵدا لە چەند وڵات (جۆرجیا، ئەفغانستان، سووریا) ژیام. نەمدەزانی دوای سووریا بۆ کوێ دەچم، یان لە کوێ دەگیرسێمەوە. ئەو ژیانە قەرەجییانە بێتاقەتی کردبووم. ئەگەر بە تەنیا بوومایە، ئاسان بوو. بەڵام هەموو جارێک دەبوو داوەتنامەی تایبەتی بۆ ئێکا بنێرم، بۆ ئەوەی مۆڵەتی سەفەرکردنی پێ بدەن. ئەویش بە فڕۆکە بچێتە مۆسکۆ، کە سێ سەعات لە باتومییەوە دوورە، بۆ ئەوەی ڤیزا وەربگرێت. لەوانەش ناخۆشتر ئەوەبوو نەمدەتوانی بلیتی فڕۆکەی بۆ بکڕم. دەبوو دایکوباوکی ئێکا، کە مامۆستا بوون، مشووری بلیتی چوون و گەڕانەوەی بۆ بخۆن.

ئەو دوو ساڵەی لە ئەفغانستان و سووریا بووم، زۆر هەژارانە ژیام، ئەو (٣٥) دۆلارەی مانگانە من و ئێکا وەکوو دەرماڵە وەرمان دەگرت و دەبوو پێی بژین، لە دۆخی ئاساییدا بەشی کڕینی کتێب، گۆڤار و ڕۆژنامەی نەدەکرد. لەوێ نە دەستم بە براکانم و خوشکم دەگەیشت تا کۆمەکم بکەن، نە لە ڕووم دەهات داوا بکەم دەرماڵەکەمان زیاد بکەن. بەو نەدارییەوە، بێدەنگ، بێ بۆڵە و گرفت، بە هیوایەکی گەورەوە لەگەڵ ئێکا دەژیاین. دیارە کەس ناتوانێت تا سەر بەو جۆرە گوزەران بکات، بەڵام پێمانوابوو ئەوە کاتییە، تێ دەپەڕێت و لە جێیەک دەگیرسێینەوە، بە تایبەت کە من دەمەویست خۆم بۆ نووسین و کاری ڕۆشنبیری تەرخان بکەم. دەبێت بڵێم هەموومان هێندە هەژارانە نەدەژیاین، چەند سەرکردە و دەستوپێوەندیان، کە لە سووریا بوون، لە هیچیان کەم نەبوو.

تا بەهاری ١٩٨٩ سەدان کادیر و پێشمەرگەی حزبی شیوعی، لە کوردستان و کامپەکانی ئێران و تورکیاوە گەیشتبوونە سووریا. خەمبار، شەکەت و بێکار، لەوێ گیرسابوونەوە. چەندانیان ناساخ

بــوون و پێویســتیان بە چارەســەری پزیشــکی و دەرمــان بــوو. چەندانی تریان لە ڕووی میزاج و دەروونییەوە بێتاقەت، یان تووڕە و بێزار بـوون. هەرچەنـد ئەوان، وەکـوو زۆربەمـان، زۆر هەژارانە دەژیـان، بەڵام هێشــتا وا دادەنــدرا کە بـارگرانیی ئابووریـیـان بـۆ حزبی شیوعی زیاد کردووە. چونکە ژیانی شار، وەکوو ژیانی شاخ و پێشمەرگایەتی نییە، شار پێداویستیی جۆراوجۆری خۆی هەیە.

بزاڤی چەکداری کۆتایی هاتبوو، مـانەوەی ئەو هەمـوو هاوڕێیانە لە دیمەشق، مانـای نەبوو، بۆیە بڕیار درا، بۆ ئەورووپای ڕۆژئاوا بەڕێ بکرێن و لەوێ وەکوو پەنابەر بژین.

لە سەرەتای حوزەیرانی ١٩٨٩ منیش وێنەی سەدان هاوڕێی تر، کە بۆ کاری حزبی، یـان حەوانەوە لە سووریا بوون، خۆم ئامـادە کـرد پەنـا بـۆ سـوێد بەرم. وەکـوو زۆربەی هاوڕێیـان بە ڕێگـای مۆسکۆدا نەچووم، بەڵکو ڕێگای پۆلۆنیام هەڵبژارد. هاوڕێیـان تەنیا ٨٠٠ دۆلاریان بۆ بلیتی فرۆکە و خەرجیی ڕێگا و قاچاخچی پێدام، هەروا هەندێک پارەم بە قەرز لە هـاوڕێیەک وەرگرت، کە دواتر لە سـوێد دامەوە. ئێکـا، کە ئەو کـاتە دووگیـان بـوو، گەڕایەوە بـۆ جۆرجیا. منیش چوومە وارشۆ. بڕیار بوو لەوێ کەریم حیسـامی و فەهـد گردەوانـی ببینـم، کە لە سـوێدەوە بە ئۆتۆمبێل دەهـاتن بـۆ وارشـۆ، بۆ ئەوەی شلێر خـانی کچی حیسامی بەرن بۆ سوێد. لە وارشــۆ هەموومــان یەکمــان گــرتەوە. کــاک فەهــد، لە ڕێــگەی بــرادەرێکییەوە، کە لە وارشـۆ دەیخوێنـد، قاچـاخچیی دۆزیـیەوە. چـووینە شـارۆچکەیەکی بـاکووری ڕۆژئـاوای پۆلۆنیـا، کە لەسـەر دەریـا بـوو. هەنـدێک پارەمـان دا بە قاچـاخچییەکە و تـا شـوێنی کۆنترۆڵی کەشتییەکە لەگەڵمان هـات، لە کۆنترۆڵ ئاودیوی کردین و دابەزی. شــەوەکەی لەنــاو کەشــتییەکە، بیــرە و ڤۆدکامــان

خواردەوە. بەیانییەکەی گەیشتینە شاری یستاد، کە لە باشووری سوێدە.

ئەو کەسەی لە زێدی خۆی هەڵکەندرا، ڕەنگە نەتوانێت لە شوێنێکی دی، یان تەنانەت لە وڵاتی خۆشیدا، بە ئاسانی بڕوێتەوە.

من لە چەندان وڵاتدا بۆ خوێندن، کار و حەوانەوە ژیام. بە کولتووری جیاواز ئاشنا بووم. سەرچاوەی خوێندنەوە و فێربوونم فرەڕەنگ و زمانی نووسین و ئەوینم جۆراوجۆر بوون. لەو پەرتەوازەبوونەدا بەشی خۆم سوودم وەرگرت و شادیم بینی. هەروا وەک (هۆڵدرین) دەڵێت (لە خاکی بیانیاندا بە ژان ئاشنا بووم و لە زمانیش کەوتم). ژیانی قەرەجییانەی ئەو ساڵانەم چیرۆکی مرۆڤێکی ژیاندۆستی بێ وڵات بوو! مرۆڤێک کە ئازادی ئامانجی، باوەڕ و ئەوین سەرمایەی، زمانەکەی وڵاتی بوو.

دوای یازدە ساڵ دەربەدەری، گەڕان بە گوند و کێو و دەشتدا، خوێندن، کارکردن و سووڕانەوە لە شاران و وڵاتاندا، گەیشتمە سوێد. کاتێک لە کەشتییەکە دابەزیم و پێم خستە سەر خاکی ئەو وڵاتە، یەکەم شت بە بیرمدا هات ئەوە بوو کە، تا ئەو ڕۆژەی دەتوانم ئازادانە لە زێدی خۆم بژیم، ئێرە وڵاتمە. سەرەنجام لێرە ماڵێکمان دەبێت، کە میهرەبانانە لە ئامێزی خۆیمان دەگرێت و دەمانپارێزێت. ماڵێک، وەکوو مارک توین دەڵێت، دڵ و ڕۆح و چاوی دەبێت تا بمانبینێت، تێمان بگات، هاودەرد و هاوسۆزمان بێت. ماڵێک دەبێتە بەشێک لە ئێمە و جێی متمانەی ئەو دەبین، لە سایەی چاکە، ئاسوودەیی و بەخشندەیی ئەودا دەژین.

١

## جێگیربوون له سوید

له شـاری یسـتاد لەگەڵ چەنـد پەنـابەری کـورد و بیـانی، له خـانوویەکی گەورە، نـزیکەی دوو مانـگ مـامەوە. له ٢٦ حـوزەیران (جونی) بیستم شاری قەڵادزێ، له لایەن دەوڵەتی عێراقەوە، وێران کرا. ئەو هەواڵە زۆر خەمبار و نیگەرانی کردم. هەستم کرد لەگەڵ کوشتنی قەڵادزێ، منداڵیی من و تەواوی یادگارییەکانی سـەردەمی منـداڵی و سـەرەتای لاوێتیی منیـان کوشـت. بەڵام بەوە دڵـی خـۆم دەدایەوە، که خەڵـکەکەی سـەلامەتن، وەکـوو خەڵکـی هەڵەبـجە و گەرمیان کۆمەڵکوژ نەکراون.

لەو مـاوەیەدا وەکـوو هەر کەسـێک، که پەنـا بـۆ سـوید دێنێـت، لێکۆڵینەوەیـان لەگەڵ کـردم. دوای ئەوە لەگەڵ کـوڕێکی کـوردی بـاکووری کوردسـتان، که نـاوی ئەسـڵان بـوو، ڕەوانەی کـامپێکی پەنابەرانیـان کـردین له کرامفـۆرش، له بـاکووری سـوید، که ١١٠٠ کیلـۆمەتر له یسـتادەوە دوورە. دوو مانـگ زیـاتر لەو کـامپە لەگەڵ ئەسڵان، له خانوویەکی بچووکی دوو ژووریدا بووین.

ئەسـڵان هەشـت سـاڵێک له مـن گەنجتـر بـوو. کـوڕێکی ئیشـکەر، دڵپاک و سادە بوو، سـەری له سیاسـەت دەرنەدەکرد، زۆر پێکەوە گونجـا بـووین. برادەرێکـی سوێدنشـینی بـۆی بـاس کردبـوو که

دەرفەتی کار لە سوێد زۆرە، هانی دابوو بێتە سوێد. ئەسلان مافی مانەوەی لە سوێد پێ نەدرا، ماوەیەک بە نهێنی لە ماڵی خێزانێکی سوێدی مایەوە، لە کێڵگەکەیان، بە نانەسک کاری بۆ کردن.

من لە ماوەی سێ مانگدا، بە پەنابەری سیاسی وەرگیرام. پێشنیاریان پێ کردم بچم بۆ شارێکی لاچەپی بچووک، بۆڵنێس، لە باکووری سوێد، لەوێ بژیم. من دەمەویست لە ستۆکهۆڵم نیشتەجێ بم، بەڵام خانوو دەست نەدەکەوت، دەبوو زۆر چاوەڕێ بکەم، بۆیە پێشنیارەکەم قبووڵ کرد، چونکە لە کامپی پەنابەران وەڕس بووم. هەروا بۆ ئەوەی دەست بە کاروباری هاتنی ئێکا بۆ سوێد بکەم، دەبوو لە شارێک جێگیربم و لەرێگەی کۆمۆنی شارەکەوە، کاروباری هاتنەکەی بۆ سوێد دەست پێ بکەم. بە نیازبووم لەو شارە لاچەپە لەگەڵ ئێکا کۆرسی فێربوونی زمانی سوێدی تەواو بکەین، دواتر بگوازینەوە بۆ ستۆکهۆڵم. لە بۆڵنێس شوقە (ئەپارتمان)ێکی دوو ژووریی و پارەی کڕینی کەلوپەلی ناوماڵیان پێ دام.

ڕۆژێک ئەسلان سەردانی کردم، نەیدەزانی چی بکات، چونکە بە ناقانوونی مابۆوە و دەبوو بینێرنەوە بۆ تورکیا. پێم وت باشترە بچی بۆ نەرویج، کە لەسەر سنووری سوێد خەڵکیان کۆنترۆل نەدەکرد. مۆڵەتی شۆفێریی عێراقییم پێ بوو، زۆر بە ئاسانی ناوەکەی خۆم گۆڕی بە تۆفیق و دام بە ئەسلان، پێموت لەوڕۆوە ناوت تۆفیقە و ئەسلان لە بیر خۆت بەرەوە. دوای ئەوە برادەرەکەی بردی بۆ نەرویج، لەوێ بە ئاسانی مۆڵەتی نیشتەجێبوونیان پێ دا.

لە ناوەڕاستی دیسەمبەری ١٩٨٩ ئێکا لە جۆرجیا تووشی خوێنبەربوون بوو. کچەکەمان، کە نەبووبوو بە هەشت مانگ، بە

نه‌شته‌رگه‌ری له سکی ده‌رهێندرا. ته‌نیا شه‌ش ڕۆژ له ئینکوباتۆردا ژیا و جوانه‌مه‌رگ بوو. له‌وێوه‌ داوه‌تنامه‌یان بۆ ناردم و به‌ په‌له‌ چووم بۆ تبیلیسی.

ئه‌و کاته‌ یه‌کێتیی سۆڤیه‌ت له‌ لێواری داڕماندا بوو. گرانی، ئاژاوه‌ و نه‌بوونی که‌لوپه‌ل و خزمه‌تگوزاریی خه‌ڵکیان هه‌راسان کردبوو. جاران جۆرجیا به‌ یه‌کێک له‌ کۆماره‌ ده‌وڵه‌مه‌نده‌کانی یه‌کێتیی سۆڤیه‌ت ناسرابوو. خه‌ڵکه‌که‌ی دارا و میواندۆست بوون. که‌چی ئه‌م جاره‌ هه‌ژاری و نه‌داری به‌زۆرینه‌وه‌ دیاربوو.

له‌ ته‌مووزی ١٩٩٠ ئێکا هات بۆ سوێد، ئه‌ویش ده‌ستی به‌ خوێندنی زمانی سوێدی کرد. دوای چه‌ند مانگێک هاوڕێم ناسر حه‌فید، شوقه‌ (ئاپارتمان)ێکی له‌ شاری ئوپسالا، که‌ ٦٥ کیلۆمه‌تر له‌ ستۆکهۆڵمه‌وه‌ دووره‌، بۆ په‌یدا کردین. ئوپسالا شارێکی جوان و ئه‌کادیمیی سوێده‌، ئه‌وێمان به‌ شوێنێکی گونجاو زانی. هه‌روا به‌ خۆشیی برایانی حه‌فید، شێخ مه‌نسوور، شێخ ناسر و شێخ محه‌مه‌د، که‌ له‌و شاره‌ ده‌ژیان، له‌وێ نیشته‌جێ بووین.

له‌ سوێد ده‌رفه‌تم بۆ ڕه‌خسا، زیاتر خۆم بۆ نووسین و کاری ڕووناکبیری ته‌رخان بکه‌م. له‌ ماوه‌یه‌کی کورتدا، به‌ کۆمه‌کی ده‌زگای کولتووریی سوێد، چه‌ند به‌رهه‌مم چاپ کرد، کۆمه‌ڵه‌هۆنراوه‌ی کاروانسه‌را، له‌گه‌ڵ چاپکردنه‌وه‌ی وه‌رزی سه‌هۆڵبه‌ندان ١٩٩٠، به‌ره‌و مێژوو، کورته‌باسێکی فیکری-مێژوویی ١٩٩١. سه‌ره‌تای ساڵی ١٩٩١ ده‌ستم به‌ نووسینی قه‌سیده‌یه‌کی درێژ کرد، به‌شی یه‌که‌میم ته‌واو کرد و ڕاپه‌ڕینی گه‌لی کوردستان ده‌ستی پێ کرد و کاره‌ساتی کۆڕه‌وی به‌دوادا هات. دوای چه‌ند هه‌فته‌یه‌ک ده‌ستم به‌ نووسینی قه‌سیده‌که‌ کرده‌وه‌، به‌ڵام له‌ ڕه‌وشی نووسیندا شیعره‌که‌ به‌ره‌و دنیایه‌کی تر، دنیای ڕاپه‌ڕین و

تراجیدیای کۆڕەوی بردم. قەسیدەکە (وەرزە بەردینە) ساڵی ۱۹۹۲ وەکوو نامیلکەیەک، بە کۆمەڵێک نیگاری ڕەنگاوڕەنگی هونەرمەند مامۆستا لالە عەبدە، لە ئەڵمانیا وەکوو بڵاوکراوەی پەڕەنگ، چاپ کرا. ساڵی دواتر بەرگی یەکەمی دیوانی ڕەفیق سابیر (۱۹۷۰-۱۹۹۰) کە چوار کۆمەڵەهۆنراوە و دوو قەسیدەی درێژی بەخۆ گرتبوو، لە سوێد، بڵاو کرایەوە. لە هەمان کاتدا، سەرەتای ساڵی ۱۹۹۱ لەگەڵ هاوڕێیانم کەمال میراودەلی، هاشم کۆچانی و کاروان عەبدوڵلا، بڕیارمان دا گۆڤارێکی کولتووریی گشتی دەربکەین، کە بۆ باس و لێکۆڵینەوە و بابەتی کولتووری، هزری و ئەدەبی تەرخان کرابوو. کاتێک ژمارەی یەکەممان بۆ چاپ ئامادە کرد، ڕاپەڕینی بەهاری ۱۹۹۱ دەستی پێ کرد، ناوی (ڕابوون)مان بۆ گۆڤارەکە هەڵبژارد. فریا کەوتین وتارێک بە ناوی (ڕاپەڕین... کارەسات... قۆناخێکی نوێ) بنووسین و بڵاوی بکەینەوە. لە سەروتاری یەکەم ژمارەدا (بەرەو ئازادی) ڕێباز و ئامانجی گۆڤارەکە، باس کراوە:

(ئەم گۆڤارە دەنگێکی سەربەخۆی ئازادە، بەو ئامانجە دەردەچێ تا لەسەر زەمینەی باوەڕبوون بە ئازادیی بیر و بۆچوون و دەربڕین و ئاخاوتن و، ڕێزگرتن لە بیروڕای لە خۆمان جیاواز، لە ڕوانگەی زانستییانە و نوێخوازانەوە بۆ ژیانی هزری و کولتووری و ئەدەبی و سیاسیی نەتەوەکەمان بڕوانێ و وەکوو سەکۆیەکی ئازاد، ئامێز بۆ هەر نووسینێکی داهێنەرانە و بیر و بۆچوونێک بگرێتەوە کە داکۆکی لە ڕاستی، ئازادی، دیموکراتی، دادپەروەریی کۆمەڵایەتی و سەربەخۆیی نیشتمانە داگیرکراوەکەمان بکات... ئێمە باوەڕمان بە ئازادیی تاکەکەس هەیە... بە ئازادیی ژن لە بڕیاردانی ڕێباز و شێوەی ژیان و پاشەڕۆژی خۆی، بە ئازادی بێبەربەست

(موتله‌ق)ی نووسین و ده‌ربڕین و ئاخاوتن و بیروڕا ئاڵوگۆڕکردن، به ئـازادیی بیـر و بۆچـوونی ئـاینی و مه‌زهه‌بـی.. به ئـازادیی هه‌ڵبژاردنـی شـێوه‌ی ژیـان.. ئازادیی ڕێکخسـتن و کـارکردن... ئه‌و ئازادییـانه نـاکرێ به هه‌ر بیانوویه‌ک بێ، ته‌جمید بکرێن، یـان دوا بخرێن. به‌ڵکو خه‌بـاتکردن بۆ ئازادیی نه‌ته‌وه‌یی و کۆمه‌لایه‌تی و نیشتمانی، ته‌نیا به‌و هێز و وزه مه‌زنـانه دێته دی که ئه‌م ئازادییه تاکه که‌سیانه و کۆمه‌ڵییانه به‌ڕه‌ڵای ده‌که‌ن. له‌و باوه‌ڕه‌شداین چه‌ند هۆشیاری و ئاسـتی کولتـووریی مرۆڤه‌کـانی کوردسـتان به‌رز و به‌رزتـر بـێ، ڕۆڵـی ئه‌م ئـازادییه تـاکه که‌سـییانه له گه‌شـه‌پێدانی کۆمه‌ڵی کوردستاندا کاریگه‌رتر ده‌بێت.)

ڕابوون تا سه‌ره‌تای ساڵی ٢٠٠١ به‌رده‌وام بـوو، له‌و ده سـاڵه‌دا ٣٠ ژماره‌ی لێ بڵاو کرایه‌وه.

دوای نیشـته‌جێبوونم له سـوێد، دنیـا به‌خێرایـی ڕووی له گـۆڕان کـرد. دوو ڕووداوی گـه‌وره‌ی نـاوچه‌یی و جیهـانی، دنیایـان هه‌ژانـد. یه‌که‌میـان له ٢ی ئـابی١٩٩٠ سـوپای عێـراق کـوه‌یتی داگیـر کـرد. ئه‌مریکـا هاوپه‌یمـانییه‌کی نێـوده‌وڵه‌تیی له دژی عێـراق پێـک هێنـا، شه‌ڕی که‌نداو هه‌ڵگیرسا. له‌شکری عێراق له کوه‌یت تێک شکێندرا و عێراق ئاڵای سپی له به‌رانبه‌ر ئه‌مریکا هه‌ڵبڕی.

له ئـاداری ١٩٩١ ڕاپه‌ڕینـی گه‌لـی شـیعه‌ی باشـووری عێـراق و گه‌لی کوردستان، ده‌ستیان پێ کرد. سوپای به‌زیوی عێراق دڕندانه ڕاپه‌ڕینـی خه‌ڵکـی شـیعه‌ی سـه‌رکوت کـرد و هه‌زاران که‌سـی لـێ کوشـتن. هه‌روا په‌لامـاری کوردسـتانی دا و کاره‌سـاتی کـۆڕه‌وی میلیـۆنیی به‌دوادا هـات، که هه‌مـوو دنیـای هه‌ژانـد. له ئه‌نجامـدا ئه‌نجوومه‌نی ئاسایشی نه‌ته‌وه یه‌کگرتووه‌کان، ڕۆژی ٥ی نیسـانی ١٩٩١ بۆ پارێزگاریی گه‌لی کوردستان له سته‌می ده‌وڵه‌تی عێراق،

بە بڕیاری ژ. ٦٨٨ ناوچەی دژەفڕینی لە باکووری عێراق دروست کرد. بە کۆمەکی ئەمریکا و وڵاتانی هاوپەیمان، ئیدارەی هەرێمی کوردستان پێک هات، پەرلەمان و حکومەتی هەرێم دامەزرێندران. ئەو دەستکەوتە لە بنەڕەتدا بەرهەمی ڕاپەڕینی خەڵکی کوردستان و ئەنجامی کۆمەکی وڵاتانی ڕۆژئاوایە، چونکە دوای ڕێککەوتنی عێراق و ئێران و شاڵاوی ئەنفال، بزاڤی چەکداری تێک شکابوو، بەرەی کوردستانی وەکوو قەوارەیەکی فەلەج و بێ ناوەرۆکی لێ هاتبوو. نوێنەرانی لە بەر دەرگای سەفارەتخانەکان دەوەستان، بە ئاواتەوە بوون فەرمانبەرێک قسەیان لەگەڵ بکات.

ڕووداوی دووەمیان ئەوە بوو سیستەمی سۆشیالیستی، کە لەسەر بنچینەی هزری مارکسی- لینینی، لە یەکێتیی سۆڤیەت و چەند وڵاتی ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا دامەزرێندرابوو، هەرەسی هێنا. یەکێتیی سۆڤیەت، هەڵوەشایەوە، لە جێی ئەو وڵاتە، کە ناوی (یەکێتیی کۆمارە سۆشیالیستەکانی سۆڤیەت) بوو، ١٥ دەوڵەتی سەربەخۆ، دروست بوون. بە هەمان شێوە یۆگۆسلاڤیا بوو بە حەوت دەوڵەت و دەوڵەتۆکە، بە زەبری خوێن و کۆمەڵکوژی، سنووری نێوان نەتەوەکانی یۆگۆسلاڤیای هەڵوەشاوە، دیاری کران. کەچی نەتەوەی چیک و سلۆڤاک، بە بێ کێشە و ئاشتییانە، لێک جیابوونەوە و بوون بە دوو دەوڵەتی سەربەخۆ. بەو جۆرە جارێکی تر نەخشەی دنیا گۆڕدرا، نزیکەی ٢٥ دەوڵەتی نوێ لە ئەورووپا و ئاسیا دروست بوون. تا ئەو کاتە دنیا دوو جەمسەر بوو، جەمسەری کاپیتالیستیی ڕۆژئاوا، کە ئەمریکا ڕابەرایەتیی دەکرد، جەمسەری سۆشیالیستی، کە یەکێتیی سۆڤییەت سەرکردەی بوو. زۆربەی کێشە، شەڕ و ناکۆکییەکانی جیهان، ڕاستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ، ئەنجامی کێشەی نێوان ئەو دوو

زلهێــزه بــوون. دوای ئەو ڕووداوه، دنیــا گــۆڕدرا و بــوو به یەکجەمسەری، ئەمریکا بوو به تاکه ئاغای دنیا.

ڕووداوی مەزن و شکســت، مــرۆڤ بەرەو ڕامــان و پرســیاری گەوره دەبەن. شکســتی بزاڤــی چەکداری و هەرەســهێنانی بلــۆکی سۆشیالیستی، کاردانەوەیان لەناو ڕێکخستنەکانی حزبی شیوعیی عێراقــدا هەبــوو. پــێش ڕاپەڕیــن، لەنــاو ئەنــدام و کــادیره کوردســتانییەکانی حزبــی شــیوعیی عێــراق، له نــاوەوه و دەرەوەی وڵات، کۆمەڵێک پرسیار و هزری نوێی جۆراوجۆر دەرکەوتبوون، که پێوەندییان به سروشــتی کێشــەی نێوان عێراق و کوردســتان، پــرس و داهــاتووی گەلــی باشــووری کوردســتان، ڕۆڵــی چەپ و کۆمۆنیستەکانی کوردستانەوه هەبوون. هەروا خەباتی چەکداری و مەسەلەی حزبی سەرانســەری (مۆدێلی حزبی شیوعی) له وڵاتــانی فــرەنەتەوه و فرەنیشــتمانی وەکــوو عێــراق و ئێــران و تورکیــا و ســووریا، خــرایه ژێــر پرســیار. ئایــا ئەو حزبــانه توانیویــانه له وڵاتەکانیــان، به یەک ئەنــدازه داکــۆکی له بەرژەوەنــدیی گەلــی سەردەســتی خۆیــان و گەلــی بندەســتی کــورد و گەلانــی تــری ئەو وڵاتانه بکەن؟ ئەوان له ناوەڕۆکدا حزبی گەلی سەردەست بوون، چونکه بەرژەوەندیی گەلەکانیان پێش بەرژەوەندیی گەلی بندەست (کورد) خستووه. ئەمه بەشێکه له سروشتی (گشت و بەش). حزبی سەرانســەری، لەو وڵاتــانەی کوردســتانیان بەســەردا دابەش کــراوه، ناتوانێــت لەپێنــاوی بەش (گەلــی کــورد) که بندەســته، قوربــانی به گشــت (گەلــی عەرەب، یــان تــورک، یــاخود فــارس) بــدات، که سەردەسته.

لەو وڵاتانەدا، کۆمەڵێک بەرژەوەندی و ئامــانجی هــاوبەش، گەلــی کوردســتان و ئەو گەلانه کــۆ دەکــاتەوه، لەوانه پرســی دیمــوکراتی،

پێشـکەوتنی ئـابووری، کـۆمەڵایەتی و ئـاوەدانی... بەڵام چەنـدان ئامانج و بەرژەوەندیی جیاوازیشیان هەیە. لەوانە پرسـی شوناسـی نەتەوەیـی، چەسـپاندنی مـافی یەکسـانبوونی نەتەوەیـی، خۆبەڕێـوەبردن، خوێنـدن بە زمـانی زگمـاک و زۆر مـافی تـری نەتەوەیـی، کە بـۆ گەلـی کوردسـتان گرینـگ و چارەنووسسـازن، کەچـی بـۆ ئەو گەلە سەردەسـتانە مـافی سروشـتین و لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەتەکانیاندا بە دەستیان هێناون.

جیاوازیی ئامانج و بەرژەوەندی، دەخوازێت بە ئامراز و ڕێگای جیـاواز، کاریـان بـۆ بکرێـت و بەدەسـت بهێنـدرێن. ڕێکخراوێکـی سەرانسەری لەو وڵاتـانەدا، ئەگەر کۆمۆنیستی، یان لیبرال، یاخود ئیسـلامی بێـت، ناتوانێـت بە هەمـان ئەنـدازە نـوێنەری ئامـانج و بەرژەوەندیی دوو گەلی سەردەست و بندەست بێت. بۆیە پێویستە مارکسی و چەپ و لیبرالی عەرەب و کورد لە عێراقدا، ڕێکخراوی تـایبەت و سـەربەخۆیان هەبێـت و وابەسـتەی هـیچ حـزب و ڕێکخراوێکـی سەرانسـەری و دەرەکـی نەبـن، چـونکە دەبـن بە پاشکۆی ئەوان. بۆچی شیوعییەکانی کوردستان پاشکۆی حزبێکی سەرانسـەریی عێراقی بن، کە لە ناوەرۆکدا حزبێکی عەرەبییە. لە پرۆگرامـی حـزبەکە و ڕاگەیاندنەکانیـدا، بە ڕێکخـراوی هەرێمـی کوردستانیشەوە، خۆی بە بەشێک لە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی عەرەبی دەزانێت و بەو شێوەیەش کار و ڕەفتار دەکات. ئەم دیدە نەتەوەییە بۆ بەشـە عەرەبییەکەی حزبی شیوعی دروستە، کەچی بۆ بەشە کوردستانییەکەی هەڵە و بێمانایە. چونکە کورد ناتوانێت بەشـێک بێـت لە بـزووتنەوەی ڕزگـاریخوازیی عەرەب، کە مـافی بڕیـاردانی چارەنووسـی گەلـی کـورد، بە ڕەوا نازانێت. کەچـی لە بەرانبەر ئەوەدا سەرکردایەتیی حزبی شیوعیی عێراق، ڕێکخراوی

هەرێمی کوردستانی حزبەکەی، کە ئەندامی بەرەی کوردستانی بوو، بە بەشێک لە بزاڤی ڕزگاریخوازیی گەلی کوردستان دانەدەنا!.

حزبی شیوعی عێراق، لەچاو حزبی کۆمۆنیستی تورکی و سووری و حزبی تودەی ئێران، هەڵوێستێکی ڕوونی لەبارەی پرسی کورد لە عێراقدا هەبوو، لە پرۆگرامی حزبەکەدا مافی بڕیاردانی چارەنووسی گەلی کورد بڕیار درابوو. بەڵام سەرکردایەتیی حزبەکە، دامەزراندنی ڕێکخراوێکی سەربەخۆی بە شیوعییە کوردستانییەکان ڕەوا نەدەبینی، تا ئازادانە بۆ مافی گەلی کوردستان کار بکات. حزبە کۆمۆنیستەکانی تری ناوچەکە، گەلی کورد و پرسی کوردیان تەواو فەرامۆش کردبوو. تەنانەت حزبی شیوعی تورکیا و سووریا، لە پرۆگرامی سیاسیی خۆیاندا، دانیان بە هەبوونی کورد و نەتەوەی تری وڵاتەکانیاندا نە نابوو. ڕۆماننوسی ناوداری سووری، حەنا مینە ١٩٢٤-٢٠٢١ کە هەندێک بە ماکسیم گۆرکی عەرەبیان دادەنا، لەڕۆمانی (الفم الكرزي- زاری گێلاسی) زۆر بەڕوونی باسی ئەم مەسەلەیە دەکات. لە ڕۆمانەکەدا، کە ساڵی ١٩٧٧ نووسراوە، کچێکی ئەرمەن (بیرانیک) کە لە سوریا دەژی، لەگەڵ کوڕێکی عەرەبی سووری (جەواد) یەکتریان خۆش دەوێت. کچەکە مامۆستای وەرزشە و کوڕەکە، کە ئەندامی حزبی شیوعییە، لە قوتابخانەیەک، کە حزبەکەی دروستی کردووە، مامۆستای زمانی فەڕەنسییە. جەواد پێداگری دەکات کە حزبی شیوعی سووری، حزبێکی عەرەبییە و ئەرمەنەکانی سووریاش وەکوو عەرەب حیساب دەکرێن.[1] واتا دەتوانن ئەندامی ئەو حزبە بن. ئەمەش وەکوو چاکە و دڵفراوانی، بەرانبەر بە ئەرمەنەکان، وتراوە!. ئاشکراشە حزبەکە هەمان هەڵوێستی

1- حنا مينه، الفم الكرزي، دار الاداب بيروت، ١٩٧٧ص٣٤-٣٧

بەرانبەر کوردی سووریاش هەبوو. کەچی کورد پەنابەری ئەو وڵاتانە نییە، خاک و نیشتمانی خۆی هەیە و لەسەری دەژی. ئەو دەوڵەتانەی کوردستانیان پێوە لکێندراوە، هەر دەوڵەتی فرەنەتەوەیی نین، بەڵکو دەوڵەتی فرەنیشتمانیشن. کەچی چەپ و ئازادیخوازانی ئەو نەتەوە سەردەستانە، ئەو ڕاستییە باس ناکەن.

ئەو جۆرە هزر و بۆچوونە جیاوازانەی لە ڕێکخراوەکانی حزبی شیوعیدا باس دەکران، ڕوونتر و فراوانتر بوون. چەند باس و وتاری هزری و سیاسیی لەو بارەیەوە نووسران. لەوانە بەندە لە ئاداری ١٩٩٠ تا ئەیلولی ١٩٩٠ زنجیرەیەک باس و وتارم لەبارەی ئەو پرسانە و چەند لایەنی کولتووری و مێژوویی کورد، لە ڕۆژنامەی سەردەمی نوێ- سوید، بڵاو کردەوە[1]. هەروا هاوڕێم هاشم کۆچانی و چەند هاوڕێی تر، باس و وتاریان لەو بارەیەوە نووسی.

هەرەسهێنانی یەکێتیی سۆڤییەت و بلۆکی سۆشیالیستی، گۆڕانێکی گەورەی بەسەر دنیادا هێنا، کە لەگەڵ خۆی، کەم تا زۆر، هەموومانی گۆڕی. ئایدیۆلۆجیای کۆمۆنیزم، لە عێراق و وڵاتانی فرەنەتەوەی تری ناوچەکە و جیهاندا، وەکوو داوی تەزبیح، کۆمۆنیستانی ئەو نەتەوانەی پێکەوە گرێ دابوو. دوای شکستی کۆمۆنیزم، داوەکە پسا. کۆمۆنیستانی هەر نەتەوەیەک ڕێگای تایبەتی خۆی گرت. بە کورتی سیستمی حوکمرانیی کۆمۆنیستانی سۆڤیەت و وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا، لە ماوەی دەیان ساڵدا، نەیانتوانی نموونەی دەوڵەتی پڕداد و خۆشگوزەران و ئازاد، پێشان بدەن، سەرەنجام ئەزموونەکە بە بنبەست گەیشت.

پاش ڕاپەڕین کێشەی نێوخۆی حزبی شیوعی عێراق زیاتر بوو،

---

1-بەشێکی ئەو نووسینانە لە کتێبی (بەرەو مێژوو) سوید، ١٩٩١ بڵاو کراونەوە.

له سوێد و کوردستان، کادیر و ئەندامان داوای گۆڕانکارییان دەکرد. حزبی شیوعی له یەکەم هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان، شکستی هێنا. دوای شەست ساڵ کار و یازده ساڵ خەباتی چەکداری و هەزاران شەهید، نەیتوانی بگاته پەرلەمانی کوردستان. دەرکەوت که ئەو حزبه له کوردستان، خەریکه ببێته قاوغێکی بەتاڵ. بۆیه داوا دەکرا ڕێکخراوی هەرێمی کورستانی حزبی شیوعی کۆنگره ببەستێت، بۆ ئەوەی کێشه و گرفته نێوخۆییەکان یەکلایی بکرێنەوە. له کوردستان ڕاپەڕین کراوە، هەرێمی کوردستان بەدەست گەلی کوردەوەیه، کەچی له پێڕەو و پرۆگرامی حزبی شیوعیدا، هیچ دەسەلاتێک به کۆمیتەی هەرێمی کوردستانی حزبی شیوعی نەدراوە، به نەبوو حیساب کراوە.[1]

له کۆتایی حوزەیرانی ١٩٩٢ بۆ یەکەم جار سەردانی کوردستانم کردەوە. له هەولێر لەگەڵ هاوڕێی هێژام ئەبو ئەحلام، ئەندامی پێشووی کۆمیتەی ناوەندیی حزبی شیوعیی عێراق، بۆ سەردانی هاوڕێ عەزیز محەمەد، چووین بۆ شەقڵاوە. لەوێ باسی دۆخی نوێی کوردستان و شکستی حیزب له هەڵبژاردن و ئەو کێشه فیکری و سیاسییانەمان کرد، که لەناو حیزبدا دروست بوو بوون و پێویست بوو چارەسەر بکرێن.

هاوڕێ عەزیز له ناخیدا، گیانی کوردایەتی، به مانا پرۆلیتارییەکەی، هەبوو. بەشێکی گرنگی بیر و بۆچوونی شێوعییه کوردستانییەکانی به دروست دەزانی. بۆیه داوام لێ کرد هەوڵی چارەسەری کێشه و ناکۆکییەکانی نێو حزب بدات، خۆی

---

1- بڕوانه پەیڕەوی ناوخۆی حزبی شیوعی عێراق، بەندی ١٣ که له ئایاری ١٩٨٨ بڕیاری لەسەر دراوە.

دەستپێشـــخەری گۆڕانکـــاری بێــت. هەروا پێشـــنیارم پــێ کــرد ڕێکخـراوی هەرێمـی کوردسـتان، لەگەڵ گـروپ و لایەنە چەپەکـانی کوردسـتان، حزبێکـی چەپـی ئـازادیخواز دابمەزرێـنن، کە بتوانێـت وەکوو هێزی سێیەم، پارسەنگ لەنێوان یەکێتیی و پارتیدا ڕابگرێت. چونکە کوردستان پێویستی بە هێزێکی سیاسیی لەو جۆرەیە. ئەو هێزە سیاسییە دەتوانێت هاوپەیمانی حزبی شیوعیی عیراق بێت. بەڵام هەستم کرد نەک هەر بە تەنگ ئەو مەسەلەیەوە نییە، بەڵکو دوای هەڵوەشـــاندنەوەی بلـــۆکی سۆسیالیســـتی و تێکشـــکانی حـزبەکەی لە هەڵبژاردنـی پەرلەمـان، هیـوای بە حزبـی شـیوعیش نەمـــابوو. بەلای زۆرەوە لەبەر ئەو هۆکـــارە، وازی لە ســـکرتێریی حزبەکەی هێنا، کە وەک قاوغێکی بێ ناوەرۆکی لێ هاتبوو.

سەرەتای سـاڵی ١٩٩٣ کۆنفرانسـی خۆئامـادەکردن بۆ کۆنگرەی ڕێکخراوی هەرێمی کوردستانی حزبی شیوعی، لە هەولێر بەسـترا. بە دەنگـدان نـوێنەران بـۆ کـۆنگرە دیـاری کـران، کە زۆرینەیـان شیوعییە کوردستانییەکان بوون. عەزیز محەمەد و کەریم ئەحمەد، ئەنجامەکەیان ڕەت کردەوە و کۆنفرانسەکەیان بەجێ هێشت. دواتر کادیر و ئەندامە کوردسـتانییەکان، بە زەبـری هەڕەشـە، لە بارەگـای حزب دەرپەڕیندران و ناچار کران جیا ببنەوە.

ڕاستییەکەی هیچ کام لەو جیابوونەوانەی لەنێو حزبی شیوعی و حـزبە کوردســـتانییەکان ڕوویـان دا، حەتمـی نەبـوون، دەتوانـدرا پێشـیان پێ بگیرێت. بەڵام هەڵپەی دەسـەلات، بیرتەنگیی سیاسـی، نەبـــوونی دیمـــوکراتی، خۆپەرســـتی و بەرژەوەنـــدیی تاکەکەســـی، هۆکاری سەرەکیی ئەو گرفت و جیابوونەوانە بوون.

دوای جیابوونەوەی شیوعییە کوردستانییەکان، یەکێتی و پـارتی، لە جاران زیاتر کۆمەک و پشتگیریی حزبی شیوعییان کرد. چونکە

له دوای کارەساتی پشتئاشانەوە، ئەو حزبە لاواز و بێ دەسەڵات کرابوو. ئەوان دەیانەویست وێنەی قاوغێکی بێ ناوەرۆک، یان توحفەیەک له مۆزەخانەی سیاسیی کوردستان بیهێڵنەوە. له هەمان کاتدا یەکێتی و پارتی، بە شێوازی جیاواز، پێوەندییان بە هاورێیانمانەوە کرد، بۆ ئەوەی بچنە ڕیزی ئەوان. هەر حزبەیان توانی چەندان کادیر و ئەندام ڕازی بکەن. دواتر هەردوو حزبەکە هەوڵیان دا زۆربەمان، یان بەشێکمان لەگەڵ ئەوان کار بکەین.

سەرەتای ساڵی ١٩٩٣ چەند هەفتەیەک پێش ئەوەی کاک کۆسرەت ڕەسووڵ، ببێتە سەرۆکوەزیری حکومەتی هەرێم، هاتە سوێد. لەگەڵ بەڕێزان هاورێم یوسف زۆزانی، سەلاحەدینی موهتەدی و ڕەوانشاد حەمە چاوشین سەردانیان کردم. کاک کۆسرەت منی جیا کردەوە و وتی:

مام جەلال ناردوومی بۆ لای تۆ، جەنابی و هەمووومان حەز دەکەین تۆ و هاورێکانت، لەگەڵ ئێمە هاوکار بن. من بۆ چەند ڕۆژ دەچم بۆ ئەمریکا، کە گەڕامەوە له جێگەی د.فوئاد مەعسووم، دەبم بە سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران. هەر وەزارەتێکت له بەشی یەکێتی دەوێت سەرپشک بە. هەروا له مەکتەبی سیاسی، سەرکردایەتی و کۆمیتەکاندا شوێنتان بۆ دیاری دەکرێت.

من سوپاسی مام جەلال و کاک کۆسرەتم کرد و وتم:

ئێمە ماوەیەکی کورتە، بە هۆی کۆمەڵێک کێشەی فیکری، ئایدیۆلۆجی و سیاسی، له حزبی شیوعی جیا بووینەتەوە و هێشتا بڕیاری چارەنووسی خۆمان نەداوە. ئەو هاورێیانە خەڵکی ڕووناکبیر و بەهەڵوێستن، من سەرۆک عەشیرەت نیم بە قسەیەک، ئەندامانی عەشیرەتەکە لەگەڵ خۆم بۆ ناو حزبێک بەرم.

کاک کۆسرەت وتی: مام جەلال تۆی مەبەستە.

وتم: من هاوین دێمەوە کوردستان، دەمەوێت لەوێ بژیم، تا ئەو کاتە ئێمە بڕیار دەدەین چی بکەین. جەنابت حکومەت پێک بهێنە و لە ئێستاوە پیرۆزباییتان لێ دەکەم و هیوادارم سەکەوتوو بن.

پێشتر مام جەلال، بە ڕێگای سەلاحەدینی موهتەدی، پەیامێکی لەو جۆرەی بۆ ناردبووم، دواتریش، پێش بەستنی کۆنگرەی پارتی کار، جارێکی تر هەمان پێشنیاری کاک کۆسرەتی بەخۆم وتەوە.

سەرەتای هاوینی ١٩٩٣ حزبی سۆشیالیست، حزبی گەل و پاسۆک، دەیانەویست بچنە ناو پارتی دیموکراتی کوردستان. سێ هاوڕێ، کە لەگەڵ ئێمە بوون و تازە چووبوونە ناو پارتی، سەرۆ قادر، شەماڵ حەوێزی و کاروان ئاکرەیی، لە هەولێر منیان بینی. پێیان وتم ئەگەر ئێمەش، وەکوو ئەو حزبانەی تر بچینە ناو پارتی، ئەوا پارتی ئامادەیە لە هەموو ڕوویەکەوە، وەکوو حزبەکانی تر، حیسابمان بۆ بکات. ئەو پێشنیارەشم ڕەتکردەوە.

من بڕیارم دابوو حزبایەتی نەکەم، خۆم بۆ نووسین و کاری ڕووناکبیریی تەرخان بکەم و ئازادانە بژیم. بەڵام حزبی شیوعی زۆربەی "گوناهی" جیابوونەوەکەی خستبووە ئەستۆی من. بە هیچ شێوەیەک ئامادە نەبووم، لە نیوەی ڕێگا و پێش ئەوەی ئەو هاوڕێیانە بڕیاری چارەنووسی خۆیان بدەن، بە جێیان بهێڵم، یان سەودا و مامەلە بەو پرسەوە بکەم، کە ئێمەی کۆ کردبۆوە. بۆیە چاوەڕێی کۆنگرەم دەکرد، کە لەوێ خۆیان سەرکردایەتی و پێڕەو و پرۆگرامی حزبەکە، دیاری بکەن. دوای ئەوە خۆیان کارەکانیان بەڕێوە دەبەن و بڕیاری چارەنووسی سیاسیی خۆیان دەدەن.

## ٢
## گەڕانەوە بۆ وڵات

لە سەرەتای حوزەیرانی ١٩٩٣ بۆ جاری دووەم چوومەوە کوردستان، بەو هیوایەی لەوێ بژیم و لە زانکۆ کار بکەم، هەروا گۆڤاری ڕابوون، لە کوردستانیش بڵاو بکەینەوە. لە هەولێر خانوویەکم بەکرێ گرت، ئەو هاوڕێیانەی لە هەولێر لە حزب جیا بووبوونەوە، لیژنەیەکیان بۆ ڕێکخستنی شیوعییە کوردستانییەکان دروست کردبوو. لە چەند شار و شارۆچکە، ڕێکخستن و کۆمیتەیان پێک هێنابوو، بەرپرسیان بۆ دیاری کردبوون. من لەو لیژنەیەدا بەشدار بووم، چەندان کۆبوونەوەمان لەگەڵ حزبە کوردستانییەکان کرد و ئامادەکاری بۆ کۆنگرە کرا.

لەو ماوەیەدا بڕوانامە و دەقی دوکتۆرنامەکەم، کە بە زمانی بولگاری بوو، پێشکەشی زانکۆی سەلاحەدین کرد، کە ئەو کاتە تاکە زانکۆ بوو لە کوردستان. لیژنەی تایبەتی یەکسانکردنی بڕوانامە لە زانکۆ، لەگەڵم دانیشتن و لە شێوەی سێمینار لەبارەی ناوەڕۆکی دوکتۆراکەم دوام. چەند پرسیاریان لێ کردم و وەڵامم دانەوە، دواتر بڕوانامەکەم یەکسان کرا. لە زانکۆی سەلاحەدین، بەشی فەلسەفە نەبوو، لە کۆلێجی ئاداب، بەشی کۆمەڵناسی، پێویستیان بە من بوو، داوایان لێ کردم لەوێ کار بکەم و فرمانی دامەزراندم لەو بەشە، دەرچوو. بەڵام ئەو کاتە پاسپۆرتی سویدیم

نەبوو، بە لیزاپاس، بە تورکیادا، چووبوومەوە کوردستان، ڤیزای هاتوچۆ بە تورکیادا بۆ ماوەی شەش مانگ بوو. لەبەر ئەوە سەرۆکی ئەو کاتەی زانکۆ، د.خەسرەو شالی، پێی وتم باشترە دەست بە کارەکە نەکەم، چونکە ئەگەر لە گەڕانەوە بۆ کوردستان دوا بکەوم، دەردەکرێم. دواتر زۆر بەزەحمەت دەتوانم بۆ کارەکەم بگەڕێمەوە.

کاتی کۆنگرەی شیوعییە کوردستانییەکان نزیک بۆوە. هاشم کۆچانی و من پرۆگرام و پێڕەوی نێوخۆی حزبەکەمان ئامادە کرد، لە کوردستانیش هاوڕێیان کاریان لەسەر پرۆژەیەکی لەو جۆرە کردبوو، کە سوودی لێ بیندرا. من بە باشم دەزانی پەلە لە دامەزراندنی حزب نەکرێت، بەڵام زۆرینەی هاوڕێیان لایان وابوو، ئەگەر خۆیان لە حزبێکدا ڕێک نەخەن، لایەنە سیاسییەکانی کوردستان بەکەم بۆیان دەڕوانن، ڕەنگە بەشێکیان بێ هیوا ببن و ڕوو لە لایەنی تر بکەن.

لە کۆنگرەدا پرۆگرام و پێڕەوی ناوخۆ، پەسەند کرا. ڕۆژی ٢٢ ئۆکتۆبەر ١٩٩٣ کۆنگرەی دامەزراندنی پارتی کاری سەربەخۆیی، بە ئامادەبوونی١٧٠ ئەندام و ١٧ چاودێر، کە لە شار و شارۆچکە و ئۆردوگا و ڕێکخستنی پێشمەرگەوە هاتبوون، بەڕێوە چوو و چەند ڕۆژی خایاند. پازدە کەس بۆ ناوەندی سەرکردایەتیی حزبەکە و سێ ئەندامی جێگر هەڵبژێردران. من زۆرترین دەنگم هێنا. پێشتر پێشنیارم بە هاشم کۆچانی کردبوو، کە ببێتە سکرتێری حزب، بەڵام ڕازی نەبوو، پێی وابوو باشترە من ئەو کارە بکەم. دوای ئەوە پێم وت کەواتا با وریا سەعید (ماجید ڕەواندزی) بە سکرتێر دابنێین.

گرفتی کاک هاشم و من ئەوە بوو، کە ئێمە تموحی سیاسی و

دەسەڵاتداریمان نەبوو. کاری سیاسی لای ئێمە بۆ چاکە و بەرژەوەندیی گشتی بوو، نەک بۆ دەسەڵات و پۆستی حزبی و حکومەتی و خۆدەوڵەمەندکردن. هەبوون بۆ ئەوەی ببن بە سکرتێر، یان ئەندامی مەکتەبی سیاسیی حزبێکی بچووکی سەد کەسی، چەندان تۆمەت و بوختانی جۆراوجۆریان بۆ یەکتر هەڵبەست و تەنانەت پەلاماری یەکتریان دا و بوون بە چەند پارچە. کەچی ئێمە ئامادە نەبووین بە کۆی دەنگ، یان بە دەنگی زۆرینەی هاورێیان، ببین بە سکرتێری حزبێک، کە سەدان ئەندام و پێشمەرگە و کادری لێهاتوو و هەزاران دۆست و لایەنگری هەبوو.

لە دەمی کردنەوەی کۆنگرەدا، سەرۆکی حکومەت، کۆسرەت ڕەسووڵ و چەند وەزیر و نوێنەری هەموو حزبەکان، بەشدار بوون. پێشتر بە وریا سەعیدم وتبوو سەرەتا ئەو وتار بخوێنێتەوە. ویستم لەبەرچاو بێت و لە کۆنگرە دەنگی بۆ بدەن. من وتارێکی کورتم ئامادە کردبوو، بەنیاز بووم لە کۆتاییدا، بیخوێنمەوە، بەڵام دواتر، کە زۆربەی میوانەکان ڕۆیشتن، نەمخوێندەوە. هەروا پێشتر قسەم لەگەڵ چەند ئەندامی سەرکردایەتی، کە تێمڕادەبینین، کردبوو بۆ ئەوەی دەنگ بە وریا سەعید بدەن، لەوانە هاورێیانە سەلاح مەزن، تەحسین محەمەد خەلیل، موحسین یاسین، مامۆستا لەشکری، بەکر حاجی، کاروان عەبدوڵلا...تاد

ناوەندی سەرکردایەتی بۆ هەڵبژاردنی سکرتێری حزب و مەکتەبی سیاسی، کۆ بۆوە. لە کۆبوونەوەکەدا هاورێیان منیان بۆ سکرتێری پارتی کار کاندید کرد، چەند جار بە پێداگرییەوە دووپاتیان کردەوە، بەڵام ڕازی نەبووم، لەجیاتیان وریا سەعیدم پێشنیار کرد. کە بە زۆرینەی دەنگ هەڵبژێردرا. بەڵام وریا سەعید نەیتوانی وەکوو سکرتێر، حزبەکە بەرێوە بەرێت و بیر و بۆچوونە

جیاوازەکان یەک بخات. هەروا پارتی و یەکێتیی فشاریان بۆ پارتی کار دەهێنا، لەم لایەنەشەوە نەیتوانی هەڵوێستی هاوسەنگانە و بێلایەنانەی پارتی کار، بەرانبەر بە کیشەی نێوان یەکێتی و پارتی و حزبەکانی تر بپارێزێت.

پێش کۆنگرەی دووەم، چەکدارانی یەکێتیی نیشتمانی کوردستان، لە بازگەی نێوان هەولێر و کۆیە، تەقەیان لە هاوڕێ محەمەد حەلاق، ئەندامی مەکتەبی سیاسیی پارتی کار کرد، کە لەگەڵ یازدە هاوڕێی تر بەرەو کۆیە دەچوون. هاوڕێ محەمەد و چەند پێشمەرگەی پارتی کار بریندار بوون، هەموویان بە دیل گیران. دواتر هاوڕێ محەمەد لەگەڵ هاوڕێیان سەرهەد کەریم تەمر، مامە کەریم تەمر، خالید سالح، تۆفیق محەمەد ئەمین، خەسرۆ ستار، کاوە ئەحمەد ڕەشید، موسەدەق کەریم پیرداود، فارس حەسەن سووسەیی، غازی ڕەشید حەمەدەمین، ئیسماعیل موراد و هاوڕێ ژینۆ سەربەست، بە دیلیی شەهید کران. ئەمە تاوانێکی گەورە و لاپەڕەیەکی ڕەشە لە مێژووی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا.

وریا سەعید چاوەڕێی نەکرد کۆنگرەی دووەم ببەسترێت، بە جۆرێکی نابەرپرسانە و تەماوی، بێ ئەوەی تەنانەت من و کاک هاشم ئاگادار بکات، حزبەکەی بۆ حەنا یوسف (ئەبو حیکمەت) بە جێ هێشت، بەم کارە سەلماندی کە شایەنی ئەو متمانەیە نەبوو پێمان دابوو.

دیاریکردنی وریا سەعید بۆ سکرتێری پارتی کار، هەڵەیەک بوو لە ژیانی سیاسیمدا کردم. هەڵەی دووەمم ئەوەبوو لە کاتی خولی دووەمی هەڵبژاردنی ئەندامانی سەرکردایەتی، داوام لە بەشداربووانی کۆنگرە کرد، کە دەنگ بە ئەبو حیکمەت (حەنا یوسف) بدەن، چونکە لە خولی یەکەمدا تەنیا چل و چوار دەنگی

هێنا، کەچی ئەندامی سەرکردایەتی دەبوو لە حەفتا دەنگ زیاتر بهێنێت. لە بەردەم ئەندامانی کۆنگرەدا وتم ئەبو حیکمەت (کە ئەو کاتە لە سوێد بوو) لە ساڵانی چلەکانەوە ئەندامی حیزبی شیوعیی عێراق بووە، تاکە ئەندامی پێشووی کۆمیتەی ناوەندییە، کە لەگەڵ ئێمەیە. ئەگەر بە ئەندامی سەرکردایەتی هەڵنەبژێردرێت، سەرکردەکانی حیزبی شیوعی گاڵتەی پێ دەکەن، بۆیە داواتان لێ دەکەم دەنگی بۆ بدەن. بەڵام بە بیری کەسماندا نەدەهات ئەبو حیکمەت بخرێتە مەکتەبی سیاسی. دواتر هانای بۆ هاشم کۆچانی برد، کە ئەندامی مەکتەبی سیاسی بوو، بە داوای کاک هاشم، سەرکردایەتیی پارتی کار، بردیانە مەکتەبی سیاسی. ئەبو حیکمەت ویستی حزبەکە بکاتە دوکانێکی سیاسی و ڕادەستی پارتی بکات، بەڵام سەرکردایەتی و ئەندامانی پارتی کار لە دژی وەستان. بۆیە سەرانی پارتی، کە ماوەیەک بوو بە تانک و لەشکری ئەنفال، هەولێریان داگیر کردبوو، پارتی کاری سەربەخۆیی کوردستانیان، بە تومەتی پێوەندیی کردن بە ئیسرائیلەوە، یاساخ کرد!.

دوای جیابوونەوەمان لە حزبی شیوعی، بە ناڕەوا چەند توومەت و بوختانیان بۆ هەڵبەستم و کەسانی داخلەدڵیان لێ هاندام. ئەمەش بەشێک بوو لە نەریت و کولتووی سیاسی و کۆمەڵایەتیی حزبی شیوعیی عێراق. تا لەگەڵ ئەوانی دڵسۆز و فریشتەیت. کە لێیان جیابوویتەوە، بە ناپاک و دوژمنی گەلت دادەنێن. تەنانەت بەشێک لەوانەی ساڵانێک هاوڕێ و دۆستی نزیکتن، کوێرانە وەکوو ئەندامی عەشیرەتێکی ئایدیۆلۆجی، سەنگەرت لێ دەگرن، توتیئاسا بوختان و توومەت دووبارە دەکەنەوە. من نەخزامە ئەو ئاستەی کاتی خۆم بە وەڵامی ئەو تومەت و بوختانانە بەفیڕۆ بدەم.

یەکێک لەو توومەتانە ئەوەبوو، گوایا من لە هۆنراوەیەکدا

سووکایەتیم بە گەلی عەرەب کردووە و پێم وتوون: (لە سروشتی ئینسانیتان بە گومانم)!. تەنانەت ئەو تومەتەیان بە چەند نووسەر و رووناکبیری عەرەبی، کە هاورێم بوون، وتبوو.

ئەو دێرەشیعرەی سەرەوە لە کۆپلەیەکی هۆنراوەی (وەرزەبەردینە) دەرهێندراوە، بۆ مەبەستی خراپەکاری و بوختانکردن بەکار هێندراوە. لە هۆنراوەکەدا بەم جۆرەیە:

من برینێکی ژێر چەقۆم
کڵپەیەکی سەرهەڵگرتووم
لەگەڵ هەزاران شەهیددا هاتوومەوە
بێ وڵاتم، وڵاتی خۆم دەوێتەوە
تەرمی باوکم، گۆڕی دایکم
جێنزرگەی تەپێندراوی باپیرانم دەوێتەوە.
تا خاکی لە خاچدراوم
ئاو و مێژوو و ئاسمانی داگیرکراوم نەستێنمەوە
لە سروشتی ئینسانیتان بە گومانم
لە هاوسێی و لە ناسینتان پەشیمانم
پەشیمانم.. پەشیمانم.

من لەو باوەڕەدام ئاستی ئەخلاقی، ئینسانی و شارستانەتیی هەر کۆمەڵ و گەلێک لەوەدا دەردەکەوێت، چۆن لەگەڵ نەتەوەی تری وڵاتەکەی و کەمینەی نەتەوەیی، ئاینی و مەزهەبیی جیاواز ڕەفتار دەکات. تا چەند باوەر بە مافی ئازادی و یەکسانبوونی خۆی و ئەوان دەهێنێت. من گومان لە ئینسانییەتی هەر کۆمەڵ و کەسێک دەکەم، کە دژی مافی ئازادی و یەکسانیی نێوان خۆی و ئەوانیتر بێت و بندەستکردنیان بە ڕەوا بزانێت.

وەکوو ئینسان و شاعیر، قەت نەمتوانیوە و ناشتوانم ڕقم لە نەتەوەی عەرەب و هیچ نەتەوەیەکی تر ببێتەوە. سالانیکی زۆر ژیانی ڕۆژنامەنووسی، ڕووناکبیری و سیاسیم لە بەغدا، لە پێشمەرگایەتی، بولگارستان، ئەفغانستان، سووریا و سوید، لەگەڵ هاوڕێیانی عەرەب بەسەر برد. پێکەوە هاوڕێ و هاوئامانج بووین. مەترسیی زینندانیکردن، پێشمەرگایەتی، دۆخی سەختی ئاوارەیی، برسێتی و هەڕەشەی گرتن و کوشتنمان پێکەوە دابەش کرد. زمان و ئەدەبیاتی عەرەبی سەرچاوەی بەپیزی ڕووناکبیریم بوون. وێڕای ئەوانە خۆشەویستیم بۆ گەلی خۆم، ڕێزم بۆ ئینسان، بۆ ئەدەبیات و هونەر، وەفاداریم بۆ ئەو پرەنسیپانەی باوەڕم پێیانە و باجی کەمیشم لەپێناویاندا نەداون، ڕێگەم نادەن ڕقم لە هیچ نەتەوەیەکی تر ببێتەوە. لە نووسینێکدا، بە زمانی عەرەبی وتوومە:

دەوڵەتی شۆڤێنیستی عەرەبیی عێراق بە شەڕی ناڕەوای، منداڵی و بەختەوەری و خەونی منداڵیی من و نەوەکەم و چەند نەوەی دواتری زەوت کرد، کەچی شاعیرانی داهێنەری عەرەب، لە وێنەی بەدر شاکر ئەلسەیاب، ئەدۆنیس، جەواهیری، سەعدی یوسف، فازیل ئەلعەزاوی، مەحموود دەرویش و هی تر، خەونی نوێ و داهێنەرانە و مرۆڤدۆستانەیان پێ بەخشین.[1]

ئیمانوێل کانت ١٧٤٢-١٨٠٤ لە وەڵامی ناهەقیی دۆستێکدا دەڵێت:

خودایە لە دۆستانم بمپارێزە، من دەتوانم لە دوژمنانم، خۆم بپارێزم.

---

1- حجلنامه، العدد ٣، ٢٠٠٠ السويد ص ٨

## ٣
## خۆتەرخانکردن بۆ نووسین

ئەو شەش مانگەی لە کوردستان بووم، بەو ئەنجامە گەیشتم، کە دۆخی کوردستان بەرەو خراپتر دەچێت. پارتی و یەکێتیی لەسەر هەموو مەسەلەکان ناکۆک بوون. تارمایی شەڕی نێوخۆ بە هەرێمی کوردستاندا دەسووڕایەوە. دیاربوو ئەو وڵاتە جێگای ئەو دوو حزبەی تێدا نابێتەوە. ئەو بۆچوونانەم لە چەند کۆڕ و لای چەندان دۆست و هاوڕێ باس کرد. لەپاڵ ئەوەدا هەژاری و نەداری، هێزیان لە خەڵک بڕیبوو. بەپێی ئاگاداریی ئەو کاتەم، دەوروبەری لەسەدا حەفتای داهاتی کوردستان بۆ پارتی و یەکێتی و حزبەکانی تری بەرەی کوردستانی دەچوو. تەنانەت یەک لە سێی داهاتەکە بۆ خەڵک نەدەمایەوە.

ڕۆژێک چوومە سەردانی برادەرێک، کە لە سلێمانی لە ڕۆژنامەی حزبێک کاری دەکرد. کارمەندێکی ڕۆژنامەکە کیسەیەکی ڕەشی بچووکی بەدەستەوە بوو، هاتە ژوورێ و دای بە نووسەرێکی ناسراو، وتی ئەم تۆچایە بەشی تۆیە. دیاربوو حزبەکەیان کۆمەکی لەو جۆرەی پێ دەکردن. من بەو دیمەنە بێتاقەت بووم. دۆخی وڵات و ژیانی نووسەران گەیشتبووە ئەو ئاستەی نووسەرێکی دیار، پێویستی بە نیوکیلۆ چا بێت، کە وەکوو خێر بەسەریدا دابەش بکرێت، لەولاشەوە نزیکەی لە سەدا حەفتای

داهاتی ولات، زەوت دەكرێت.

پاش گەڕانەوەم بۆ سوێد، چەند مانگ چاوەڕێی پاسپۆرتی سوێدی بووم. لەو ماوەیەدا بەو ئەنجامە گەیشتم كە لەكاتێكی نەگونجاودا، بڕیارم داوە بگەڕێمەوە كوردستان. من وازم لە كاری حزبایەتی هێنا بۆ ئەوەی خۆم بۆ نووسین و كاری ڕۆشنبیری تەرخان بكەم. دوای ئەو هەموو ساڵانەی دوورەوڵاتی، دەمەویست لە كوردستان بژیم و كار بكەم. بەڵام لەو دۆخە سیاسی، ئابووری و ڕۆشنبیرییە داڕماوەی كوردستان، دڵنیا نەبووم بتوانم ئازادانە كار بكەم، بنووسم و بە ڕەنجی كارەكەم بژیم؟ بە گومان بووم لەوەی ئازدی و كەرامەت و ژیانم پارێزراو بن؟

لەو سەروبەندەدا هەندێك كێشەی خێزانیشم بۆ دروست ببووبوو، كار گەیشتە ئەوەی ماوەیەك لەگەڵ ئێكا جیا ببینەوە. ڕاستییەكەی خەتاكە زیاتر لە منەوە بوو، كە ناهەقیم بەرامبەر كرد. بەڵام بە هۆی دڵفراوانی و میهرەبانیی ئێكا و پەرۆشییمان بۆ ئەوین و ژیانی هاوبەشمان، توانیمان گرفتەكە چارەسەر بكەین.

بڕیارم دا لە سوێد بمێنمەوە، زمانی سوێدی بخوێنم و بتوانم سوودی لێ ببینم. چونكە پێش چوونەوەم بۆ كوردستان، تەنیا قۆناخی سەرەتاییم خوێند، كە بە خوێندنی سوێدی بۆ بیانیان (ئێس ئێف ئی) ناو دەبرێت. دوای ڕاپەڕین بەو هیوایەوە دەژیام، كە دەگەڕێمەوە ولات، ئەوەندە سوێدییەم بەسە كە بەشی كاروباری ڕۆژانەم بكات. بەڵام ئەم جارە بڕیارم دا خۆم لەگەڵ ژیانی سوێد ڕابهێنم، بە جۆرێك بژیم وەكوو ئەوەی قەت نەتوانم جارێكی تر بگەڕێمەوە ولات. دەستم بە خوێندنی زمانی سوێدی كردەوە. قۆناخی ئامادەییم تەواو كرد، كە ئەوكاتە بە قۆناخی (ئا بێ سێ) ناو دەبرا.

من لەو باوەڕەدام لانی کەم سێ کاری گرینگ لە ژیاندا هەن هەر کەسێک، لە هەر تەمەنێکدا بێت، ئەگەر هەوڵ بدات، دەتوانێت بیانکات:

یەکەم خوێندن و فێربوون، دووەم وەرزشکردن، سێیەم ئەوینداری (بە ژنهێنان، یان شووکردنیشەوە).

ماوەیەک وێنەی هەر خوێندکارێکی تر، لە دەزگای پێدانی قەرزی خوێندن (سی ئێس ئێن) پارەم بە قەرز وەرگرت، کە سالانێکی زۆر مانگانە ئەو قەرزەم دایەوە. ئێکا نزیکەی دوو ساڵ مامۆستای زمانی ئینگلیزی بوو. هەروا وانەی تایبەتی مۆسیقای بە منداڵان دەوت و فێری پیانۆلێدانی دەکردن. بەڵام لە کاری مامۆستایی بێتاقەت بوو، ئەویش بڕیاری دا بخوێنێت، هەردووکمان جارێکی تر بووینەوە بە خوێندکار، بەڵام ئەو سێ ساڵ و نیو لە زانکۆی ستۆکهۆڵم، بەشی سۆسیۆنۆم، خوێندی، وەکوو سکرتێری کۆمەڵایەتی لە کۆمۆنی ئوپسالا، دەست بە کار بوو. تا ٣ی جەنیوەری (کانوونی دووەم)ی ٢٠٢١ کە بە نەخۆشی شێرپەنجە کۆچی دوایی کرد، لە کارەکەی بەردەوام بوو.

لەو ماوەیەدا ئێکا چوار جار دووگیان بوو، بەڵام هەر جارێک دوای نزیکەی سێ چوار مانگ منداڵەکەی لەبار دەچوو، خەم و نیگەرانیی ئێمەش زۆرتر دەبوو. هەموو جارێک دوکتۆر دەیوت ئێکا هیچ گرفتێکی لەشساغیی نییە، منیش پێداگریم دەکرد کە ئەمە ماقووڵ و زانستی نییە، چۆن ئەو لەبارچوونە، بە بێ هۆکار، دووبارە دەبێتەوە! بۆیە بەدڵنیاییەوە کەمتەرخەمییەک لە لایەن دوکتۆرەکانیەوە هەبوو، کە دەبوو ئێمە باجەکەی بدەین. سەرەنجام

ماریا، کە ١٦-٨-٢٠٠٠ لەدایک بووە، لەگەڵ خۆی خۆشەویستی، شادی، ڕووناکیی زۆرتری هێنایە ناو ژیان و ماڵ و داهاتوومان[1].

پاش خوێندنی زمان، ماوەیەکی کورت لە کتێبخانە و قوتابخانەی فێرکردنی زمانی سوێدی بە بیانیان، ڕاهێنان و کاری کاتیم کرد. چەند ساڵ لە قوتابخانە مامۆستا بووم.

لە ڕێگەی زمانی سوێدییەوە، بەسەر گەنجینەیەکی تری ئەدەبی و هزریدا کەوتم، کە بۆم بوونە سەرچاوەیەکی نوێی ئەدەبی و ڕۆشنبیری. هەروا سروشتی کەموێنەی سوێد، وەکوو هونەرێکی خۆڕسک، ڕەنگین و ڕازاوە، سەرنجیان ڕاکێشام، ئاسوودەیی و ئیلهامیان پێ بەخشیم. ئەمەش لە بەشێکی ئەو شیعرانەی، لە سوێد نووسیومن، ڕەنگیان داوەتەوە. لەوانە لە کۆمەڵەهۆنراوەی (ژوانی ڕووناکی١٩٩٧) کە یەک ساڵ، ڕۆژانە و بە بەردەوامی، بەدەم گوێگرتن لە مۆسیقا، سەرقاڵی نووسینی بووم.

وێرای ئەو بەرهەمە، دوو کۆمەڵە هۆنراوەی ترم بڵاو کردەوە، ئاوێنە و سێبەر ١٩٩٦، ڕوونبوونەوە ٢٠٠١، هەروا دوو کتێبی تری ئەکادێمیم نووسی، ئیمپراتۆریای لم، لەبارەی ئاین، خێڵ و ناسیۆنالیزم ١٩٩٨، لەگەڵ کولتوور و ناسیۆنالیزم ٢٠٠٢. لە هەمان کاتدا، لەگەڵ دەستەی نووسەرانی گۆڤاری ڕابوون، درێژەمان بە ئامادەکردن و بڵاوکردنەوەی گۆڤارەکە دا، کە ئاستێکی باشی ئەکادێمی و کولتووری هەبوو، دەیان وباس و نووسین، بەرهەمی ئەدەبی و چەند فایلی تایبەتی تێدا بڵاو کرایەوە.

لە کتێبی (ئیمپراتۆریای لم)دا باسی سەرەتای سەرهەڵدانی ئاینی ئیسلام کراوە، کە بە شێوەی سیستمێکی میتۆلۆجی و هزری و تێڕامانی کەون و سروشت، دەرکەوت. بەڵام لە سنووری ئیمان

1- بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە ٦

بــاوەڕ و تەبشــیردا نەمــایەوە، بەڵکــو گــۆڕدرا بە ئایــدیۆلۆجیای بزاڤێکــی سیاســی و دەوڵەت. مــۆدێلی ئیمپراتۆریــای ئیســلامیی ســوننەمەزهەبی عەرەبــی و عوســمانی و شــیعەمەزهەبی ئێرانــی، نمــوونەی مــۆدێلی دەوڵەتــی ئیســلامی بــوون. ئەو دەوڵەتــانە، بە درێژایــی ســەدان ســاڵ، وڵاتــانی تریــان داگیــر و تــاڵان کــرد. هەر لایەنێکی جیاوازی ئاینی، مەزهەبی و سیاسییان لەنـاو بـرد، یـان بەکۆیلەیـــان کـــردن. لە ئەنجامـــدا کولتـــووری شـــەڕخوازی و ســـتەمکاری، لەو وڵاتـــانەدا بەهێـــز و، هەســـتی دادخـــوازی و مرۆڤدۆستیی لاواز بوون.

دوای داڕمانی ئەو ئیمپراتۆریا ئیسلامییانە، دەوڵەتی نەتەوەیی لە جێگەیـــان دامەزرێنـــدرا. ئایـــدیۆلۆجیای ناســـیۆنالیزم، جێگـــای ئایدیۆلۆجیای ئاینی-ئیسلامیی گرتەوە. بەڵام سروشتی ئیستیبدادی و ســـتەمکاریی دەوڵەت نەگـــۆڕدرا. کولتـــووری شـــەڕخوازی و لەنــاوبردنی ئەویتــری جــودا، بەنــاوی نەتەوە و وڵاتپەروەریــیەوە، بەردەوام بــوو. ئەو کولتــووورە شــەڕخوازەی ســەدان ســاڵە لەو وڵاتانەدا ڕیشەیان داکوتاوە، دەرفەتیان نەداوە بزاڤی ڕۆشنگەری و دیمـوکرات و لیبـراڵ بەهێـز ببن و گۆڕانکاری لـە بنەمای سیاسـی، فیکریــی و کولتــووری، دەربــکەون. داپڵۆســینی مــرۆڤ و ســتەمی نەتــەوەیی، بەرامبــەر بــە نەتەوەی جیاوازی بندەستیان، بە تــایبەت کورد، تـا ئەمڕۆ هەر بەردەوامە. لـە هـەمان کاتدا ستەمی ئاینی و مەزهــەبییش، بەرامبــەر مەســیحی، جولەکــە، ئێزدی، شــەبەک...تــاد وەک ڕێبازی سیاسی و کولتووری ڕەسەنی ئەو وڵاتانە، درێژەیـان هەیە. لە کتێبەکەدا ئاماژە بەوە دراوە کە ئەو کولتـووورە شـەڕانگێزە لە داهاتووشدا، بە شێوازی تر و ناوی تر، دەردەکەوێتەوە.

ســاڵی ٢٠٠٣ دوای ڕوخانـدنی دەوڵەتـی بەعـس، چەنـد بـاس و

نووسینم لەبارەی عێراقی دوای بەعس و کێشەی نێوان عێراق و کوردستان، بڵاو کرانەوە. لەو باسانەدا بەو ئەنجامە گەیشتم کە:

(بەهێزبوونی هێز و نفووزی سیاسیی شیعەکان لە عێراقدا، بزاڤی ئیسلامی سیاسیی سوننەمەزهەب، لەناو سوننەکانی عێراقدا بە هێز دەکات. بە واتایەکی دی دیاردەی ئیسلامی سیاسیی شیعەمەزهەب، دژەدیاردەکەی خۆی لە عێراقدا، لە شێوەی ئیسلامی سیاسیی سوننەمەزهەب دێنێتەوە بەرهەم. عەرەبە سوننەکانی عێراق ناتوانن بە ئایدیۆلۆجیای تێکشکاوی ناسیۆنالیزمی عەرەبی، لە بەرامبەر هێزە سیاسییە شیعەکاندا ڕاوەستن و تایبەتمەندی و خواستی سیاسیی خۆیان دەربڕن. بەڵکو ئەوان یان بە ئایدیۆلۆجیای ئاینیی سوننی، یان بە لیبرالیزم و بە عەلمانییەت دەتوانن ئەم کارە بکەن... بەلای زۆرەوە تەوژمێکی ئیسلامی سیاسیی سوننەمەزهەب، بە ناوەرۆکێکی قەومییەوە، لە عێراقدا دەردەکەوێت. ئەوان بە چەکی ئیسلام و مەزهەب، هەم لە بەرامبەر ئیسلامی سیاسیی شیعەکاندا، هەم لە بەرامبەر ئەمریکا و هاوپەیمانانیدا خۆیان دەردەخەن.)[1]

دوو ساڵ دوای ئەو نووسینە، بەعسییەکان و ناسیۆنالیستانی سوننەمەزهەبی عەرەبی عێراق، بە ناوی چەند ڕێکخراوی تیرۆریستیی سوننەمەزهەب، وەکوو ئەلقاعیدە، نەقشبەندییەکان، ئەلنوسرە و دواتر داعش دەرکەوتن و عێراقیان نوقمی خوێن کرد.

لەدوای ڕوخاندنی دەوڵەتی بەعس، شێوەمۆدێلی ناسیۆنالیزمی عەرەبی لە عێراق و ناوچەکە کۆتایی هات. ئەمڕۆ پەیامی یەکخستنی نەتەوەی عەرەب، وەکوو بەشێک لە مێژوو دەبیندرێت.

---

1- ڕەفیق سابیر، دەرفەتێکی نوێ بۆچارەسەرکردنی کێشەی نێوان عێراق و باشووری کوردستان، ڕۆژنامەی هاوولاتی، ئایار یان حوزەیرانی ٢٠٠٣، هەروا بڕوانە عێراق دیموکراتیزەکردن یان هەڵوەشانەوە، بیر و هۆشیاری، سلێمانی، ٢٠٠٥ ل٢٨

بەڵام ساڵانێکە ناسۆنالیزمی عەرەبی، بە مۆدێلێکی نوێ و لەبەرگی ئایندا کاری خۆی دەکات. ڕێکخراوی تیرۆریستیی ئیخوان ئەلموسلیمین، مۆدێلێکی حیجابپۆشی ناسیۆنالیزمی عەرەبییە. ئاینی ئیسلام، لە بنەڕەتدا ئاینێکی عەرەبییە و لە دورگەی عەرەب دەرکەوتووە، زمان و کولتووری عەرەبیی سەردار و زاڵ کردووە. ئیخوانییەکان ئەو ئاینە بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو زمان و کولتوورە و بۆ سەرداربوونی ئایدیۆلۆجیای عەرەبیزم، بەکار دەهێنێن. ئەوان بە ناوی ئومەی ئیسلامییەوە، کە لە ناوەرۆکدا مەبەست لە ئومەی عەرەبییە، درێژە بە پانعەرەبیزم و پەیامی نەتەوەیی خۆیان دەدەن و دژایەتیی ماف و ئازادیی گەلی کوردستان دەکەن.

ناسیۆنالیزمی تورک و فارسیش، شکستیان هیناوە و بەرگی ئاینییان پۆشیوە. ئەوان سەدان ساڵ ئاینی ئیسلامیان، وەکو ئامرازێکی سیاسی، بۆ مەزنخوازی و بەرژەوەندیی نەتەوەیی خۆیان، بەکار هێنا، ئەمڕۆش بە شێوازی تر بەکاری دەهێننەوە.

هەر نەتەوەیەک ئەگەر نەتوانێت ئاین و ئایدیۆلۆجیا، لەگەڵ کولتوور و کۆمەڵی خۆیدا بگونجێنێت و بۆ بەرژەوەندیی خۆی بەکاریان بهێنێت، نەتەوەیەکی زیندوو نییە. بۆیە وەکوو کۆیلەی ئاین، یان کۆیلەی ئایدیۆلۆجیای لێ دێت. نەتەوەی تر، بە ناوی ئاین، یان ئایدیۆلۆجیا، بەکاری دەهێنن. کورد باشترین نموونەیە. چونکە سەدان ساڵ بە ناوی برایەتیی ئاینییەوە، کۆیلە و ئامرازی دەستی ئیمپراتۆریای عوسمانی و ئێرانی بوو، وەک مورتەزەقە لە دژی خۆی و گەلانی تر، بەکار هێندرا. ئەمڕۆش بە ناوی تر و شێوازی تر، بەکار دەهێندرێتەوە. هیچ شتێک لە نەبوونەوە نایەت.

بە کورتی مۆدێلی ناسیۆنالیزمی ئەو وڵاتانە، لەبری ئەوەی ئازادی، داد و خۆشگوزەرانی بۆ خەڵک بێنن، کراونەتە چەکێک لە

دژی بزاڤـی ئـازادیخوازی و ئـاین و مەزهەب و نەتەوەی جیـاواز، بەکـار دەهێنـدرێن. کوشـتنی زمـان و کولتـووری کـوردی و کۆیلەکردنی گەلی کوردستانیش، کراونەتە ئامانج و ئاینی نەتەوەیی ئەو وڵاتانە.

له ساڵی ٢٠٠٣ له زانکۆی ئوپسالا، له سەنتەری لێکۆڵینەوەی فرەکولتـووری، له پـرۆژەی (ئەو زمـان و کولتـوورانەی مەترسـی نەمانیان لەسەرە) بەشدار بووم. دوو تـوێژەر لێنا هیوس و ساتو گرۆندال سەرنووسەری ئەو زنجیرە باسانە بوون، که به کتێب و نـامیلکە بـڵاو دەکرانەوە. دەسـتەی ڕاوێژکـاریی نووسـەران له ١٣ تـوێژەر له سـوێد، ئەمریکـا، ئەوسـترالیا، نەرویـج، فینلانـد، ژاپـۆن، ئەڵمانیا، عێراق، پێک هاتبوو.[1]

یەکەم بەرهەمـی ئەو لیـژنەیە نـامیلکەیەک بـوو لەبـارەی (سام)ەکان، ساڵی ٢٠٠٤ به زمانی سوێدی بڵاو کرایەوە. سامەکان گەلێکن لەنێوان سوێد و نەرویج و فینلاند، دابەش کراون، زمـان و کولتووریـان هەڕەشـەی لەناوچوونیـان لەسـەرە. دووەم بەرهەم باسـێک بـوو به نـاوی (سـەرەتایەک لەبـارەی شـیعری مـۆدێرنی کـوردی و ئەنتۆلۆگیـایەک)، مـن باسـەکەم به زمـانی سـوێدی پێشـکەش کرد. لەوێدا سـەرەتای سـەرهەڵدانی شـیعری کوردی و ڕەوشـی گـۆڕان و گەشـەکردنی، بـاس کـراون. بـایەخی شـیعر له ژیانی ڕۆحی، کولتووری و سیاسیی کورد و ڕۆڵی له پاراسـتن و

1 --Editors: Leena Huss and Satu Gröndal

Advisory Editorial committee: Rosemary Ann Blanchard, USa, Brigitta Buch, Australia, Eva Casto Yohanson, Sweden, Vuokko Hirvonen, Norway, Kendall King, USA, Anna-Riitta Lindgem, Norway, Rafik Sabir, Irak, Matti Savolainen, Finland, Hiroshi Shoji, Japan, Helena Sulkala, Finland, Alastair Walker, Germeny, Erling Wande, Sweden, Lars Wendelius, Sweden

گەشەکردنی زمانی کوردی ڕوون کراونەتەوە. چونکە زمانی کوردی، کە بنچینەی شوناسی نەتەوەیی کوردە، بۆ یەکەم جار بە هۆی شیعرەوە، لە زمانی ئاخاوتنەوە گۆڕدرا بە زمانی نووسین. ئەو زمانە لە ڕەوشی مێژوویی خۆیدا، وەکوو زمانی ئەدەبیات و نووسین، گەشەی کرد و چەسپا. لە بواری ڕۆژنامەنووسی، خوێندن، ڕۆشنبیری، سیاسی و ئیداریدا، بەکار هێندرا. هەروا لە باسەکەدا، چەند لایەنی ئەو گۆڕانکارییانەی شیعری نوێی کوردی، تا کۆتایی سالانی حەفتاکان، بە خۆیەوە دیوە باس کراون. ئاماژە بە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی ئەو گۆڕانکارییانە دراوە.

ساتو گرۆندال باسەکەی بەلاوە گرینگ بوو، پێشنیاری پێ کردم لەگەل ئەنتۆلۆگیایەکی شیعری مۆدێرنی کوردی، بە زمانی ئینگلیزی بلاو بکرێتەوە. بۆ مەسەلەی ئەنتۆلۆگیاکە، هاوڕێم د.کەمال میراودەلی، لەگەل سەرقالبوونی بە کاری خۆیەوە، توانی ئەنتۆلۆگیایەکی شیعری مۆدێرنی کوردی، بە زمانی ئینگلیزی، ئامادە بکات. ئەنتۆلۆگیاکە لە شەست هۆنراوە پێک هاتووە. بەرهەمی سی شاعیری، لە پیرەمێرد و گۆرانەوە تا شاعیرە گەنجەکانی، بە خۆ گرتووە.[1]

چەند شاعیر تەنیا یەک هۆنراوەی کراوە بە ئینگلیزی، چەند شاعیری تر دوو تا پێنج هۆنراوەی هەلبژێردراون. سەرنووسەرانی

١-ناوی شاعیرەکان: پیرەمێرد، گۆران، شێخ نووری شێخ سالح، دلدار، ئەحمەد هەردی، هێمن موکریانی، کامەران موکری، سوارەی ئیلخانیزادە، جەمال شارباژێڕی، شێرکۆ بێکەس، عەبدوللا پەشێو، لەتیف هەلمەت، ئەنوەر قادر محەمەد، ڕەفیق سابیر، کەمال میراودەلی، دلشاد عەبدوللا، محەمەد عومەر عوسمان، قوباد جەلیزادە، کەریم دەشتی، ئەحمەد مەلا، جەلال بەرزنجی، بەختیار عەلی، جەمال غەمبار، نەزەند بەگی خانی، ژیلا حوسێنی، کەژال ئەحمەد، دلاوەر قەرەداخی، نەوزاد عەلی ئەحمەد، سارا فەقێ خدر، چۆمان هەردی.

پرۆژەکە داوایان لە شاعیری ناسراوی بریتانی ستیڤان واتس کرد، لەگەڵ د. کەمال بە تێکستەکاندا چوونەوە. باسەکەی بەندەش لە لایەن ئەنگێلا فاڵک و ڕیتا هارتیک کرا بە ئینگلیزی. لە کۆتایی کتێبەکەدا چەند دێڕێک لەبارەی ژیان و هەندێک بەرهەمی ئەو شاعیرانە نووسران. ساڵی ٢٠٠٦ کتێبەکە (شیعری مۆدێرنی کوردی، ئەنتۆلۆگیایەک) لە لایەن زانکۆی ئوپسالا، وەکوو دووەم بەرهەمی پرۆژەکە چاپ کرا. ئەوەندەی بزانم تا ئێستا، باس و ئەنتۆلۆگیای فراوانی لەو جۆرە، لەبارەی شیعری کوردی، بە زمانی ئینگلیزی، یان سوێدی بڵاو نەکراوەتەوە.[1]

1--Modern Kurdish poetry An Anthology & Introduction

Rafiq Sabir, Kamal Mirawdeli & stephan Watts

Endangerd Languges and Cultures, Center of Multiethnic Recearch Uppsala Univercitet 2006

٤

## فێستیڤاڵی ئەدەبیی جیهانی و پرسی کورد

لە ڕۆژانی ٧-١٣ی ئابی ١٩٩٩ حەوتەمین فێستیڤاڵی ئەدەبیی جیهانی (فێستڤاڵی بیۆرسۆن) لە شاری مۆڵدێ، لە نەرویج، ڕێک خرا و منیش بانگێشتن کرام. لە ماوەی هەفتەیەکدا دەیان کۆڕی شیعر، چیرۆک، باس و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، پێشانگای هونەری و ئاهەنگی مۆسیقای جاز بەڕێوە چوون. هەروا پرسی کورد و تورکیا بابەتێکی سەرەکیی فێستیڤاڵەکە بوو.

لە فێستیڤاڵەکەدا چەند نووسەر و شاعیری دیاری جیهانی بەشدار بوون، لەوانە توماس ترانسترۆمەر، کە دواتر خەڵاتی نۆبلی وەرگرت، نووسەری ئیسرائیلی، ئامۆس ئۆز، کە ساڵانێک کاندیدی هەمان خەڵات بوو، ساڵی ٢٠٢١ کۆچی دوایی کرد، مارلین فرێنچ، کە لە کۆتایی حەفتاکانەوە ڕۆمانەکانی، بە تایبەت ڕۆمانی (ژووری ژنان) بە کتێبێکی بایەخداری فێمینیستانی ئەمریکا و ئەوروپا دادەندرێت، شاعیری نەرویجی کنوت ئۆدێگۆرد، شاعیر و ڕۆماننووسی نەرویجی ئۆرڤاڵد ستین، دوو شاعیری ناسراوی دانمارک ئۆرکیلد بیۆرنڤیگ و پیا تاڤدرۆپ، نووسەری کورد نەدیم داغدەڤیرەن، نووسەری تورک ئەحمەد ئاڵتان، نووسەری فەلەستینی عیزەت غەزەوی، شاعیری نێجیری بێن ئۆکرێ و

کۆمەڵێک شاعیر و نووسەری تری وڵاتانی لاتڤیا، لیتوانیا و ئیستۆنیا، بەشدار بوون. بە درێژایی هەفتەکە، ڕۆژانە لە بەیانییەوە کۆڕ و سیمیناری ئەدەبی و کولتووری بەڕێوە چوو. لە سەعاتی هەشتی ئێوارەوە تا دەی شەو چەند شاعیر و چیرۆکنووس، لە هۆڵی سەرەکی فیستیڤاڵەکە، بەرهەمەکانیان بە زمانی خۆیان و تەرجومەی تێکستەکانیان بەزمانی نەرویجی و ئینگلیزی خوێندرانەوە. شەوانە لە دوای دەی شەو، لە پرۆگرامی (هۆت هات) لە ڕێستورانتی هۆتێل مۆڵدێ، دوو نووسەر، هەر یەکەیان ٤٠ دەقیقەی بۆ دیاری کرا بەرهەمەکانیان خوێندەوە. شەوی سێیەمی (هۆت هات) بۆ ئامۆس ئۆز و من تەرخان کرا.

لەپاڵ ئەو چالاکییانەدا، ڕۆژێکی تایبەت بۆ سێ پرسی گرینگ، دیاری کرابوو، پرسی فەلەستین و ئیسرائیل، کە سەفیری ئیسرائیل لە ئۆسلۆ و نووسەری ناوداری ئیسرائیل ئامۆز ئوز، لەگەڵ سەرۆکی یەکێتیی نووسەرانی فەلەستینی ئامادە بوون. پرسی کورد و تورکیا، کە نووسەر و دامەزرێنەری کتێبخانەی کوردی لە ستۆکهۆڵم، نەدیم داغدەڤیرەن، ڕەفیق سابیر و نووسەری دیاری تورک ئەحمەد ئاڵتان بەشدار بوون. سەفیری تورکیا لە ئۆسلۆ بانگ کرابوو، بەڵام نەهات. پرسی کەمایەتیی (تاتی)کان لە نەرویج، کە نووسەران یاهن ئۆتۆ یوهانسێن و هاراڵد فرانز مارتینسێن، ئامادە بوون.

پاشنیوەڕۆی ڕۆژی سێیەمی فیستیڤاڵەکە، لە سەعاتی دوو تا هەشتی ئێوارە بۆ پرسی کورد و تورک تەرخان کرا. وەزیری کاروباری ئەو کاتەی دەوڵەت، هێلدێ یۆهنسۆن، لەبارەی هەڵوێستی حکومەتی نەرویج، سەبارەت بە چارەسەری ئاشتییانەی پرسی کورد لە تورکیا و پێوەندیی نێوان نەرویج و تورکیا، قسەی

کرد. چەند نووسەر ڕەخنەیان لە حکومەتی نەرویج گرت، کە چەک بە تورکیا دەفرۆشێت، حکومەتی تورکیاش ئەو چەکانە لە دژی گەلی کورد بەکار دەهێنێت. دوای ئەوە بەڕێوەبەری ناوەندی بازرگانیی نەرویج، یۆن ڤیبا، باسێکی لەبارەی مەسەلەی بازرگانی و ئێتیک پێشکەش کرد. توێژەر خاتو بیاتی سیلدال، لەبارەی بازرگانی و مافی مرۆڤ و نموونەی تورکیا دوا. دوای ئەو جەنەراڵ فرێدریک بۆل هالسێن پرسی کورد و مەسەلەی ئاشتیی لە تورکیا باس کرد.

لە بەشی دووەمی سێمینارەکە، سێ نووسەری کورد و تورک، باسی کێشەی تورکیا و کوردستانیان کرد. نەدیم داغدەڤیرەن وتی:

کاتێک دەوڵەتی تورک حاشا لە هەبوونی هەر نەتەوە و کولتوورێکی غەیرەتورک دەکات و تەنیا مافی ئازادی بە تورک دەدات، ئەوا بەو مانایەیە کە تورک خۆی گرفتی هەیە. دەوڵەتێکی مۆدێرن و شارستانی ناتوانێت بەم جۆرە ڕەفتار بکات. هەروا وتی:

من نامەوێت ببم بە تورک، وەکوو کوردێک دەمەوێت ئەو مافەم هەبێت کە تورکێک هەیەتی. من کوڕەکەم ناوی ڕۆبینە، کە ناوێکی کوردییە و ئەو ناوە لە تورکیا یاساغە. دوای ئەوە بە زمانی سوێدی هەموو ئەو پەڕەگراف و بڕگانەی قانوونی تورکیای خوێندەوە، کە حاشا لە هەبوونی کورد دەکەن لە تورکیا. لە کۆتاییدا کاک نەدیم کۆمەڵێک پێشنیازی سەبارەت بە چارەسەری ئاشتییانەی پرسی کورد و ڕۆڵی نەرویج، وەکوو ئەندامێکی ناتۆ، لە چارەسەری کێشەکەدا پێشکەش کرد.[1]

دوای ئەو، من باسی پرسی کوردم کرد، ئاماژەم بەوەدا کە

---

1-رابوون، ژ. ٢٨، ١٩٩٩، ل ٩٠-٩٣

لەکاتێکدا دنیا بەرەو سەدەی بیستویەک هەنگاو دەنێت، هێشتا تورکیا حاشا لە هەبوونی کورد دەکات، ئێستا باس لەوە دەکرێت کە تورکیا مافی کولتووریی کورد بناسێت و ڕێگەی خوێندن و بڵاوکردنەوە بە زمانی کوردی بدات. سەیرە تورکیای ئەندامی ناتۆ، کە دەخوازێت ببێتە ئەندامی یەکێتیی ئەورووپا، تەنانەت هێندەی جەلادێکی وەکوو سەدام حوسێن و کۆماری ئیسلامی، ناتوانێت تەحەمولی هەبوونی کورد بکات و دان بە بوونی کورددا بنێت. دەیان ساڵە تورکیا جینۆسایدی کورد دەکات و کولتوور و زمانەکەی دەکوژێت. تورکیا لەسەر بنچینەی ئایدیۆلۆجیایەکی ڕەگەزپەرستی بەڕێوە دەچێت. بەپێی ئەو ئایدۆلۆجیایە یەک میلیۆن و نیو ئەرمەن کوژران، هێندەش یۆنانی ڕاگوێزران، سەدان هەزار کورد و ئاسووری لەناو بران. دوای ئەوە وتم:

لە مێژووی نوێدا دەوڵەتی تورک پێش ئەڵمانیای نازی، جینۆسایدی داهێناوە. ئایا بۆ ناتۆ ئەوە گرینگە کە نەتەوەیەک جینۆساید دەکرێت و دەبێت کۆمەکی بکرێت، یان ئەوە گرینگە کە دۆست یان نەیاری ناتۆ، ئەو نەتەوەیە لەناو دەبات!

دوای ئەوە نووسەری تورک ئەحمەد ئاڵتان، کە چەند جار بە هۆی نووسین سەبارەت بە پرسی کورد سزا دراوە، قسەی کرد. بەڵام زۆر بە پەرێز دوا، چونکە دوو تورک خۆبەسەرانە، بە ناوی گوایا کۆمەڵەی کولتووریی ئەتاتورک لە ئۆسلۆ، هاتبوون، وەکوو میتی تورک ڕەفتاریان دەکرد. لە هۆڵەکەدا هەندێک قسە و ڕەفتاری ئاژاوەچییانەیان نواند، کە ئامادەبووانیان بێزار کرد. هەروا ڕۆژی پێشتر سەرکۆنەی ئەحمە ئاڵتانیان کردبوو، کە چۆن لەگەڵ ئێمە بەشداری ئەو سێمینارە دەکات!.

ئەحمەد ئاڵتان لە وتەکەیدا ئامـاژەی بەوەدا کە دەبێت پرسی

کورد لە تورکیا، بە جۆرێکی ئاشتییانە چارەسەر بکرێت. بەڵام بە جۆرێکی چاوەڕواننەکراو وتی:

مەسەلەی ئاڵا شتێکی بایەخدارە، ئێوە خۆتان داکۆکی لە ئاڵای خۆتان دەکەن و ڕێگە نادەن کەس دەست لە ئاڵاکەتان بدات. کەواتا مافی ئەوەتان نییە داوا لە خەڵک بکەن کە بە هەمان شێوەی ئێوە، ئاڵاکەی خۆی نەپارێزێت". دوای ئەوە وتی: "مەسەلەی کورد، لە تورکیا چارەسەر دەکرێت نەک لێرە.

سێمینارەکە لە لایەن سەرۆکی ئەو کاتەی یەکێتیی نووسەرانی نەرویج، کارستین ئاڵنێیس، بەڕێوە چوو. لە دەرەوەی هۆڵەکە ئەحمەد ئاڵتان بە ڕوونی بە نەرویجییەکان و ئێمەی وت:

کاتێک دەگەڕێمەوە ئەستانبول، نامەوێت لە فرۆکەخانەوە بەرەو زیندانم بەرن.

بابەتی سێیەمی فێستیڤاڵەکە تایبەت بوو بە (تاتی)یەکانی نەرویج، کە ساڵانێکی زۆر، تا کۆتایی پەنجاکانی سەدەی پێشوو، ستەم و تاوانی زۆریان بەرانبەر کراوە، بەپێی پرۆگرامی تایبەتی دەوڵەت، پیاوانیان دەخەسێندران، منداڵەکانیان لە دایکوباوکیان دەستێندران و لە خانەی تایبەت، بە سەرپەرشتیی قەشە و کارمەندی کڵێسا، پەروەردە دەکران، تا بکرێنە نەرویجی. نووسەر هارالد فرانز مارتینسێن، کە سەر بە خەڵکی تاتییە، باسی ژیانی خۆی کرد، کە چۆن دەوڵەت بەزۆرەملێ، لە منداڵییەوە لە دایکوبابی دابڕیوە و لە دۆخێکی زۆر سەختدا، لەگەڵ سەدان منداڵی تری تاتیدا، پەروەردە کراون. بە گەروویەکی پڕ لە گریانەوە وتی:

زۆر هاوڕێی منداڵیم بەرگەی ئەو جۆرە ژیان و پەروەردەیان نەگرت و سەرەنجام خۆیان کوشت.

لەو ساتانەدا من منداڵانی باکووری کوردستانم بە بیر هاتەوە،

که دەوڵەتی تورک، بە هەمان شێوازی درندانە، لە دایکوباوکیانی دەستاندن و دەیانکردن بە تورک. نووسەری کۆچکردووی کورد، مەحموود باکسی، لە کتێبێکیدا، کە ساڵی ١٩٧٩ بە زمانی سوێدی بڵاو کراوەتەوە، باسی ئەزموونی خۆی دەکات، لە قوتابخانەیەکی تورکیادا. دەوڵەتی تورکیا لەبری ئەوەی لە گوندەکانیان قوتابخانە بکاتەوە، منداڵە کوردەکانی لە کەسوکاریان دادەبڕی و دەیانبردن بۆ شوێنی دوور تا نەتوانن بە کوردی بپەیڤن:

(ساڵی ١٩٦٢ من تەمەنم حەوت ساڵان بوو کاتێک لەگەڵ خوشکم، کە ساڵێک لەمن گەورەتر بوو، دەستمان بە خوێندن کرد. ئەو کاتە ئێمە یەک وشەی تورکیمان نەدەزانی. بۆیە لە ساڵانی سەرەتادا هەستمان دەکرد کە بەتەواوی لاڵین. هەروا بۆمان نەبوو لە کاتی پشوودا، بە کوردی قسە لەگەڵ یەکتر بکەین. دەبوو بێدەنگانە پێکەوە بە بەرد و شتی لەو جۆرە یاری بکەین. مامۆستاکان بەردەوام، لە حەوشەی قوتابخانە، چاودێرییان دەکردین. هەر کەسێک بە کوردی دەپەیڤی سزا دەدرا: مامۆستاکان بەڕاستە لە سەرپەنچە و سەرمانیان دەدا. ئەو لێدانە ئازارێکی یەکجار زۆری هەبوو. لەبەر ئەوە ئێمە بەردەوام لە قوتابخانە دەترساین و نەمان دەویست بڕۆینە قوتابخانە.)[1]

ئەو قوتابییانە بە درێژایی ساڵ و ساڵان، لە خوێندنگا تایبەتەکاندا، لە کەسوکاریان دادەبڕان و بەتورک دەکران. دواتر ئەوان کەسوکاری خۆیان نەدەناسییەوە. باکسی دەنووسێت: (منداڵەکان بۆیان نەبوو لە قوتابخانەدا بە کوردی قسە بکەن. ئەوان فێر دەکران کە کورد چەپەڵ و بیدایین (پریمیتیڤن). کاتێکیش منداڵەکان بە سەردان، بۆ گوندەکانیان دەچوونەوە، بە

---

١- Tove Skutnabb-Kangas, Minoritet, språk och rasism, s.197

دایکوباوکیـان دەوت کـە ئـەوان تـورکن، دایکوبـاوکێکی پریمیتیڤـی کوردیان ناوێت، بەڵکو دەیانـەوێت کە ئەوانیش بە تـورکی قسـان بکەن و ببنە کەسانی شارستانی.)[1]

گەلی نەرویج، کە گەیشتۆتە ئاستی شارستانەتی و مرۆڤدۆستی، شــەرم لەو مێـژووەی خـۆی دەکـات، بـۆیە داوای لێبـوردنی لەو قوربانیانە کرد و قەرەبووی کردنەوە. کەچی دەوڵەتـی تـورک، کە سـەد سـاڵ زیـاترە، لەنـاو زەلکـاوی تـۆرانیزم و رەگەزپەرسـتیدا چەقیـوە، هێشـتا ئامـادە نییە دان بە جینۆسـایدی گەلـی ئەرمەن و خەڵکـی دەرسـیمدا بنێـت، دەسـت لە کۆمەڵکـوژیی گەلـی کـورد و لەنـاوبردنی زمـان و کولتـوورەکەی هەڵبگرێـت. لە دەسـتووردا، وەکوو دەوڵەتی عێراق، دان بە مـافی یەکسـانبوونی کورد و تـورک و نەتەوەکانی تری تورکیادا بنێت.

دوای تەواوبـوونی سـێمینارەکە نەدیـم داغـدەڤیرەن پێشـانگای کتێـبە قەدەغەکراوەکـان و گـوڵە یاسـاغەکانی کـردەوە. بەشـێکی پێشانگاکە لەو کتێبە کوردی و تورکیانە پێک هـاتبوو، کە لە تورکیا قەدەغە کرابوون. بەشـەکەی تـری ئەو گوڵانەی بەخـۆ گرتبوو، کە ڕووەکناس (بوتانیک)ە ئەوروپییەکان، بۆ یەکەم جار لە کوردستان دۆزیویـاننەوە و نـاوی کوردیـان لـێ نـاون، بەڵام لە تورکیـا ناوەکانیـان یاسـاغ کـراون. بـۆ نمـوونە ڕووەکناسـی سـوێدی پرۆفێسـۆر جۆن فرۆدین سـاڵی ١٩٥٢ لە کوردسـتان چەند جۆرە گـوڵێکی دۆزیـیەوە وەکـو: پرانگـۆس، ئەوفراسـیا و هەدیسـاریۆم. لەبەرئەوەی ئەم جـۆرە گـوڵانە یەکەمـین جـار لە کوردسـتان دۆزرانەوە، نـاوی جۆرەکەیـان وشـەی کـوردی خـرایە پـاڵ و بەم شـێوەیە نـاونران: پرانگـۆس کوردیکـا، ئەوفراسـیا کوردیکـا و

---

1- هەمان سەرچاوە، ل. ١٩٨

هەدیساریۆم کوردیکوم. ئەم ناوە کوردیانە، تورکیای هەژاند. بۆیە ئەو وتـار و کتێبـانەی نـاوی ئەو گولانەیـان تێـدا هـاتبوو، لەگەڵ کتێبەکـانی فـرۆدین، لە تورکیـا قەدەغە کـران. نەدیـم لە کـاتی کردنەوەی پێشانگاکەدا باسی ئەو مەسەلەیەی کرد و وتی:

ئەو گـولانە یـان ناوەکانیـان گـۆڕدران، یـاخود بە "جوداخـواز" داندران و یاساخ کران.

سێمینارەکە و ئەو پێشانگایە، لە میدیای نەرویجی باس کران و چاوپێکەوتن لەگەڵ نەدیم داغدەڤیرەن، ئەحمەد ئاڵتـان و بەنـدە کرا. ئەو پێشانگایە پێشتر لە ستۆکهۆڵم، لە کتێبخانەی کوردی، کرابۆوە، لە مێدیای سوێدی زۆری لەبارەوە وترا و نووسرا.

لە کۆتایی فێستیڤاڵدا سەرۆکی فێستیڤاڵ، کنوت ئۆدێگۆرت وتی:

ئەمساڵ فێستیڤاڵەکە لە سالانی تر سـەرکەوتووتر بوو، چونکە نووسـەری جیهـانیی زیـاتر بەشـدار بـوون، هەروا باسـکردنی مەسـەلەی کـورد و تورکیـا، فەلەسـتین و ئیسـرائیل و مەسـەلەی تاتییەکان، ناوەرۆکێکی تریان بە فێستیڤاڵەکە دا.

دواتر بە ناوی فێستیڤاڵەکەوە داوای لە دەوڵەتی نەرویج کرد، کە ئەو ڕاکێت و چەکـانەی بڕیـارە بە تورکیـا بفرۆشـرێن، ڕابگیـرێن. چونکە تورکیا لە دژی کورد بەکاریان دەهێنێت.

لەو فێستیڤاڵە هونەرمەندی شێوەکاری نەرویجی خاتوو (سیسیل سـتانگێنێس)م ناسـی، کە لە هەمـوو چالاکییەکـانی فێسـتیڤاڵەکەدا بەشـدار بـوو. وا دیـار بـوو هۆنراوەکـانی مـن سـەرنجی ئەویـان ڕاکێشـابوو. لەوێ پێی وتـم دەیەوێـت بە ئیلهـاموەرگرتن لە چـاپی سـوێدی کـۆمەڵە هـۆنراوەی (وەرزی سـەهۆڵبەندان) کە شـاعیر و نووسەر گۆران مەریوانی کردوویەتی بە سـوێدی، کۆمەڵێک نیگار بکێشێت. من ویستم کارەکانی ببینم. پێکەوە چووینە ئەتەلیێکەی، کە

لە دەرەوەی مۆڵدێ بوو، بەسەر دەریاچەیەکی دڵگیردا دەیڕوانی. لەوێ بەشێکی کارە هونەرییەکانی خۆی پیشان دام. دواتر سیسیل، کۆمەڵێک نیگاری گرافیک و زەیتیی کێشا و سێ ساڵ لە سێ شاری نەرویج پیشاندران و چەند وتاریان لەبارەوە نووسران، لەبەشی دواتردا ئاماژەی پێ دەدەم.

هەروا لە فیستیڤاڵی تری ئەدەبی، لە گەڵ شاعیرانی بیانی، لە ستۆکهۆڵم و فیستیڤاڵی شیعری کوردی- دانمارکی و پیشانگای شێوەکاریی کوردی کە لە ڕۆژانی ٢٩ و ٣٠ ئایاری ١٩٩٩ لە شاری کۆپنهاگن ڕێک خرا، بەشدار بووم.

لە ڕۆژانی ٢٥ تا ٢٧ی نیسانی ٢٠٠٢ ڕۆژی ئەدەبی سکاندیناڤی و فیستیڤاڵی شیعری سکاندیناڤیا لە تالین، پایتەختی ئێستۆنیا، لە لایەن بیرۆی ڕاگەیاندنی ئەنجومەنی وەزیرانی سکاندیناڤی لە تالین و یەکێتیی نووسەرانی ئێستۆنی و کتێبخانەی نەتەوەیی ئێستۆنیا، بەڕێو چوو. لە هەر وڵاتێکی سکاندیناڤیا- سوێد، نەرویج، دانمارک، فینلەندا، ئایسلاند، سێ شاعیر بانگ کرابوون. لە سوێد ئێڤا ڕونەفێلت، هۆکان ساندێل و ڕەفیق سابیر بەشدار بووین.

لە کاتی کردنەوەی فیستیڤاڵەکە بەرپرسی بیرۆی ڕاگەیاندنی ئەنجومەنی وەزیرانی سکاندیناڤی، خاتوو کاللی کلێمێنت، لە وتەیەکدا وتی:

لە وڵاتانی سکاندیناڤیا چەندان شاعیر و نووسەری بیانی دەژین، ئەوان بە بەرهەمەکانیان ژیانی ئەدەبی ئێمەیان دەوڵەمەند کردووە. خۆشحاڵین یەکێک لەو شاعیرانە، کە خەڵکی کوردستانە و لە سوێد دەژی، بەشداری ئەم فیستیڤاڵەمان دەکات.

لە فیستیڤاڵەکەدا هەر شاعیرەی سێ جار و لە ڕۆژانی جۆراوجۆر و شوێنی جیاواز شیعریان خوێندەوە. ئێمە بە زمانی

خۆمان شیعرەکانمان دەخوێندەوە، تەرجومەی شیعرەکان بە زمانی ئێستلاندی، لە لایەن ئەکتەرێکەوە، دەخوێندرانەوە. خاتوو ئیریا کیسکیۆلا پازدە هۆنراوەی منی لە سویدییەوە تەرجەمەی زمانی ئیستۆنی کردبوو، کە هەموویان لەوێ خوێندرانەوە. لە هەمان کاتدا دوای نیوەڕۆیەک بۆ شاعیرانی ئێستۆنیا تەرخان کرابوو. ڕۆژی ٢٦ی نیسان، ڕۆژنامەی ئەدەبیی SIRP بە زمانی ئێستۆنی چەند بەرهەمی ئەو شاعیرانەی بڵاو کردەوە، لەوانە شیعری من. دواتر ساڵی ٢٠٠٣ هەڵبژاردەی شیعری شاعیرە میوانەکان، لەگەڵ کورتەی ژیانیان، بە زمانی ئێستۆنی و زمانی هەر کام لەو وڵاتانەی شاعیرەکان نوێنەریان بوون، لە کتێبێکدا بڵاو کرانەوە.[1]

---

1- ناوی کتێبەکە بە زمانی ئێستۆنی:

VIKUSTE VARJUS, Pohjamaade Lullet, Esti Ramat, Talin 2003

٥

## زایەڵەی شیعر

ســـاڵی ١٩٩٩ گـــوڵبژێرێکی هۆنراوەکـــانم بە نـــاوی (وەرزی ســەهۆڵبەندان) کە گـۆران مەریـوانی کردبـووی بە سـوێدی، بـڵاو کـــرایەوە. کتێـــبەکە لە قەســـیدەی وەرزی ســــەهۆڵبەندان و ٢٩ هۆنراوەی هەڵبژاردە پێک هاتووە، کە ساڵانی حەفتاکان تا کۆتـایی نەوەتەکـان نووسـراون. نووسـەری دیـاری سـوێدی، توربیـۆرن سێففێ، لە پێشەکیی کتێبەکەدا، نووسیویەتی:

(من لەم هۆنراوەیەدا –وەرزی سەهۆڵبەندان- بەردەوام زایەڵەی مایاکۆفسـکیم دێـتە بەرگـوێ، نەک وەکـوو لاسـاییکردنەوە، بەڵکـو وەکـوو نمـوونەیەکی تـری کەسـایەتییەکی سـەربەخۆ، یـاخییەکی ئەویـن، یـان ئەویـنـدارێکی یـاخی. ڕەفیقـیش وەکـوو مایاکۆفسـکی دەسووتێت، ژانی سیاسی و جیهانگری "کەونی"ی خۆی، پڕ بەدەنگ دەردەبڕێت... ئەو هەمیشە فۆرمی نوێ تاقی دەکاتەوە، هەر وەکوو لـە هـۆنراوەی حەسـرەتەکانی ئۆدیسـادا... ڕەفیـق دەزانـێ چـی لـە شـاعیرێکی ڕەسـەن دەخـوازرێ: {مەترسـە، خـۆت بیـر بکـەرەوە!}. منـیش وەک ڕەفیــق هــەر ئــەو دوو هاندانــەم بــۆ خوێنــەران لا پەسەندە.)[1]

---

1-Rafik Saber, Istidens epok, översättning och urval av Goran -1 Meriwani, Lindelöws bokförlag, Göteborg, 1999, s.8

شـاعیر و ڕەخنەگـری سـوێدی بـۆ گوستاڤسـۆن، کە چەنـد بەرهەمـی کـراون بە کـوردی، لە وتارێکـدا، قەسـیدەی وەرزی سەهۆڵبەندان بە (وێرانە خاک)ی ئێلیۆت دەچوێنێت:

(وەرزی سـەهۆڵبەندان هۆنراوەیـەکی وەهـا هاوچەرخـە کـە نـەک هەر ڕەنگی باری دەروونیی منی هۆنراوەکە، بەڵکوو ڕەنگی نامۆیی و ستەمکاریی سەردەمی ئێمەش دەداتـەوە. ئـەم هـۆنراوە درێـژە لـە تـین و گـوڕی تێڕامانەکەیـدا، وەک هـۆنراوەی وێرانـەخاکی ئێلیـۆت دەچێت. تەنانەت لە بواری تـەکنیکی شیعریشـییەوە جارێک لـە ڕێی وێنـــە مەجازییـــە زۆرەکـــانی و جـــارێکیش لـــە ڕێـــی شـــێوازە مووزیکییەکەیەوە بە وێنەگری پاتەوپات و سـەربەندەکانییەوە، هـەر بە وێرانە خاک دەچێت.)[1]

ئەم قەسیدەیە و هۆنراوەکانی تری نێو کتێبەکە، هانی شاعیر و ڕەخنەگر، بۆ گوستاڤسۆنی دا، سەرەتا چەپکە هۆنراوەیەکی من، لە ئینگلیزییەوە بکات بە سوێدی. ساڵی ٢٠١٨ هۆنراوەکان لە ئەنتۆلۆگیایەکی شیعریدا، بڵاو کرانەوە[2]. هەروا گوستاڤسۆن کۆمەڵەهۆنراوەیەکی منی لە ئینگلیزییەوە کردووە بە سوێدی، پێشەکیی بۆ نووسیوە و ئێستا بۆ چاپ ئامادەیە.

نووســـەر و ڕۆژنـــامەنووس مایـــا نیتیـــامیکی دەنووســـێت: (لە هۆنراوەی وەرزی سـەهۆڵبەنداندا ئەم شۆڕشـگێڕە لاوە، بە ناچاری پێشی پێ دەگیرێ و لەبەر هەلومەرجە سەختەکانی مرۆڤ و وڵات و ئەڤین، ئازار دەچێژێت... ئەم هۆنراوەیە پڕە لە هێزێکی زایەڵەدار: لێرەدا هاواری مرۆڤێکمان دێتە بەرگوێ کە گەیشتۆتە کۆتایی ڕێگا

---

1- ڕۆژنامەی ئوپسالا نیا تیدنینگ Uppsala Nya Tidning ڕۆژی ١٥-١١-١٩٩٩، نووسەر حەسەن نوور ئەم وتارەی کردووە بە کوردی، لە ڕەخنەی چاودێر ژ.٧٤، ١٦-٧-٢٠٠٧ بڵاو کراوەتەوە.

2- I RÖRELSE, 27 poet från Uppland, bokförlaget EDDA 2018

و سۆراخی سەرەتایەکی نوێ دەکات... هۆنراوەکانی سابیر، بە بەراورد لەگەڵ ئەو بەرهەمە کوردییانەی کە بە سوێدی خوێندوومنەتەوە، تایبەتتر و ئیندیڤیدوالترن. ڕەفیق کەمتر پەنا دەباتە بەر زەخرەفەی تەقلیدی- ئەو خیتابە نیشتمانپەروەرییەی کە زۆربەی جاران بۆ خوێنەری ڕۆژئاوایی نامۆ دێتە بەرچاو. میتافۆرەکانی بنەڕەتی و جیهانین، وەکوو ڕەگەزەکانی ڕووناکی و تاریکی، ئەستێرەکان، مانگ...)[1]

نووسەر پێتەر ئۆرتمان دەنووسێت: (ڕەفیق سابیر شاعیرێکی گرینگە.. بەرهەمەکانی (ئوپسالا)ی هۆنراوەی ڕاستەقینەی ئەویندارین. پاشخانی هۆنراوەکانی پێشووی خەباتە لەپێناوی ئازادیدا... من کە ئەم کتێبە دەخوێنمەوە دەرک بە هێزی هۆنراوەکان دەکەم، دەزانم چەند وەرگێڕان بەهێز بێت، ناتوانێت فرەڕەنگیی هۆنراوەکان بخاتە ڕوو، بە هەر حاڵ دیارە گۆران مەریوانی توانیویەتی شاعیری فرە بە توانا دیار بخات.)[2]

نووسەر و ڕۆژنامەنووس ڕێکارد هۆڵمی دەنووسێت: (ئەگەر ئەوین بخەینە پاڵ پەیام و ئازادییەوە، بیانخەینە پاڵ یەکسانی و برایەتییەوە، ئەوسا چوارچێوەی گەوهەری هۆنراوەکانی ڕەفیق سابیر دەستنیشان دەکەین.. خەونەکانی لەبارەی جیهانێکەوەن لەسەر بنەمای نرخاندنی مرۆڤایەتی پێک هاتووە.. ڕەفیق تاسەیەکی هەمیشەیی لەکۆڵ ناوە، تاسەی هێزێکی لەمرۆڤبەدەر، تاکو لەگەڵ بروسکەدا یەک بگرێت: -ئەمشەو بروسکە زین دەکەم هەڵت دەگرم- تاسەی گەڕانەوە بۆ سەرەتایەکی نوێی هەڵگرتووە، بۆیە ئاوڕ لە منداڵیی دەداتەوە. شیعرەکانی ڕەفیق سابیر داوای زۆریان

---

1- مایا نیتیمێکی ڕۆژنامەی: Nerikes Allhanda ١٠/٣٠ – ١٩٩٩

27.12.1999 , Helsiborg Dagblad-2

لە خوێنەر هەیە، هەر پێهەڵنانێکی هەڵە خوێنەر هەڵتە دەکات.)[1]

شاشتین هۆگبووم یوهانسۆن، لە گۆڤاری ئەدەبیی کارڤان دەنووسێت: (شیعرە درێژ و گرنگەکە، وەرزی سەهۆڵبەندان، کە ناوی گوڵبژێرەکەشە، مەبەستی هەم وەرزی جەنگ و هەم وەرزی مەنفایە. لە شیعرەکەدا هەستەکان لەنێوان ڕقبوونەوە لە کۆمەڵکوژی و ئەو توندوتیژییە بێمانایەی کە کورد، لە ڕاونانیاندا، دووچاریان دەبنەوە، دێن و دەچن. بەڵام جۆرێک بێهیوابوونیش لە مێژوو بەدی دەکرێت. دیمەنی شیعرەکە بەرفراوانە، مەوداکان گەورەن و ئاسۆ بەرینە. چیاکان هەڵدەکشێن، داربەڕووی چیا گەشە دەکەن و جۆگەکان بەخوڕ دەڕژێن. ئیتر لەناکاو چەخماخەی شەڕ ئاسمان دەقەڵێشێ و ئاسۆ دەلەرزێ. هەموو شتێک بە جوولانەوەیەکی دینامیکیی بەهێز دەخرێتە گەڕ و کۆچی پێ دەکرێ. (من)ی شیعر ناچار دەکرێ: ڕوو لە شاخ بکات و ببێت بە ڕێگر، گۆڕهەڵکەن، زێوان، یاخی، ئاژاوەگێڕ، تورکی کێوی، کۆڵبەر و زۆر شتی تریش.)[2]

گۆران مەریوانی، کە شیعرەکانی کردوون بە سوێدی، ڕای وایە:

(هیچ ژان و ئازارێک لە ژانی (بوون-و-نەبوون) سەختر، قورستر، بە ئازارتر و قووڵتر نییە. ئەمن کە (وەرزی سەهۆڵبەندان) یان (لاوکی هەڵەبجە) دەخوێنمەوە تووشی هەمان ژان و ئازار دەبم، یانی بە وشەیەکی دی، بمێنم یان نەمێنم! تەنێ دوورگەیەکی

1-ڕۆژنامەی Östgöta Correspondenten لە ١٧-١١-١٩٩٩

نووسەر حەسەن نوور پوختەی ئەو بۆچوونانەی سەرەوەی نووسەرە سوێدییەکانی لەبارەی (وەرزی سەهۆڵبەندان) نووسیویانە، کردووە بە کوردی. بڕوانە: حەسەن نوور، وەرزی سەهۆڵبەندان، گۆڤاری ڕابوون، ژ. ٢٩-٢٠٠٠ ل ٩٩-١٠٠ سوێد.

2-Karavan nr. 1, 2000, Kärstin Högnbom Johansson

نووسەر و وەرگێڕ ڕزگار شێخانی ئەم نووسینەی کردووە بە کوردی.

گچکە لەو نێوەندەدا هەیە، ئەویش سنووری نێوان ئەو دووانەیە کە دۆزەخێکە بۆخۆی! دۆزەخێک ناڵەی ئاگری هەرگیز سارد نابێتەوە؛ تا دەتکاتە قەرەبرووت. تا خۆت دە نێو دۆزەخی بێ بنی خۆتدا بە (سووتاوی)، بەڵام پڕ گومان لە خۆت، لە دەوروپشتت و لە گشت دیاردەیەک دەدۆزیتەوە! ئەم ژانی بوون-نەبوونە خەسڵەتی سەرەکی پێشکەوتنە. ئەو دوو بەرهەمە پێش ئەوەی لاوانەوە و دڵدانەوەی خەڵک و نەوەیەک بێ، لاوانەوەی خودی (سابیر)ی مرۆڤ و شاعیر خۆیەتی لەو دۆزەخەدا، تا کڵوکۆی کەمێ دامرکێتەوە. ئەو دڵدانەوەی خۆی لە لاواندنەوەیەکدا، بە پلەی یەک، بۆ خودی خۆی نووسیووە، پێش ئەوەی ببنە لاوانەوە و دڵدانەوەی ئێمە. هەر چی لە کایەی ئێستێتیکادا، بە بۆچوونی من، لەمەڕ ئەنفال و هەڵەبجە نووسراون بە شکۆ و جوانی ئەو دوو بەرهەمە ناگەن. چوون سابیر باسی هەمان دۆزەخ و (ئەنفالستان)ی نێو ناخی خۆی و لەوێوە دەروونی ئێمەش دەکا! ئەمجۆرە لە ئێستێتیکا بە نەمری دەمێننەوە. ئەو دواکەی تۆز و غوبار کۆ دەکەنەوە.

هەر ئەم ژانەیە من دەهێنێتە سەر مەراقی وەرگێڕانی بەرهەمی ئەو. تا دنیا، گەر بکرێ، ناخی سووتاوی میللەتێک هاوتەبای هۆلۆکۆست ببینن.)

نووسەر و ڕۆژنامەنووس ئاننا فرانکلین، لە کتێبی (گەنجینە ئەدەبییە نەبیندراوەکان)، کە بەشێکی لەبارەی بەندەیە و دیدارێکی ئەدەبیی، بە زمانی سوێدی، لەگەڵ کردووم، دەنووسێت:

(شیعرەکانی ڕەفیق سابیر زۆر باسی ئازادی، عیشق، جوانی، تەنیایی، غەریبی و مەنفا دەکەن، ئەوانە بەردی بناغەی

نووسەرایەتیی ئەون.)[1]

دوای بڵاوبوونەوەی کۆمەڵە هۆنراوەی وەرزی سەهۆڵبەندان، ساڵی ۲۰۰۲ خەڵاتی ئەدەبیی (کلاس دی ڤیلدیر)م لە سوید پێ درا. ئەو خەڵاتە دوو ساڵ جارێک بە نووسەرێکی بیانی، کە بەرهەمی بە سوێدی بڵاو کرابێتەوە، دەدرێت. لە کاتی وەرگرتنی خەڵاتەکە، لە پێشانگای ساڵانەی جیهانیی کتێب لە یۆتۆبورگ، سەرۆکی لیژنەی خەڵاتەکە، جیمی هۆفسۆ، لە وتارێکدا، کە لەوێ پێشکەشی کرد، وتی:

(وەرزی سەهۆڵبەندان کۆمەڵە شیعرێکی جوان و بەهێز و باڵادەستە، رەفیق تابلۆی سووریالی توورە و خەمگینی تیادا کێشاون، کە بە چاوێکی هاندەرانەوە دەڕواننە چاوانی خوێنەران. تابلۆکان بە شێوازی هەم کلاسیکیانە و هەم مۆدێرنیستانە ڕازێندراونەتەوە. لەم کۆمەڵە شیعرەدا مرۆڤ هەست بە بوونی ڕێگایەک دەکات، کە لە بێچارەیی و پەژموردەیی جەنگەوە رووەو بڕوابوونێکی پتەو و سەرکەش بە هێزی هەڵسانەوەی خۆشەویستی، درێژ دەبێتەوە).

لە دەمی ڕێزلێنانەکە گۆران و من چەپکە هۆنراوەیەکی وەرزی سەهۆڵبەندانمان بە سوێدی و کوردی خوێندەوە. دواتریش چەند کۆڕێکی تری شیعریی، بە بۆنەی چاپبوونی کتێبەکە لە شاری تر بۆ شیعردۆستانی سوێدی ڕێک خرا.

ڕۆژی ۲٤-۸-۲۰۰۲ ڕۆژنامەی سڤێنسکە داگبلادت نووسی:

---

1- Anna Franklin & Reza Rezvani, De osynliga litirateraturskatten, Bokförlaget Tranan, 2010 Stockholm

ڕزگار شێخانی تەواوی دیدارەکەی کردووە بە کوردی. بڕوانە: رەفیق سابیر، ڕوانین بە ڕووناکیدا، سەرچاوەی پێشوو.

(ڕەفیق سابیر بەهۆی وڵاتە شیعرییەکەی، وەرزی سەهۆڵبەندان، لە لایەن دەزگــای –کــلاس دی ڤیلــدێر– خەڵات کــرا، ئەمە لەبەر ئەوەی ڕەفیق دۆخی تاراوگە (ئێکسیل)ی لە شیعرەکانیدا گۆڕیوە بە وڵاتێکی شیعری و بۆخۆی بە بێ هیچ گەرەنتییەک تێیدا دەژی.)

***وەرزی سەهۆڵبەندان بە تابلۆ**

هونەرمەندی نەرویجی سیسیڵ ستانگێنێس، کۆمەڵێک نیگاری بە ئیلهــامەوەرگرتن لە کۆمەڵەهــۆنراوەی (وەرزی ســـەهۆڵبەندان) بەزمــانی ســویدی، کێشــا و لە شــوباتی ٢٠٠٠ لە پێشــانگایەکی تایبەتدا، بە نــاوی (ئێکسـیل) لە شــاری بێرگێن لە نەرویــج، پێشــان دران، منیش بۆ کردنەوەی پێشانگاکە بانگهێشتن کرام، کە وێڕای نەرویجییەکان، چەند هاووڵاتیی کوردی دانیشتووی بێرگن ئامادە بوون. لەوێ چەند شیعری خۆم بە کوردی و سویدی خوێندەوە. ئەو ســاڵە بێـرگین یەکێـک لەو دوو شــارە بــوو، کە بە پــایتەختی کولتووریی ئەوروپا دیاریی کرابوو.

ڕۆژی ١٤-٢-٢٠٠٠ ڕۆژنامەی نەرویجی Berg Tidende سیسـیڵ هــامرێ داگســلاند وتــارێکی بە نــاوی (بــابەتی ئێکسـیل لە وێـنەدا) لەبارەی پێشانگاکە بڵاو کردەوە، تیایدا هاتووە:

(ڕەفیــق ســابیر دەنگــێکە بــۆ ئەو کــوردانەی لە مەنفــا دەژیــن. شیعرەکانی ڕەفیق سابیر هێندە کاریان لە هونەرمەندی شێوەکار سیسـیڵ سـتانگێنێس کردووە، کە کۆمەڵە کارێکی گرافیکی لەسـەر چەنـد شـیعری ئەو کێشــاون. ئـێمە دەتـوانین کۆمەڵەکارێـک، یـان ڕاســتتر بڵـێم پرۆژەیەکــی بەڕاســتی هونەرمەنــدانە و بەتوانــا لە پێشانگای U.S.F بە ناوی ئێکسیل لە شاری بێرگین ببینین. سیسـیڵ

دەیەوێت لەڕێگای ئەم کارانەوە کۆمەڵێک لایەنی دەروونی و جەستەیی مرۆڤە ئاوارەکان پیشان بدات، کە بەزۆر لە وڵاتی خۆیان دەرکراون. لە هەمان کاتدا کۆمەڵێک شیعری ڕەفیق سابیر لە -وەرزی سەهۆڵبەندان- بە زمانی سوێدی لەناو کەتەلۆگی پێشانگاکە دەبیندرێن. سابیر دەڵێت:

ئەم شیعرە باسی ژیانی منداڵی دەکات لە بارودۆخی شەڕدا، باسی تەنیایی، مەنفا و ئەو شتانە دەکات کە مرۆڤ لە دەستی داون.

پار لە فێستیڤاڵی بیۆرسۆن، فێستیڤاڵی ئەدەبی جیهانی، سیسیل بۆ یەکەم جار ڕەفیق سابیری ناسیوە و گوێی لە شیعرەکانی بووە، کە زۆر کاری تێکردوون، سیسیل دەڵێت:

دوای خوێندنەوەی شیعرەکان -وەرزی سەهۆڵبەندان-م لە لاوە دادەنا، بە ئیلهاموەرگرتن لەوان، خەریکی نیگارکێشان دەبووم. دوای ئەو کارە بۆم دەرکەوت کە شیعر و ڕەسم چەند دەتوانن پێکەوە یەکتر بخوێننەوە و کاریگەری لەسەر یەکتری دروست بکەن. کولتوور زمانێکە سنووری نییە، بۆیە هێزێکە بۆ ئاشتی و تولێرانس. ئەمە دیدی سیسیل ستانگێنیسە.)[1]

هەروا ڕۆژنامەی BAی نەرویجی، لە ژمارەی ٤٣ی ڕۆژی ١٣-٢-٢٠٠٠ لەبارەی پێشانگاکە، نووسیویەتی:

(شیعرەکانی شاعیری کورد ڕەفیق سابیر پڕ هەستن و ئیلهامیان بە سیسیل ستانگێنیس داوە کە بیر لە کارێکی هاوبەش لەگەڵ شاعیردا بکاتەوە، پێشانگای (ئێکسیل) ئەنجامی ئەمەیە. لە فێستیڤاڵی ئەدەبیی بیۆرنسۆندا لە شاری مۆلدێ، کە مەسەلەی

1- تەها فەرهاد، وەرزی سەهۆڵبەندان لە پێشانگایەکی نیگارکێشیدا، ڕابوون، ژ. ٢٩، ٢٠٠٠، ل٩٨-٩٩

زمان و کولتووری کوردی بابەتێکی سەرەکی بوون، شیعرەکانی ڕەفیق سابیر لەوێ سەرنجی ستانگێنێسیان ڕاکێشاوە. کارە گرافیکییەکانی هونەرمەندی شێوەکار، سیسێل، سەربەخۆن، بەڵام لە هەمان کاتدا بە هاوکاریی کۆمەڵەهۆنراوەی ڕەفیق سابیر، وەرزی سەهۆڵبەندان، هێنراونەتە بەرهەم. پێشانگاکە لێکدانەوەی جۆر بە جۆری مەنفای دەرەکی-جەستەیی- و مەنفای ناخ – دەروونی- پێشان دەدات.)[1]

دوای پێشانگاکە چەند ئەدەبدۆستی کورد، کە لە شارەکە دەژیان، لە کەبابخانەیەکی ناودار میوانداریبیان کردم. دەرکەوت تۆفیق، کە لە سویدەوە بۆ پەنابەری ناردم بۆ نەرویج و لە هەواڵی دابڕابووم، خاوەنی کەبابخانەکەیە. تۆفیق گوزەرانی باش بوو، کچێکی نەرویجی هێنابوو، پێکەوە کەبابخانەکەیان هەڵدەسووڕاند. ئەو ڕۆژە هەمووومان میوانی تۆفیق بووین.

لە ٢٦-٦- ٢٠٠٣ لە نەرویج، فیستیڤاڵی ساڵانەی نووسەر و زماناس(ئیڤار ئاسین)، لە شاری ئۆرشتا و ڤۆڵدا، ڕێک خرا. لەوێ هەمان پێشانگا، لەگەڵ کۆمەڵێک نیگاری نوێ، کە بە ڕەنگی زەیتی کێشرابوون بە ناوی (ئێکسیل٢- ئایا جارێک لە جاران دەتوانم بگەڕێمەوە ماڵ؟)، پێشان دران. ساڵی دواتریش لە ١٦-٧ پێشانگاکە (ئێکسیل٣) گوازرایەوە شاری دۆڤرێ، لە نەرویج. هەردوو جار پرۆفێسۆری هونەر لە زانکۆی بێرگێن، گوننار دانبۆڵت و بەندە بەشدار بووین[2]. پرۆفێسۆر گوننار باسێکی فراوانی لەبارەی پێشانگاکە و پێوەندیی نێوان تابلۆکان و

---

1- تەها فەرهاد، ڕابوون، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٨-٩٩

2- بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە ٧

شیعرەکانی ناو وەرزی سەهۆڵبەندان، پێشکەش کرد، منیش کۆمەڵێک هۆنراوەی خۆم بە کوردی و سویدی خوێندەوە.

سۆنیا دالسێت لە ڕۆژنامەی Vigga Tidning ژ. ٢٧ لە ١٥-٧ وتارێکی لەبارەی پێشانگاکە و لایەنی هونەری تابلۆکان و پێوەندییان لەگەڵ هۆنراوەکاندا نووسی، هەروا باسی هەندێک لایەنی ژیانی منی لە بەغدا و مەنفادا کردبوو.

لە فابریوەری ٢٠١١ بەشێک لەو تابلۆیانە لە سوید، لە شاری ئوپسالا، لە کاتی بڵاوکردنەوەی کتێبی (گەنجینە ئەدەبییە نەبیندراوەکان) پێشان دران، کە بەشێکی کتێبەکە لەبارەی بەندەیە.

گوننار دانبۆڵت لەبارەی پێشانگای هونەریی ئێکسیل و هۆنراوەکان نووسیویەتی:

(تایبەتمەندیی ئەم پێشانگایە ئەوەیە کە ناونیشانی هەر تابلۆیەک یان ئاماژە بە یەکێک لە شیعرەکانی سابیر دەکات، یاخود ئیلهام لە ئەدەبیاتێکی جیهانی وەردەگرێت کە لەنێو ڕستەکانی سابیردا ئاهەنگێکیان پێک هێناوە. پێشانگاکە، بەو چوارچێوە و نەخشەیەی کە سیسیل ستانگێنێس کێشاویەتی، تەماشاوانان بەنێو جیهانی ئێکسیلدا دەبات. ئێمە تەنیا سەرنجمان ڕاناکێشرێت، بەڵکو دەبینە هاوبەش و پارچەیەکی مرۆڤی ئێکسیل و لەگەڵ هەستی مرۆڤی بێزمان و تەنیایی لە ئێکسیلدا ڕووبەڕوو دەبینەوە:

تەنیا یەکتری شک دەبەین
پاڵمان داوە بە یەکەوە،
جەستەمان بۆنی یەکتری و
بۆنی باران و تریفەی گرتووە.
وەکوو دوو پشکۆ پاڵمان داوە بە سەرماوە
یاری بەڕووناکی دەکەین،

پاڵمان داوە بە خەون و تەنیاییەوە
یاری بە ژیان و مەحاڵ دەکەین.
هەر تەنیا یەکتری شک دەبەین
پێکەوە وڵاتێک لە خەون
ماڵێک لە ڕووناکی
داهاتوو لە ئەڤین چێ دەکەین.

بەراوردکردن و گونجاندنی ئەم ماڵە لەگەڵ ڕاستیی ئەو وڵاتەدا کە مرۆڤی ئێکسیل زۆر دەمێکە بە جێی هێشتووە، وا ئاسان نییە، بەڵام ڕاگرتنی خەونەکانی مرۆڤی ئێکسیل بە زیندوویی، لەڕاستییەکانی وڵات گرنگترە.

تابلۆکانی ستانگێنێس و شیعرەکانی سابیر لەگەڵ دژواریی ژیانی ئێکسیلدا ڕووبەڕوومان دەکەنەوە. بۆیە ناتوانین بیر لە وەڵامی ئەو پرسیارانە نەکەینەوە کە ئەوان، لە ڕێگەی ئەم پێشانگایەوە، ڕووبەڕوومانی دەکەنەوە. ئەمەیش وامان لێ دەکات باشتر تێبگەین کە خەون بۆ بەرەنگاربوونەوەی دژواریی دۆخی ئێکسیل پێویستن. بەڵام ئایا ئەم مەسەلەیە، بۆ ئێمە، کە لە وڵاتی خۆماندا دەژین، زۆر جیاوازە؟ کێشە تایبەتەکانی مرۆڤی ئێکسیل تیشکی ڕووناکی دەخەنە سەر بارودۆخی مرۆڤی ئاسایی، هەرچەندە ئێمە لە دوو جیهانی نایەکسانیشدا دەژین.)[1]

***

1- ڕەفیق سابیر لە ڕوانینی پرۆفیسۆرێکی نەرویجیدا، مەسعود زیلان کردوویەتی بە کوردی، ڕەخنەی چاودێر ژ.٦٩ و ٧٠ لە ١١ و ١٨ ی حوزەیرانی ٢٠٠٧

پاش ڕوخاندنی ڕێژیمی سەدام، هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی عێراق، قۆناخێکی نوێی سیاسی، لە عێراق و کوردستان دەستی پێ کرد. دەرفەتی نوێ بۆ چارەسەری عادیلانەی کێشەی نێوان عێراق و کوردستان، دامەزراندنی دەزگای نەتەوەیی لە کوردستان، ڕەخسا. پایزی ٢٠٠٥ گەڕامەوە کوردستان، لە سلێمانی لە مەڵبەندی کوردۆلۆجی دەستبەکار بووم.

تا ئەو کاتە تەنیا دوو کۆمەڵە هۆنراوەم لە باشووری کوردستان بڵاو کرابوونەوە. هەشت کۆمەڵەهۆنراوە و نامیلکەی شیعریم لە ئێران-مهاباد، لەندەن، لوبنان، ئەڵمانیا، سوێد، پەخش کرابوون. لە کوردستان ئەو کۆمەڵەهۆنراوانە و چەند هۆنراوەی ترم، لە دوو بەرگدا بۆ چاپ ئامادە کرد. ساڵی ٢٠٠٦ لە لایەن دەزگای هاووڵاتی بە ناوی (بە تەنیا جێی مەهێڵن) و (ڕاز و گومان)، بڵاو کرانەوە. خوێنەران و نووسەران زۆر بە باشی پێشوازییان لێ کرد. ڕۆژنامەی چاوێر، بەشی پاشکۆی ڕەخنەی چاودێر، دۆسیەیەکی بە ناوی (ڕەفیق سابیر سیمفۆنیای شیعری ئەم سەدەیە) تەرخان کرد، زنجیرەیەک وتار و باس لەبارەی شیعرەکان نووسران. هەفتانە، لە ماوەی ١٨ هەفتەدا، لە ڕەخنەی چاودێردا بڵاو کرانەوە[1].

زۆربەی باسەکان بە دوو بەش و سێ بەش چاپ کران. لە دۆسیێیەکەدا ئەم نووسەرە بەڕێزانە بەشدار بوون: د.موحسین عومەر ئەحمەد، محەمەد کوردۆ، عەباس سەلیمی ئانگێل، ئەحمەد ڕەزا، عەبدوڵڵا تاهیر بەرزنجی، نەجات نوری، جەبار سابیر، پرۆفیسۆر گوننار دانبۆڵت، لە نەرویج و شاعیر و نووسەری سوێدی بو گوستافسۆن، دواتریش، لە ١٩-٥-٢٠٠٨ ژ.١١٧ی

1- ڕەخنەی چاودێر، ژ. ٦٢ لە ٢٣-٤- تا ژ. ٧٩ی ڕۆژی ٢٠-٨-٢٠٠٧

چاودێر، نووسەری ئێرانی، حافز موسەوی، وتارێکی لەبارەی قەسیدەی وەرزی سەهۆڵبەندان و لاوکی هەڵەبجە نووسی، کە مەریوان هەڵەبجەیی کردوونی بە فارسی.[1]

ساڵی ٢٠٠٧ لە سلێمانی خەڵاتی ئەدەبیی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدم پێ درا.

لە دیسەمبەری ٢٠٢٢ ناوەندی پێنی کورد، لە ستۆکهۆڵم، ڕێزی لە چوار نووسەر نا، دوو نووسەری سویدی و نەرویجی و بەرپرسی ناوەندی پێنی نێونەتەوەیی، تێری کارلبۆم و یوجین شولگین، لەگەڵ دوو نووسەری کورد، محەمەد ئەمین بۆزئەرسەلان و ڕەفیق سابیر.

ساڵی ٢٠١٤ کۆی هۆنراوەکانم، لەگەڵ کۆمەڵەهۆنراوەیەکی نوێ (خەونێکی والا) لە بەرگێکدا بە ناوی (دیوانی ڕەفیق سابیر) لە لایەن ناوەندی غەزەلنووس لە سلێمانی چاپ کرا. ساڵی ٢٠١٧ هەمان دیوان بە ناوی (کۆی بەرهەمە شیعرییەکان)، لەگەڵ کۆمەڵەهۆنراوەی (ئەویننامە)، لە لایەن پەخشخانەی (مانگ) لە ئێران بڵاو کرانەوە. نووسەر و شاعیری ناسراو سەیدا (خەلیل دهۆکی) دیوانەکە و کۆمەڵەهۆنراوەی ئەویننامەی، گۆڕی بۆ تیپی کوردی-لاتینی، باسێکی لەبارەی شیعرەکان، بە کرمانجی نووسی و فەرهەنگۆکی بۆ وشە گرانەکان ئامادە کرد. ساڵی ٢٠١٩ کۆی بەرهەمە شیعرییەکانم، بە ناوی (شەوچرا) لە لایەن پەخشخانەی (لیس) لە ئامەد، تورکیا، بڵاو کرایەوە. پێشتر سەیدا خەلیل، ساڵی ١٩٩٦ کتێبێکی بە ناوی (مرۆڤ و وەلات د هەڵبەستێن ڕەفیق

---

1-بۆ بینینی هەموو نووسینەکان ویرای ڕەخنەی چاودێر، بڕوانە: سایتی هەواڵنامەی کتێب -د. ڕەفیق سابیر- hewalname.com

سابیر دا) لە سوید، بڵاو کردەوە. کتێبەکە باسێکی بە کرمانجی و تیپی لاتینی، لەگەڵ گوڵبژێرێکی شیعرەکان بەخۆ گرتووە.

چەندان نووسەر و شاعیر تریش، باس و وتاریان لەبارەی شیعرەکانم، بڵاو کردوونەوە، لەوانە:

کەمال میراودەلی، حەمەی حەمە باقی، ئەحمەدی مەلا، عەتا قەرەداخی، گۆران مەریوانی، گۆران قەرەداخی، مەلا بەختیار، عەباس بۆسکانی، ئومێد بێ نیاز، دارا مەحموود، نەجات حەمید، سەباح ڕەنجدەر، د.سەنگەر قادر شێخ محەمەد (نامەی دوکتۆرا)، عەبدولخالق یەعقووبی، د.مارف عومەر گوڵ، عەلی مستەفا نەجمەدین، گۆران گۆریانی، مەجید خەلیل، د.عەبدوڵڵا ڕەحمان، فاورق هۆمەر، ستار قادر، ئەنوەر قادر محەمەد، لەتیف هەڵمەت، سەباح غالب و نووسەری تر.

شەش ساڵ زیاتر لە کوردستان مامەوە. بەشێکی کار و چالاکیی ئەو ساڵانەم، لە کوردۆلۆجی و دوو ساڵ کارکردن لە پەرلەمانی کوردستان، لە چەند نووسین و چاوپێکەوتندا، باس کراون. لەوانە چاوپێکەوتنێکی فراوان، کە ڕۆژنامەنووس خەڵەف غەفوور، لەگەڵ بەندە سازی کردووە، وەکوو کتێب بڵاو کراوەتەوە.[1]

ڕۆژی ١٧ی شوباتی ٢٠١١ لە سلێمانی، تەقە لە خۆپیشاندەران کرا و چەند کەس شەهید و بریندار کران. من ئەو تاوانە مەحکوم کرد، پشتگیریی خۆم بۆ خۆپیشاندەران دەربڕی، وازم لە کاری پەرلەمان هێنا و گەڕامەوە سوید.[2] ڕەنگە بەشێکی تری ئەزموونی ئەو ساڵانە و دواتر، شایەنی ئەوە بن، لە دەرفەتێکدا باس بکرێن.

---

1- خەڵەف غەفور، عەشق و ئازادی، چاوپێکەوتن لەگەڵ ڕەفیق سابیر، چاپخانەی کارۆ، ئینستتوتی نارین، سلێمانی ٢٠٢١

2- بڕوانە بەڵگەنامەی ژ. ٨

## دواوته

له سـهرهتای لاویـیهوه پرسـی ئـازادی، داد، یهکسـانیی مـرۆڤ و هاومـافیی گهلان جێگـای بـایهخم بـوون. مارکسـیزم، هـزری سۆشیالیسـتی و هیومانیسـتی، لهو بـارهیهوه کـاریگهریی زۆریـان ههبووه. بهڵام وهکوو مـرۆڤ و نووسـهر، بیـر و هۆشـم بهڕووی هزری نوێ و جیاوازدا، کراوه بوون. له ئهدهبیات و هونهردا، پێش ههر شتێک، ئاستی داهێنان و لایهنی ئێستێتیکیم به گرینگ زانیون. لهگهڵ ههڵکشانی تهمهن و ئهزموونی ژیـان، خوێندن، خوێندنهوه و نووسـین، ئهو هـزر و پرسـانه گهشـهیان کرد، به هـزر و بۆچـوونی نـوێ متـوربه کـران. بهو ئهنجـامه گهیشـتم که پرسـی ئـازادی، داد، هاومـافیی مـرۆڤ و گهلان، تهنیـا له یهک جـۆره هـزر و فهلسـهفهدا سنووردار نـاکرێن. لهودیو چوارچێوهی ههر هـزر و فهلسـهفهیهک، فهزای کراوهتـر ههن، که دهتـوانن بهرچاومـان ڕوونتـر و سـنووری بیرکردنهوه و لێکدانهوهمان بهرینتر بکهن.

من لهو جۆره کهسـانهم، که ئهوهی به ڕاسـتم زانیوه، زۆر جـار بهپێـی شـوێن و دهرفهت وتـوومه، یـان نووسـیومه و داکـۆکیم لـێ کردووه. له ههندێک کات و حاڵهتدا بهڵگهی سـهلمێندراوم لهبارهی پرسـێک نهبـووه، کهچـی وهکـوو ڕاسـتییهک بـۆم ڕوانیـوه، چـونکه لهگهڵ هـزر و بۆچـوون، یـان حهز و ویسـتی منـدا گونجـاو بـووه.

دواتـــر ده‌رکـــم کـــردووه که به هه‌ڵه چـــووم. ئه‌وه‌ی به ڕاســـتی (هه‌قیقه‌ت)ی ده‌زانـین مه‌رج نییه هه‌میشـه دروسـت، یـان زانسـتی بێت، ده‌شێت هه‌ندێک جار ته‌نیا له‌نێو سه‌ری ئێمه‌دا بوونی هه‌بێت.

هه‌ڵه‌کـردن دیـارده‌یه‌کی مـرۆییه، هه‌ر مـرۆڤ- تـاکه‌که‌س هه‌ڵه ناکات، به‌ڵکو ته‌نانه‌ت کۆمه‌ڵ و گه‌لانیش به‌هه‌ڵه‌دا چوون و ده‌چن، یان گومڕا کراون و ده‌کرێن. زۆر هـزر، دیارده و ڕووداو وه‌کوو ڕاسـتییه‌ک قبـووڵ ده‌که‌ن و بـاوه‌ڕی پـێ دێـنن، ڕه‌نـگه قوربـانیی له‌پێناودا بده‌ن، که‌چی هه‌ڵه و نازانستین. هه‌قیقه‌ت و زانست مه‌رج نییه هه‌میشـه یه‌ک بن، ئه‌وه‌ی به ڕاسـتی داده‌نـدرێت و تـاکه‌که‌س، یان کۆمه‌ڵ، وه‌کوو حه‌قیقه‌تێک باوه‌ڕی پێ ده‌هێنێت، ده‌شـێت بێ بنه‌مـا و نازانسـتی بێت. چه‌ندان ڕووداوی مێژوویی هه‌ن که چۆن هێزێکـی سیاسـی، یـان سـه‌رکرده‌یه‌ک، درۆ و فانتازیـا و ئامـانجه خۆپه‌رسـتییه‌کانی خـۆی، وه‌کـوو هه‌قـیقه‌ت به خه‌ڵـک ناسـاندووه. ســـه‌رەنجام نه‌ته‌وه‌یه‌کـــی گـــومڕا کـــردووه، به‌ره‌و کاره‌ســـات و هه‌ڵدێری بردوون.

لێـره‌دا ئامـاژه به نمـوونه‌یه‌ک ده‌ده‌م، که پێوه‌نـدی به بـاوه‌ڕ و سروشته‌وه هه‌یه.

له ســه‌رده‌می یۆنـانی کـۆنه‌وه (گریـک) وا زانـدرابوو که خـۆر و مانگ به‌ده‌وری زه‌ویدا ده‌سووڕێنه‌وه. ئاینه‌کان هه‌مـان بۆچوونیـان، وه‌کوو ڕاستییه‌کی حاشاهه‌ڵنه‌گر، دووباره کردۆته‌وه. سـه‌دان ساڵ مرۆڤایه‌تی باوه‌ڕی به‌و بۆچوونه هێنابوو و قبووڵی کردبوو. به‌ڵام فه‌له‌کناس، زانـای ماتماتیک، نیکۆلاوس کۆپه‌رنیکوس ١٤٧٣-١٥٢٤ به‌و ئه‌نجـامه گه‌یشـت که خـۆر، نه‌ک زه‌وی، ســه‌نته‌ری گه‌ردوونه، ئه‌و دیـــمه‌نه‌ی که ده‌یبینـــین، خـــۆر له ڕۆژهه‌ڵاته‌وه هه‌ڵـدێت و له ڕۆژئـــاواوه ئـــاوا ده‌بێـــت، دیمه‌نێکـــی هه‌ڵخه‌ڵه‌تێـنه‌ره، چـونکه به

پێچەوانەوە، زەوی و هەسارەکان بە دەوری خۆردا دەسووڕێنەوە.

سەد ساڵ دواتر زانا و فەلەکناس گالیلۆ گالیلێی ١٥٦٤-١٦٤٢ تێلسکۆپی داهێنا و لەو ڕێیەوە سەلماندی کە تیئۆری کۆپەرنیکۆس ڕاستە. ئەو بۆچوونە پیاوانی ئاینیی تووڕە کرد، چونکە پێشتر تەنیا لە ڕووی تیئۆرییەوە ئەو قسەیە دەکرا، کەچی گالیلۆ وتی هەرکەس باوەڕ ناکات، با بێت بە بەڵگەوە ببینێت. ئەمە بە هەڕەشە لە دەسەڵاتی کلێسا و پیاوانی ئایینی دانرا. بۆیە کلێسا دادگای تایبەتی بۆ گالیلۆ دانا و ناچاریان کرد لە ماڵەکەی خۆی دەستبەسەر بێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زەوی بەدەوری خۆردا خولایەوە و دەخولێتەوە. ئەمە ڕاستییەکە، لەمێژە زانست و گەڕانی مرۆڤ بەناو گەردووندا، سەلماندوویانە.

ساڵانیکی زۆر بەو هیوایە دەژیاین، کە دەتوانین کۆمەڵ و ژیان بگۆڕین، سنوور بۆ ستەم دابنێین، وڵات ئازاد و پڕداد بکەین. لەوەشدا پشتمان بە ئایدیۆلۆجیای چەپی مارکسی، سۆشیالیستی و ئازادیخوازی، بەستبوو. لە ناوەڕاستی سەدەی پێشوو تا کۆتایی هەشتاکان، بزاڤی چەپ لە ناوچەکە و دنیادا بەهێز بوو. ئەو ئامانج و خەون و هیوایانە، مانای گرینگیان بە ژیانمان دابوون. بە هۆیانەوە گەشبین و دڵخۆش بووین، ئامادەبووین لەپێناویاندا هەموو شتێک ببەخشین. ئەوە کارێکی ئاسان نەبوو، وەکوو لە هۆنراوەیەکدا ئاماژەم پێ داوە:

بیرت نایە چۆن ڕێت کەوتە ئەم دەڤەرە
تەمی زەمان هەر شتێکی داپۆشیوە
تروسکەیەک هیوا نەبێت
خەونی مەزن ژانی گەورەی بەدواوەیە
لەوانەیە تا ڕۆخی شێتبوونت بەرێت.

هەزاران کەسی چەپ و ئازادیخواز، لە ئەندامانی حیزبی شیوعی، کۆمەڵە و ڕێکخراوە مارکسی و چەپ و ئازادیخوازەکانی کوردستان، گیانی خۆیان لەپێناوی ئەو خەون و ئامانجانەدا بەخشی. بەڵام ڕێگای خەونە مەزنەکە، بە هیچ جێیەک نەگەیشت. ئەو شکستە تەنیا هێزی و سیاسی نەبوو، بەڵکو ڕۆحی-مەعنەوییش بوو. کاردانەوەی جۆراوجۆر و ڕەشبینی و بێئومێدیی لێ کەوتەوە. بۆشایی لە ژیانی زۆربەماندا دروست کرد، بەڵام لە هەمان کاتدا بێداری کردینەوە. ژیان لەوێدا نەچەقی، مەسەلەی کارکردن بۆ دادپەروەری، بەرەنگاربوونەوەی ستەم و داکۆکیکردن لە ئازادی، هاومافیی گەلان و ڕەگەزەکان، کۆتاییان نەهات.

مرۆڤایەتی بۆ گەیشتن بە ژیانێکی باشتر، ئازاد، خۆشگوزەران و پڕداد، دەبێت بەردەوام ڕێگای نوێ تاقی بکاتەوە، لە ئەزموونێکەوە بەرەو ئەزموونێکی تر، ئەگەر بە قوربانیدانیش بێت، هەنگاو بنێت. ڕەنگە ئەوە بەشێک بێت لە چارەنووسی مرۆڤایەتی.

لە کاتی شکست و دارمانی خەون و هیوادا، مرۆڤ هەوڵ دەدات، بە شێوازی تایبەتی خۆی، قەرەبووی ڕابردوو بکاتەوە. بە دوای هیوای تردا دەگەڕێت، بۆ ئەوەی مانایەکی تازە بە ژیانی خۆی بدات. بۆشایی لە ژیانی مرۆڤ، لە کۆمەڵ و ڕەنگە لە سروشتیشدا، دەبێت پڕ بکرێتەوە.

لەو دۆخە سەخت و نائاساییانەدا، کە لە ناخەوە مرۆڤ دەهەژێنێت، خەڵک بە شێوازی جیاواز دەگۆڕدرێن. بەلای زۆرەوە هەرکەس دەگەڕێتەوە بۆ ئەسڵی خۆی، واتا بەو جۆرەی کە هەیە و هەڵکەوتووە، یان پەروەردە کراوە، نەک بەو شێوەیەی ویستوویەتی ببێت، یاخود خۆی پێ دەرخستووە. دیارە هەر کەس

ئازادە چۆن دەژی، خۆشی و داهاتووی خۆی لە چیدا دەبینێتەوە و چۆن بۆشایی ژیانی پڕ دەکاتەوە، بەڵام بەو مەرجەی زیان بە کۆمەڵ و کەسانی تر نەگەیەنێت.

بەشێک لەو هاوڕێ و دۆست و کەسانەی خەونی مەزنیان هەبوو و لەپێناویدا ژیان، دوای شکستیش، وەکوو جاران بە هەمان ڕێگا و بە هەمان میتۆد بەردەوام بوون. نەیانتوانی، یان نەیانویست، بڕوا بێنن کە ڕێگاکە بە بنبەست گەیشتووە، میتۆدەکەش لەکار کەوتووە. یان ئەوان هێندە گیرۆدە و پەرۆشی ڕابردوویان بوون، ئەوەندە بەسۆزەوە بۆ مێژووی تاکەکەسیی خۆیان دەڕوانی، نەیانتوانی دەستبەرداری بن. پێیان وابوو، بە بێ ئەو مێژووە و ئەو پێوەندییە کۆمەڵایەتییەی بەرهەمی هێناوە، وەکوو گەڵایەک دەبن، کە لە لکەدارێکی گەورە بەربووبنەوە. کەچی بەشێکی تر، لەوانە بەندە، سەربەخۆیانە، ئازادانە و بە شێوازی تر درێژەمان بە کارکردن دا. هاتینە سەر ئەو باوەڕەی کە مارکسیزم و ئەو مۆدێلە سیاسی و حوکمڕانییەی سۆشیالیزم پێشکەشی کرد، کۆتایی هات. بەڵام کارکردن بۆ ئازادی، داد، پێشکەوتن و یەکسانی، بە هزر و فەلسەفەیەکی تایبەتەوە بەند نییە، بۆیە هەر بەردەوامە. ئەمە پرسێکی هزری، ئەخلاقی، ڕووناکبیرییە، ڕاستییەکی ڕەهایە، کۆتایی نەهاتووە و نایە.

لە ڕەوشی ئەو گۆڕانکارییە مەزنەدا، هەندێکی دی لەوپەڕی چەپەوە ڕوویان لەوپەڕی ڕاست کرد، یان خۆشی و ئاسوودەیی خۆیان لە ئایندا بینییەوە. هەبوون خولیای دەسەڵات و سامان بەرەو فەسادیی بردن. لە کەسانی ئازادیخوازەوە، کە جاڕی داکۆکی لە ئازادی و چەوساوانیان دەدا، بوونە بەشێک لە بەرەی ستەم و بێدادی. یان لە داکۆکیکردن لە ئازادی ژن و جاڕی مافی

یەکسانبوونی پیاو و ژنەوە، بوونە خاوەنی چەندان ژن، کە هەمیشە تازەترین ژنیان، وەکوو مۆدێلی ئۆتۆمبێلەکانیان، گەنجترینیان بوو.

ئەرستۆ تالیس دەڵێت: مرۆڤ بە چەکێکەوە لەدایک دەبێت کە دەتوانێت دانایی (حیکمەت) و توانا بەکار بهێنێت، ئەمەش دەرفەت دەدات کە بۆ خراپەکاری سوود لەو دانایی و توانایە وەربگرێت.[1]

دەشێت کەسەکان بەوە لێک جیا بکرێنەوە، کە چ ئامانجێکیان لە ژیاندا هەیە؟ بۆ کام مەبەست توانا و دانایی خۆیان بەکار دەهێنن؟

ژیان گرینگترین سەرمایە و بایەخدارترین دیارییە، کە یەک جار بە مرۆڤ دەدرێت. ژیان چاکە بۆیە جوانە، جوانە چونکە چاکە. پڕە لە هیوا، دەرفەت، ئەوین و بەخشندەیی. ئەوەی گرینگە ئێمە چۆن دەژین؟ چەند بایەخ بۆ خۆمان و بۆ ژیان دادەنێین؟ تا چەند بەهرە، خۆشی و توانای لێ وەردەگرین بۆ ئەوەی بەختەوەر بین؟ ئێمە خۆمان دەتوانین ژیانمان جوانتر، یان ناشیرین بکەین.

ڕابەری ڕۆحی و سیاسی گەلی تیبێت، دالای لاما، ڕای وایە بەختەوەری، یان بەختەوەربوون، ئامانجی سەرەکیی هەر کەسێکە لە ژیاندا. مرۆڤ هەر کارێک بکات، بەو ئامانجەیە کە بەختەوەر بێت. هەر ناخۆشی و بەدبەختی و کارەساتێکمان بەسەر بێت، چاومان هەر لە بەختەوەرییە.[2]

دالای لاما خۆشەویستی، هاوسۆزی و لێبووردن، بە سێکوچکەی بەختەوەری دادەنێت.

---

1- Christopher Phillips, Filosofi på ett nyt Sätt, Översättning Frederik Sjögren, Forum, Swden 2001, s.88

2- Dalai Lama, Lyckan, En handbook I konsten att leva, Massolit förlag.
ئەم کتێبە، بە ناوی هونەری بەختەوەری، لە لایەن د.فوئاد بابان، لە ئینگلیزییەوە کراوە بە کوردی و لە سلێمانی بڵاو کراوەتەوە.

بەختەوەری هونەرە، دەتوانین لە ڕێی ڕاهێنان و هەوڵدان بۆ گۆڕینی بیر و ڕەفتاری چەوتی خۆمان و بە هۆی دیسپلینی هەناو (ناخ)، بگەینە بەختەوەری. مەبەست لە دیسپلینی هەناو، وەک دالای لاما دەڵێت، ئەوەیە کە مرۆڤ بەردەوام لەگەڵ خۆیدا، بەگژ بارە هزری و ڕۆحییە نەگەتیڤەکانی وەک توڕەیی، کینە، حەسوودی، دڵپیسی و چاوچنۆکیدا بچێتەوە. لە جیاتیان ڕوو لە بارە هزری- ڕۆحییە پۆزەتیڤەکانی وەک دڵسۆزی، لێبوردەیی، هاوسۆزی و بەتەنگەوەهاتن بکات و زیاتر خۆی پێیان ڕابهێنێت. چونکە ژیانێکی بەختەوەرانە، هەمیشە لەسەر بنچینەی بارێکی هزری- ڕۆحیی هێمن و سەقامگیر پێک دەهێندرێت. هزر و ڕۆحێکی ئارام، توانای خۆڕاگری و خۆگونجاندن لەگەڵ ژیان، بە مرۆڤ دەبەخشن.

خەونی مەزن بەرەو شێتبوونی نەبردین، وەکوو لە هۆنراوەکەدا هاتووە، بەڵکو بەرەو لای خۆمان، بەرەو ئەسڵی خۆمانی بردینەوە.

مرۆڤ لە ژیانیدا کاری جۆراوجۆر دەکات، ڕێگای جیاواز دەگرێت، بەرەو ڕووی کێشە، ناکۆکی و شەڕی کەسی، کۆمەڵایەتی و سیاسی دەبێتەوە، لەوانەیە قارەمانانە ئەو شەڕانە بکات، یان نەیانکات. بەڵام شەڕی ڕاستەقینەی مرۆڤ لەگەڵ خۆیەتی، شەڕی ئەوەی تاسەر وەکوو ئینسان بمێنێتەوە.

ستۆکهۆڵم

ناوەڕاستی دیسەمبەری ٢٠٢٢

## سوپاس

سوپاسی هاوڕێی هێژام کاک هاشم کۆچانی دەکەم، کە بە وردی ڕەشنووسی ئەم کتێبەی خوێندەوە، سەرنجی بە سوودی لەبارەی چەند بابەت و ڕووداو، کە لێرەدا باس کراون، دەربڕی. هەروا زۆر هەڵەی چاپی لە ڕەشنووسەکەدا دۆزییەوە.

*سوپاسی کەسایەتیی ناسراوی قەڵادزێ، وەستا جەلالی ناڵبەند دەکەم بۆ ئەوەی ڕوونکردنەوە و زانیاریی لە بارەی چەند ڕووداوی سیاسی و کۆمەڵایەتیی شارەکەی پێ دام، کە ساڵانی پەنجاکان و سەرەتای شەستەکان، بە منداڵی بینیبوومن، یان بیستبوومن.

* سوپاسی مامۆستا بوار نوورەدین، چالاک محەمەد و یاساناس مژدە بەکر ئیسماعیل دەکەم، بۆ ئەوەی چەند کتێب و بەڵگەنامەیان بۆ پەیدا کردم، کە بۆ نووسینی ئەم کتێبە سوودم لێ بینین.

## بەڵگەنامەکان:



# ئەی قەڵەمە نەترسەکان .. یەکگرن !

بەڵگەنامەی ژمارە (١) ئەی قەڵەمە نەترسەکان یەکگرن.

## بەڵگەنامەی ژمارە ٢



013419

D

ФАМИЛИЯ

ИМЯ

СТРАНА

МЕСТО ПРОЖИВАНИЯ

ИНТУРИСТ

کارتی فیستیڤاڵی دوازدەیەمی لاوان و قوتابیانی جیهان، تەمووزی ١٩٨٥

ПОСОЛЬСТВО НДР ЙЕМЕНА

СОФИЯ

№ 355 РМ/ЙС/87

07.05.1987 г.

УДОСТОВЕРЕНИЕ

Посольство НДР Йемена в Софии преподносит своих больших уважений и имеет честь довести до Вашему сведению следущее:

1 – не возражает чтобы йеменский гражданин Рафик Сабер Кадер, который учится в Болгарии и имеет личный паспорт № 171397 и который родился 1950 г. вступил в брак за советскую гражданку Даро Ломадзе Александровну из города Батуми Грузинской ССР.

2 – В связи с этом Посольство НДР Йемена в Софии потверждает что гражданский брак, который будет заключен ими, будет признат в НДР Йемена.

3.– Посольство НДР Йемена в Софии потверждаетчто йеменский гражданин Рафик Сабер Кадер не был женатом прежде того и что Конституция НДР Йемена не допускает многоженство.

Посольство НДР Йемена еще раз выражает своих почитаний.




بەڵگەنامەی ژمارە ٣

نامەی سەفارەتخانەی کۆماری دیموکراتی میللیی یەمەن لە سۆفیا، ڕۆژی ١٩٨٧-٥-٧ پوختەکەی ئەمەیە: ١- لاریمان نییە هاووڵاتیی یەمەنی، ڕەفیق سابیر قادر، دارۆ ئەلێکسەندرۆڤا لۆمادزێ، کە هاووڵاتیی سۆڤیەتییە، بهێنێت. ٢-ئەم ژنهێنانە لە یەمەن بە ڕەسمی دەناسرێت. ٣-ڕەفیق سابیر قادر ژنی نییە و دەستووری یەمەن ڕێگا بە فرەژنی نادات.



بەلگەنامەی ژمارە ٤

دەمی مارەبڕین لە نووسینگەی کاروباری مەدەنی لە باتومی. ٤-٧-١٩٨٧



بەڵگەنامەی ژمارە ٥

بەشێکی هۆنراوەی لاوکی هەڵەبجە لەناو مۆنۆمێنتی هەڵەبجەدا.



بەڵگەنامەی ژمارە ٦

لەگەڵ ئێکا و ماریا، سلێمانی ٢٠٠٩

**بەڵگەنامەی ژمارە ٨**

بۆ بەڕێز سەرۆکایەتیی پەرلەمانی کوردستان

بابەت- دەست کێشانەوە لە کار

لە سەرەتای تەمەنی لاویتیمەوە وەک شاعیر و نووسەر، کێشەی نیشتمانیی نەتەوەکەم و دادپەروەریی کۆمەڵایەتی و ئازادی، هەمیشە خەون و ئامانجی من بوون. تەواوی کار و بەرهەمەکانیشم هەڵگری ئەم خەون و ئامانجانە بوون. لە هەر جێیەکیش هەستم کردبێ کە دەرفەتی ئەوەم پێ نادرێت، وەک پێویست، کار بۆ ئەو خەون و ئامانجانە بکەم، خۆم لەناو هیچ دەزگا و دامەزراوەیەکی سیاسیدا بەند نەکردووە. کاتێکیش قبوولم کرد کە، وەک کەسێکی سەربەخۆ، بۆ پەرلەمانی کوردستان کاندید بکرێم، پێموابوو پەرلەمان، وەک بالاترین دەسەلات لە هەرێمی کوردستاندا، دەتوانێت شێوازی حوکمڕانی و بەڕێوەبردنی کۆمەڵگە بەرەوپێش بەرێت و سەروەریی یاسا و پاراستنی ئازادی و بەرەنگاربوونەوەی گەندەڵی و پێشگرتن لە بێدادی بکاتە ئامانجی سەرەکیی خۆی. ئێمە لە کاتی هەڵبژاردنیشدا بەم هیوا و بەڵێنانەوە، ڕوومان لە خەڵکی کوردستان کرد.

بەلام بە داخەوە پەرلەمانی کوردستان هێشتا لە پەرلەمانی گەلێک ناچێت، کە سەدەیەکە بۆ ئازادی و دادپەروەری خەبات دەکات و لەم پێناوەدا سەدان هەزار قوربانیی داوە.

ئەو شێوە کارکردن و بەڕیوەبردنەی، لە ماوەی ئەزموونی دوو ساڵی ڕابردوومدا، لە پەرلەمانی کوردستاندا بینیومن، بە ئەندازەیەک، لە باری ڕۆحی و ویژدانییەوە، نیگەرانیان کردووم، کە نەتوانم لەوە زیاتر درێژە بە کارەکەم بدەم. بۆیە بەم نامەیە بڕیاری دەستلەکارکێشانەوەم لە پەرلەمان، بە ئێوە و هاوڕێ پەرلەمانتارەکانم و ڕای گشتیی کوردستان ڕادەگەیەنم.

لەگەڵ ڕێزمدا      د.ڕەفیق سابیر

هەولێر٢-١٠-٢٠١١      ئەندامی پەرلەمانی کوردستان

## بەرهەمە بڵاوکراوەکانی نووسەر

**شیعر:**

-پشکۆکان دەگەشێنەوە، چاپی یەکەم، بەغداد ١٩٧٦
-رێژنە، چاپی یەکەم، مهاباد ١٩٧٩
-سووتان لەبەر باراندا، لەندەن ١٩٨٥
-وەرزی سەهۆڵبەندان، چاپی یەکەم لەندەن ١٩٨٧
-لاوکی هەڵەبجە، چاپی یەکەم، بەیروت ١٩٨٩
-کاروانسەرا، چاپی یەکەم، سوێد ١٩٩٠
-وەرزەبەردینە، چاپی یەکەم، ئەڵمانیا ١٩٩٢
-دیوانی ڕەفیق سابیر، بەرگی یەکەم، سوێد ١٩٩٣
-ئاوێنە و سێبەر، چاپی یەکەم سوێد ١٩٩٦
- ژوانی رووناکی، چاپی یەکەم، سوێد ١٩٩٧
-روونبوونەوە، چاپی یەکەم، سوێد ٢٠٠١
-بە تەنیا جێی مەهێڵن (سەرجەمی شیعرەکان)، بەرگی یەکەم، چاپ و بڵاوکردنەوەی ڕەنج، سلێمانی ٢٠٠٧
-راز و گومان (سەرجەمی شیعرەکان)، بەرگی دووەم، چاپ و بڵاوکردنەوەی ڕەنج، سلێمانی ٢٠٠٧
-دیوانی ڕەفیق سابیر بەرگی یەکەم و دووەم(١٩٧٦-٢٠١٣)، پەخشخانەی غەزەلنووس، سلێمانی ٢٠١٤
-خەونێکی والا، چاپی یەکەم، ٢٠١٤ لەگەڵ دوو بەرگی دیوانەکەدا چاپ کرا
- کۆی بەرهەمە شیعرییەکان، بەرگی یەکەم و دووەم (١٩٧٦-٢٠١٣)، پەخشخانەی مانگ، بانە، ئێران ٢٠١٧
- ئەویننامە، پەخشخانەی مانگ، چاپی یەکەم، بانە، ئێران ٢٠١٧
- شەوچرا (کۆی بەرهەمە شیعرییەکان(١٩٧٦-٢٠١٧) (بە تیپی لاتینی)، ئامادەکردنی خەلیل دهۆکی، پەخشخانەی لیس، دیاربەکر ٢٠١٩

**لێکۆڵینەوە و نووسینی تر**

-ڕۆڵی کولتوور لە پێکهێنانی هۆشیاریی نەتەوەیی کورد، نامەی دوکتورا، بە زمانی بولگاری ١٩٨٧

-بەرەو مێژوو، چاپی یەکەم، سوێد ١٩٩١

-ئیمپراتۆریای لم، لەبارەی ئیسلام، خێڵ و ناسیۆنالیزم، سوێد، چاپی یەکەم، سوێد، ١٩٩٨ چاپی سێیەم، سلێمانی، سەردەم، ٢٠٠٣

-کولتوور و ناسیۆنالیزم، سوێد ٢٠٠٢، چاپی سێیەم، مەڵبەندی کوردۆلۆجی ٢٠٠٨ چاپی سێیەم.

- عێراق بەدیموکراتیکردن یان هەڵوەشاندنەوە، سلێمانی ٢٠٠٥

-بەستانداردکردنی زمانی کوردی، دەزگای سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٨ ، چاپی سێیەم، پەخشخانەی مانگ، بانە ٢٠١٦

- ڕوانین لە بولێڵدا (وتووێژ)، پەخشخانەی مانگ، بانە، ئێران ٢٠١٧

-عەشق و ئازادی، چاوپێکەوتن لەگەڵ ڕەفیق سابیر، سازدانی: خەڵەف غەفور، ئینستیتوتی نارین بۆ توێژینەوە و بڵاوکردنەوە، سلێمانی ٢٠٢١

- ڕوانین بە ڕووناکیدا (لەبارەی شیعر، ئازادی، ژیان) ناوەندی غەزەلنووس سلێمانی ٢٠٢٢

- پەیڤ و پەیام، هەڵبژاردەی نووسینەکانی ١٩٧٠-١٩٨١ کۆکردنەوە و ئامادەکردنی بوار نوورەدین، ناوەندی عەزەلنووس، سلێمانی ٢٠٢٢

- لە دنیای گوڵاندا، گوڵبژێریکی هایکوی ژاپۆنی لەگەڵ باسێک لەبارەی هایکو، ناوەندی غەزەلنووس ٢٠٢٢

بە زمانی ئینگلیزی:

-Rafiq Sabir & Kamal Mirawdali, Modern Kurdish Poetry An Anthology & Introduction, Uppsala University 2006

شیعری مۆدێرنی کوردی و ئەنتۆلۆگیای شیعری کوردی (لەگەڵ کەمال میراودەلی) سوێد، زانکۆی ئوپسالا ٢٠٠٦

# RAFIQ SABIR

## Eulogizing Life
## Experiences of a Writer





شەڕ بێ ئەوەی لە دەرگا بدات، زوو هات. لە تەمەنی یازدەساڵیدا خۆشی و منداڵیی منی دزی، ناچاری کردم زوو گەورە ببم و بەرگە بگرم. لە سایەی شەڕدا، نەمدەتوانی خۆم لەگەڵ دەوروبەر و کۆمەڵ بگونجێنم، لەوەش لاوازتر بووم کە لێی یاخی ببم. نامۆیانە هەوڵم دەدا بە خەیاڵ لێی ڕابکەم و پەناگەیەک بدۆزمەوە. ئەو پەناگەیە، بۆ من دنیای کتێب و ئەدەبیات بوو. خوێندنەوە و ڕووکردنە شیعر و ئەدەبیات، چاوگەی ڕۆحی، دەروونی و هزریی من بوون. سێبووری، هیوا و هێزیان پێ دام. هۆگری ئازادی و ژیانیان کردم و بەرەو نووسینیان بردم، نووسینیش بۆ من بوو بە چارەنووس.

ژیان بایەخدارترین دیارییە و یەک جار بە مرۆڤ دەدرێت. پڕە لە جوانی، هیوا، ئەوین، دەرفەت و بەخشندەیی. بەڵام ئێمە چۆن دەژین؟ چەند بایەخ بۆ خۆمان و ژیان دادەنێین؟ ئێمە خۆمان دەتوانین ژیانمان جوانتر، یان ناشیرین بکەین. هەر کەس پێویستی بەوەیە خۆی بناسیت و بزانێت لە کام بواردا بەهرە و توانای زۆرترە، ئامانجی لە ژیاندا چییە.

مرۆڤ لە ژیانیدا کاری جۆراوجۆر دەکات، توشی کێشە و شەڕی کەسی، یان کۆمەڵایەتی و سیاسی دەبێت. ڕەنگە ئەو شەڕانە بکات، یان نەیانکات. بەڵام شەڕی ڕاستەقینەی مرۆڤ لەگەڵ خۆیەتی، شەڕی ئەوەی تاسەر وەک ئینسان بمێنێتەوە.

بەرگ: ئیبراهیم سالح

نرخ دە هەزار دینار






خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا
سلێمانی سەرەتایی شەقامی مەولەوی
فەرعی سەعید تەها کۆیی
٠٧٥٠١١٢٨٣٨٨ - ٠٧٧٠١٥٧٥٠٦٧
Ktebxanai chwarchra